# سُنَنُ النَّسَائِيِّ

## بە کوردی

للإمام أحمد بن شعيب أبو عبد الرحمن النسائي

بەرگی چوارەم

وەرگێرانی

عباس محمد أمين

حوکمی فەرمودەکان وەرگیراوە لە

الشيخ محمد صبحي بن حسن حلاق




# سُنَنُ النَّسَائِيِّ

## بەکوردی

نووسینی: الإمام أحمد بن شعيب أبو عبد الرحمن النسائي
وەرگێڕانی : عـبـاس محـمـد أمين
دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی
خـەتی بـەرگ : نـەوزاد کۆیـی
چاپـی یەکـەم : ١٤٤٢ك - ٢٠٢١ز
٥٨٦ لاپـەڕە
١٧ * ٢٤ سـم
بابـەت : ئـایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٨٢٧ ) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە










## فەرمانکردن بە ناوهێنانی خوا لە کاتی ڕاو کردندا

**٤٢٦٣-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﵁، أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الصَّيْدِ، فَقَالَ: إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ، فَإِنْ أَدْرَكْتَهُ لَمْ يَقْتُلْ فَاذْبَحْ، وَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ، وَإِنْ أَدْرَكْتَهُ قَدْ قَتَلَ، وَلَمْ يَأْكُلْ، فَكُلْ، فَقَدْ أَمْسَكَهُ عَلَيْكَ، فَإِنْ وَجَدْتَهُ قَدْ أَكَلَ مِنْهُ، فَلَا تَطْعَمْ مِنْهُ شَيْئاً، فَإِنَّمَا أَمْسَكَ عَلَى نَفْسِهِ، وَإِنْ خَالَطَ كَلْبُكَ كِلَاباً فَقَتَلْنَ فَلَمْ يَأْكُلْنَ، فَلَا تَأْكُلْ مِنْهُ شَيْئاً، فَإِنَّكَ لَا تَدْرِي أَيُّهَا قَتَلَ»[1].

**واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﵁ دەگێڕێتەوە: ئەو پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لە بارەی ڕاوکردن، فەرمووی: ئەگەر سەگەکەت نارد بۆ ڕاوکردنی نێچیر ناوی خوای لەسەر بهێنە، ئەگەر پێی گەیشتی نەیکوشتبوو، ئەوە سەری ببڕەو ناوی خوای لەسەر بهێنە، خۆ ئەگەر پێی گەیشتی کوشتبووی و لێی نەخواردبوو، ئەوا بیخۆ، چونکە ئەو بۆ تۆی گرتووە، ئەگەر بینیت لێی خواردبوو، هیچی لێ مەخۆ، چونکە بۆ خۆی گرتوویەتی، وە ئەگەر سەگەکەت تێکەڵاوی سەگی تر بوو نێچیرەکەیان کوشت و لێیان نەخواردبوو، ئەوە هیچی لێ مەخۆ، چونکە تۆ نازانی کامەیان کوشتوویەتی.**

## ڕێگری کردن لە خواردنی ئەو نێچیرەی ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە

**٤٢٦٤-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﵁ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَيْدِ الْمِعْرَاضِ، فَقَالَ: مَا أَصَبْتَ بِحَدِّهِ فَكُلْ، وَمَا أَصَبْتَ بِعَرْضِهِ فَهُوَ وَقِيذٌ. وَسَأَلْتُهُ عَنِ الْكَلْبِ فَقَالَ: إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ فَأَخَذَ، وَلَمْ يَأْكُلْ، فَكُلْ، فَإِنَّ أَخْذَهُ ذَكَاتُهُ، وَإِنْ كَانَ مَعَ كَلْبِكَ كَلْبٌ آخَرُ، فَخَشِيتَ أَنْ يَكُونَ أَخَذَ مَعَهُ فَقَتَلَ، فَلَا تَأْكُلْ، فَإِنَّكَ إِنَّمَا سَمَّيْتَ عَلَى كَلْبِكَ، وَلَمْ تُسَمِّ عَلَى غَيْرِهِ»[2].

**واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﵁ دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی ڕاوکردن بە نەقیزە فەرمووی: ئەگەر بەسەر نەقیزەکەوە پێکات ئەوە بیخۆ، وە ئەگەر بە باری پانی پێکات و مردار بوویەوە، ئەوە پیسەو مەیخۆ، وە پرسیارم لێکرد**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٥ و ٢٠٥٤ و ٥٤٧٥ و ٥٤٧٦ و٥٤٨٣ و ٥٤٨٤ و ٥٤٨٦ و ٥٤٨٧، ومسلم: ٢ و ١٩٢٩/٧، وأبو داود: ٢٨٤٨ و ٢٨٤٩ و ٢٨٥٠ و ٢٨٥١ و ٢٨٥٣ و ٢٨٥٤، والترمذي: ١٤٦٧ و ١٤٦٩ و ١٤٧٠ و ١٤٧١، وإبن ماجه: ٣٢٠٨ و ٣٢١٢ و ٣٢١٣ و ٣٢١٤.

(٢) صحيح.





دەربارەی ڕاوکردن بە سەگ، فەرمووی: ئەگەر سەگەکەت نارد بۆ ڕاوکردن، نێچیرەکەی گرت و لێی نەخوارد، بیخۆ، چونکە گرتنی سەربڕینێتی، وە ئەگەر لەگەڵ سەگەکەتدا سەگێکی دیکە ڕاوی کرد، ترسای لەوەی پێکەوە گرتبێتیان، نێچیرەکەیش مردار بوو بوویەوە، مەیخۆ، چونکە تۆ ناوی خوات لەسەر سەگەکەی خۆت هێناوە، لەسەر غەیری ئەو نەتهێناوە.

(وَقِيذ): واتە وەک ئەو ئاژەڵەی کە بە زەبری بەرکەوتنی شتێک مردار دەبێتەوە.

## ڕاو کردنی سەگی ڕاهێنراو

**٤٢٦٥-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: أُرْسِلُ الْكَلْبَ الْمُعَلَّمَ فَيَأْخُذُ، فَقَالَ: إِذَا أَرْسَلْتَ الْكَلْبَ الْمُعَلَّمَ، وَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ فَأَخَذَ فَكُلْ، قُلْتُ: وَإِنْ قَتَلَ؟ قَالَ: وَإِنْ قَتَلَ، قُلْتُ: أَرْمِي بِالْمِعْرَاضِ قَالَ: إِذَا أَصَابَ بِحَدِّهِ فَكُلْ، وَإِذَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ، فَلَا تَأْكُلْ»[١].

واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: سەگە فێرە ڕاوەکەم دەنێرم بۆ سەر نێچیر و دەیگرێ، فەرمووی: ئەگەر سەگە فێرە ڕاوەکەت نارد بۆ سەر نێچیرو ناوی خوات لەسەر هێنا، نێچیرەکەی گرت، بیخۆ، وتم: ئەگەر کوشتیشی، فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر کوشتیشی وتم: بە نەقیزە ڕاو دەکەم، فەرمووی: ئەگەر بەسەر نەقیزەکە پێکای ئەوا بیخۆ، وە ئەگەر بە باری پانی پێکای و مردار بوویەوە، مەیخۆ.

## ڕاو کردن بەو سەگەی کە فێری ڕاونەکراوە

**٤٢٦٦-** «عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ ﷺ يَقُولُ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا بِأَرْضِ صَيْدٍ، أَصِيدُ بِقَوْسِي، وَأَصِيدُ بِكَلْبِي الْمُعَلَّمِ، وَبِكَلْبِي الَّذِي لَيْسَ بِمُعَلَّمٍ، فَقَالَ: مَا أَصَبْتَ بِقَوْسِكَ، فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ وَكُلْ، وَمَا أَصَبْتَ بِكَلْبِكَ الْمُعَلَّمِ، فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ وَكُلْ، وَمَا أَصَبْتَ بِكَلْبِكَ الَّذِي لَيْسَ بِمُعَلَّمٍ، فَأَدْرَكْتَ ذَكَاتَهُ فَكُلْ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٧٧ و ٧٣٩٧، ومسلم: ١٩٢٩، وأبو داود: ٢٨٥٤، والترمذي: ١٤٦٥، وإبن ماجه: ٣٢١٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٧٨ و ٥٤٨٨ و ٥٤٩٦، ومسلم: ١٩٣٠، وأبو داود: ٢٨٥٢ و ٢٨٥٥ و ٢٨٥٦، والترمذي: ١٤٦٤ و ١٥٦٠، وإبن ماجه: ٣٢٠٧.




واتە: ئەبو ثەعلەبەی خوشەنی ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە لە زەویەکی ڕاودایِن، بە کەوانەکەم ڕاو دەکەم، وە ڕاو دەکەم بەو سەگەم کەوا فێرە ڕاوە، وە بەو سەگەش کەوا فێرە ڕاو نیە، فەرمووی: ئەوەی بە کەوانەکەت ڕاوت کردو ناوی خوات لەسەر هێنا بیخۆ، وە ئەوەی بە سەگە فێرە ڕاوەکەت ڕاوت کردو ناوی خوات لەسەر هێنا بیخۆ، وە ئەوەی بە سەگە فێرنەکراوەکەت ڕاوی دەکەی فریای سەربڕینی کەوتی بیخۆ.

## ئەگەر سەگ نێچیرەکەی کوشت

**٤٢٦٧-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُرْسِلُ كِلَابِي الْمُعَلَّمَةَ فَيُمْسِكْنَ عَلَيَّ فَآكُلُ؟ قَالَ: إِذَا أَرْسَلْتَ كِلَابَكَ الْمُعَلَّمَةَ، فَأَمْسَكْنَ عَلَيْكَ فَكُلْ، قُلْتُ: وَإِنْ قَتَلْنَ؟ قَالَ: وَإِنْ قَتَلْنَ. قَالَ: مَا لَمْ يَشْرَكْهُنَّ كَلْبٌ مِنْ سِوَاهُنَّ، قُلْتُ: أَرْمِي بِالْمِعْرَاضِ فَيَخْزِقُ؟ قَالَ: إِنْ خَزَقَ فَكُلْ، وَإِنْ أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَلَا تَأْكُلْ»[١].

واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، سەگە ڕاوکەرەکانم دەنێرم نێچیرم بۆ دەگرن بیخۆم؟ فەرمووی: ئەگەر سەگە فێرە ڕاوەکانت ناردو نێچیرەکەیان بۆ گرتی بیخۆ، وتم: ئەی ئەگەر کوشتیان؟ فەرمووی: ئەگەر کوشتیشیان. فەرمووی: بە مەرجێ سەگی تر جگە لە ئەوان بەشدار نەبووبێ لەگەڵیاندا، وتم: بە نەقیزەکەم ڕاو دەکەم و نێچیرەکە کون دەکات؟ فەرمووی: ئەگەر کونی کرد بیخۆ، وە ئەگەر بە باری پانی پێکای ئەوا مەیخۆ.

## ئەگەر لەگەڵ سەگەکەی خۆی سەگی تری بینی ناوی خوای لەسەر نەهێنرا بوو

**٤٢٦٨-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الصَّيْدِ، فَقَالَ: إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ فَخَالَطَتْهُ أَكْلُبٌ لَمْ تُسَمِّ عَلَيْهَا فَلَا تَأْكُلْ، فَإِنَّكَ لَا تَدْرِي أَيُّهَا قَتَلَهُ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەگێڕێتەوە، پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لە بارەی ڕاوەوە، فەرمووی: کاتێ سەگە فێرکراوەکەت نارد نێچیرت بۆ بگرێت، کۆمەڵە سەگێکی تری تێکەڵ بوو ناوی خوات لەسەر ئەو سەگانە نەهێنا بوو، ئەوە لێی مەخۆ، چونکە تۆ نازانی کامەیان کوشتویەتی (واتە: تۆ نازانی ئەو سەگە کوشتویەتی کە ناوی خوات لەسەر هێناوە یان ئەو سەگەی ناوی خوات لەسەر نەهێناوە).

## ئەگەر (ڕاوچی) لەگەڵ سەگەکەی خۆی سەگی دیکەی بینی

**٤٢٦٩-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْكَلْبِ، فَقَالَ: إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ فَسَمَّيْتَ فَكُلْ، وَإِنْ وَجَدْتَ كَلْباً آخَرَ مَعَ كَلْبِكَ فَلَا تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا سَمَّيْتَ عَلَى كَلْبِكَ، وَلَمْ تُسَمِّ عَلَى غَيْرِهِ»[١].

واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی سەگەوە، فەرمووی: ئەگەر سەگەکەت نارد بۆ ڕاوکردن و ناوی خوات لێ هێنا ئەوا لێی بخۆ، وە ئەگەر سەگێکت بینی لەگەڵ سەگەکەتدا لێی مەخۆ، چونکە ناوی خوات لەسەر سەگەکەت هێناوە، ناوی خوات لەسەر غەیری ئەو نەهێناوە.

**٤٢٧٠-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: أُرْسِلُ كَلْبِي فَأَجِدُ مَعَ كَلْبِي كَلْباً قَدْ أَخَذَ لَا أَدْرِي أَيُّهُمَا أَخَذَ، قَالَ: لَا تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا سَمَّيْتَ عَلَى كَلْبِكَ، وَلَمْ تُسَمِّ عَلَى غَيْرِهِ»[٢].

واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ وتی: من سەگەکەم دەنێرم بۆ ڕاو کردن دەبینم سەگێکی تر لەگەڵ سەگەکەمدا نێچیرێکیان گرتووە، نازانم کامەیان گرتویەتی، فەرمووی: مەیخۆ، چونکە تۆ ناوی خوات لەسەر سەگەکەت هێناوە، لە غەیری ئەو ناوت نەهێناوە.

**٤٢٧١-** «عَنْ عَدِيٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِمِثْلِ ذَلِكَ»[٣].

واتە: عەدی ﷺ دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەر ﷺ وەک فەرموودەکەی پێشەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**٤٢٧٢-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قُلْتُ: أُرْسِلُ كَلْبِي؟ قَالَ: إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ فَسَمَّيْتَ فَكُلْ، وَإِنْ أَكَلَ مِنْهُ فَلَا تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا أَمْسَكَ عَلَى نَفْسِهِ، وَإِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ فَوَجَدْتَ مَعَهُ غَيْرَهُ فَلَا تَأْكُلْ، فَإِنَّكَ إِنَّمَا سَمَّيْتَ عَلَى كَلْبِكَ، وَلَمْ تُسَمِّ عَلَى غَيْرِهِ»[١].

**واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: من سەگەکەم دەنێرم بۆ ڕاوکردن؟ فەرمووی: ئەگەر سەگەکەت نارد بۆ ڕاوکردن و ناوی خوات لێهێنا ئەوا لێی بخۆ، وە ئەگەر لێی خوارد مەیخۆ، چونکە ئەوە بۆ خۆی گرتویەتی، وە ئەگەر سەگەکەت نارد بۆ ڕاوکردن سەگێکی ترت لەگەڵیدا بینی ئەوە لێی مەخۆ، چونکە تۆ ناوی خوات لەسەر سەگەکەی خۆت هێناوە، لەسەر غەیری ئەو نەتهێناوە.**

**٤٢٧٣-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قُلْتُ: أُرْسِلُ كَلْبِي فَأَجِدُ مَعَ كَلْبِي كَلْباً آخَرَ، لَا أَدْرِي أَيُّهُمَا أَخَذَ، قَالَ: لَا تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا سَمَّيْتَ عَلَى كَلْبِكَ وَلَمْ تُسَمِّ عَلَى غَيْرِهِ»[٢].

**واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: من سەگەکەم دەنێرم بۆ ڕاوکردن سەگێکی تر دەبینم لەگەڵ سەگەکەمدا نازانم کامەیان گرتویەتی، فەرمووی: مەیخۆ، چونکە تۆ ناوی خوات لەسەر سەگەکەی خۆت هێناوە، لەسەر غەیری ئەو نەتهێناوە.**

## سەگ لە نێچیرەکە بخوات

**٤٢٧٤-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَيْدِ الْمِعْرَاضِ، فَقَالَ: مَا أَصَابَ بِحَدِّهِ فَكُلْ، وَمَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَهُوَ وَقِيذٌ، قَالَ: وَسَأَلْتُهُ عَنْ كَلْبِ الصَّيْدِ، فَقَالَ: إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ وَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ فَكُلْ، قُلْتُ: وَإِنْ قَتَلَ؟ قَالَ: وَإِنْ قَتَلَ، فَإِنْ أَكَلَ مِنْهُ فَلَا تَأْكُلْ، وَإِنْ وَجَدْتَ مَعَهُ كَلْباً غَيْرَ كَلْبِكَ، وَقَدْ قَتَلَهُ فَلَا تَأْكُلْ، فَإِنَّكَ إِنَّمَا ذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ ﷻ عَلَى كَلْبِكَ، وَلَمْ تَذْكُرْ عَلَى غَيْرِهِ»[٣].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) صحيح.**




واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی ڕاوکردن بە نەقیزە، فەرمووی: ئەگەر بەسەر نەقیزەکە پێکات ئەوا بیخۆ، وە ئەگەر بە باری پانی پێکات و مرداربوویەوە، ئەوە پیسەو مەیخۆ، وە پرسیارم لێکرد دەربارەی ڕاوکردن بە سەگ، فەرمووی: ئەگەر سەگەکەت نارد بۆ ڕاوکردن و ناوی خوات لەسەر هێنا بیخۆ، وتم: ئەگەر کوشتیشی؟ فەرمووی: ئەگەر کوشتیشی، ئەگەر لێی خوارد مەیخۆ، وە ئەگەر لەگەڵ سەگەکەتدا سەگێکی دیکە ڕاویکرد نێچیرەکەی کوشتبوو مەیخۆ، چونکە تۆ ناوی خوات لەسەر سەگەکەی خۆت هێناوە، لەسەر غەیری ئەو نەتهێناوە.

**٤٢٧٥-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ الطَّائِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الصَّيْدِ، قَالَ: إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ فَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ فَقَتَلَ، وَلَمْ يَأْكُلْ فَكُلْ، وَإِنْ أَكَلَ مِنْهُ فَلَا تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا أَمْسَكَهُ عَلَيْهِ، وَلَمْ يُمْسِكْ عَلَيْكَ»[١].

واتە: عەدی کوڕی حاتەمی طائی ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی ڕاوکردن، فەرمووی: ئەگەر سەگەکەت نارد بۆ ڕاوکردن و ناوی خوات لەسەر هێنا و کوشتی و لێی نەخوارد، بیخۆ، وە ئەگەر لێی خوارد مەیخۆ، چونکە بۆ خۆی گرتوویەتی و بۆ تۆ نەیگرتووە.

## فەرمانکردن بە کوشتنی سەگەکان

**٤٢٧٦-** «عَنْ مَيْمُونَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ: لَكِنَّا لَا نَدْخُلُ بَيْتاً فِيهِ كَلْبٌ، وَلَا صُورَةٌ فَأَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَئِذٍ، فَأَمَرَ بِقَتْلِ الْكِلَابِ حَتَّى إِنَّهُ لَيَأْمُرُ بِقَتْلِ الْكَلْبِ الصَّغِيرِ»[٢].

واتە: مەیمونە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: جیبریل بە پێغەمبەری ﷺ فەرموو: ئێمە ناچینە ناو ماڵێکەوە سەگی تێدا بێت، هەروەها وێنەیشی تێدا بێ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژە بەیانی کردەوە، فەرمانی کرد بە کوشتنی سەگەکان، تەنانەت فەرمانی دەکرد بە کوشتنی سەگی بچووکیش (چونکە سەگەکان بێ حەدو حیساب زۆر بوو بوون، دواتر نەهی کرد لە کوشتنیان).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح دون «إِنَّهُ لَيَأْمُرُ..».




**٤٢٧٧-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ بِقَتْلِ الْكِلَابِ غَيْرَ مَا اسْتَثْنَى مِنْهَا»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە کوشتنی سەگەکان، جگە لەو سەگانەی جیای کردنەوە.**

**٤٢٧٨-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَافِعاً صَوْتَهُ، يَأْمُرُ بِقَتْلِ الْكِلَابِ، فَكَانَتِ الْكِلَابُ تُقْتَلُ، إِلَّا كَلْبَ صَيْدٍ أَوْ مَاشِيَةٍ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەنگی بەرز کردەوە، فەرمانی دەکرد بە کوشتنی سەگەکان، پاشان سەگەکان دەکوژران، جگە لە سەگی ڕاوو سەگی ناو ئاژەڵ.**

**٤٢٧٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ بِقَتْلِ الْكِلَابِ إِلَّا كَلْبَ صَيْدٍ، أَوْ كَلْبَ مَاشِيَةٍ»[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە کوشتنی سەگەکان، جگە لە سەگی ڕاو، یان سەگی ناو مەڕو ماڵات.**

## سیفەتی ئەو سەگانەی کە فەرمان کراوە بە کوشتنیان

**٤٢٨٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَوْلَا أَنَّ الْكِلَابَ أُمَّةٌ مِنَ الْأُمَمِ لَأَمَرْتُ بِقَتْلِهَا فَاقْتُلُوا مِنْهَا الْأَسْوَدَ الْبَهِيمَ، وَأَيُّمَا قَوْمٍ اتَّخَذُوا كَلْباً لَيْسَ بِكَلْبِ حَرْثٍ، أَوْ صَيْدٍ، أَوْ مَاشِيَةٍ، فَإِنَّهُ يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطٌ»[٤].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موغەفەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر سەگەکان ئوممەتێک نەبوونایە لە ئوممەتەکان، فەرمانم دەکرد بە کوشتنیان، ئەوانە بکوژن کە ڕەشی قەترانین، وە هەر گەلێک سەگ ڕاگیر بکەن جگە لە سەگی**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٢٣، ومسلم: ٤٣ و ١٥٧٠/٤٥، وإبن ماجه: ٣٢٠٢.

(٢) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٤٢٧٨.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٧١، والترمذي: ١٤٨٨.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٤٥، والترمذي: ١٤٨٦ و ١٤٨٩، وإبن ماجه: ٣٢٠٥.




کشتووکاڵ، یان سەگی ڕاو و سەگی ناو مەڕو ماڵات، ئەوە هەموو ڕۆژێک بە ئەندازەی شاخێک وەکو شاخی ئوحود لە چاکەکانی کەم دەکات.

## نەچوونە ژوورەوەی فریشتەکان بۆ نێو ماڵێک سەگی تێدابێت

**٤٢٨١-** «عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْمَلَائِكَةُ لَا تَدْخُلُ بَيْتاً فِيهِ صُورَةٌ، وَلَا كَلْبٌ، وَلَا جُنُبٌ»[١].

**واتە: عەلی کوڕی ئەبو طاڵیب ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: فریشتەکان ناچنە ماڵێکەوە وێنە یان سەگ یان لەشگرانی تێدا بێت.**

**٤٢٨٢-** «عَنْ أَبِي طَلْحَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَدْخُلُ الْمَلَائِكَةُ بَيْتاً فِيهِ كَلْبٌ، وَلَا صُورَةٌ»[٢].

**واتە: ئەبو طەڵحە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فریشتەکان ناچنە ماڵێکەوە سەگ یان وێنەی تێدابێت.**

**٤٢٨٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَخْبَرَتْنِي مَيْمُونَةُ زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَصْبَحَ يَوْماً وَاجِماً، فَقَالَتْ لَهُ مَيْمُونَةُ: أَيْ رَسُولَ اللَّهِ لَقَدِ اسْتَنْكَرْتُ هَيْئَتَكَ مُنْذُ الْيَوْمَ، فَقَالَ: إِنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلَامُ كَانَ وَعَدَنِي أَنْ يَلْقَانِي اللَّيْلَةَ، فَلَمْ يَلْقَنِي، أَمَا وَاللَّهِ مَا أَخْلَفَنِي، قَالَ: فَظَلَّ يَوْمَهُ كَذَلِكَ ثُمَّ وَقَعَ فِي نَفْسِهِ جَرْوُ كَلْبٍ تَحْتَ نَضَدٍ لَنَا، فَأَمَرَ بِهِ فَأُخْرِجَ، ثُمَّ أَخَذَ بِيَدِهِ مَاءً فَنَضَحَ بِهِ مَكَانَهُ، فَلَمَّا أَمْسَى لَقِيَهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قَدْ كُنْتَ وَعَدْتَنِي أَنْ تَلْقَانِي الْبَارِحَةَ، قَالَ: أَجَلْ، وَلَكِنَّا لَا نَدْخُلُ بَيْتاً فِيهِ كَلْبٌ، وَلَا صُورَةٌ، قَالَ: فَأَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ ذَلِكَ الْيَوْمِ فَأَمَرَ بِقَتْلِ الْكِلَابِ»[٣].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: مەیمونەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدام، پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانی کردەوە بێتاقەتی پێوە دیار بوو، مەیمونە پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەمڕۆ بینیم بێتاقەت بووی، فەرمووی: جبریل**

---

(١) صحيح دون قوله: «وَلاَ جُنُبٌ».

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٢٥ و ٣٣٢٢ و ٤٠٠٢ و ٥٩٤٩، ومسلم: ٨٣ و ٢١٠٦/٨٤، والترمذي: ٢٨٠٤، وإبن ماجه: ٣٦٤٩.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢١٠٥، وأبو داود: ٤١٥٧.




پەیمانی پێدام ئەم شەو بمبینێ، بەڵام نەمبینی، سوێن بە خوا پەیمانی لەگەڵمدا نەشکاندوە (شتێک لە بابەتەکە هەیە) ڕۆژەکەی بەو شێوەیە بەسەر برد، پاشان بەبیری هاتەوە توتکە سەگێک لە ژێر بۆفیەکەماندا بوو، پاشان سەگەکەی دەرکردە دەرەوە، پاشان ئاوی هەڵگرت و شوێنەکەی ئاوپرژێن کرد، کاتێ ئیوارەی کردەوە جبریل هات بۆ لای، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: تۆ دوێنێ پەیمانت پێدام بێی بۆ لام، وتی: بەڵێ، بەڵام ئێمە ناچینە ماڵێکەوە سەگی تێدابێت، هەروەها وێنەش، پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانی کردەوە فەرمانی کرد بە کوشتنی سەگەکان.

## مۆڵەتدان بە ڕاگیر کردنی سەگ بۆ (پاسەوانی) مەڕو ماڵات

**٤٢٨٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنِ اقْتَنَى كَلْباً نَقَصَ مِنْ أَجْرِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطَانِ إِلَّا ضَارِياً أَوْ صَاحِبَ مَاشِيَةٍ»[1].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس سەگێک ڕاگیر بکات ئەوە هەموو ڕۆژێک بە ئەندازەی شاخێک وەکو شاخی ئوحود لە چاکەکانی کەم دەکات، جگە لە سەگی ڕاو یان سەگی ناو مەڕو ماڵات.

**٤٢٨٥-** «عَنِ السَّائِبِ بن يَزِيدَ أَنَّهُ سُفْيَانَ بْنِ أَبِي زُهَيْرٍ الشَّنَائِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنِ اقْتَنَى كَلْباً لَا يُغْنِي عَنْهُ زَرْعاً، وَلَا ضَرْعاً نَقَصَ مِنْ عَمَلِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطٌ، قُلْتُ: يَا سُفْيَانُ، أَنْتَ سَمِعْتَ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: نَعَمْ وَرَبِّ هَذَا الْمَسْجِدِ»[2].

واتە: سائیبی کوڕی یەزید دەگێڕێتەوە، سوفیانی کوڕی زوهەیری شەنائی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس سەگێک ڕاگیر بکات، بۆ کشتوکاڵ سوودی لێ وەرنەگرێ، وە بۆ ڕاوکردنیش، هەموو ڕۆژێک بە ئەندازەی شاخێک وەکو شاخی ئوحود لە چاکەکانی کەم دەکات، جگە لە سەگی ڕاو یان سەگی ناو مەڕو ماڵات، وتم: ئەی سوفیان: تۆ ئەمەت بیستووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ وتی: بەڵێ، بە پەروەردگاری ئەم مزگەوتە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٢٣ و ٣٣٢٥، ومسلم: ١٥٧٦، وإبن ماجه: ٣٢٠٦.

## بابەت: مۆڵەتدان بە ڕاگیرکردنی سەگ بۆ ڕاو کردن

**٤٢٨٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَمْسَكَ كَلْباً إِلَّا كَلْباً ضَارِياً أَوْ كَلْبَ مَاشِيَةٍ، نَقَصَ مِنْ أَجْرِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطَانِ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس سەگێک ڕاگیر بکات جگە لە سەگی ڕاوکردن یان سەگی ناو مەڕو ماڵات، هەموو ڕۆژێک بە ئەندازەی دوو شاخی وەکو شاخی ئوحود لە چاکەکانی کەم دەکات.**

**٤٢٨٧-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنِ اقْتَنَى كَلْباً إِلَّا كَلْبَ صَيْدٍ أَوْ مَاشِيَةٍ نَقَصَ مِنْ أَجْرِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطَانِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس سەگێ ڕاگیر بکات جگە لە سەگی ڕاوکردن یان سەگی ناو مەڕو ماڵات، هەموو ڕۆژێک بە ئەندازەی دوو شاخی وەکو شاخی ئوحود لە چاکەکانی کەم دەکات.**

## بابەت: مۆڵەتدان بە ڕاگیرکردنی سەگ بۆ کشتوکاڵ

**٤٢٨٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنِ اتَّخَذَ كَلْباً إِلَّا كَلْبَ صَيْدٍ أَوْ مَاشِيَةٍ أَوْ زَرْعٍ نَقَصَ مِنْ أَجْرِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطٌ»[٣].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موغەفەل ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس سەگێک ڕاگیر بکات جگە لە سەگی ڕاو یان ناو مەڕو ماڵات یان کشتوکاڵ، هەموو ڕۆژێک بە ئەندازەی شاخێکی وەکو ئوحود لە چاکەکانی کەم دەکات.**

**٤٢٨٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنِ اتَّخَذَ كَلْباً إِلَّا كَلْبَ صَيْدٍ أَوْ زَرْعٍ أَوْ مَاشِيَةٍ نَقَصَ مِنْ عَمَلِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطٌ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٢٢ و ٣٣٢٤، ومسلم: ٥٧ و ١٥٧٥/٥٩، وأبو داود: ٢٨٤٤، والترمذي: ١٤٩٠، وإبن ماجه: ٣٢٠٤.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس سەگێک ڕاگیر بکات جگە لە سەگی ڕاو یان کشتوکاڵ، یان سەگی ناو مەڕو ماڵات، هەموو ڕۆژێک بە ئەندازەی شاخێکی وەکو ئوحود لە چاکەکانی کەم دەکات.

**٤٢٩٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنِ اقْتَنَى كَلْباً لَيْسَ بِكَلْبِ صَيْدٍ، وَلَا مَاشِيَةٍ، وَلَا أَرْضٍ فَإِنَّهُ يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِهِ قِيرَاطَانِ كُلَّ يَوْمٍ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس سەگێک ڕاگیر بکات سەگی ڕاو نەبێ، وە هی ناو مەڕو ماڵات و کشتوکاڵیش نەبێت، ئەوا هەموو ڕۆژێک بە ئەندازەی دوو شاخی وەکو ئوحود لە چاکەکانی کەم دەکات.

**٤٢٩١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنِ اقْتَنَى كَلْباً إِلَّا كَلْبَ مَاشِيَةٍ أَوْ كَلْبَ صَيْدٍ نَقَصَ مِنْ عَمَلِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطٌ، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ أَوْ كَلْبَ حَرْثٍ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس سەگێ ڕاگیر بکات جگە لە سەگی ناو مەڕو ماڵات یان سەگی ڕاوکردن، هەموو ڕۆژێک بە ئەندازەی شاخێک وەکو شاخی ئوحود لە چاکەکانی کەم دەکات عەبدوڵلا وتی: ئەبو هورەیرە وتی: جگە لە سەگی کشتوکاڵیش.

## قەدەغەکردن لە وەرگرتنی نرخی سەگ

**٤٢٩٢-** «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ عُقْبَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَمَهْرِ الْبَغِيِّ، وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ»[٣].

واتە: ئەبو مەسعود عوقبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە وەرگرتنی پارەی سەگ و پارەی ئافرەتی زیناکەرو پێدانی پارە بە فاڵچی لە بری فاڵگرتنەوەکەی.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٣٧ و ٢٢٨٢ و ٥٣٤٦ و ٥٧٦١، ومسلم: ١٥٦٧، وأبو داود: ٣٢٢٨ و ٣٤٨١، والترمذي: ١١٣٣ و ١٢٧٦ و ٢٠٧١، وإبن ماجه: ٢١٥٩.




**٤٢٩٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَا يَحِلُّ ثَمَنُ الْكَلْبِ، وَلَا حُلْوَانُ الْكَاهِنِ، وَلَا مَهْرُ الْبَغِيِّ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پارەی (کڕین و فرۆشتنی) سەگ حەڵاڵ نیە، هەروەها پێدانی پارە بە فاڵچی لەبری فاڵگرتنەوەکەی، وە پارەی ئافرەتی زیناکەر (ئەو پارەی لەبری زینا کردنی پێی دەدرێ).**

**٤٢٩٤-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: شَرُّ الْكَسْبِ مَهْرُ الْبَغِيِّ، وَثَمَنُ الْكَلْبِ، وَكَسْبُ الْحَجَّامِ»[٢].

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خراپترین دەستەکەوت پارەی ئافرەتی زیناکەر و پارەی سەگ و دەست خستنی پارەی ئەوانەیە کەڵەشاخ دەکەن.**

## مۆڵەتدان بە کڕین و فرۆشتنی پارەی سەگی ڕاو کردن

**٤٢٩٥-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ ثَمَنِ السِّنَّوْرِ، وَالْكَلْبِ إِلَّا كَلْبَ صَيْدٍ»[٣].

**واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ پارەی (کڕین و فرۆشتنی) پشیلەو سەگی قەدەغە کردوە جگە لە سەگی ڕاو نەبێت.**

**٤٢٩٦-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي كِلَاباً مُكَلَّبَةً، فَأَفْتِنِي فِيهَا، قَالَ: مَا أَمْسَكَ عَلَيْكَ كِلَابُكَ فَكُلْ، قُلْتُ: وَإِنْ قَتَلْنَ؟ قَالَ: وَإِنْ قَتَلْنَ. قَالَ: أَفْتِنِي فِي قَوْسِي، قَالَ: مَا رَدَّ عَلَيْكَ سَهْمُكَ فَكُلْ، قَالَ: وَإِنْ تَغَيَّبَ عَلَيَّ؟ قَالَ: وَإِنْ تَغَيَّبَ عَلَيْكَ، مَا لَمْ تَجِدْ فِيهِ أَثَرَ سَهْمٍ غَيْرَ سَهْمِكَ أَوْ تَجِدْهُ قَدْ صَلَّ، يَعْنِي قَدْ أَنْتَنَ»[٤].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیرەی ﷺ، پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من سەگی ڕاهێنەرم هەیە،**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٤٨٤.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٦٩، وأبو داود: ٣٤٧٩، وإبن ماجه: ٢١٦١.

(٤) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٥٧.




فەتوام بۆ بدە لەبارەیەوە، فەرمووی: ئەوەی سەگەكانت بۆ تۆیان گرت، بیخۆ، وتم: ئەگەر كوشتیشیان؟ فەرمووی: ئەگەر كوشتیشیان، وتی: فەتوام بۆ بدە لە بارەی تیرەكەمەوە، فەرمووی: ئەوەی تیرەكەت پێكای بیخۆ، وتی: ئەی ئەگەر لەبەر چاوم دیار نەما؟ فەرمووی: ئەگەر لەبەر چاویشت دیار نەما، بە مەرجێك شوێنەواری تیری جگە لە تۆی پێوە نەبێت، یان بۆگەن نەبووبێت.

## ئاژەڵی ماڵی دەبێتە كێوی

**٤٢٩٧-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي ذِي الْحُلَيْفَةِ مِنْ تِهَامَةَ، فَأَصَابُوا إِبِلاً وَغَنَماً وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي أُخْرَيَاتِ الْقَوْمِ فَعَجَّلَ أَوَّلُهُمْ فَذَبَحُوا، وَنَصَبُوا الْقُدُورَ، فَدُفِعَ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَمَرَ بِالْقُدُورِ فَأُكْفِئَتْ، ثُمَّ قَسَّمَ بَيْنَهُمْ، فَعَدَلَ عَشْراً مِنَ الشَّاءِ بِبَعِيرٍ، فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ نَدَّ بَعِيرٌ، وَلَيْسَ فِي الْقَوْمِ إِلَّا خَيْلٌ يَسِيرَةٌ، فَطَلَبُوهُ فَأَعْيَاهُمْ فَرَمَاهُ رَجُلٌ بِسَهْمٍ فَحَبَسَهُ اللَّهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ لِهَذِهِ الْبَهَائِمِ أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ فَمَا غَلَبَكُمْ مِنْهَا فَاصْنَعُوا بِهِ هَكَذَا»[1].

واتە: رافعی كوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: لەكاتێكدا ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە (ذِي الْحُلَيْفَة) لە تیهامە، كۆمەڵە وشترو مەڕێكیان دەستكەوت، پێغەمبەریش لە كۆتایی خەڵكەكەوە بوو، بەپەلە یەكەمینیان سەربڕی و مەنجەڵی گەورەیان لەسەر ئاگر دانا، پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە لایان فەرمانی كرد چی لەناو مەنجەڵەكاندا بوو بەتاڵ كرایەوە، پاشان وشترو مەڕەكانی لە نێوانیاندا دابەش كرد، دە مەڕی یەكسان كرد بەرانبەر بە وشترێك، لەكاتێكدا ئەوان سەرقاڵی ئەو كارە بوون، وشترێك هەڵهات، لە نێو خەڵكەكەشدا تەنها وشترێكی كەم هەبوو، كەوتنە دوای ماندوی كردن پیاوێك ڕمێكی تێهاوێشت و پێكای، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەم ئاژەڵانە ئەوەندە لە دەشت ماونەتەوە وەكو ئاژەڵی كێویان لێهاتووە، ئەوەی لێتان گیربوو وەكو ئەمە بەم شێوەیەی لێ بكەن.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٨٨ و ٢٥٠٧ و ٣٠٧٥ و ٥٤٩٨ و ٥٥٠٣ و ٥٥٠٦ و ٥٥٤٣ و ٥٥٠٩ و ٥٥٤٣ و ٥٥٤٤، ومسلم: ١٩٦٨، وأبو داود: ٢٨٢١، والترمذي: ١٤٩١ و ١٤٩٢ و ١٦٠٠، وإبن ماجه: ٣١٣٧ و ٣١٧٨ و ٣١٨٣.




## لە بارەی ئەو كەسەی نێچیر دەپێكێ و دەكەوێتە ناو ئاوەوە

**٤٢٩٨-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الصَّيْدِ، فَقَالَ: إِذَا رَمَيْتَ سَهْمَكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ ﷻ، فَإِنْ وَجَدْتَهُ قَدْ قُتِلَ فَكُلْ، إِلَّا أَنْ تَجِدَهُ قَدْ وَقَعَ فِي مَاءٍ، وَلَا تَدْرِي الْمَاءُ قَتَلَهُ أَوْ سَهْمُكَ»[١].

**واتە:** عەدی كوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: پرسیارم كرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی ڕاوكردنەوە فەرمووی: ئەگەر تیرەكەت هاوێشت ناوی خوا بێنە، ئەگەر دۆزیتەوە كوژرابوو بیخۆ، بەڵام ئەگەر كەوتبووە نێو ئاوەوە مەیخۆ، چونكە تۆ نازانی ئاوەكە خنكاندوویەتی یان تیرەكەت.

**٤٢٩٩-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الصَّيْدِ، فَقَالَ: إِذَا أَرْسَلْتَ سَهْمَكَ وَكَلْبَكَ وَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ فَقَتَلَ سَهْمُكَ فَكُلْ، قَالَ: فَإِنْ بَاتَ عَنِّي لَيْلَةً يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: إِنْ وَجَدْتَ سَهْمَكَ، وَلَمْ تَجِدْ فِيهِ أَثَرَ شَيْءٍ غَيْرَهُ فَكُلْ، وَإِنْ وَقَعَ فِي الْمَاءِ فَلَا تَأْكُلْ»[٢].

**واتە:** عەدی كوڕی حاتەم ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو پرسیاری كرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی ڕاو كردنەوە، فەرمووی: ئەگەر تیرەكەت هاوێشت یان سەگەكەت نارد بۆ ڕاوكردن و ناوی خوات هێنا، تیرەكەت كوشتی، بیخۆ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر شەوێكم بە سەردا تێپەڕی؟ فەرمووی: ئەگەر تیرەكەت دۆزیەوە شوێنەواری هیچت نەبینی بە نێچیرەكەوە جگە لە تیرەكەت نەبێت، بیخۆ، وە ئەگەر كەوتە ناو ئاوەوە مەیخۆ.

## لە بارەی ئەو كەسەی نێچیر ڕاودەكات و لەبەرچاوی ون دەبێ

**٤٣٠٠-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا أَهْلُ الصَّيْدِ وَإِنَّ أَحَدَنَا يَرْمِي الصَّيْدَ فَيَغِيبُ عَنْهُ اللَّيْلَةَ وَاللَّيْلَتَيْنِ فَيَبْتَغِي الْأَثَرَ فَيَجِدُهُ مَيِّتاً وَسَهْمُهُ فِيهِ، قَالَ: إِذَا وَجَدْتَ السَّهْمَ فِيهِ، وَلَمْ تَجِدْ فِيهِ أَثَرَ سَبُعٍ، وَعَلِمْتَ أَنَّ سَهْمَكَ قَتَلَهُ فَكُلْ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٤٦٨.




واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە خەڵکێکین ڕاو دەکەین، یەکێکمان تیر دەهاوێژێ بۆ نێچیرەکەی، پاشان نێچیرەکەی لە پێش چاوی ون دەبێ شەوێک و دوو شەو، شوێنی شوێنەوارەکەی دەکەوێ دەبینێتەوە مردارەوە بووەو تیرەکەی لەناو گیانیدایە، فەرمووی: (ئەگەر تیرەکەت بینی تیایداو شوێنەواری درندەت نەبینی بە جەستەیەوە، هەروەها زانیت تیرەکەی تۆ کوشتوویەتی، ئەوە بیخۆ).

**٤٣٠١-** «عَنْ عَدِيٍّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا رَأَيْتَ سَهْمَكَ فِيهِ، وَلَمْ تَرَ فِيهِ أَثَراً غَيْرَهُ، وَعَلِمْتَ أَنَّهُ قَتَلَهُ فَكُلْ»[١].

واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر تیرەکەی خۆتت بینی بە گیانیەوە، هیچ شوێنەوارێکی ترت نەبینی جگە لە تیرەکەت، وە زانیت تیرەکەی تۆ کوشتوویەتی، ئەوە بیخۆ.

**٤٣٠٢-** «عَنْ عَدِيٍّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرْمِي الصَّيْدَ، فَأَطْلُبُ أَثَرَهُ بَعْدَ لَيْلَةٍ، قَالَ: إِذَا وَجَدْتَ فِيهِ سَهْمَكَ، وَلَمْ يَأْكُلْ مِنْهُ سَبُعٌ فَكُلْ»[٢].

واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من تیر دەهاوێژم، پاشان دەگەڕێم بە شوێنی نێچیرەکەم دوای شەوێک دەیدۆزمەوە، فەرمووی: ئەگەر تیرەکەی خۆتت بینی بە گیانیەوە، هیچ دڕندەیەک لێی نەخواردبوو، ئەوە بیخۆ.

## نێچیر ئەگەر بۆگەنی کرد

**٤٣٠٣-** «عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الَّذِي يُدْرِكُ صَيْدَهُ بَعْدَ ثَلَاثٍ فَلْيَأْكُلْهُ إِلَّا أَنْ يُنْتِنَ»[٣].

واتە: ئەبو ثەعلەبە ﷺ دەگێڕێتەوە: لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە بارەی ئەو کەسەی نێچیرەکەی لە دوای سێ ڕۆژ بدۆزێتەوە با بیخوا مەگەر بۆگەن بکات.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٩ و ١٩٣١/١٠، وأبو داود: ٢٨٦١.




**٤٣٠٤-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُرْسِلُ كَلْبِي فَيَأْخُذُ الصَّيْدَ، وَلَا أَجِدُ مَا أُذَكِّيهِ بِهِ فَأُذَكِّيهِ بِالْمَرْوَةِ وَالْعَصَا قَالَ: أَهْرِقِ الدَّمَ بِمَا شِئْتَ، وَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ ﷻ»[1].

**واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من سەگەکەم بەردەدەم بە دوای نێچیردا، شتێک نابینمەوە پێی سەرببڕم، بە بەردە تەران و گۆچان سەری دەبڕم، فەرمووی: خوێنی بڕێژە بەوەی دەتەوێ، وە ناوی خوایشی لەسەر بێنە.**

## ڕاو کردن بە (مِعْرَاضِ: نەقیزە

**تێبینی: (مِعْرَاضِ): بریتیە لە دارێکی قورس یان قۆچانێک سەری ئاسنە، یان ڕمێک پەڕی پێوە نەبێت، ئەگەر چووە ناو گۆشتەکەوەو بڕی، ئەوە حەڵاڵە بخورێ، ئەگەر لەسەر باری پانی پێکای ئەوە گۆشتەکەی حەرامە.**

**٤٣٠٥-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أُرْسِلُ الْكِلَابَ الْمُعَلَّمَةَ، فَتُمْسِكُ عَلَيَّ، فَآكُلُ مِنْهُ؟ قَالَ: إِذَا أَرْسَلْتَ الْكِلَابَ «يَعْنِي الْمُعَلَّمَةَ» وَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ، فَأَمْسَكْنَ عَلَيْكَ فَكُلْ، قُلْتُ: وَإِنْ قَتَلْنَ؟ قَالَ: وَإِنْ قَتَلْنَ، مَا لَمْ يَشْرَكْهَا كَلْبٌ لَيْسَ مِنْهَا، قُلْتُ: وَإِنِّي أَرْمِي الصَّيْدَ بِالْمِعْرَاضِ، فَأُصِيبُ فَآكُلُ؟ قَالَ: إِذَا رَمَيْتَ بِالْمِعْرَاضِ، وَسَمَّيْتَ فَخَزَقَ فَكُلْ، وَإِذَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَلَا تَأْكُلْ»[2].

**واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: وتم: من سەگی فێرە ڕاو دەنێرم بۆ نێچیر گرتن، بۆم دەگرن و لێی دەخۆم، فەرمووی: کاتێ سەگە فێرە ڕاوەکەت ناردو ناوی خوات لەسەر هێنا، ئەوە ئەوەی بۆی گرتی بیخۆ، وتم: ئەگەر کوشتیشیان؟ فەرمووی: ئەگەر کوشتیشیان، مادام سەگێکی تری فێر نەکراو لەگەڵیدا بەژداری نەکەن، وتم: من نەقیزەکەم دەگرمە نێچیرەکەو دەیپێکم و دەیخۆم؟ فەرمووی: ئەگەر نەقیزەکەت تێگرت و کونی کرد ئەوە بیخۆ، وە ئەگەر بە باری پانی پێکای ئەوە مەیخۆ.**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٢٤، وابن ماجه: ٣١٧٧.

(٢) صحيح.




## ئەو (ئامێرەی) نێچیرەکە دەپێکێ بە باری پانی نەقیزەکە

**٤٣٠٦-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمِعْرَاضِ فَقَالَ: إِذَا أَصَابَ بِحَدِّهِ فَكُلْ، وَإِذَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَقُتِلَ، فَإِنَّهُ وَقِيذٌ فَلَا تَأْكُلْ»[١].

**واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لە بارەی نەقیزەوە، فەرمووی: ئەگەر بەسەر نەقیزەکە پێکای ئەوە بیخۆ، وە ئەگەر بە باری پانی پێکای و مرداربوویەوە، ئەوە پیسەو مەیخۆ.**

## ئەوەی نێچیرەکەی بەسەر نەقیزە پێکا

**٤٣٠٧-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَيْدِ الْمِعْرَاضِ، فَقَالَ: إِذَا أَصَابَ بِحَدِّهِ فَكُلْ، وَإِذَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَلَا تَأْكُلْ»[٢].

**واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لە بارەی نەقیزەوە، فەرمووی: ئەگەر بەسەر نەقیزەکە پێکات ئەوە بیخۆ، وە ئەگەر بە باری پانی پێکات و مرداربوویەوە، ئەوە پیسەو مەیخۆ.**

**٤٣٠٨-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَيْدِ الْمِعْرَاضِ، فَقَالَ: مَا أَصَبْتَ بِحَدِّهِ فَكُلْ، وَمَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَهُوَ وَقِيذٌ»[٣].

**واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لە بارەی نەقیزەوە، فەرمووی: ئەگەر بەسەر نەقیزەکە پێکات ئەوە بیخۆ، وە ئەگەر بە باری پانی پێکات و مرداربوویەوە، ئەوە پیسەو مەیخۆ.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




## شوێنکەوتنی ڕاو کردن

**٤٣٠٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ سَكَنَ الْبَادِيَةَ جَفَا، وَمَنِ اتَّبَعَ الصَّيْدَ غَفَلَ، وَمَنِ اتَّبَعَ السُّلْطَانَ افْتُتِنَ»[١].

**واتە:** ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس لە دەشت دابنیشێ وشک و دڵڕەق دەردەچێ (چونکە تێکەڵی زانایان ناکات، وە بەرگەی ئازاری خەڵکی ناگرێ) هەرکەس شوێنی ڕاوکردن بکەوێ ئەوە (سەرقاڵی دەکات و) بێ ئاگا دەبێ، (لە زیکرو یادی خوا) وە هەرکەس شوێنی دەسەڵاتدار بکەوێ تووشی فیتنەو بەڵا دەبێت.

## (حوکمی خواردنی گۆشتی) کەروێشک

**٤٣١٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بِأَرْنَبٍ قَدْ شَوَاهَا، فَوَضَعَهَا بَيْنَ يَدَيْهِ، فَأَمْسَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَلَمْ يَأْكُلْ، وَأَمَرَ الْقَوْمَ أَنْ يَأْكُلُوا، وَأَمْسَكَ الْأَعْرَابِيُّ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تَأْكُلَ، قَالَ: إِنِّي أَصُومُ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، قَالَ: إِنْ كُنْتَ صَائِماً فَصُمِ الْغُرَّ»[٢].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: دەشتەکیەک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کەروێشکێکی برژاندبوو هێنای بۆی خستیە بەردەستی، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی گرتەوەو لێی نەخوارد، وە فەرمانی بە خەڵکەکە کرد لێی بخۆن، کابرای دەشتەکیش خۆی گرتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: چی ڕێگریت لێ دەکات لێی بخۆیت، وتی: من لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بە ڕۆژو دەبم، فەرمووی: ئەگەر بەڕۆژوو دەبی، ئەوە ئەو ڕۆژانە بگرە کە شەوەکانی مانگ ڕۆشنی کردوەتەوە، (سێزدەو چواردەو پازدە).

**٤٣١١-** «عَنِ ابْنِ الْحَوْتَكِيَّةِ قَالَ قَالَ عُمَرُ ﷺ مَنْ حَاضِرُنَا يَوْمَ الْقَاحَةِ؟ قَالَ: قَالَ أَبُو ذَرٍّ: أَنَا، أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِأَرْنَبٍ فَقَالَ الرَّجُلُ الَّذِي جَاءَ بِهَا: إِنِّي رَأَيْتُهَا تَدْمَى، فَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ لَمْ يَأْكُلْ، ثُمَّ

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٥٩، والترمذي: ٢٢٥٦.

(٢) ضعيف.




إنَّهُ قَالَ: كُلُوا، فَقَالَ رَجُلٌ: إِنِّي صَائِمٌ، قَالَ: وَمَا صَوْمُكَ؟ قَالَ: مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ، قَالَ: فَأَيْنَ أَنْتَ عَنِ الْبِيضِ الْغُرِّ ثَلَاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ»[١].

**واتە: ئیبنو حەوتەکیە دەڵێ: عومەر ﷺ وتی: کێ لە ڕۆژی (الْقَاحَة)دا (کە جێگایەک بوو لە نێوان مەککەو مەدینەدا) لەگەڵماندا ئامادەبوو؟ ئەبو زەڕ وتی: من، دەشتەکیەک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کەروێشکێکی هێنا بوو، ئەو پیاوەی کە هێنا بووی وتی: من بینیم خوێنی حەیزی لێ دەهات، پێغەمبەر ﷺ لێی نەخوارد، پاشان فەرمووی: بخۆن، پیاوێک وتی: من بەڕۆژووم، فەرمووی: ڕۆژووی چی؟ وتی: سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا، فەرمووی: ئەگەر تۆ بەڕۆژوو دەبی ئەوە دەست بگرە بە ئەو ڕۆژانەی کە شەوەکانی مانگ ڕۆشنی کردووەتەوە، سێزدەو چواردەو پازدە.**

**٤٣١٢-** «عَنْ هِشَامٍ وَهُوَ ابْنِ زَيْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَساً ﷺ يَقُولُ: أَنْفَجْنَا أَرْنَباً بِمَرِّ الظَّهْرَانِ، فَأَخَذْتُهَا، فَجِئْتُ بِهَا إِلَى أَبِي طَلْحَةَ، فَذَبَحَهَا فَبَعَثَنِي بِفَخِذَيْهَا وَوَرِكَيْهَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَبِلَهُ»[٢].

**واتە: هیشامی کوڕی زەید دەڵێ: گوێم لە ئەنەس ﷺ بوو دەیوت: پەلاماری کەروێشکێکماندا لە (مَرِّ الظَّهْرَان)، گرتم و هێنام بۆ لای ئەبو طەڵحە، ئەویش سەری بڕی ڕانەکەی و سمتەکەی بە مندا نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەویش وەریگرت.**

**٤٣١٣-** «عَنِ ابْنِ صَفْوَانَ ﷺ قَالَ: أَصَبْتُ أَرْنَبَيْنِ فَلَمْ أَجِدْ مَا أُذَكِّيهِمَا بِهِ فَذَكَّيْتُهُمَا بِمَرْوَةٍ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ ذَلِكَ فَأَمَرَنِي بِأَكْلِهِمَا»[٣].

**واتە: ئیبنو صەفوان ﷺ دەڵێ: دوو کەروێشکم ڕاو کرد هیچ شتێکم لانەبوو پێی سەر ببڕم، بە بەردە تەرانێکی سپی سەرم بڕی، پرسیارم کرد لە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردم بە خواردنی.**

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٧٢ و ٥٤٨٩ و ٥٥٣٥، ومسلم: ١٩٥٣، وأبو داود: ٣٧٩١، والترمذي: ١٧٨٩، وإبن ماجه: ٣٢٤٣.

(٣) صحيح.

## (حوکمی خواردنی گۆشتی) بزنە مژە

**٤٣١٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ سُئِلَ عَنِ الضَّبِّ، فَقَالَ: لَا آكُلُهُ وَلَا أُحَرِّمُهُ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر پرسیاری لێکرا سەبارەت بە بزنە مژە، فەرمووی: نە دەیخۆم و نە قەدەغەی دەکەم.**

**٤٣١٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا تَرَى فِي الضَّبِّ؟ قَالَ: لَسْتُ بِآكِلِهِ وَلَا مُحَرِّمِهِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بزنە مژە چۆن دەبینی؟ فەرمووی: نە دەیخۆم و نە قەدەغەی دەکەم.**

**٤٣١٦-** «عَنْ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُتِيَ بِضَبٍّ مَشْوِيٍّ، فَقُرِّبَ إِلَيْهِ، فَأَهْوَى إِلَيْهِ بِيَدِهِ لِيَأْكُلَ مِنْهُ، قَالَ لَهُ: مَنْ حَضَرَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ لَحْمُ ضَبٍّ، فَرَفَعَ يَدَهُ عَنْهُ، فَقَالَ لَهُ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَحَرَامٌ الضَّبُّ؟ قَالَ: لَا، وَلَكِنْ لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِ قَوْمِي فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ، فَأَهْوَى خَالِدٌ إِلَى الضَّبِّ فَأَكَلَ مِنْهُ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْظُرُ»[٣].

**واتە: خالدی کوڕی وەلید ﷺ دەگێڕێتەوە: بزنە مژەیەکی برژاویان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێناو لە پێشی دانرا، دەستی بۆی برد لێی بخوات، ئەو کەسەی ئامادەی کردبوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە گۆشتی بزنە مژەیە، دەستی لە خواردنەکە هەڵگرت و نەیخوارد، خالد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، گۆشتی بزنە مژە قەدەغەیە؟ فەرمووی: نا، بەڵام لە زەوی قەومەکەمدا نیە قیزی لێ دەکەمەوە، خالد دەستی بۆ بزنە مژەکە درێژ کردو لێی خوارد، پێغەمبەری خواش ﷺ تەماشای دەکرد.**

---

**(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٣٦ و ٧٢٦٧، ومسلم: ٣٩ و ٤٠ و ١٩٤٣/٤١ و ١٩٤٤، والترمذي: ١٧٩٠، وإبن ماجه: ٣٢٤٢.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٩١ و ٥٤٠٠ و ٥٥٣٧، ومسلم: ١٩٤٥، وأبو داود: ٣٧٩٤، وإبن ماجه: ٣٢٤١.**

**٤٣١٧-** «عَنْ خَالِدِ بْنَ الْوَلِيد ﷺ، أَنَّهُ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى مَيْمُونَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ وَهِيَ خَالَتُهُ، فَقُدِّمَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَحْمُ ضَبٍّ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يَأْكُلُ شَيْئاً حَتَّى يَعْلَمَ مَا هُوَ، فَقَالَ بَعْضُ النِّسْوَةِ: أَلَا تُخْبِرْنَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَا يَأْكُلُ، فَأَخْبَرَتْهُ أَنَّهُ لَحْمُ ضَبٍّ، فَتَرَكَهُ، قَالَ خَالِدٌ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَحَرَامٌ هُوَ؟ قَالَ: لَا وَلَكِنَّهُ طَعَامٌ لَيْسَ فِي أَرْضِ قَوْمِي فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ. قَالَ خَالِدٌ: فَاجْتَرَرْتُهُ إِلَيَّ، فَأَكَلْتُهُ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْظُرُ»(١).

**واتە: خالدی کوڕی وەلید ﷺ دەگێڕێتەوە، لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتنە ژورەوە بۆ لای مەیمونەی کچی حاریثە، پوری خالد بوو، گۆشتی بزنەمژە نزیک کرایەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ شتێکی نەدەخوارد هەتا نەیزانیایە ئەوە چیە، هەندێ لە ژنەکان وتی: هەواڵ نادەن بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەوەی کە دەیخوا، ئەویش هەواڵی پێدا کە ئەوە گۆشتی بزنەمژەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ لێی نەخوارد، خالد وتی: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئایا ئەوە قەدەغەیە؟ فەرمووی: نا، بەڵکو ئەم خواردنە لە زەوی قەومەکەمدا نەبووە بۆیە من قیزی لێدەکەمەوە. خالد وتی: لە خۆمم نزیک کردەوەو لێم خوارد، پێغەمبەریش تەماشای دەکرد.**

**٤٣١٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَهْدَتْ خَالَتِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَقِطاً وَسَمْناً وَأَضُبّاً، فَأَكَلَ مِنَ الْأَقِطِ وَالسَّمْنِ، وَتَرَكَ الْأَضُبَّ تَقَذُّراً، وَأُكِلَ عَلَى مَائِدَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلَوْ كَانَ حَرَاماً مَا أُكِلَ عَلَى مَائِدَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»(٢).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پورم «خوشکی دایکم» کەشک و ڕۆن و بزنەمژەی بە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا، لە کەشک و ڕۆنەکەی خواردو، وازی لە بزنەمژەکە هێنا قیزی لێدەکردەوە، وە لەسەر سفرەی پێغەمبەری خوا ﷺ بزنەمژە خوراوە، ئەگەر قەدەغە بووایە لەسەر سفرەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەخورا.**

**٤٣١٩-** «عَنِ سَعِيدِ بن جُبَيْرٍ عن ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ أَكْلِ الضِّبَابِ، فَقَالَ: أَهْدَتْ أُمُّ حُفَيْدٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ سَمْناً وَأَقِطاً وَأَضُبّاً، فَأَكَلَ مِنَ السَّمْنِ وَالْأَقِطِ، وَتَرَكَ الضِّبَابَ تَقَذُّراً لَهُنَّ، فَلَوْ كَانَ حَرَاماً مَا أُكِلَ عَلَى مَائِدَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَلَا أَمَرَ بِأَكْلِهِنَّ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٧٥ و ٥٣٨٩ و ٥٤٠٢ و ٧٣٥٨، ومسلم: ١٩٤٧، وأبو داود: ٣٧٩٣.

(٣) صحيح الإسناد.





واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، ئەو پرسیاری لێکرا لەبارەی گۆشتی بزنەمژە وتی: دایکی حوفەید بە دیاری ڕۆن و کەشک و بزنەمژەی نارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش لە ڕۆن و کەشکەکەی خوارد، وازی لە خواردنی بزنەمژە هێنا، چونکە قیزی لێ دەکردەوە، ئەگەر قەدەغە بووایە لەسەر سفرەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەخورا، فەرمانیشی نەدەکردن بە خواردنی.

**٤٣٢٠-** «عَنْ ثَابِتِ بْنِ يَزِيدَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَنَزَلْنَا مَنْزِلاً، فَأَصَابَ النَّاسُ ضِبَاباً، فَأَخَذْتُ ضَبّاً فَشَوَيْتُهُ، ثُمَّ أَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ، فَأَخَذَ عُوداً يَعُدُّ بِهِ أَصَابِعَهُ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ أُمَّةً مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ مُسِخَتْ دَوَابَّ فِي الْأَرْضِ، وَإِنِّي لَا أَدْرِي أَيُّ الدَّوَابِّ هِيَ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ النَّاسَ قَدْ أَكَلُوا مِنْهَا، قَالَ: فَمَا أَمَرَ بِأَكْلِهَا وَلَا نَهَى»[١].

واتە: ثابتی کوڕی یەزیدی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە گەشتێکدا، دابەزینە شوێنێک، خەڵکەکە چەند بزنە مژەیەکیان گرت، منیش بزنەمژەیەکم گرت و برژاندم، پاشان هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، چیلکەیەکی گرتە دەستەوە بە پەنجەکانی ئەمدیو ئەو دیوی پێدەکرد، پاشان فەرمووی: ئوممەتێک لە بەنی ئیسرائیل شێوەیان گۆڕا بۆ ئاژەڵ لەسەر زەویدا، منیش نازانم ئەوە چی ئاژەڵێکە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی لێیان خوارد، وتی: نە فەرمانی بە خواردنی کرد و نە ڕێگری لێکرد.

٤٣٢١- «عَنْ ثَابِتِ بْنِ وَدِيعَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِضَبٍّ، فَجَعَلَ يَنْظُرُ إِلَيْهِ وَيُقَلِّبُهُ، وَقَالَ: إِنَّ أُمَّةً مُسِخَتْ لَا يُدْرَى مَا فَعَلَتْ، وَإِنِّي لَا أَدْرِي لَعَلَّ هَذَا مِنْهَا»[٢].

واتە: ثابتی کوڕی وەدیعە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بزنەمژەیەکی هێنا، تەماشای دەکردو ئەم دیو ئەو دیوی پێدەکرد، وە فەرمووی: (ئەمانە) ئوممەتێک بوون شێوەیان گۆڕا، نازانرێ چیان کرد، من نازانم پێدەچێ ئەم بزنە مژە لەو ئوممەتە بێت.

**٤٣٢٢-** «عَنْ ثَابِتِ ابْنِ وَدِيعَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ بِضَبٍّ فَقَالَ: إِنَّ أُمَّةً مُسِخَتْ وَاللَّهُ أَعْلَمُ»[٣].

---

(١) صحيح الإسناد. أخرجه أبو داود: ٣٧٩٥، وإبن ماجه: ٣٢٣٨.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: ثابتی کوڕی وەدیعە ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بزنەمژەیەکی هێنا، فەرمووی: (ئەمانە) ئوممەتێک بوون شێوەیان گۆڕا بۆ ئەم جۆرە گیانداره. خواش زاناترە.

## (حوکمی خواردنی گۆشتی) کەمتیار

**٤٣٢٣-** «عَنِ ابْنِ أَبِي عَمَّارٍ قَالَ: سَأَلْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ الضَّبُعِ، فَأَمَرَنِي بِأَكْلِهَا، فَقُلْتُ أَصَيْدٌ هِيَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قُلْتُ: أَسَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ»[١].

**واتە: ئیبنو ئەبی عەممارِ دەڵێ: پرسیارم لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا کرد لە بارەی کەمتیارەوە، فەرمانی پێکردم بە خواردنی، وتم: ئایا ئەوە نێچیرە؟ وتی: بەڵێ، وتم: ئایا لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوتە؟ وتی: بەڵێ.**

## بابەت: قەدەغەکردنی خواردنی ئاژەڵە دڕندەکان

**٤٣٢٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: كُلُّ ذِي نَابٍ مِنْ السِّبَاعِ فَأَكْلُهُ حَرَامٌ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەموو خاوەن کەڵپەیەک لە دڕندەکان گۆشتی قەدەغەیە.**

**٤٣٢٥-** «عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: نَهَى عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ»[٣].

**واتە: ئەبو ثەعلەبەی خوشەنی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ خواردنی گۆشتی هەموو خاوەن کەڵپەیەکی قەدەغەکردوە لە دڕندەکان.**

**٤٣٢٦-** «عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَحِلُّ النُّهْبَى، وَلَا يَحِلُّ مِنَ السِّبَاعِ، كُلُّ ذِي نَابٍ، وَلَا تَحِلُّ الْمُجَثَّمَةُ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٨٠١، وإبن ماجه: ٣٠٨٥ و ٣٢٣٦.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٣٣، وإبن ماجه: ٣٢٣٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٣٠ و ٥٧٨٠ و ٥٧٨١، ومسلم: ١٩٣٢، وأبو داود: ٣٨٠٢، والترمذي: ١٤٧٧، وإبن ماجه: ٣٢٣٢.

(٤) صحيح.



واتە: ئەبو ثەعلەبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەموویەتی: تاڵانی حەڵاڵ نیە، وە لە دڕندەکانیشدا هەموو خاوەن کەڵپەیەک حەڵاڵ نیە، وە ئەو ئاژەڵەش کە دەکرێتە نیشانەو تیری تێ دەهاوێژن حەڵاڵ نیە.

## ڕێگەپێدان بە خواردنی گۆشتی ئەسپ

**٤٣٢٧-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: نَهَى وَذَكَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ خَيْبَرَ، عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ، وَأَذِنَ فِي الْخَيْلِ»[1].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا گۆشتی گوێدرێژی قەدەغە کردو ڕێگەیدا بە خواردنی گۆشتی ئەسپ.**

**٤٣٢٨-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: أَطْعَمَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لُحُومَ الْخَيْلِ، وَنَهَانَا عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ»[2].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنی گۆشتی ئەسپی دەرخواردماندا و ڕێگری لێکردین لە گۆشتی گوێدرێژ.**

**٤٣٢٩-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: أَطْعَمَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ خَيْبَرَ لُحُومَ الْخَيْلِ، وَنَهَانَا عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ»[3].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنی گۆشتی ئەسپی دەرخواردماندا، وە ڕێگری لێکردین لە گۆشتی گوێدرێژ.**

**٤٣٣٠-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَأْكُلُ لُحُومَ الْخَيْلِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[4].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ گۆشتی ئەسپمان دەخوارد.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٢١٩ و ٥٥٢٠ و ٥٥٢٤، ومسلم: ٣٦ و ١٩٤١/٣٧، وأبو داود: ٣٧٨٨ و ٣٧٨٩، والترمذي: ١٧٩٣، وإبن ماجه: ٣١١٩ و ٣١٩٧.

(٤) صحيح الإسناد.




## قەدەغەکردنی خواردنی گۆشتی ئەسپ

**٤٣٣١-** «عَنْ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ ﷺ أَنَّهُ: سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا يَحِلُّ أَكْلُ لُحُومِ الْخَيْلِ، وَالْبِغَالِ، وَالْحَمِيرِ»[١].

**واتە: خالدی کوڕی وەلید ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: حەڵاڵ نیە گۆشتی ئەسپ و هێسترو گوێدرێژ.**

**٤٣٣٢-** «عَنْ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: نَهَى عَنْ أَكْلِ لُحُومِ الْخَيْلِ، وَالْبِغَالِ، وَالْحَمِيرِ، وَكُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ»[٢].

**واتە: خالدی کوڕی وەلید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کرد لە خواردنی گۆشتی ئەسپ و هێسترو گوێدرێژ، وە هەموو خاوەن کەڵپەیەک لە دڕندەکان.**

**٤٣٣٣-** «عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَأْكُلُ لُحُومَ الْخَيْلِ، قُلْتُ: الْبِغَالَ؟ قَالَ: لَا»[٣].

**واتە: عەطاء دەگێڕێتەوە، لە جابرەوە ﷺ: دەڵێ: ئێمە گۆشتی ئەسپمان دەخوارد، وتم: هێستریش؟ وتی: نەخێر.**

## قەدەغەکردنی خواردنی گۆشتی گوێدرێژیماڵی

**٤٣٣٤-** «عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: لِابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ: نَهَى عَنْ نِكَاحِ الْمُتْعَةِ، وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الْأَهْلِيَّةِ يَوْمَ خَيْبَرَ»[٤].

**واتە: عەلی بە ئیبنو عەباسی ﷺ وت: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا ڕێگری کرد لە مارەیی (الْمُتْعَة) (کە بریتیە لەوەی پیاوێک بە ژنێک دەڵێ ئەوەندە پارەت دەدەمێ لەبری ئەوەی ئەوەندە ڕۆژ لەگەڵتدا ڕابوێرم، بە ئامادەبوونی دوو شایەت)، وە لە گۆشتی گوێدرێژی ماڵیش.**

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٧٩٠، وإبن ماجه: ٣١٩٨.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**٤٣٣٥-** «عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ مُتْعَةِ النِّسَاءِ يَوْمَ خَيْبَرَ، وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الْإِنْسِيَّةِ»[١].

**واتە: عەلی كوڕی ئەبو طاڵیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا موتعەی ئافرەتان و گۆشتی گوێدرێژیماڵیشی قەدەغە كرد.**

**٤٣٣٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: نَهَى عَنِ الْحُمُرِ الْأَهْلِيَّةِ يَوْمَ خَيْبَرَ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا گۆشتی گوێدرێژی ماڵی قەدەغە كرد.**

**٤٣٣٧-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مِثْلَهُ، وَلَمْ يَقُلْ خَيْبَرَ»[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ وەكو ئەوەی باسكرد، باسی خەیبەری نەكرد.**

**٤٣٣٨-** «عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الْإِنْسِيَّةِ نَضِيجاً وَنِيئاً»[٤].

**واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا گۆشتی گوێدرێژی ماڵی قەدەغە كرد.**

**٤٣٣٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى ﷺ قَالَ: أَصَبْنَا يَوْمَ خَيْبَرَ حُمُراً خَارِجاً مِنَ الْقَرْيَةِ، فَطَبَخْنَاهَا، فَنَادَى مُنَادِي النَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ حَرَّمَ لُحُومَ الْحُمُرِ فَأَكْفِئُوا الْقُدُورَ بِمَا فِيهَا فَأَكْفَأْنَاهَا»[٥].

**واتە: عەبدوڵلای كوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی خەیبەر لە دەرەوەی شار گوێدرێژی ماڵیمان گرت، كردمان بە چێشت، بانگكەرێک لە لایەن پێغەمبەرەوە**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٢١٥ و ٤٢١٧ و ٤٢١٨ و ٥٥٢١ و ٥٥٢٢، ومسلم: ٢٤ و ١٥٣٨/٢٥.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٢٢١ و ٤٢٢٣ و ٤٢٢٥ و ٤٢٢٦، ومسلم: ٢٨ و ١٩٣٨/٢٩، وإبن ماجه: ٣١٩٤.

(٥) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٥٥ و ٤٢٢٠، ومسلم: ٢٦ و ١٩٣٧/٢٧، وإبن ماجه: ٣١٩٢.




**بانگی کرد: پێغەمبەری خوا ﷺ گۆشتی گوێدرێژی قەدەغە کردوە، مەنجەڵەکان بەتاڵ بکەنەوە لەوەی تیایدایە، ئێمەش بەتاڵمان کردەوە.**

**٤٣٤٠-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: صَبَّحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَيْبَرَ، فَخَرَجُوا إِلَيْنَا، وَمَعَهُمُ الْمَسَاحِي، فَلَمَّا رَأَوْنَا، قَالُوا: مُحَمَّدٌ وَالْخَمِيسُ، وَرَجَعُوا إِلَى الْحِصْنِ يَسْعَوْنَ، فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، خَرِبَتْ خَيْبَرُ، إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ، فَأَصَبْنَا فِيهَا حُمُراً، فَطَبَخْنَاهَا، فَنَادَى مُنَادِي النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ وَرَسُولَهُ يَنْهَاكُمْ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ، فَإِنَّهَا رِجْسٌ»[1].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەیبەر بەیانی کردەوە، هاتن بۆ لامان خاکەناز ئەو شتانەیان پێ بوو، کاتێ ئێمەیان بینی، وتیان: موحەممەدو سەربازەکانی هاتن بەپەلە گەڕانەوە بۆ ناو قەڵاکانیان، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی بەرزکردەوە، پاشان فەرمووی: (اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَر) خەیبەر وێران بوو، ئەگەر ئێمە هێرش ببەینە سەر هەر قەومێک ئەوسا ترسێنراوان چ ڕۆژێکی خراپ و تەنگانەیان دەبێ، لە خەیبەر گوێدرێژمان دەستکەوت کردمان بە چێشت، بانگکەرێک لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بانگی کرد وتی: خواو پێغەمبەرەکەی گۆشتی گوێدرێژیان قەدەغە کردوە، چونکە پیسە.**

**٤٣٤١-** «عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ ﷺ قال: أَنَّهُمْ غَزَوْا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى خَيْبَرَ، وَالنَّاسُ جِيَاعٌ، فَوَجَدُوا فِيهَا حُمُراً مِنْ حُمُرِ الْإِنْسِ، فَذَبَحَ النَّاسُ مِنْهَا، فَحُدِّثَ بِذَلِكَ النَّبِيُّ ﷺ، فَأَمَرَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ، فَأَذَّنَ فِي النَّاسِ: أَلَا إِنَّ لُحُومَ الْحُمُرِ الْإِنْسِ لَا تَحِلُّ لِمَنْ يَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ»[2].

**واتە: ئەبو ئەعلەبەی خوشەنی ﷺ دەڵێ: ئەوان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ غەزای خەیبەریان کرد، خەڵکەکەش برسیان بوو، گوێدرێژیماڵیان لەوێ بینی، خەڵکەکە هەندێکیان لێ سەربڕی، ئەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ باسکرا، فەرمانی کرد بە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عوف، هاواری کرد لە نێو خەڵکیدا: ئاگادار بن گۆشتی گوێدرێژی ماڵان حەڵاڵ نیە بۆ ئەو کەسەی شایەتی دەدات من پێغەمبەری خوام ﷺ.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٤٣٤٢-** «عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ، وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ»[١].

**واتە: ئەبو ثەعلەبەی خوشەنی  دەگێڕێتەوە: کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە خواردنی گۆشتی هەموو دڕندەیەکی خاوەن کەڵبەو گۆشتی گوێدرێژی ماڵی.**

## بابەت: ڕەوایەتی خواردنی گۆشتی گوێدرێژی کێوی

**٤٣٤٣-** «عَنْ جَابِرٍ  قَالَ: أَكَلْنَا يَوْمَ خَيْبَرَ لُحُومَ الْخَيْلِ، وَالْوَحْشِ وَنَهَانَا النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الْحِمَارِ»[٢].

**واتە: جابر  دەڵێ: لە ڕۆژی خەیبەر گۆشتی ئەسپ و گوێدرێژی کێویمان خواردو، پێغەمبەر ﷺ ڕێگری لێکردین لە گۆشتی گوێدرێژ.**

**٤٣٤٤-** «عَنْ عُمَيْرِ بْنِ سَلَمَةَ الضَّمْرِيِّ  قَالَ: بَيْنَا نَحْنُ نَسِيرُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِبَعْضِ أَثَايَا الرَّوْحَاءِ وَهُمْ حُرُمٌ، إِذَا حِمَارُ وَحْشٍ مَعْقُورٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: دَعُوهُ فَيُوشِكُ صَاحِبُهُ أَنْ يَأْتِيَهُ، فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ بَهْزٍ هُوَ الَّذِي عَقَرَ الْحِمَارَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، شَأْنَكُمْ هَذَا الْحِمَارُ؟، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَبَا بَكْرٍ يُقَسِّمُهُ بَيْنَ النَّاسِ»[٣].

**واتە: عومەیری کوڕی سەلەمەی ضەمری  دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە دەڕۆیشتین لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەندێ شوێنی (أَثَايَا)ی ڕەوحاء (کە ناوچەیەکە لە ڕێگای جوحفە لە نێوانی ئەوو مەدینەدا بیست و پێنج فەرسەخە) ئەوان لە ئیحرامدا بوون، گوێدرێژێکی دەشتیان بینی قاچەکانی بریندار کرابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وازی لێ بێنن نزیکە خاوەنەکەی بێت بۆی، پیاوێک لە هۆزی بەهز هات، ئەو گوێدرێژەکەی بریندار کردبوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەم گوێدرێژە بۆ ئێوە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە ئەبو بەکر دابەشی بکات لە نێوان خەڵکەکەدا.**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح الإسناد.

**٤٣٤٥-** «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: أَصَابَ حِمَاراً وَحْشِيّاً، فَأَتَى بِهِ أَصْحَابَهُ وَهُمْ مُحْرِمُونَ، وَهُوَ حَلَالٌ، فَأَكَلْنَا مِنْهُ فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: لَوْ سَأَلْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْهُ، فَسَأَلْنَاهُ، فَقَالَ: قَدْ أَحْسَنْتُمْ، فَقَالَ لَنَا: هَلْ مَعَكُمْ مِنْهُ شَيْءٌ؟، قُلْنَا: نَعَمْ. قَالَ: فَاهْدُوا لَنَا فَأَتَيْنَاهُ مِنْهُ فَأَكَلَ مِنْهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ»[١].

**واته: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: گوێدرێژێکی کێویم ڕاو کرد، هێنام بۆ لای هاوەڵەکانم ئەوان ئیحڕامیان پۆشی بوو، منیش ئیحڕامم نەپۆشی بوو، لێمان خوارد، هەندێکیان بە هەندێکی دیکەیان وت: ئەگەر پرسیارمان بکردایە لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی، ئیدی پرسیارمان لێکرد، فەرمووی: کارێکی چاکتان کرد، پێی وتین: ئایا هیچتان لەگەڵ خۆتان هێناوە؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: بە دیاری بیدەن پێمان، ئێمەش بۆمان هێنا، لێی خوارد لە ئیحڕامیشدا بوو.**

## بابەت: ڕەوایەتی خواردنی گۆشتی مریشک یان مامر

**٤٣٤٦-** «عَنْ زَهْدَمٍ، أَنَّ أَبَا مُوسَى ﷺ أُتِيَ بِدَجَاجَةٍ فَتَنَحَّى رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ، فَقَالَ: مَا شَأْنُكَ؟ قَالَ: إِنِّي رَأَيْتُهَا تَأْكُلُ شَيْئاً قَذِرْتُهُ فَحَلَفْتُ أَنْ لَا آكُلَهُ، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: ادْنُ فَكُلْ، فَإِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْكُلُهُ، وَأَمَرَهُ أَنْ يُكَفِّرَ عَنْ يَمِينِهِ»[٢].

**واته: زەهدەم دەگێڕێتەوە: مریشکێک هێنرا بۆ ئەبو موسا ﷺ پیاوێک لە خەڵکەکە هاتە دواوە، وتی: ئەوە چیتە بۆ چوویتە دواوە؟ وتی: من بینیم شتێکی دەخوارد قیزم لێکردەوە، سوێندم خوارد ئیتر نەیخۆم، ئەبو موسا ﷺ وتی: نزیک بەرەوەو بخۆ، چونکە من بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیخواردو، فەرمانی پێکرد کەفارەتی سوێندەکەی بدات.**

**٤٣٤٧-** «عَنْ زَهْدَمٍ الْجَرْمِيِّ، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ أَبِي مُوسَى ﷺ، فَقُدِّمَ طَعَامُهُ وَقُدِّمَ فِي طَعَامِهِ لَحْمُ دَجَاجٍ، وَفِي الْقَوْمِ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَيْمِ اللَّهِ أَحْمَرُ، كَأَنَّهُ مَوْلًى، فَلَمْ يَدْنُ، فَقَالَ لَهُ أَبُو مُوسَى: ادْنُ، فَإِنِّي قَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْكُلُ مِنْهُ»[٣].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) صحيح.**




واتە: زەهدەمی جەرمی، دەڵێ: ئێمە لای ئەبو موسا ﷺ بووین، خواردنێکی بۆ هێنرا، خواردنەکەی گۆشتی مریشک بوو، لە نێو خەڵکەکەدا پیاوێکی سوور لە نەوەی (تَيْمُ اللَّه) نزیک نەبوویەوە، ئەبو موسا پێی وت: نزیک بەرەوە، من بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ لێی دەخوارد.

**٤٣٤٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ نَهَى يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ كُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ، وَعَنْ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا قەدەغەی کرد لە (خواردنی) هەموو باڵندەیەکی خاوەن چڕنووک، وە لە هەموو دڕندەیەکی خاوەن کەڵبە.

## ڕەوایەتی خواردنی چۆلەکەکان

**٤٣٤٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَا مِنْ إِنْسَانٍ قَتَلَ عُصْفُوراً فَمَا فَوْقَهَا بِغَيْرِ حَقِّهَا، إِلَّا سَأَلَهُ اللَّهُ ﷻ عَنْهَا، قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا حَقُّهَا؟ قَالَ: يَذْبَحُهَا فَيَأْكُلُهَا، وَلَا يَقْطَعُ رَأْسَهَا يَرْمِي بِهَا»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر مرۆڤێک چۆلەکەیەک یان لە سەروی ئەوەوە بکوژێ بە ناحەق، ئیللا خوا ﷻ پرسیاری لێدەکات لەبارەیەوە، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، حەقی چیە؟ فەرمووی: سەری ببڕی و بیخوات، با سەری لە لاشەی جیانەکاتەوەو فڕێی بدات.

## بابەت: خواردنی مردارەوە بووی دەریا

**٤٣٥٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي مَاءِ الْبَحْرِ: هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، الْحَلَالُ مَيْتَتُهُ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٣٤، وأبو داود: ٣٨٠٣، وإبن ماجه: ٣٢٣٤.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە بارەی ئاوی دەریاوە فەرمووی: ئاوی دەریا پاکە، مەردارەوە بووشی حەڵاڵە.**

**٤٣٥١-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: بَعَثَنَا النَّبِيُّ ﷺ وَنَحْنُ ثَلَاثُ مِائَةٍ، نَحْمِلُ زَادَنَا عَلَى رِقَابِنَا، فَفَنِيَ زَادُنَا حَتَّى كَانَ يَكُونُ لِلرَّجُلِ مِنَّا كُلَّ يَوْمٍ تَمْرَةٌ فَقِيلَ لَهُ: يَا أَبَا عَبْدِ اللَّهِ، وَأَيْنَ تَقَعُ التَّمْرَةُ مِنَ الرَّجُلِ؟، قَالَ: لَقَدْ وَجَدْنَا فَقْدَهَا حِينَ فَقَدْنَاهَا، فَأَتَيْنَا الْبَحْرَ، فَإِذَا بِحُوتٍ قَذَفَهُ الْبَحْرُ، فَأَكَلْنَا مِنْهُ ثَمَانِيَةَ عَشَرَ يَوْماً»[1].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئێمەی نارد سێ سەد کەس بووین، توێشووی خۆمان لەسەر شانمان دانابوو، توێشووەکەمان تەواو بوو، تا هەریەکەمان ڕۆژانە یەک خورمامان دەخوارد، پێی وترا: ئەی باوکی عەبدوڵڵا خورمایەک چی لە پیاو دەکات؟ وتی: کاتێ لە دەستماندا زانیمان سودەکەی چیە، پاشان هاتین بۆ لای دەریاکە، دەریاکە نەهەنگێکی فڕێ دابووە قەراغ، هەژدە ڕۆژ لێیمان خوارد.**

**٤٣٥٢-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثَلَاثَ مِائَةِ رَاكِبٍ، أَمِيرُنَا أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ، نَرْصُدُ عِيرَ قُرَيْشٍ، فَأَقَمْنَا بِالسَّاحِلِ، فَأَصَابَنَا جُوعٌ شَدِيدٌ حَتَّى أَكَلْنَا الْخَبَطَ، قَالَ: فَأَلْقَى الْبَحْرُ دَابَّةً، يُقَالُ لَهَا: الْعَنْبَرُ فَأَكَلْنَا مِنْهُ نِصْفَ شَهْرٍ، وَادَّهَنَّا مِنْ وَدَكِهِ فَثَابَتْ أَجْسَامُنَا، وَأَخَذَ أَبُو عُبَيْدَةَ ضِلْعاً مِنْ أَضْلَاعِهِ، فَنَظَرَ إِلَى أَطْوَلِ جَمَلٍ وَأَطْوَلِ رَجُلٍ فِي الْجَيْشِ، فَمَرَّ تَحْتَهُ، ثُمَّ جَاعُوا فَنَحَرَ رَجُلٌ ثَلَاثَ جَزَائِرَ، ثُمَّ جَاعُوا فَنَحَرَ رَجُلٌ ثَلَاثَ جَزَائِرَ، ثُمَّ جَاعُوا فَنَحَرَ رَجُلٌ ثَلَاثَ جَزَائِرَ، ثُمَّ نَهَاهُ أَبُو عُبَيْدَةَ، قَالَ: سُفْيَانُ قَالَ: أَبُو الزُّبَيْرِ عَنْ جَابِرٍ، فَسَأَلْنَا النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: هَلْ مَعَكُمْ مِنْهُ شَيْءٌ؟ قَالَ: فَأَخْرَجْنَا مِنْ عَيْنَيْهِ كَذَا وَكَذَا، قُلَّةً مِنْ وَدَكٍ، وَنَزَلَ فِي حَجَّاجِ عَيْنِهِ أَرْبَعَةُ نَفَرٍ، وَكَانَ مَعَ أَبِي عُبَيْدَةَ جِرَابٌ فِيهِ تَمْرٌ، فَكَانَ يُعْطِينَا الْقَبْضَةَ، ثُمَّ صَارَ إِلَى التَّمْرَةِ، فَلَمَّا فَقَدْنَاهَا وَجَدْنَا فَقْدَهَا»[2].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەی نارد بە سێ سەد کەسەوە بە پێشەوایەتی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح، بۆسە بۆ کاروانی قورەیش دابنێین، لە کەناری دەریا ماینەوە، تووشی برسێتیەکی سەخت بووین هەتا گەڵای دارمان**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٨٣ و ٢٩٨٣ و ٢٩٨٣ و ٤٣٦٠، ومسلم: ٢٠ و ١٩٣٥/٢١، وإبن ماجه: ٤١٥٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٣٦١ و ٥٤٩٣، ومسلم: ١٨ و ١٩٣٥/١٩.




خوارد، وتی: دەریاکە گیاندارێکی خستە کەنار پێی دەوترا: (الْعَنْبَرُ) نیو مانگ لێیمان دەخوارد، ڕۆنیشمان لێی گرتەوە، جەستەمان هاتەوە جێگای خۆی، ئەبو عوبەیدە پەراسویەکی لە سەرەوە لێکردەوە لە پەراسوەکانی، تەماشای بەرزترین وشترو بەرزترین پیاوی کرد لە ناو سەربازەکاندا، بە ژێر پەراسوەکەدا ڕۆیشت، پاشان برسیان بوویەوە پیاوێک سێ وشتری سەربڕی، پاشان برسیان بوویەوە پیاوێک سێ وشتری سەربڕی، پاشان برسیان بوویەوە پیاوێک سێ وشتری سەربڕی، پاشان ئەبو عوبەیدە ڕێگری لێکردن، وتی: سوفیان وتی: ئەبو زوبەیر دەگێڕێتەوە لە جابرەوە، پرسیارمان کرد لە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا لە گیاندارەکە هیچتان لەلا ماوە؟ لە نێو هەردوو چاویدا ئەوەو ئەوەمان بۆ دەرهێنا؟ کەمێکیش لە بەزەکەی، چوارکەس چوونە ناو چاویەوە، ئەبو عوبەیدە کۆڵە پشتیەکی پێبوو خورمای تێدا بوو، مشتێکی پێدەداین، پاشان بووبە یەک خورما، کاتێ لە دەستماندا زانیمان سوودەکەی چیە.

**٤٣٥٣-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: بَعَثَنَا النَّبِيُّ ﷺ مَعَ أَبِي عُبَيْدَةَ فِي سَرِيَّةٍ فَنَفِدَ زَادُنَا، فَمَرَرْنَا بِحُوتٍ قَدْ قَذَفَ بِهِ الْبَحْرُ، فَأَرَدْنَا أَنْ نَأْكُلَ مِنْهُ، فَنَهَانَا أَبُو عُبَيْدَةَ، ثُمَّ قَالَ: نَحْنُ رُسُلُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ، كُلُوا، فَأَكَلْنَا مِنْهُ أَيَّاماً، فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَخْبَرْنَاهُ، فَقَالَ: إِنْ كَانَ بَقِيَ مَعَكُمْ شَيْءٌ فَابْعَثُوا بِهِ إِلَيْنَا»[1].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئێمەی نارد لەگەڵ ئەبو عوبەیدە لە سوپایەکدا، خوردنمان پێ نەما، تێپەڕین بەلای نەهەنگێکدا دەریاکە خستبوویە کەنار، ویستمان لێی بخۆین، ئەبو عوبەیدە قەدەغەی لێکردین، پاشان وتی: ئێمە نێردراوی خواین و لە پێناوی خواشدا نێردراوین، پاشان وتی: بخۆن، چەند ڕۆژێک لێیمان خوارد، کاتێ گەڕاینەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵمان پێدا، فەرمووی: ئەگەر شتێکتان لەلا ماوەتەوە بۆمانی بنێرن.

**٤٣٥٤-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَعَ أَبِي عُبَيْدَةَ، وَنَحْنُ ثَلَاثُ مِائَةٍ وَبِضْعَةَ عَشَرَ، وَزَوَّدَنَا جِرَاباً مِنْ تَمْرٍ، فَأَعْطَانَا قَبْضَةً قَبْضَةً، فَلَمَّا أَنْ جُزْنَاهُ أَعْطَانَا تَمْرَةً تَمْرَةً، حَتَّى إِنْ كُنَّا لَنَمُصُّهَا كَمَا يَمُصُّ الصَّبِيُّ، وَنَشْرَبُ عَلَيْهَا الْمَاءَ، فَلَمَّا فَقَدْنَاهَا وَجَدْنَا فَقْدَهَا، حَتَّى إِنْ كُنَّا لَنَخْبِطُ الْخَبَطَ بِقِسِيِّنَا، وَنَسَفُّهُ ثُمَّ نَشْرَبُ عَلَيْهِ مِنَ الْمَاءِ حَتَّى سُمِّينَا جَيْشَ الْخَبَطِ، ثُمَّ أَجَزْنَا السَّاحِلَ،

---

(١) صحيح.




فَإِذَا دَابَّةٌ مِثْلُ الْكَثِيبِ «يُقَالُ لَهُ الْعَنْبَرُ» فَقَالَ أَبُو عُبَيْدَةَ: مَيْتَةٌ لَا تَأْكُلُوهُ، ثُمَّ قَالَ: جَيْشُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ، وَنَحْنُ مُضْطَرُّونَ كُلُوا بِاسْمِ اللَّهِ، فَأَكَلْنَا مِنْهُ، وَجَعَلْنَا مِنْهُ، وَشِيقَةً، وَلَقَدْ جَلَسَ فِي مَوْضِعِ عَيْنِهِ ثَلَاثَةَ عَشَرَ رَجُلاً قَالَ: فَأَخَذَ أَبُو عُبَيْدَةَ ضِلْعاً مِنْ أَضْلَاعِهِ، فَرَحَلَ بِهِ أَجْسَمَ بَعِيرٍ مِنْ أَبَاعِرِ الْقَوْمِ، فَأَجَازَ تَحْتَهُ، فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: مَا حَبَسَكُمْ؟ قُلْنَا كُنَّا نَتَّبِعُ عِيرَاتِ قُرَيْشٍ، وَذَكَرْنَا لَهُ مِنْ أَمْرِ الدَّابَّةِ، فَقَالَ: ذَاكَ رِزْقٌ رَزَقَكُمُوهُ اللَّهُ ﷻ، أَمَعَكُمْ مِنْهُ شَيْءٌ، قَالَ: قُلْنَا: نَعَمْ»[١].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەی نارد بە سێ سەدو ئەوەندە کەسەو بە پێشەوایەتی ئەبو عوبەیدە، چەند بارێک خورمای لەگەڵماندا نارد، پڕ ناو مشتێکی پێدەداین، کاتێ کەم بوویەوە یەک یەک خورمای پێدەداین، تەنانەت وامان لێهات دەمانمژی وەکو چۆن منداڵ دەمژێ، ئاویشمان بەسەردا دەکرد، کاتێ لە دەستماندا زانیمان سودەکەی چی بوو، تا پەنامان بردە بەر گەڵای دارو دەمان خوارد، پاشان ئاومان دەکرد بەسەریدا، تا پێیان وتین سوپای گەڵادار، پاشان گەیشتینە قەراغی دەریا، گیاندارێکمان بینی وەکو تەپۆڵکە وابوو، پێی دەوترا (الْعَنْبَرُ) ئەبو عوبەیدە وتی مردار بۆتەوە مەیخۆن، پاشان وتی: سوپای پێغەمبەری خوایە ﷺو لە پێناوی خوادا دەرچووە، ئێمەش ناچارین، لێی بخۆن بە ناوی خواوە، ئێمەش لێمان خوارد، پاشان هەندێکی ترمان لەو گۆشتە خستە سەر ئاگرو هەڵمان گرت تا لە ڕێگا خراپ نەبێ، سێزدە کەس لە شوێنی چاوەکەیدا دانیشتن، وتی: ئەبو عوبەیدە پەراسویەکی لە پەراسوەکانی سەرەوەی هەڵگرت، بەرزترین وشتر بە ژێریدا ڕۆیشت، کاتێ هاتینەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چیتان کرد؟ وتمان: شوێنی کاروانی قورەیش کەوتین، وە باسی گیاندارەکەشمان بۆ کرد، فەرمووی: ئەوە ڕزق و ڕۆزیەکە خوا پێی بەخشیون، ئایا هیچتان لەگەڵ خۆتان هێناوە لەو گۆشتە، وتی: وتمان: بەڵێ.**

## (حوکمی خواردنی گۆشتی) بۆق، قورباقە

**٤٣٥٥**- «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ ﷺ، أَنَّ طَبِيباً ذَكَرَ ضِفْدَعاً فِي دَوَاءٍ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ قَتْلِهِ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٣٥، وأبو داود: ٣٨٤٠.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٨٧١ و ٥٢٦٩.




واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عوسمان ﷺ دەگێڕێتەوە: پزیشکێک باسی قورباقەی کرد کە بۆ چارەسەری نەخۆش دەبێ، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کوشتنی کرد.

## (حوکمی خواردنی گۆشتی) کوللە

**٤٣٥٦**- «عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: سَبْعَ غَزَوَاتٍ فَكُنَّا نَأْكُلُ الْجَرَادَ»(١).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفی ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ حەوت غەزامان کرد، کوللەمان دەخوارد.

**٤٣٥٧**- «عَنْ أبي يَعْفُورَ قال سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بن أبي أَوْفَى ﷺ، عن قَتْلِ الْجَرَادِ، فَقَالَ: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ سِتَّ غَزَوَاتٍ نَأْكُلُ الْجَرَادَ»(٢).

واتە: ئەبو یەعفور دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئیبن و ئەبی ئەوفی ﷺ لەبارەی کوشتنی کوللەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەشداری شەش غەزام کرد کوللەمان دەخوارد.

## کوشتنی مێرووڵە

**٤٣٥٨**- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّ نَمْلَةً قَرَصَتْ نَبِيّاً مِنَ الْأَنْبِيَاءِ، فَأَمَرَ بِقَرْيَةِ النَّمْلِ، فَأُحْرِقَتْ، فَأَوْحَى اللَّهُ ﷻ إِلَيْهِ أَنْ قَدْ قَرَصَتْكَ نَمْلَةٌ أَهْلَكْتَ أُمَّةً مِنَ الْأُمَمِ تُسَبِّحُ»(٣).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مێرووڵەیەک پێغەمبەرێک لە پێغەمبەرانی گەست، (پێغەمبەرەکەش) فەرمانی کرد شارە مێرووڵەکەی سوتاند، خوا وەحی بۆ نارد تۆ یەک مێرووڵە گازی لێگرتی، ئوممەتێک لە ئوممەتەکانت لە ناوبرد یادی خوایان دەکرد. (ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ سوتاندن لە شەریعەتی ئەو پێغەمبەرەدا دروست بووە، بۆیە خوا سەرزەنشتی نەکرد لەسەر سوتاندنەکە، بەڵکو بەوە سەرزەنشتی کرد لە بری یەکێک کۆمەڵێکی سوتاند، خوا زاناترە).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٩٥، ومسلم: ١٩٥٢، وأبو داود: ٣٨١٢، والترمذي: ١٨١٢ و ١٨٢٢.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠١٩ و ٣٣١٩، ومسلم: ١٤٨ و ٢٢٤١/١٥٠، وأبو داود: ٥٢٦٥ و ٥٢٦٦، وإبن ماجه: ٣٢٢٥.




**٤٣٥٩-** «عَنِ الْحَسَنِ، نَزَلَ نَبِيٌّ مِنَ الْأَنْبِيَاءِ تَحْتَ شَجَرَةٍ فَلَدَغَتْهُ نَمْلَةٌ، فَأَمَرَ بِبَيْتِهِنَّ، فَحُرِّقَ عَلَى مَا فِيهَا، فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ فَهَلَّا نَمْلَةٌ وَاحِدَةٌ»[١].

**واتە: حەسەن دەگێڕێتەوە: پێغەمبەرێک لە پێغەمبەران دابەزیە ژێر دارێک (بۆ پشوودان) مێروولەیەک گازی لێگرت، (ئەویش) فەرمانی کرد ماڵەکەیان سوتێنراو ئەوەشی کە تیایدا بوو، خوا وەحی بۆ نارد، ئەی بۆ یەک مێروولەکەت نەکوشت؟!**

**٤٣٥٩-** «وقَالَ الْأَشْعَثُ: عَنْ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ، وَزَادَ فَإِنَّهُنَّ: يُسَبِّحْنَ»[٢].

**واتە: ئەشعەث وتی: لە ئیبنو سیرینەوە لە ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەر ﷺ وەکو ئەو، ئەوەشی زیاد کرد، بێگومان ئەوانە: یادی خوایان دەکرد.**

**٤٣٦٠-** «عَنِ الْحَسَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ نَحْوَهُ وَلَمْ يَرْفَعْهُ»[٣].

**واتە: حەسەن دەگێڕێتەوە، لە ئەبو هورەیرە ﷺ وەکو فەرموودەکەی تر، بەڵام ڕەفعی نەکردۆتەوە بۆ.**

---

**(١) صحيح مقطوع.**

**(٢) صحيح الإسناد.**

**(٣) ضعيف الإسناد موقوف.**

**٤٣٦١-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ رَأَى هِلَالَ ذِي الْحِجَّةِ، فَأَرَادَ أَنْ يُضَحِّيَ، فَلَا يَأْخُذْ مِنْ شَعْرِهِ، وَلَا مِنْ أَظْفَارِهِ حَتَّى يُضَحِّيَ»[١].

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس مانگی (ذي الْحِجَّة)ی بینی، وە ویستی قوربانی بکات، با هیچ لە قژو نینۆکی نەکاتەوە تا قوربانیەکە دەکات.**

**٤٣٦٢-** « عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قالَتْ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَرَادَ أَنْ يُضَحِّيَ فَلَا يَقْلِمْ مِنْ أَظْفَارِهِ، وَلَا يَحْلِقْ شَيْئاً مِنْ شَعْرِهِ فِي عَشْرِ الْأُوَلِ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ»[٢].

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) کە خێزانی پێغەمبەرە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەس ویستی قوربانی بکات، با نینۆکی کورت نەکاتەوە، وە با هیچ لە قژی نەتاشێ لە دە ڕۆژی یەکەمی (ذي الْحِجَّة).**

**٤٣٦٣-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ قَالَ: مَنْ أَرَادَ أَنْ يُضَحِّيَ فَدَخَلَتْ أَيَّامُ الْعَشْرِ، فَلَا يَأْخُذْ مِنْ شَعْرِهِ وَلَا أَظْفَارِهِ، فَذَكَرْتُهُ لِعِكْرِمَةَ فَقَالَ: أَلَا يَعْتَزِلُ النِّسَاءَ، وَالطِّيبَ»[٣].

**واتە: سەعیدی کوڕی موسەییب دەڵێ: هەر کەس ویستی قوربانی بکات، دە ڕۆژی (یەکەمی ذي الْحِجَّة) هات، با لە قژو نینۆکی نەکاتەوە، بۆ عیکریمەم باس کرد، وتی: با لە خێزان و بۆنی خۆشیش دوور بکەوێتەوە.**

**٤٣٦٤-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا دَخَلَتِ الْعَشْرُ فَأَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يُضَحِّيَ فَلَا يَمَسَّ مِنْ شَعْرِهِ، وَلَا مِنْ بَشَرِهِ شَيْئاً»[٤].

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ دە ڕۆژی (یەکەمی ذي الْحِجَّة) هات، یەکێک لە ئێوە ویستی قوربانی بکات، ئەوە با دەست لە قژ و نینۆکی نەدات.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٩ و ١٩٧٧/٤٢، وأبو داود: ٢٧٩١، والترمذي: ١٥٢٣، وإبن ماجه: ٣١٤٩ و ٣١٥٠.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف الإسناد.

(٤) صحيح.




## بابەت: ئەو كەسەی توانای قوربانی نەبوو

**٤٣٦٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لِرَجُلٍ: أُمِرْتُ بِيَوْمِ الْأَضْحَى عِيداً جَعَلَهُ اللَّهُ ﷻ لِهَذِهِ الْأُمَّةِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: أَرَأَيْتَ إِنْ لَمْ أَجِدْ إِلَّا مَنِيحَةً أُنْثَى أَفَأُضَحِّي بِهَا؟ قَالَ: لَا، وَلَكِنْ تَأْخُذُ مِنْ شَعْرِكَ، وَتُقَلِّمُ أَظْفَارَكَ، وَتَقُصُّ شَارِبَكَ، وَتَحْلِقُ عَانَتَكَ، فَذَلِكَ تَمَامُ أُضْحِيَّتِكَ عِنْدَ اللَّهِ ﷻ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمری كوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە پیاوێكی فەرموو: فەرمانم پێكراوە ڕۆژی قوربانی بكەم بە جەژن، خوا دایناوە بۆ ئەم ئوممەتە، پیاوێک وتی: ئەی ئەگەر هیچم دەستنەكەوێت جگە لە (مَنِيحَة)یەكی مێینە نەبێ (ئەویش مەڕێكە دەدرێ بە كەسێک سوود لە شیرەكەی وەربگرێ و پاشان بیگەڕێنێتەوە) ئایا بیكەم بە قوربانی؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵام قژت چاک دەكەیت و نینۆكەكانت دەبڕی و بەرسمێڵت دەكەیت و بەرت دەتاشی، ئەوە لە تەواوی سەربڕینتە لای خوا ﷻ.**

## ئیمام قوربانیەكەی سەردەبڕێ لە شوێنی نوێژەكەی

**٤٣٦٦-** «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: كَانَ يَذْبَحُ أَوْ يَنْحَرُ بِالْمُصَلَّى»[٢].

**واتە: نافع دەگێڕێتەوە: عەبدوڵڵا ﷺ هەواڵی پێداوە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاژەڵی سەردەبڕی، یان قوربانی دەكرد لە شوێنی نوێژەكەی.**

**٤٣٦٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: نَحَرَ يَوْمَ الْأَضْحَى بِالْمَدِينَةِ، قَالَ: وَقَدْ كَانَ إِذَا لَمْ يَنْحَرْ يَذْبَحُ بِالْمُصَلَّى»[٣].

**واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی قورباندا لە مەدینە قوربانی كرد، وتی: ئەگەر وشتری سەرنەبڕیایە لە شوێنی نوێژەكەی مەڕی سەردەبڕی.**

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٣٩٩ و ٢٧٨٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٨٢ و ١٧١١ و ٥٥٥١ و ٥٥٥٢، وأبو داود: ٢٨١١، وإبن ماجه: ٣١٦١.

(٣) صحيح.




## قوربانی کردنی خەڵک لە شوێنی نوێژی جەژندا

**٤٣٦٨-** «عَنْ جُنْدُبِ بْنِ سُفْيَانَ ﷺ قَالَ: شَهِدْتُ أَضْحًى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَصَلَّى بِالنَّاسِ، فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ رَأَى غَنَماً قَدْ ذُبِحَتْ، فَقَالَ: مَنْ ذَبَحَ قَبْلَ الصَّلَاةِ فَلْيَذْبَحْ شَاةً مَكَانَهَا، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ ذَبَحَ فَلْيَذْبَحْ عَلَى اسْمِ اللَّهِ ﷻ»(١).

**واتە: جوندوبی کوڕی سوفیان ﷺ دەڵێ: ئامادەی قوربانی بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، کاتێ نوێژی تەواوکرد، مەڕی بینی سەربڕا بوو، فەرمووی: کێ پێش نوێژ ئاژەڵی سەری بڕیوە با لە دوای نوێژ مەڕێک لە جێگای سەر ببڕێ، هەر کەسیش پێش نوێژ سەری نەبڕیوە، با بە ناوی خواوە سەری ببڕێ.**

## قەدەغە کردنی ئاژەڵی کوێر بۆ قوربانی

**٤٣٦٩-** «عَنْ أَبِي الضَّحَّاكِ عُبَيْدِ بْنِ فَيْرُوزَ مَوْلَى بَنِي شَيْبَانَ قَالَ: قُلْتُ لِلْبَرَاءِ حَدِّثْنِي عَمَّا نَهَى عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْأَضَاحِيِّ، قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَيَدِي أَقْصَرُ مِنْ يَدِهِ، فَقَالَ: أَرْبَعٌ لَا يَجُزْنَ الْعَوْرَاءُ: الْبَيِّنُ عَوَرُهَا، وَالْمَرِيضَةُ الْبَيِّنُ مَرَضُهَا، وَالْعَرْجَاءُ الْبَيِّنُ ظَلْعُهَا، وَالْكَسِيرَةُ الَّتِي لَا تُنْقِي، قُلْتُ: إِنِّي أَكْرَهُ أَنْ يَكُونَ فِي الْقَرْنِ نَقْصٌ، وَأَنْ يَكُونَ فِي السِّنِّ نَقْصٌ، قَالَ: مَا كَرِهْتَهُ فَدَعْهُ، وَلَا تُحَرِّمْهُ عَلَى أَحَدٍ»(٢).

**واتە: باوکی ضەحاکی کوڕی عوبەیدی کوڕی فەیروز مەولای نەوەکانی شەیبان وتی: بە بەڕائم وت: بۆم باس بکە ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردوە لە قوربانیەکان، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا دەستم لە دەستی ئەو کورتترە، فەرمووی: چوار ئاژەڵ دروست نین بۆ قوربانی کردن: کوێرێک، کوێریەکەی دیاربێت، نەخۆشێک، نەخۆشیەکەی دیاربێت، شەلێک بە ئاشکرا بشەلێت، وە قاچی شکا بێت و نەتوانێ ڕێ بکات، وتم: بە کەراهەتی دەزانم کەموکوڕی لە شاخیدا هەبێت، هەروەها لە ددانیشیدا، وتی: ئەوەی پێت باش نیە وازی لێ بێنە، لەسەر کەس قەدەغەی مەکە.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٨٥ و ٥٥٠٠ و ٥٥٦٢ و ٦٦٧٤ و ٧٤٠٠، ومسلم: ١ و ١٩٦٠/٣، وإبن ماجه: ٣١٥٢.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٠٢، والترمذي: ١٤٩٧، وإبن ماجه: ٣١٤٤.

## ئاژەڵی شەل (بۆ قوربانی)

**٤٣٧٠-** «عَنْ عُبَيْدِ بْنِ فَيْرُوزَ قَالَ: قُلْتُ لِلْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ: حَدِّثْنِي مَا كَرِهَ أَوْ نَهَى عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْأَضَاحِيِّ، قَالَ: فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ هَكَذَا بِيَدِهِ، وَيَدِي أَقْصَرُ مِنْ يَدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَرْبَعَةٌ لَا يُجْزِينَ فِي الْأَضَاحِيِّ: الْعَوْرَاءُ الْبَيِّنُ عَوَرُهَا، وَالْمَرِيضَةُ الْبَيِّنُ مَرَضُهَا، وَالْعَرْجَاءُ الْبَيِّنُ ظَلْعُهَا، وَالْكَسِيرَةُ الَّتِي لَا تُنْقِي، قَالَ: فَإِنِّي أَكْرَهُ أَنْ يَكُونَ نَقْصٌ فِي الْقَرْنِ، وَالْأُذُنِ، قَالَ: فَمَا كَرِهْتَ مِنْهُ فَدَعْهُ، وَلَا تُحَرِّمْهُ عَلَى أَحَدٍ»[1].

**واتە: عوبەیدی کوڕی فەیرۆز دەڵێ: بە بەڕائی کوڕی عازبم ﷺ وت: بۆم باس بکە ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردوە لە قوربانیەکان، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا بەم شێوە بە دەستەکانی، دەستی من لە دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ کورتترە، بە دەستەکانی ئاماژەی کردو فەرمووی: چوار ئاژەڵ دروست نین بۆ قوربانی کردن، کوێرێک، کوێریەکەی دیاربێت، نەخۆشێک، نەخۆشیەکەی دیاربێت، شەلێک بە ئاشکرا بشەلێت، وە قاچی شکابێت و نەتوانێ ڕێبکات، وتی: من بە کەراهەتی دەزانم کەموکوڕی لە شاخ و گوێیدا هەبێت، وتی: ئەوەی پێت باش نیە وازی لێ بێنە، لەسەر کەس قەدەغەی مەکە.**

## ئاژەڵێ لەبەر لاوازی مێشکی نەمابێت

**٤٣٧١-** «عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَأَشَارَ بِأَصَابِعِهِ، وَأَصَابِعِي أَقْصَرُ مِنْ أَصَابِعِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، يُشِيرُ بِأُصْبُعِهِ يَقُولُ: لَا يَجُوزُ مِنَ الضَّحَايَا: الْعَوْرَاءُ الْبَيِّنُ عَوَرُهَا، وَالْعَرْجَاءُ الْبَيِّنُ عَرَجُهَا، وَالْمَرِيضَةُ الْبَيِّنُ مَرَضُهَا، وَالْعَجْفَاءُ الَّتِي لَا تُنْقِي»[2].

**واتە: بەڕائی کوڕی عازب ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بە پەنجەکانی ئاماژەی کرد، پەنجەی من لە پەنجەی ئەو بچوکترە، دەیفەرموو: دروست نیە لە ئاژەڵی قوربانیدا: کوێرێک، کوێریەکەی دیاربێت، شەلێک بە ئاشکرا بشەلێت، نەخۆشێک، نەخۆشیەکەی دیار بێت، وە ئاژەڵێ لەبەر لاوازی مێشکی نەمابێت.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## (الْمُقَابَلَةُ): بریتیە لەو ئاژەڵەی بەشی پێشەوەی گوێچکەی بڕابێت

٤٣٧٢- «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَسْتَشْرِفَ الْعَيْنَ، وَالْأُذُنَ، وَأَنْ لَا نُضَحِّيَ بِمُقَابَلَةٍ، وَلَا مُدَابَرَةٍ، وَلَا بَتْرَاءَ، وَلَا خَرْقَاءَ»(١).

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین سەرنجی چاوو گوێچکەی ئاژەڵی قوربانی بدەین، ئاژەڵێک نەکەین بە قوربانی بەشی پێشەوەی گوێچکەی بڕابێت، یان بەشی دواوەی گوێچکەی بڕابێت، یان کلکی بڕابێت، یان گوێچکەی کون کرابێت.

## (الْمُدَابَرَةُ): بریتیە لەو ئاژەڵەی بەشی دواوەوەی گوێچکەی بڕابێت

٤٣٧٣- «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَسْتَشْرِفَ الْعَيْنَ، وَالْأُذُنَ، وَأَنْ لَا نُضَحِّيَ بِعَوْرَاءَ، وَلَا مُقَابَلَةٍ، وَلَا مُدَابَرَةٍ، وَلَا شَرْقَاءَ وَلَا خَرْقَاءَ»(٢).

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین سەرنجی چاوو گوێچکەی ئاژەڵی قوربانی بدەین، ئاژەڵێک نەکەین بە قوربانی کوێر بێت، یان بەشی پێشەوەی گوێچکەی بڕابێت، یان بەشی دواوەی گوێچکەی بڕابێت، یان گوێچکەی درابێت، یان گوێچکەی کون کرابێت.

## (الْخَرْقَاءُ): بریتیە لەو ئاژەڵەی گوێچکەی کون کرا بێت

٤٣٧٤- «عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نُضَحِّيَ بِمُقَابَلَةٍ، أَوْ مُدَابَرَةٍ، أَوْ شَرْقَاءَ، أَوْ خَرْقَاءَ، أَوْ جَدْعَاءَ»(٣).

واتە: عەلی کوڕی ئەبو طالیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد ئاژەڵێ بکەین بە قوربانی بەشی پێشەوەی گوێچکەی بڕابێت، یان بەشی دواوەوەی

---

(١) ضعيف دون جملة الاستشراف صحيحة. أخرجه أبو داود: ٢٨٠٤ و ٢٨٠٥، والترمذي: ١٤٩٨ و ١٥٠٣ و ١٥٠٤، وإبن ماجه: ٣١٤٢ و ٣١٤٣ و ٣١٤٥.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف.




گوێچکەی بڕابێت، یان گوێچکەی دڕابێت، یان گوێچکەی کون کرا بێت یان لووت و گوێچکەی بڕابێت.

## (الشَّرْقَاءُ): بریتیە لەو ئاژەڵەی گوێچکەی بڕابێت

**٤٣٧٥-** «عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يُضَحَّى بِمُقَابَلَةٍ، وَلَا مُدَابَرَةٍ، وَلَا شَرْقَاءَ، وَلَا خَرْقَاءَ، وَلَا عَوْرَاءَ»[١].

**واتە: عەلی کوڕی ئەبو طاڵیب ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با قوربانی نەکرێ بە ئاژەڵێ بەشی پێشەوەی گوێچکەی بڕابێت، یان بەشی دواوەی گوێچکەی بڕابێت، یان گوێچکەی دڕابێت، یان گوێچکەی کون کرابێت یان کوێر بێت.**

**٤٣٧٦-** «عن عَلِيٍّ ﷺ يَقُولُ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَسْتَشْرِفَ الْعَيْنَ وَالْأُذُنَ»[٢].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین سەرنجی چاوو گوێچکەی ئاژەڵی قوربانی بدەین.**

## (الْعَضْبَاءَ) ئاژەڵی گوێ بڕاو یان شاخ شکاو

**٤٣٧٧-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُضَحَّى بِأَعْضَبِ الْقَرْنِ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِسَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ قَالَ: نَعَمْ، إِلَّا عَضَبَ النِّصْفِ، وَأَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ»[٣].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە قوربانی بکرێ بە ئاژەڵێکی شاخ شکاو، ئەوەم بۆ سەعیدی کوڕی موسەیب باس کرد، وتی: بەڵێ، مەگەر نیوەی شکا بێت یان زیاتر لە نیوە.**

---

(١) ضعيف.

(٢) حسن صحيح.

(٣) ضعيف.





## (المُسِنَّةُ): واتە: ددانی دەرکردبێ، ڕەشەوڵاخی دوو ساڵە پێی دەوترێ نۆبەن (الْجَذَعَةُ) لە مەڕیشدا کاوڕێکی مێی یەک ساڵە

**٤٣٧٨-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَذْبَحُوا إِلَّا مُسِنَّةً إِلَّا أَنْ يَعْسُرَ عَلَيْكُمْ فَتَذْبَحُوا جَذَعَةً مِنَ الضَّأْنِ»[١].

**واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سەرمەبڕن ڕەشەوڵاخی دوو ساڵە (نۆبەن) نەبێت مەگەر گران بێت بەلاتانەوە ئەوکات کاوڕێکی یەک ساڵە سەربڕن.**

**٤٣٧٩-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَعْطَاهُ غَنَماً يُقَسِّمُهَا عَلَى صَحَابَتِهِ، فَبَقِيَ عَتُودٌ، فَذَكَرَهُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: ضَحِّ بِهِ أَنْتَ»[٢].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامرِ ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵە مەڕێکی پێدا دابەشی بکات بەسەر هاوەڵەکانیدا، گیسکێک مایەوە ساڵی تەواو نەکردبوو، توانای ئەوەی هەبوو خۆی بۆ خۆی بژی بەبێ دایک، بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ باس کرد، فەرمووی: بۆ خۆت بیکە بە قوربانی.**

**٤٣٨٠-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَسَمَ بَيْنَ أَصْحَابِهِ ضَحَايَا، فَصَارَتْ لِي جَذَعَةٌ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، صَارَتْ لِي جَذَعَةٌ، فَقَالَ: ضَحِّ بِهَا»[٣].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامرِ ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند قوربانیەکی دابەشکرد بەسەر هاوەڵەکانیدا، منیش کاوڕێکی یەک ساڵەم بەرکەوت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من کاوڕێکم بەرکەوتووە، فەرمووی: بیکە بە قوربانی.**

**٤٣٨١-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: قَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ أَصْحَابِهِ أَضَاحِيَ، فَأَصَابَنِي جَذَعَةٌ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَصَابَتْنِي جَذَعَةٌ، فَقَالَ: ضَحِّ بِهَا»[٤].

---

(١) ضعيف. أخرجه مسلم: ١٩٦٣، وأبو داود: ٢٧٩٧، وإبن ماجه: ٣١٤١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٠٠ و ٢٥٠٠ و ٥٥٥٥، ومسلم: ١٩٦٥، والترمذي: ١٥٠٠، وإبن ماجه: ٣١٣٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٤٧، ومسلم: ١٩٦٥/١٦، والترمذي: ١٥٠٠.

(٤) صحيح.





واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان هاوەڵەکانیدا قوربانی دابەشکرد، منیش کاوڕێکی یەک ساڵەم بەرکەوت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من کاوڕێکم بەرکەوت، فەرمووی: بیکە بە قوربانی.

**٤٣٨٢-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: ضَحَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِجَذَعٍ مِنَ الضَّأْنِ»[١].

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کاوڕێکی یەک ساڵەمان کرد بە قوربانی.

**٤٣٨٣-** «عَنْ عَاصِمِ بْنِ كُلَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا فِي سَفَرٍ فَحَضَرَ الْأَضْحَى، فَجَعَلَ الرَّجُلُ مِنَّا يَشْتَرِي الْمُسِنَّةَ بِالْجَذَعَتَيْنِ وَالثَّلَاثَةِ، فَقَالَ لَنَا رَجُلٌ، مِنْ مُزَيْنَةَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَحَضَرَ هَذَا الْيَوْمُ، فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَطْلُبُ الْمُسِنَّةَ بِالْجَذَعَتَيْنِ وَالثَّلَاثَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ الْجَذَعَ يُوفِي مِمَّا يُوفِي مِنْهُ الثَّنِيُّ»[٢].

واتە: عاصمی کوڕی کولەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: ئێمە لە گەشتێکدا بووین کاتی قوربانی هات، پیاوی وامان تێدا بوو ڕەشەوڵاخێکی یەک ساڵەی دەکڕی بە دوو یان سێ کاوڕی یەک ساڵە، پیاوێک لە (مُزَيْنَةَ) پێی وتین: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە گەشتێکدا، ئەم ڕۆژە هاتە پێشەوە، جا پیاو بە دوای ڕەشە وڵاخێکی یەک ساڵەدا دەگەڕا بە دوو یان سێ کاوڕی یەک ساڵە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کاوڕیش بەرانبەر بە ڕەشەوڵاخ دروستە بۆ قوربانی.

**٤٣٨٤-** «عَنْ عَاصِمِ بْنِ كُلَيْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يُحَدِّثُ، عَنْ رَجُلٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ قَبْلَ الْأَضْحَى بِيَوْمَيْنِ نُعْطِي الْجَذَعَتَيْنِ بِالثَّنِيَّةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ الْجَذَعَةَ تُجْزِئُ مَا تُجْزِئُ مِنْهُ الثَّنِيَّةُ»[٣].

واتە: عاصمی کوڕی کولەیب دەڵێ: گوێم لە باوکم بوو دەیگێڕایەوە، لە پیاوێکەوە وتویەتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بوین دوو ڕۆژ پێش جەژنی قوربان، دوو کاوڕی یەک ساڵەمان دەگۆڕیەوە بە ڕەشەوڵاخێکی یەک ساڵە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان کاوڕیش هەروەکو بزنی دووساڵیش (چتیر) دروستە بۆ قوربانی.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. انظر أبو داود: ٢٧٩٩، وإبن ماجه: ٣١٤٠.

(٣) صحيح.





## بەران (بۆ سەربڕین)

**٤٣٨٥-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُضَحِّي بِكَبْشَيْنِ، قَالَ أَنَسٌ: وَأَنَا أُضَحِّي بِكَبْشَيْنِ»[١].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو بەرانی شاخداری کرد بە قوربانی، ئەنەس وتی: منیش دوو بەرانم کرد بە قوربانی.**

**٤٣٨٦-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: ضَحَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو بەرانی بۆری کرد بە قوربانی. (سپی و ڕەش تێکەڵ بوو).**

**٤٣٨٧-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: ضَحَّى النَّبِيُّ ﷺ بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ ذَبَحَهُمَا بِيَدِهِ، وَسَمَّى، وَكَبَّرَ، وَوَضَعَ رِجْلَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا»[٣].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دوو بەرانی بۆری شاخداری بەدەستی خۆی سەربڕی، ناوی خوای هێناو تەکبیر (اللَّهُ أَكْبَرُ)ی کرد، قاچیشی خستە سەر ملیان.**

**٤٣٨٨-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ أَضْحًى، وَانْكَفَأَ إِلَى كَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ، فَذَبَحَهُمَا»[٤].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی قورباندا وتارێکی بۆ داین، پاشان ڕۆیشت بۆ لای دوو بەرانی بۆر (سپی و ڕەش تێکەڵ بوو) هەردووکیانی سەربڕی.**

**٤٣٨٩-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: ثُمَّ انْصَرَفَ كَأَنَّهُ يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ يَوْمَ النَّحْرِ إِلَى كَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ فَذَبَحَهُمَا، وَإِلَى جُذَيْعَةٍ مِنَ الْغَنَمِ فَقَسَمَهَا بَيْنَنَا»[٥].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧ و ١٠٥ و ١٧٤١ و ٣١٤١ و ٣١٩٧ و ٤٤٠٦ و ٤٦٦٢ و ٥٥٥٠ و ٧٠٧٨ و ٧٤٤٧، ومسلم: ٢٩ و ١٦٧٩/٣١، وأبو داود: ١٩٤٧ و ١٩٤٨، والترمذي: ١٥٢٠، وإبن ماجه: ٣٣.




واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: پاشان پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی قورباندا ڕۆیشت، دوو بەرانی بۆری هێنا (سپی و ڕەش تێکەڵ بوو) سەری بڕین، وە ڕۆیشت بۆ لای چەند کاوڕێکی یەک ساڵە دابەشی کرد لە نێوانماندا.

**٤٣٩٠-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: ضَحَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِكَبْشٍ أَقْرَنَ، فَحِيلٍ يَمْشِي فِي سَوَادٍ، وَيَأْكُلُ فِي سَوَادٍ، وَيَنْظُرُ فِي سَوَادٍ»[(١)].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قوربانی کرد بە بەرانێکی شاخدار، قاچەکانی ڕەش بوو، ژێر سکیشی ڕەش بوو، دەورو بەری چاوی ڕەش بوو. (هەموو شوێنەکانی دیکەی سپی بوو)

## بابەت: دروستە وشترێک بکرێت بە قوربانی لە جیاتی چەند کەسێک

**٤٣٩١-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَجْعَلُ فِي قَسْمِ الْغَنَائِمِ عَشْراً مِنَ الشَّاءِ بِبَعِيرٍ»[(٢)].

واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دابەشکردنی غەنیمەت و دەستکەوتەکاندا دە مەڕی بەرانبەر بە وشترێک دادەنا.

**٤٣٩٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَحَضَرَ النَّحْرُ، فَاشْتَرَكْنَا فِي الْبَعِيرِ عَنْ عَشْرَةٍ وَالْبَقَرَةِ عَنْ سَبْعَةٍ»[(٣)].

واتە: ئیبنو عەبباس دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین لە گەشتێکدا، کاتی قوربانی هات، ئێمە بە دەکەس بەشداربووین لە وشترێکدا، بە حەوت کەسیش لە مانگا یان ڕەشەوڵاخێکدا.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٧٩٦، والترمذي: ١٤٩٦، وإبن ماجه: ٣١٢٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٨٨، ومسلم: ١٩٦٨، وأبو داود: ٢٨٢١، والترمذي: ١٤٩١ و ١٤٩٢ و ١٦٠٠، وإبن ماجه: ٢١٣٧ و ٣١٧٨ و ٣١٨٣.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٩٠٥ و ١٥٠١، وإبن ماجه: ٣١٣١.

**بابەت: دروستە مانگایەک بکرێت بە قوربانی لە جیاتی چەند کەسێک.**

**٤٣٩٣-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَتَمَتَّعُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَنَذْبَحُ الْبَقَرَةَ عَنْ سَبْعَةٍ، وَنَشْتَرِكُ فِيهَا»[١].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ مانگایەکمان بۆ حەوت کەس سەردەبڕی و هەموومان بەشدار دەبووین تیایدا.**

## سەربڕینی قوربانی پێش ئیمام

**٤٣٩٤-** «عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الْأَضْحَى، فَقَالَ: مَنْ وَجَّهَ قِبْلَتَنَا، وَصَلَّى صَلَاتَنَا، وَنَسَكَ نُسُكَنَا فَلَا يَذْبَحْ حَتَّى يُصَلِّيَ، فَقَامَ خَالِي فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي عَجَّلْتُ نُسُكِي لِأُطْعِمَ أَهْلِي، وَأَهْلَ دَارِي أَوْ أَهْلِي وَجِيرَانِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَعِدْ ذِبْحاً آخَرَ، قَالَ: فَإِنَّ عِنْدِي عَنَاقَ لَبَنٍ هِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ شَاتَيْ لَحْمٍ، قَالَ: اذْبَحْهَا، فَإِنَّهَا خَيْرُ نَسِيكَتَيْكَ، وَلَا تَقْضِي جَذَعَةٌ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ»[٢].

**واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی قورباندا هەڵسا فەرمووی: هەرکەس ڕوو بکاتە قیبلەمان و وەکو ئێمە نوێژ بکات، وەکو ئێمەیش سەربڕێ ئەوە با هیچ سەرنەبڕێ تا نوێژی (جەژن) دەکات، خاڵۆم هەڵسا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من لەپێشەوە حەیوانم سەربڕی بۆ ئەوەی دەرخواردی خانەوادەکەم و خزم و کەس و دراوسێکانی لێ بدەم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: قوربانیەکی تر سەرببڕە، وتی: بەڕاستی من گیسکێکی قەڵەوی مێینەی شیردەری چاکم لە لایە، لام خۆشەویستترە لە هەموو مەڕەکانی دیکە، فەرمووی: سەری ببڕە، چونکە بەڕاستی ئەوە چاکترینی قوربانیەکانتە، لە دوای تۆ بۆ هیچ کەسێکی دیکە نابێت.**

**٤٣٩٥-** «عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ النَّحْرِ بَعْدَ الصَّلَاةِ، ثُمَّ قَالَ: مَنْ صَلَّى صَلَاتَنَا، وَنَسَكَ نُسُكَنَا، فَقَدْ أَصَابَ النُّسُكَ، وَمَنْ نَسَكَ قَبْلَ الصَّلَاةِ، فَتِلْكَ شَاةُ لَحْمٍ، فَقَالَ أَبُو بُرْدَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ لَقَدْ نَسَكْتُ قَبْلَ أَنْ أَخْرُجَ إِلَى الصَّلَاةِ، وَعَرَفْتُ أَنَّ الْيَوْمَ يَوْمُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ، فَتَعَجَّلْتُ فَأَكَلْتُ، وَأَطْعَمْتُ أَهْلِي وَجِيرَانِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تِلْكَ شَاةُ لَحْمٍ، قَالَ:

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣١٨/٣٥٥، وأبو داود: ٢٨٠٧ و ٢٨٠٨.

(٢) صحيح.





فَإِنَّ عِنْدِي عَنَاقاً جَذَعَةً خَيْرٌ مِنْ شَاتَيْ لَحْمٍ، فَهَلْ تُجْزِئُ عَنِّي؟ قَالَ: نَعَمْ، وَلَنْ تَجْزِيَ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ»[١].

**واتە: بەڕائی کوڕی عازب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی قورباندا وتارێکی بۆ داین لە دوای نوێژ، پاشان فەرمووی: هەرکەس وەکو ئێمە نوێژ بکات، وەکو ئێمەیش سەرببڕێ، ئەوە سەربڕینی تەواوی ئەنجام داوە، هەرکەس پێش نوێژ ئاژەڵ سەر ببڕێ، ئەوە بۆ گۆشتەکەی سەری بڕیوە، ئەبو بوردە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێش ئەوەی دەربچم بۆ نوێژ حەیوانێکم سەربڕی، چونکە زانیم ئەم ڕۆژە ڕۆژی خواردن و خواردنەوەیە بۆیە پەلەم کردو لێم خواردو بەشی کەس و کارو دراوسێکانمدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەو مەڕە بۆ گۆشتەکەی سەربڕاوە، وتی: بەڕاستی من گیسکێکی قەڵەوی مێینەی شیردەری چاکم لە لایە، چاکترە لە مەڕێک بۆ گۆشتەکەی ئامادە کرابێ، ئایا دەکرێ لە بری خۆم سەری ببڕم؟ فەرمووی: بەڵێ، بەڵام لە دوای تۆ بۆ هیچ کەسێکی دیکە نابێت.**

**٤٣٩٦-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ النَّحْرِ: مَنْ كَانَ ذَبَحَ قَبْلَ الصَّلَاةِ فَلْيُعِدْ فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا يَوْمٌ يُشْتَهَى فِيهِ اللَّحْمُ، فَذَكَرَ هَنَةً مِنْ جِيرَانِهِ، كَأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَدَّقَهُ، قَالَ: عِنْدِي جَذَعَةٌ هِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ شَاتَيْ لَحْمٍ، فَرَخَّصَ لَهُ، فَلَا أَدْرِي أَبَلَغَتْ رُخْصَتُهُ مَنْ سِوَاهُ أَمْ لَا، ثُمَّ انْكَفَأَ إِلَى كَبْشَيْنِ فَذَبَحَهُمَا»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی قورباندا فەرمووی: هەر کەس پێش نوێژ ئاژەڵی سەر بڕیوە با دووبارەی بکاتەوە، پیاوێک هەڵسا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەمڕۆ ڕۆژێکە ئارەزووی گۆشتی تێدا دەکرێ، باسی هەندێ لە دراوسێکانی کرد، وەک ئەوەی بڵێی پێغەمبەری خوا ﷺ بڕوای پێ کرد، وتی: من گیسکێکی قەڵەوی مێینەی شیردەری چاکم لە لایە، خۆشەویستترە لە لام لە مەڕێکی قەڵەو، مۆڵەتی پێدا، نازانم ئایا مۆڵەتەکەی بۆ دوای ئەویش بوو یان نا، پاشان پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ لای دووبەران هەردووکیانی سەربڕی.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٥٤ و ٩٨٤ و ٥٥٤٦ و ٥٥٤٩ و ٥٥٦١، ومسلم: ١٠ و ١٩٦٢/١٢، وإبن ماجه: ٣١٥١.




**٤٣٩٧-** «عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ نِيَارٍ ﷺ، أَنَّهُ ذَبَحَ قَبْلَ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُعِيدَ، قَالَ: عِنْدِي عَنَاقُ جَذَعَةٍ هِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ مُسِنَّتَيْنِ، قَالَ: اذْبَحْهَا، فِي حَدِيثِ عُبَيْدِ اللَّهِ فَقَالَ: إِنِّي لَا أَجِدُ إِلَّا جَذَعَةً، فَأَمَرَهُ أَنْ يَذْبَحَ»[١].

**واتە: ئەبو بوردەی کوڕی نیار ﷺ، پێش پێغەمبەر ﷺ ئاژەڵی سەربڕی، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد دووبارەی بکاتەوە، وتی: من گیسکێکی قەڵەوی مێینەی شیردەری چاکم لە لایە، خۆشەویستترە لە لام لە دوو ڕەشە وڵاخی یەک ساڵ، فەرمووی: سەری ببڕە، لە فەرموودەی عوبەیدوڵلادا وتی: هیچ شک نابەم جگە لە گیسکێکی قەڵەوی مێینە، فەرمانی پێکرد سەری ببڕێ.**

**٤٣٩٨-** «عَنْ جُنْدُبِ بْنِ سُفْيَانَ ﷺ قَالَ: ضَحَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَضْحًى ذَاتَ يَوْمٍ، فَإِذَا النَّاسُ قَدْ ذَبَحُوا ضَحَايَاهُمْ قَبْلَ الصَّلَاةِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ رَآهُمُ النَّبِيُّ ﷺ أَنَّهُمْ ذَبَحُوا قَبْلَ الصَّلَاةِ، فَقَالَ: مَنْ ذَبَحَ قَبْلَ الصَّلَاةِ فَلْيَذْبَحْ مَكَانَهَا أُخْرَى، وَمَنْ كَانَ لَمْ يَذْبَحْ حَتَّى صَلَّيْنَا، فَلْيَذْبَحْ عَلَى اسْمِ اللَّهِ ﷻ»[٢].

**واتە: جوندوبی کوڕی سوفیان ﷺ دەڵێ: ڕۆژێک لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ قوربانیمان کرد، خەڵکەکە پێش نوێژ قوربانی خۆیان کردبوو، کاتێ کە ڕۆیشت پێغەمبەر ﷺ بینیانی کە ئەوان پێش نوێژ قوربانیان کردوە، فەرموی: هەرکەس پێش نوێژ ئاژەڵی سەر بڕیوە، با لە شوێنی ئەوە دانەیەکی تر سەر ببڕێ، هەرکەس هیچی سەرنەبڕی تا نوێژمان کرد، ئەوا با بە ناوی خواوە سەری ببری.**

## بابەت: ڕەوایەتی سەربڕین بە بەردی تەنکی سپی و تیژ

**٤٣٩٩-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ صَفْوَانَ ﷺ أَنَّهُ: أَصَابَ أَرْنَبَيْنِ، وَلَمْ يَجِدْ حَدِيدَةً يَذْبَحُهُمَا بِهِ فَذَكَّاهُمَا بِمَرْوَةٍ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي اصْطَدْتُ أَرْنَبَيْنِ، فَلَمْ أَجِدْ حَدِيدَةً أُذَكِّيهِمَا بِهِ فَذَكَّيْتُهُمَا بِمَرْوَةٍ أَفَآكُلُ؟ قَالَ: كُلْ»[٣].

**واتە: موحەممەدی کوڕی صەفوان ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو دوو کەروێشکی ڕاو کرد، ئاسنێکی نەدۆزیەوە سەریان ببڕێ، بە (مَرْوَة) (کە بەردێکی تەنکی سپی و**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٢٢، وإبن ماجه: ٣٢٤٤.




تیژە) سەری بڕین، هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: من دوو کەروێشکم ڕاوکردوە، ئاسنیشم نەدۆزیەوە تا پێی سەر ببڕم، بۆیە بە (مَرْوَة) (کە بەردێکی تەنکی سپی و تیژە) سەرم بڕی، ئایا لێی بخۆم؟ فەرمووی: بەڵێ، بیخۆ.

**٤٤٠٠-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﵁، أَنَّ ذِئْباً نَيَّبَ فِي شَاةٍ، فَذَبَحُوهَا بِالْمَرْوَةِ فَرَخَّصَ النَّبِيُّ ﷺ فِي أَكْلِهَا»[١].

واتە: زەیدی کوڕی ثابت ﵁ دەڵێ: گورکێک بە کەڵپەکانی مەڕێکی بریندار کردبوو، ئەوانیش بە (مَرْوَة) (کە بەردێکی تەنکی سپی و تیژە) سەریان بڕی، پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتیدا بە خواردنی.

## دروستی سەربڕین بە دار

**٤٤٠١-** «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﵁ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أُرْسِلُ كَلْبِي، فَآخُذُ الصَّيْدَ فَلَا أَجِدُ مَا أُذَكِّيهِ بِهِ، فَأَذْبَحُهُ بِالْمَرْوَةِ وَبِالْعَصَا، قَالَ: أَنْهِرِ الدَّمَ بِمَا شِئْتَ، وَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ ﷻ»[٢].

واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﵁ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من سەگەکەم دەنێرم بۆ ڕاوکردنی نێچیر، نێچیرەکەم دەگرم شتێک نابینم پێی سەربببڕم، بە (مَرْوَة) (کە بەردێکی تەنکی سپی و تیژە) سەری دەبڕم بە گۆچان (کە قەراغێکی تیژی هەبووە)، فەرمووی: خوێن بڕێژە بە هەر شتێک کە دەتەوێ، ناوی خوایشی لە سەر بهێنە.

**٤٤٠٢-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: كَانَتْ لِرَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ نَاقَةٌ تَرْعَى فِي قِبَلِ أُحُدٍ، فَعُرِضَ لَهَا، فَنَحَرَهَا بِوَتَدٍ، فَقُلْتُ لِزَيْدٍ: وَتَدٌ مِنْ خَشَبٍ أَوْ حَدِيدٍ؟ قَالَ: لَا. بَلْ خَشَبٌ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَسَأَلَهُ: فَأَمَرَهُ بِأَكْلِهَا»[٣].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێ: پیاوێکی ئەنصاری وشترێکی هەبوو، لە پێشی چیای ئوحود دەیلەوەڕاند، پاشان هاتە لا، ئەویش بە مێخێک سەری بڕی، بە یەزیدم وت: مێخێکی دار یان ئاسن؟ وتی: نەخێر، بەڵکو لە دار، هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکرد ئەویش فەرمانی پێکرد بیخوات.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه إبن ماجه: ٣١٧٦.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٢٤، وإبن ماجه: ٣١٧٧.

(٣) صحيح.




## قەدەغەکردنی سەربڕین بە چەقۆی (حەبەشە نەک هەموو چەقۆیەک)

**٤٤٠٣-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَا أَنْهَرَ الدَّمَ، وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ فَكُلْ، إِلَّا سِنٌّ أَوْ ظُفُرٍ»[١].

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر ئاژەڵێک بە هەر شتێک سەر بڕاو خوێنی ڕژاو، ناوی خوای لەسەر هێنرا، بیخۆ، جگە لە ئێسک و چەقۆی حەبەشە.**

## بابەت: سەربڕین بە (السِّنُّ) ئێسک
## (بە واتای ددانیش دێت، بەڵام لێرەدا مەبەست ئێسکە)

**٤٤٠٤-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا نَلْقَى الْعَدُوَّ غداً، وَلَيْسَ مَعَنَا مُدًى، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا أَنْهَرَ الدَّمَ، وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ ﷻ، فَكُلُوا مَا لَمْ يَكُنْ سِناً أَوْ ظُفُراً، وَسَأُحَدِّثُكُمْ عَنْ ذَلِكَ، أَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ، وَأَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الْحَبَشَةِ»[٢].

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە سبەینێ ڕووبەڕووی دوژمن دەبینەوە، چەقۆمان لەلا نیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر ئاژەڵێک بە هەر شتێک سەربڕاو خوێنی ڕژاو، ناوی خوای لەسەر هێنرا، بیخۆن، بە مەرجێک بە (سِنٍّ) یان (ظُفُر) سەر نەبڕدرێت، ئێستا لەو بارەیەوە قسەتان بۆ دەکەم، بەڵام (السِّنُّ) ئێسکە، وە (الظُّفُرُ) چەقۆی حەبەشەیە.**

## فەرمانکردن بە تیژکردنی چەقۆ

**٤٤٠٥-** «عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ قَالَ: اثْنَتَانِ حَفِظْتُهُمَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذِّبْحَةَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٥٥، وأبو داود: ٢٨١٥، والترمذي: ١٤٠٩، وإبن ماجه: ٣١٧٠.




واتە: شەدادی كوڕی ئەوس ﷺ دەڵێ: دوو شت هەیە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لەبەرم كردوە، فەرموویەتی: خوا ﷻ چاكەی پێویست كردوە لەسەرتان لە هەموو شتێكدا، جا ئەگەر شتێكتان كوشت بە چاكترین شێوە بیكوژن، وە ئەگەر سەرتان بڕی بە چاكترین شێوە سەری ببڕن، با یەكێكتان چەقۆكە تیژ بكات، (بۆ ئەوەی زوو سەری ببڕێ)، وە با وازی لێ بهێنێ تا جەستەی سەربڕاوەكە سارد دەبێتەوە.

## بابەت: ڕێگەدان بە سەربڕینی ئەو ئاژەڵەی گەردنی درێژە وەكو وشتر، وە سەربڕینی ئەو ئاژەڵەی گەردنی كورتە وەكو مانگاو مەڕ

تێبینی: وشەی (نَحْر): سەربڕینی ئەو ئاژەڵەیە گەردنی (ملی) درێژە وەكو وشتر، وە وشەی: (ذَبْح): سەربڕینی ئەو ئاژەڵەیە گەردنی كورتە وەكو مانگاو مەڕ، واتە: ڕێگەدراوە وشتر وەكو مانگا سەر ببڕدرێت و مانگاش وەكو وشتر سەرببڕدرێت.

**٤٤٠٦-** «عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَتْ: نَحَرْنَا فَرَساً عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَكَلْنَاهُ»[١].

واتە: ئەسمائی كچی ئەبو بەكر (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئەسپێكمان لەسەر شێوەی وشتر سەربڕی لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان خواردمان.

## بابەت: سەربڕینی ئەو ئاژەڵەی دڕندە بریندراری كردوە

**٤٤٠٧-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، أَنَّ ذِئْباً نَيَّبَ فِي شَاةٍ فَذَبَحُوهَا بِمَرْوَةٍ، فَرَخَّصَ النَّبِيُّ ﷺ فِي أَكْلِهَا»[٢].

واتە: زەیدی كوڕی ثابت ﷺ دەگێڕێتەوە: گورگێك پەلاماری مەڕێكی داو بریندراری كرد، ئەوانیش بە (مَرْوَة) (كە بەردێكی تەنكی سپی و تیژە) سەریان بڕی، پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی دا بە خواردنی.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥١٠ و ٥٥١١ و ٥٥١٢ و ٥٥١٩، ومسلم: ١٩٤٢، وإبن ماجه: ٣١٩٠.

(٢) صحيح.

## باسی ئەو ئاژەڵەی هەڵدێراوە بۆ ناو بیر کە دەست ناگاتە قوڕگی بۆ سەربڕین

**٤٤٠٨-** «عَنْ أَبِي الْعُشَرَاءِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَمَا تَكُونُ الذَّكَاةُ إِلَّا فِي الْحَلْقِ وَاللَّبَّةِ؟ قَالَ: لَوْ طَعَنْتَ فِي فَخِذِهَا لَأَجْزَأَكَ»[١].

**واتە:** ئەبو عوشراء دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا سەربڕین تەنها لە گەردن و قوڕگەوە دەبێت؟ فەرمووی: ئەگەر ڕانی بریندار بکەی بەسە بۆ تۆ.

## باسی ئەو ئاژەڵەی کە یاخی دەبێ و ناتوانرێ بهێنرێتەوە

**٤٤٠٩-** «عَنْ رَافِعٍ ﷺ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا لَاقُو الْعَدُوِّ غداً، وَلَيْسَ مَعَنَا مُدًى قَالَ: مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ ﷻ فَكُلْ، مَا خَلَا السِّنَّ وَالظُّفُرَ، قَالَ: فَأَصَابَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نَهْباً فَنَدَّ بَعِيرٌ، فَرَمَاهُ رَجُلٌ بِسَهْمٍ فَحَبَسَهُ، فَقَالَ: إِنَّ لِهَذِهِ النَّعَمِ أَوْ قَالَ: الْإِبِلِ أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ، فَمَا غَلَبَكُمْ مِنْهَا فَافْعَلُوا بِهِ هَكَذَا»[٢].

**واتە:** ڕافع ﷺ دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە سبەینێ ڕووبەڕووی دوژمن دەبینەوە (ئەگەر شمشێر بەکاربێنن کول دەبێ و توانای شەڕ پێکردنی نامێنێ، چەقۆمان پێ نیە (بۆ سەربڕینی ئاژەڵ) فەرمووی: هەر ئاژەڵێک بە هەر شتێک سەر بڕاو خوێنی ڕژا و ناوی خوای لەسەر هێنرا، بیخۆ، جگە لە (السِّنُّ) ئێسکە، وە (الظُّفُرُ) چەقۆی حەبەشەیە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستکەوتی دەستکەوت وشترێک هەڵهات، پیاوێک ڕمێکی تێ هاوێشت و پێکای، فەرمووی: ئەم وشترانە نەوەندە لە دەشت ماونەتەوە وەکو ئاژەڵی کێویان لێهاتووە، ئەوەی لێتان گیربوو وەکو ئەمە بەم شێوەیەی لێ بکەن.

**٤٤١٠-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا لَاقُو الْعَدُوِّ، وَلَيْسَتْ مَعَنَا مُدًى، قَالَ: مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ ﷻ فَكُلْ، لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ، وَسَأُحَدِّثُكُمْ، أَمَّا السِّنُّ: فَعَظْمٌ،

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٨٢٥، والترمذي: ١٤٨١، وابن ماجه: ٣١٨٤.

(٢) صحيح.

وَأَمَّا الظُّفُرُ: فَمُدَى الْحَبَشَةِ، وَأَصَبْنَا نَهْبَةَ إِبِلٍ، أَوْ غَنَمٍ، فَنَدَّ مِنْهَا بَعِيرٌ، فَرَمَاهُ رَجُلٌ بِسَهْمٍ فَحَبَسَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ لِهَذِهِ الْإِبِلِ أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ، فَإِذَا غَلَبَكُمْ مِنْهَا شَيْءٌ فَافْعَلُوا بِهِ هَكَذَا»[١].

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە ڕووبەڕووی دوژمن دەبینەوە، چەقۆمان لەلا نیە (بۆ سەربڕینی ئاژەڵ) فەرمووی: هەر ئاژەڵێک بە هەر شتێک سەر بڕاو خوێنی ڕژاو، ناوی خوای لەسەر هێنرا، بیخۆ، بە مەرجێ بە (سِنٌّ) یان (ظُفُر) سەر نەبڕدرێت، ئێستا لەو بارەیەوە قسەتان بۆ دەکەم، بەڵام (السِّنُّ) ئێسکە، وە (الظُّفُرُ) چەقۆی حەبەشەیە، وە کۆمەڵە وشترێک، یان کۆمەڵە مەڕێکمان گرت، وشترێکیان هەڵهات، پیاوێک ڕمێکی تێ هاوێشت و پێکای، فەرمووی: ئەم وشترانە ئەوەندە لە دەشت ماونەتەوە وەکو ئاژەڵی کێویان لێهاتووە، ئەوەی لێتان گیربوو وەکو ئەمە بەم شێوەیەی لێ بکەن.**

**٤٤١١-** «عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ إِذَا ذَبَحَ شَفْرَتَهُ، وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ»[٢].

**واتە: شەدادی کوڕی ئەوس ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوا ﷻ چاکەی پێویست کردوە لەسەرتان لە هەموو شتێکدا، جا ئەگەر شتێکتان کوشت بە چاکترین شێوە بیکوژن، وە ئەگەر سەرتان بڕی بە چاکترین شێوە سەری ببڕن، با یەکێکتان چەقۆکە تیژ بکات، (بۆ ئەوەی زوو سەری ببڕێ)، وە با وازی لێ بهێنێ تا جەستەی سەربڕاوەکە سارد دەبێتەوە.**

## بابەت: سەربڕین بە چاکترین شێوە

**٤٤١٢-** «عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: شەدادی کوڕی ئەوس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ چاکەی پێویست کردوە لەسەرتان لە هەموو شتێکدا، جا ئەگەر شتێکتان کوشت بە چاکترین شێوە بیکوژن، وە ئەگەر سەرتان بڕی بە چاکترین شێوە سەری ببڕن، با یەکێکتان چەقۆکە تیژ بکات، (بۆ ئەوەی زوو سەری ببڕێ)، وە با وازی لێ بهێنێ تا جەستەی سەربڕاوەکە سارد دەبێتەوە.

**٤٤١٣**- «عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ اثْنَتَيْنِ فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، ثُمَّ لِيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ»[1].

واتە: شەدادی کوڕی ئەوس ﷺ دەڵێ: دوو شتم بیست لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: خوا ﷻ چاکەی پێویست کردوە لەسەرتان لە هەموو شتێکدا، جا ئەگەر شتێکتان کوشت بە چاکترین شێوە بیکوژن، وە ئەگەر سەرتان بڕی بە چاکترین شێوە سەری ببڕن، با یەکێکتان چەقۆکە تیژ بکات، (بۆ ئەوەی زوو سەری ببڕێ)، پاشان با وازی لێ بهێنێ تا جەستەی سەربڕاوەکە سارد دەبێتەوە.

**٤٤١٤**- «عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ قَالَ: ثِنْتَانِ حَفِظْتُهُمَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذِّبْحَةَ، لِيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ»[2].

واتە: شەدادی کوڕی ئەوس ﷺ دەڵێ: دوو شتم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لەبەرکرد: خوا ﷻ چاکەی پێویست کردوە لەسەرتان لە هەموو شتێکدا، جا ئەگەر شتێکتان کوشت بە چاکترین شێوە بیکوژن، وە ئەگەر سەرتان بڕی بە چاکترین شێوە سەری ببڕن، با یەکێکتان چەقۆکە تیژ بکات، (بۆ ئەوەی زوو سەری ببڕێ)، پاشان با وازی لێ بهێنێ تا جەستەی سەربڕاوەکە سارد دەبێتەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




## دانانی قاچ لەسەر ملی (ئاژەڵی) قوربانی بۆ سەربڕین

**٤٤١٥-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: ضَحَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ، يُكَبِّرُ وَيُسَمِّي، وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَذْبَحُهُمَا بِيَدِهِ، وَاضِعاً عَلَى صِفَاحِهِمَا قَدَمَهُ»[١].

**واتە:** ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو بەرانی بۆری شاخداری سەربڕی، تەکبیری کردو ناوی خوای هێنا، بینیم بە دەستەکانی سەری دەبڕی قاچیشی خستبووە سەر ملیان.

## ناوهێنانی خوای ﷻ لەسەر سەربڕا

**٤٤١٦-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُضَحِّي بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ، وَكَانَ يُسَمِّي وَيُكَبِّرُ، وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَذْبَحُهُمَا بِيَدِهِ وَاضِعاً رِجْلَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا»[٢].

**واتە:** ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو بەرانی بۆری شاخداری سەربڕی، ناوی خوای هێناو تەکبیری کرد، بینیم بە دەستەکانی سەری دەبڕی قاچیشی خستبووە سەر ملیان.

## تەکبیر (اللَّهُ أَكْبَر) کردن لەسەر سەربڕاو

**٤٤١٧-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُهُ، يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ يَذْبَحُهُمَا بِيَدِهِ وَاضِعاً عَلَى صِفَاحِهِمَا قَدَمَهُ، يُسَمِّي وَيُكَبِّرُ، كَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ»[٣].

**واتە:** ئەنەس ﷺ دەڵێ: بێگومان پێغەمبەرم ﷺ بینی دوو بەرانی بۆری شاخداری سەربڕی، قاچیشی خستبووە، سەر ملیان ناوی خوای هێناو تەکبیری کرد.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٥٣ و ٥٥٥٤ و ٥٥٥٨ و ٥٥٦٤ و ٥٥٦٥، ومسلم: ١٧ و ١٩٦٦/١٨، وأبو داود: ٢٧٩٤، والترمذي: ١٤٩٤، وإبن ماجه: ٣١٢٠ و ٣١٥٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## ئەو کەسەی قوربانی دەکات بە دەستی خۆی (ئاژەڵەکە) سەر ببڕێ

**٤٤١٨-** «عن قَتَادَةَ أَنَّ أَنَسَ بن مَالِكٍ ﵁ حَدَّثَهُمْ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ ضَحَّى بِكَبْشَيْنِ أَقْرَنَيْنِ أَمْلَحَيْنِ يَطَؤُ عَلَى صِفَاحِهِمَا، وَيَذْبَحُهُمَا، وَيُسَمِّي وَيُكَبِّرُ»[١].

**واتە: قەتادە دەگێڕێتەوە، ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ بۆی باس کردن، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو بەرانی شاخداری بۆری کرد بە قوربانی، قاچیشی خستبووە سەر ملیان و سەریانی بڕی، ناوی خوای هێناو تەکبیری کرد.**

## سەربڕینی ئاژەڵێ قوربانی لەلایەن کەسێکی ترەوە لە غەیری خاوەنەکەی

**٤٤١٩-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: نَحَرَ بَعْضَ بُدْنِهِ بِيَدِهِ، وَنَحَرَ بَعْضَهَا غَيْرُهُ»[٢].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ لە وشترەکانی بە دەستی خۆی سەر بڕی، هەندێکیشیان غەیری خۆی سەری دەبڕی.**

## سەربڕینی ئاژەڵ لەسەر شێوە سەربڕی وشتر

**٤٤٢٠-** «عَنْ أَسْمَاءَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: نَحَرْنَا فَرَساً عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَكَلْنَاهُ»[٣].

**واتە: ئەسماء (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەسپێکمان لەسەر شێوەی وشتر سەربڕی و خواردمان.**

**٤٤٢١-** «عَنْ أَسْمَاءَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: ذَبَحْنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَرَساً وَنَحْنُ بِالْمَدِينَةِ فَأَكَلْنَاهُ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




واتە: ئەسماء (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لە سەردەم پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەسپێکمان لەسەر شێوەی وشتر سەربڕی، ئێمە لە مەدینە بووین، پاشان خواردمان.

## ئەوەی بۆ غەیری خوای ﷻ سەرببڕدرێ

**٤٤٢٢-** «عَنْ عَامِرِ بْنِ وَاثِلَةَ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ عَلِيّاً ﷺ: هَلْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُسِرُّ إِلَيْكَ بِشَيْءٍ دُونَ النَّاسِ؟ فَغَضِبَ عَلِيٌّ حَتَّى احْمَرَّ وَجْهُهُ وَقَالَ: مَا كَانَ يُسِرُّ إِلَيَّ شَيْئاً دُونَ النَّاسِ غَيْرَ أَنَّهُ حَدَّثَنِي بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ، وَأَنَا وَهُوَ فِي الْبَيْتِ، فَقَالَ: لَعَنَ اللَّهُ مَنْ لَعَنَ وَالِدَهُ، وَلَعَنَ اللَّهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللَّهِ، وَلَعَنَ اللَّهُ مَنْ آوَى مُحْدِثاً، وَلَعَنَ اللَّهُ مَنْ غَيَّرَ مَنَارَ الْأَرْضِ»[١].

واتە: عامرى كوڕى واثلە دەڵێ: پیاوێک پرسیاری لە عەلی ﷺ کرد، ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی بە نهێنی بۆت باس کرد جگە لە خەڵکی؟ ئەویش تووڕە بوو تا ڕوخساری سور هەڵگەڕاو، وتی: هیچ شتێکی بە نهێنی لام باس نەکردوە جگە لەوە نەبێ هەردووکمان لەماڵەوە بووین فێری چوار وشەی کردم و فەرمووی: خوا نەفرینی کردوە لەو کەسەی نەفرین لە دایک و باوکی دەکات، خوا نەفرینی کردوە لەو کەسەی بۆ غەیری خوا سەردەبڕێ، خوا نەفرینی کردوە لەو کەسەی پەنای تاوانبارێک دەدات لەوەی تۆڵەی لێ بکرێتەوە، خوا نەفرینی کردوە لەو کەسەی کە نیشانەی سنوری زەوی تێک دەدات.

## قەدەغەکردنی خواردنی گۆشتی قوربانی لە دوای سێ ڕۆژ، وە لە هەڵگرتنیشی

**٤٤٢٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى أَنْ تُؤْكَلَ لُحُومُ الْأَضَاحِيِّ بَعْدَ ثَلَاثٍ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لەوەی گۆشتی قوربانی بخورێ لە دوای سێ ڕۆژ.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٣ و ٤٤ و ١٩٧٨/٤٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٧٤، ومسلم: ٢٦ و ١٩٧٠/٢٧، والترمذي: ١٥٠٩.




**٤٤٢٤-** «عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ، مَوْلَى ابْنِ عَوْفٍ قَالَ: شَهِدْتُ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ كَرَّمَ اللَّهُ وَجْهَهُ فِي يَوْمِ عِيدٍ، بَدَأَ بِالصَّلَاةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ، ثُمَّ صَلَّى بِلَا أَذَانٍ وَلَا إِقَامَةٍ، ثُمَّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: يَنْهَى أَنْ يُمْسِكَ أَحَدٌ مِنْ نُسُكِهِ شَيْئاً فَوْقَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ»(١).

واتە: ئەبو عوبەیدی مەولای ئیبنو عەوف دەڵێ: ئامادەبووم لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبو طاڵیب خوا ڕوخساری ڕێزدار بکات لە ڕۆژی جەژندا، سەرەتا نوێژی کرد پێش وتاردان، پاشان نوێژی کرد بە بێ بانگ و قامەت، پاشان وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو قەدەغەی کرد لەوەی کەسێک لە سەرووی سێ ڕۆژەوە گۆشتی قوربانیەکەی هەڵبگرێت.

**٤٤٢٥-** «عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ أَبَا عُبَيْدٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ نَهَاكُمْ أَنْ تَأْكُلُوا لُحُومَ نُسُكِكُمْ فَوْقَ ثَلَاثٍ»(٢).

واتە: ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە، ئەبو عوبەیدە هەواڵیداوە، عەلی کوڕی ئەبو طاڵیب رضي الله عنه گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردن لەوەی گۆشتی قوربانیەکانتان بخۆن لەسەرووی سێ ڕۆژەوە (بەڵام دواتر مۆڵەتی دا زیاتر لە سێ ڕۆژە بمێنێتەوەو بیخۆن).

## ڕێگەپێدان بە خواردنی گۆشتی قوربانی لە دوای سێ ڕۆژ، وە لە هەڵگرتنیشی

**٤٤٢٦-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ أَكْلِ لُحُومِ الضَّحَايَا بَعْدَ ثَلَاثٍ، ثُمَّ قَالَ: كُلُوا، وَتَزَوَّدُوا، وَادَّخِرُوا»(٣).

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کرد لە خواردنی گۆشتی قوربانی لە دوای سێ ڕۆژ، پاشان فەرمووی: بخۆن و لێی هەڵبگرن.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٧٣، ومسلم: ٢٤ و ١٩٦٩/٢٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٩ و ٣٠ و ٣١ و ١٩٧٢/٣٢.

**٤٤٢٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ خَبَّابٍ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ، فَقَدَّمَ إِلَيْهِ أَهْلُهُ لَحْماً مِنْ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ، فَقَالَ: مَا أَنَا بِآكِلِهِ حَتَّى أَسْأَلَ، فَانْطَلَقَ إِلَى أَخِيهِ لِأُمِّهِ قَتَادَةَ بْنِ النُّعْمَانِ، وَكَانَ بَدْرِيّاً، فَسَأَلَهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: إِنَّهُ قَدْ حَدَثَ بَعْدَكَ أَمْرٌ نَقْضاً لِمَا كَانُوا نُهُوا عَنْهُ مِنْ أَكْلِ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ بَعْدَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی خەبباب دەگێڕێتەوە، سەعیدی کوڕی موسەیب لە گەشتێکدا هاتەوە، کەس و کارەکەی گۆشتیان پێشکەش کرد لە گۆشتی قوربانی، وتی: لێی ناخۆم تا پرسیار نەکەم، ڕۆیشت بۆ لای براکەی لە دایکیەوە قەتادەی کوڕی نوعمان (خوا لێی ڕازی بێ)، کە لە شەڕی بەدردا بەشداری کردبوو، پرسیاری ئەوەی لێ کرد، وتی: لە دوای تۆ فەرمانێک دەرچووە ئەوەی پێشی تۆی هەڵوەشاندۆتەوە، لە بارەی خواردنی گۆشتی قوربانیەکان لە دوای سێ ڕۆژ.**

**٤٤٢٨-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ فَوْقَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ، فَقَدِمَ قَتَادَةُ بْنُ النُّعْمَانِ وَكَانَ أَخَا أَبِي سَعِيدٍ لِأُمِّهِ وَكَانَ بَدْرِيّاً، فَقَدَّمُوا إِلَيْهِ فَقَالَ: أَلَيْسَ قَدْ نَهَى عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: إِنَّهُ قَدْ حَدَثَ فِيهِ أَمْرٌ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَانَا أَنْ نَأْكُلَهُ فَوْقَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ، ثُمَّ رَخَّصَ لَنَا أَنْ نَأْكُلَهُ، وَنَدَّخِرَهُ»[٢].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گۆشتی قوربانی لە سەرووی سێ ڕۆژەوە، قەتادەی کوڕی نوعمان هات کە برای ئەبو سەعید بوو لە دایکەوە، وە لە بەدریشدا بەشداربوو بوو، گۆشتی قوربانیان هێنایە پێشەوە بۆ لای، وتی: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێ نەکردوە؟ ئەبو سەعیدیش وتی: بێگومان فەرمانێک لە بارەیەوە دەرچووە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردن لێی بخۆین لە سەرووی سێ ڕۆژەوە، پاشان مۆڵەتی پێداین لێی بخۆین و هەڵیشی بگرین.**

**٤٤٢٩-** «عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنِّي كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ ثَلَاثٍ: عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوهَا، وَلْتَزِدْكُمْ زِيَارَتُهَا خَيْراً، وَنَهَيْتُكُمْ عَنْ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ بَعْدَ ثَلَاثٍ فَكُلُوا مِنْهَا، وَأَمْسِكُوا مَا شِئْتُمْ، وَنَهَيْتُكُمْ عَنِ الْأَشْرِبَةِ فِي الْأَوْعِيَةِ فَاشْرَبُوا فِي أَيِّ وِعَاءٍ شِئْتُمْ، وَلَا تَشْرَبُوا مُسْكِراً»[٣].

---

**(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٦٨.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) صحيح.**

**واتە: ئیبنو بورەیدە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من سێ شتم لێ قەدەغەکردن: سەردانی گۆڕستان، ئیتر سەردانی بکەن، لەبەر ئەوەی زیارەتکردنتان ببێتە خێر بۆتان، وە ڕێگریم لێکردن لە گۆشتی قوربانی لە دوای سێ ڕۆژەوە، ئیتر لێی بخۆن و لێی هەڵبگرن بە ویستی خۆتان، وە سەرەتا ڕێگریم لێکردن لە خواردنەوە لە نێو قاپ و قاچاخدا (مەبەستی ئەوەیە سەرەتا ڕێگری دەکرد شلەمەنی دروست بکرێ لە هەندێ قاپ و قاچاخ وەکو کولەکە و قەدی دارخورماو قاپی ڕوپۆشکراو بە زفت وێنەی ئەوانەیش، دواتر ڕێگەیدا)، بخۆنەوە لە نێو هەر قاپ و قاچاخێکدا بە ویستی خۆتان، بەڵام شتی سەرخۆشکەر مەخۆنەوە.**

**٤٤٣٠-** «عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنِّي كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ بَعْدَ ثَلَاثٍ، وَعَنِ النَّبِيذِ إِلَّا فِي سِقَاءٍ، وَعَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ فَكُلُوا مِنْ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ مَا بَدَا لَكُمْ، وَتَزَوَّدُوا وَادَّخِرُوا، وَمَنْ أَرَادَ زِيَارَةَ الْقُبُورِ، فَإِنَّهَا تُذَكِّرُ الْآخِرَةَ، وَاشْرَبُوا، وَاتَّقُوا كُلَّ مُسْكِرٍ»[1].

**واتە: ئیبنو بورەیدە دەگێڕێتەوە: لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من گۆشتی قوربانیم لێ قەدەغەکردن لە دوای سێ ڕۆژەوە، وە لە گرتنەوەی شلەمەنی تەنها لەناو جەوەنە نەبێت، وە لە سەردانی گۆڕستان، ئیتر لە گۆشتی قوربانی بخۆن چۆن بۆتان ڕێککەوت و لێی هەڵبگرن، هەرکەسیش ویستی سەردانی گۆڕستان بکات، ئەوە یادی دواڕۆژی دەخاتەوە بیر، وە بخۆنەوەو خۆتان بپارێزن لە هەموو سەرخۆشکەرێک.**

## هەڵگرتنی گۆشتی قوربانی

**٤٤٣١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: دَفَّتْ دَافَّةٌ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ، حَضْرَةَ الْأَضْحَى، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كُلُوا، وَادَّخِرُوا ثَلَاثاً، فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ النَّاسَ كَانُوا يَنْتَفِعُونَ مِنْ أَضَاحِيِّهِمْ، يَجْمُلُونَ، مِنْهَا، الْوَدَكَ، وَيَتَّخِذُونَ مِنْهَا الْأَسْقِيَةَ، قَالَ: وَمَا ذَاكَ؟ قَالَ: الَّذِي نَهَيْتَ مِنْ إِمْسَاكِ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ، قَالَ: إِنَّمَا نَهَيْتُ لِلدَّافَّةِ الَّتِي دَفَّتْ، كُلُوا وَادَّخِرُوا، وَتَصَدَّقُوا»[2].

---

**(١) صحيح لغيره.**

**(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٧١، وأبو داود: ٢٨١٢.**




واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: کۆمەڵێ دەشتەکی بەپەلە هاتن بۆ مەدینە، بۆ ئەوەی گۆشتی قوربانی بە دەست بهێنن، پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار فەرمووی: بخۆن و لێی هەڵبگرن، دوای ئەوە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی سوود لە قوربانیەکانیان وەردەگرن، بەزەکەی دەیتوێننەوەو پێستەکەی دەکەن بە جەوەنە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چی ڕێگری لێکردوون لەوەی سوودی لێ وەرنەگرن، وتی: تۆ ڕێگریت کرد لە هەڵگرتنی گۆشتی قوربانیەکان، فەرمووی: بەڵکو لەبەر ئەو دەشتەکیانە ڕێگریم کرد کە بەپەلە دەهاتن، ئیتر بخۆن و لێی هەڵبگرن، وە بیکەن بە خێر.

**٤٤٣٢-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَابِسٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ فَقُلْتُ: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْهَى عَنْ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ بَعْدَ ثَلَاثٍ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، أَصَابَ النَّاسَ شِدَّةٌ، فَأَحَبَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُطْعِمَ الْغَنِيُّ الْفَقِيرَ ثُمَّ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ آلَ مُحَمَّدٍ ﷺ يَأْكُلُونَ الْكُرَاعَ بَعْدَ خَمْسَ عَشْرَةَ، قُلْتُ: مِمَّ ذَاكَ؟ فَضَحِكَتْ، فَقَالَتْ: مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ ﷺ مِنْ خُبْزٍ مَأْدُومٍ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ حَتَّى لَحِقَ بِاللَّهِ ﷻ»[1].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عابس دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە دەڵێ: هاتم بۆ لای عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) وتم: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ گۆشتی قوربانی لەدوای سێ ڕۆژەوە قەدەغە دەکرد؟ وتی: بەڵێ، خەڵکی تووشی برسێتیەکی سەخت بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی باش بوو خەڵکانی دەوڵەمەند بەشی هەژار بدەن، پاشان وتی: خانەوادەی پێغەمبەرم ﷺ بینی لە دوای پازدە ڕۆژ سەرەوەی قاچی مەڕی دەخوارد کە هیچ گۆشتێکی پێوە نەبوو، وتم: ئەوە کەی بوو؟ عائیشە پێکەنی و وتی: خانەوادەی پێغەمبەر ﷺ سێ ڕۆژ بە دوای یەکتردا نان و چێشتیان پێکەوە نەخواردووە تا کۆچی دوایی کردو گەیشتە لای خوا ﷻ.

**٤٤٣٣-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَابِسٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَنْ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ؟ قَالَتْ: كُنَّا نَخْبَأُ الْكُرَاعَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَهْراً ثُمَّ يَأْكُلُهُ»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٢٣ و ٥٤٣٨ و ٦٦٨٧، ومسلم: ٢٩٧٠/٢٣، والترمذي: ١١٥١، وإبن ماجه: ٣١٥٩ و ٣٣١٣.

(٢) صحيح.




واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عابس دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) لە بارەی گۆشتی قوربانی؟ وتی: ئێمە قاچی مەڕمان هەڵدەگرت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ماوەی یەک مانگ پاشان دەیخوارد.

**٤٤٣٤-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ إِمْسَاكِ الْأُضْحِيَّةِ فَوْقَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ، ثُمَّ قَالَ: كُلُوا وَأَطْعِمُوا»[1].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵگرتنی گۆشتی قوربانی قەدەغەی کرد لە سەرووی سێ ڕۆژەوە، پاشان فەرمووی: بخۆن و دەرخواردی خەڵکیشی بدەن.

## بابەت: خواردنی سەربڕاوی جولەکەکان

**٤٤٣٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ قَالَ: دُلِّيَ جِرَابٌ مِنْ شَحْمٍ يَوْمَ خَيْبَرَ فَالْتَزَمْتُهُ، قُلْتُ: لَا أُعْطِي أَحَداً مِنْهُ شَيْئاً، فَالْتَفَتُّ، فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَبَسَّمُ»[2].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی موغەفەل ﷺ دەڵێ: لە قەڵای خەیبەر دابەزینە خوارەوە کوندەیەکمان پێبوو بەزی تێدا بوو لە ڕۆژی خەیبەردا، منیش دەستم پێوە گرت، وتم: هیچی لێنادەم بە کەس، ئاوڕم دایەوە بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ پێدەکەنی.

## قوربانی کردن لەلایەن کەسێکەوە نازانرێ ئەو کەسە ناوی خوای لەسەر قوربانیەکە هێناوە یان نەیهێناوە

**٤٤٣٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ نَاساً مِنَ الْأَعْرَابِ كَانُوا يَأْتُونَا بِلَحْمٍ، وَلَا نَدْرِي أَذَكَرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ أَمْ لَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ ﷻ عَلَيْهِ وَكُلُوا»[3].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: خەڵکانێکی دەشتەکی گۆشتیان بۆ دەهێنایین، نەماندەزانی ناوی خوای لەسەر هێنراوە یان نا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ناوی خوای لەسەر بهێنەو بیخۆ.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٧٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٥٣ و ٤٢٢٤ و ٥٥٠٨، ومسلم: ٧٢ و ١٧٧٢/٧٣، وأبو داود: ٢٧٠٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٥٧ و ٥٥٠٧ و ٧٣٩٨، وأبو داود: ٢٨٢٩، وإبن ماجه: ٣١٧٤.




**لێکدانەوەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿ وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ ﴿١٢١﴾ ﴾ (واتە: لەو سەربڕاوە مەخۆن کە ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە).**

**٤٤٣٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فِي قَوْلِهِ ﷻ: ﴿ وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ ﴿١٢١﴾ ﴾الأنعام، قَالَ: خَاصَمَهُمُ الْمُشْرِكُونَ، فَقَالُوا: مَا ذَبَحَ اللَّهُ فَلَا تَأْكُلُوهُ، وَمَا ذَبَحْتُمْ أَنْتُمْ أَكَلْتُمُوهُ»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) لەبارەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿ وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ ﴿١٢١﴾ ﴾، وتی: هاوبەشدانەران دژایەتیان کردو وتیان: ئەوەی خوا سەری بڕیوە ئێوە نایخۆن (واتە: ئەو ئاژەڵەی مردارەوە بووە)، وە ئەوەی خۆتان سەرتان بڕیوە دەیخۆن.**

## قەدەغەکردنی خواردنی گۆشتی ئەو ئاژەڵەی دەکرێ بە نیشانە

**٤٤٣٨-** «عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَحِلُّ الْمُجَثَّمَةُ»[٢].

**واتە: ئەبو ثەعلەبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە گۆشتی ئەو ئاژەڵەی دەکرێ بە نیشانە.**

**٤٤٣٩-** «عَنْ هِشَامِ بْنِ زَيْدٍ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ أَنَسٍ عَلَى الْحَكَمِ يَعْنِي ابْنَ أَيُّوبَ، فَإِذَا أُنَاسٌ يَرْمُونَ دَجَاجَةً فِي دَارِ الْأَمِيرِ، فَقَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ تُصْبَرَ الْبَهَائِمُ»[٣].

**واتە: هیشامی کوڕی زەید دەڵێ: لەگەڵ ئەنەسدا هاتین بۆ لای حەکەمی کوڕی ئەیوب، خەڵکانێکم بینی مریشکێکیان بەردباران دەکرد لەماڵی ئەمیردا (کردبویان بە نیشانە)، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە گیاندارەکان بگیرێن و بکرێن بە نیشانە تا دەمرن (گۆشتیان حەڵاڵ نیە).**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥١٣، ومسلم: ١٩٥٦، وأبو داود: ٢٨١٦، وإبن ماجه: ٣١٨٦.





**٤٤٤٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى أُنَاسٍ وَهُمْ يَرْمُونَ كَبْشاً بِالنَّبْلِ، فَكَرِهَ ذَلِكَ، وَقَالَ: لَا تَمْثُلُوا بِالْبَهَائِمِ»(١).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بە لای خەڵکێکدا بەرانێکیان تیرباران دەکرد، ئەو کردەوەی پێ ناخۆش بوو، فەرمووی: ئاژەڵەکان مەشێوێنن و (بە زیندوویی) پەل پەلی مەکەن.**

**٤٤٤١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَنِ اتَّخَذَ شَيْئاً فِيهِ الرُّوحُ غَرَضاً»(٢).

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لەو کەسەی گیانلەبەرێک دەکات بە نیشانە (بە بەردو بە تیر ئەزیەتی دەدات).**

**٤٤٤٢-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَعَنَ اللَّهُ مَنْ مَثَّلَ بِالْحَيَوَانِ»(٣).

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: نەفرینی خوا لەو کەسەی ئاژەڵێک دەشێوێنێ و پەل پەلی دەکات (بە زیندوویی).**

**٤٤٤٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا تَتَّخِذُوا شَيْئاً فِيهِ الرُّوحُ غَرَضاً»(٤).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ گیانلەبەرێک مەکەن بە نیشانە.**

**٤٤٤٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا تَتَّخِذُوا شَيْئاً فِيهِ الرُّوحُ غَرَضاً»(٥).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥١٥، ومسلم: ١٩٥٨.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٥٧، والترمذي: ١٤٧٥، وإبن ماجه: ٣١٨٧.

(٥) صحيح.




واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ گیانلەبەرێک مەکەن بە نیشانە.

## هەر کەس چۆلەکەیەک، یان پاساریەک بکوژێ بە ناحەق

**٤٤٤٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَرْفَعُهُ قَالَ: مَنْ قَتَلَ عُصْفُوراً فَمَا فَوْقَهَا بِغَيْرِ حَقِّهَا، سَأَلَ اللَّهُ ﷻ عَنْهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَمَا حَقُّهَا؟ قَالَ: حَقُّهَا أَنْ تَذْبَحَهَا فَتَأْكُلَهَا، وَلَا تَقْطَعْ رَأْسَهَا فَيُرْمَى بِهَا»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ (خوا لێیان ڕازی بێ) ڕەفعی کردوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس چۆلەکەیەک، یان لە سەرووی ئەوەوە بکوژێ بە ناحەق، خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییدا لە بارەیەوە پرسیاری لێ دەکات، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ حەقەکەی چیە؟ فەرمووی: حەقەکەی ئەوەیە سەری ببڕێ و بیخوات، نەک سەری لە لاشەی جیابکاتەوەو فڕێی بدات.**

**٤٤٤٦-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ قَالَ: سَمِعْتُ الشَّرِيدَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ قَتَلَ عُصْفُوراً عَبَثاً عَجَّ إِلَى اللَّهِ ﷻ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَقُولُ: يَا رَبِّ، إِنَّ فُلَاناً قَتَلَنِي عَبَثاً، وَلَمْ يَقْتُلْنِي لِمَنْفَعَةٍ»[٢].

**واتە: عەمری کوڕی شەرید دەڵێ: گوێم لە شەرید ﷺ بوو دەیووت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەرکەس لە خۆڕا چۆلەکەیەک بکوژێ لە ڕۆژی دواییدا دەنگی بەرز دەکاتەوە بۆ لای خواو دەڵێ: ئەی پەروەردگارم فلانە کەس لە خۆڕا کوشتمی، لەبەر سودێک نەیکوشتم.**

## قەدەغە کردن لە خواردنی گۆشتی (الْجَلَّالَةِ): پیس خۆر:

**تێبینی: (الْجَلَّالَةِ) بریتیە لەو ئاژەڵەی شتی پیس بخوات، پاشان گۆشتەکەی و شیرەکەی بۆنی ئەو شتە پیسە لە خۆ بگرێت، بۆیە دەبێ چەند ڕۆژێک دابنرێت، پاشان شیرەکەی بخورێت، یان سەر ببڕدرێت).**

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

**٤٤٤٧-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: نَهَى يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الْأَهْلِيَّةِ، وَعَنِ الْجَلَّالَةِ، وَعَنْ رُكُوبِهَا، وَعَنْ أَكْلِ لَحْمِهَا»[1].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیرەیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا گۆشتی گوێدرێژی ماڵی قەدەغە کرد، هەروەها پیس خۆرو سواربوونیشی، وە لە خواردنی گۆشتەکەیشی.**

## قەدەغە کردن لە شیری (الْجَلَّالَةِ): پیس خۆر

**٤٤٤٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمُجَثَّمَةِ، وَلَبَنِ الْجَلَّالَةِ، وَالشُّرْبِ مِنْ فِي السِّقَاءِ»[2].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە (خواردنی ئەو ئاژەڵەی دەکرێتە نیشانە، وە لە (خواردنەوەی) شیری ئاژەڵی پیس خۆر، وە خواردنەوە لە دەمی جەوەنە.**

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٨١١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٢٩، وأبو داود: ٣٧١٩ و ٣٧٨٦، والترمذي: ١٨٢٥، وإبن ماجه: ٣٤٢١.




## بابەت: هاندان لە سەر کاروو کەسابەت کردن

**٤٤٤٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ أَطْيَبَ مَا أَكَلَ الرَّجُلُ مِنْ كَسْبِهِ، وَإِنَّ وَلَدَ الرَّجُلِ مِنْ كَسْبِهِ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترین و پاکترین خواردنێک کە پیاو بیخوات ڕەنجی شانی خۆیەتی، بێگومان منداڵەکەیشی لە ڕەنجی شانی خۆیەتی.**

**٤٤٥٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِنَّ أَوْلَادَكُمْ مِنْ أَطْيَبِ كَسْبِكُمْ، فَكُلُوا مِنْ كَسْبِ أَوْلَادِكُمْ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی منداڵەکانتان لە چاکترینی ڕەنجە شانی خۆتانن، کەواتە بخۆن لە ڕەنجە شانی منداڵەکانتان.**

**٤٤٥١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ أَطْيَبَ مَا أَكَلَ الرَّجُلُ مِنْ كَسْبِهِ وَوَلَدُهُ مِنْ كَسْبِهِ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی چاکترین شتێک کە پیاو بیخوات ڕەنجە شانی خۆیەتی و منداڵەکەیشی لە ڕەنجە شانی خۆیەتی.**

**٤٤٥٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ أَطْيَبَ مَا أَكَلَ الرَّجُلُ مِنْ كَسْبِهِ، وَإِنَّ وَلَدَهُ مِنْ كَسْبِهِ»[٤].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی چاکترین و پاکترین شتێک کە پیاو بیخوات ڕەنجە شانی خۆیەتی، وە منداڵەکەیشی لە ڕەنجە شانی خۆیەتی.**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٢٨ و ٣٥٢٩، والترمذي: ١٣٥٨، وإبن ماجه: ٢١٣٧ و ٢٢٩٠.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

## بابەت: دووركەوتنەوە لەو شتانەی گومانی تێدایە لە کارو کەسابەتدا

**٤٤٥٣-** «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ الْحَلَالَ بَيِّنٌ، وَإِنَّ الْحَرَامَ بَيِّنٌ، وَإِنَّ بَيْنَ ذَلِكَ أُمُوراً مُشْتَبِهَاتٍ وَرُبَّمَا قَالَ: وَإِنَّ بَيْنَ ذَلِكَ أُمُوراً مُشْتَبِهَةً، قَالَ: وَسَأَضْرِبُ لَكُمْ فِي ذَلِكَ مَثَلاً إِنَّ اللَّهَ ﷻ حَمَى حِمًى، وَإِنَّ حِمَى اللَّهِ ﷻ مَا حَرَّمَ، وَإِنَّهُ مَنْ يَرْتَعُ حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يُخَالِطَ الْحِمَى، وَرُبَّمَا قَالَ: إِنَّهُ مَنْ يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يُرْتِعَ فِيهِ وَإِنَّ مَنْ يُخَالِطُ الرِّيبَةَ يُوشِكُ أَنْ يَجْسُرَ»[١].

**واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: حەڵاڵ ڕوون و ئاشکرایەو حەرامیش ڕوون و ئاشکرایە، لە نێوانیشیاندا چەند شتێکی گوماناوی هەن، لەو بارەیشەوە نموونەیەکتان بۆ دەهێنمەوە: خوا ﷻ سنوورێکی بۆ خۆی داناوە بەڕاستی سنووری خوا ئەوەیە کە حەرامی کردوە، هەرکەسیش لە دەوروبەری سنووری خوادا ئاژەڵەکانی بلەوەڕێنێ نزیکە تێکەڵی ببێ، هەرکەسیش تێکەڵی شتی گوماناوی بێت نزیکە تووشی شتێکی قەدەغە کراویش بێت.**

**٤٤٥٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ مَا يُبَالِي الرَّجُلُ مِنْ أَيْنَ أَصَابَ الْمَالَ مِنْ حَلَالٍ أَوْ حَرَامٍ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەمانێک بەسەر خەڵکدا دێت پیاو کێشەی نیەو گرنگی نادات بەوەی لە کوێوە ماڵی بە دەست هێناوە بە حەرامی یان بە حەڵاڵی.**

**٤٤٥٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَأْكُلُونَ الرِّبَا، فَمَنْ لَمْ يَأْكُلْهُ أَصَابَهُ مِنْ غُبَارِهِ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەمانێک بەسەر خەڵکدا دێت خەڵکی ڕیباو سوو دەخۆن، هەرکەسیش نەیخوا تۆزەکەی دەیگرێتەوە.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢ و ٢٠٥١، ومسلم: ١٠٧ و ١٥٩٩/١٠٨، وأبو داود: ٣٣٢٩ و ٣٣٣٠، والترمذي: ١٢٠٥، وإبن ماجه: ٣٩٨٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٥٩ و ٢٠٨٣.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٣٣١، وإبن ماجه: ٢٢٧٨.




## بـابەت: بــازرگانی

**٤٤٥٦-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ تَغْلِبَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يَفْشُوَ الْمَالُ وَيَكْثُرَ، وَتَفْشُوَ التِّجَارَةُ، وَيَظْهَرَ الْعِلْمُ، وَيَبِيعَ الرَّجُلُ الْبَيْعَ فَيَقُولَ: لَا حَتَّى أَسْتَأْمِرَ تَاجِرَ بَنِي فُلَانٍ، وَيُلْتَمَسَ فِي الْحَيِّ الْعَظِيمِ الْكَاتِبُ فَلَا يُوجَدُ»[١].

**واتە: عەمری کوڕی تەغلیب ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی، ماڵ و سامان زۆر دەبێت، بازرگانیش زۆر دەبێت، زانستیش دەردەکەوێ، کەسێک دەیەوێ شمەکێک بفرۆشێ و دەڵێ: نایفرۆشم تا بڕیار لە فڵانە بازرگان وەردەگرم، وە دەگەڕێن بەناو گەڕەکێکی گەورەدا کەسێک نابیننەوە بۆیان بنووسێ.**

## ئەوەی پێویستە لەسەر بازرگان لە خۆپاراستن لە کڕین و فرۆشتنەکانیاندا

**٤٤٥٧-** «عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَفْتَرِقَا، فَإِنْ صَدَقَا وَبَيَّنَا بُورِكَ فِي بَيْعِهِمَا، وَإِنْ كَذَبَا وَكَتَمَا مُحِقَ بَرَكَةُ بَيْعِهِمَا»[٢].

**واتە: حەکەمی کوڕی حیزام ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کڕیارو فرۆشیار سەرپشکن مادام لەیەک جیانەبووبێتنەوە، (واتە: کڕیارو فرۆشیار بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە لەو ماوەی کە لە یەکتر جیانەبووبنەوە) جا ئەگەر لەگەڵ یەکتردا کەم وکوڕیەکان بۆ یەکتری ڕوون بکەنەوەو ڕاستگۆبن، بەرەکەت و پیرۆزی دەکەوێتە مامەڵەکانیانەوە، خۆ ئەگەر درۆیان کرد لەگەڵ یەکداو کەم و کوڕیەکانیان لە یەکتری شاردەوە ئەوە خێرو بەرەکەتی مامەڵەکەیان دەڕوات.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٧٩ و ٢٠٨٢ و ٢١٠٨ و ٢١١٠ و ٢١١٤، ومسلم: ١٥٣٢، وأبو داود: ٣٤٥٩، والترمذي: ١٢٤٦.

## ئەو كەسەی ماڵ و سامانەكەی ساغ دەكاتەوەو دەیفرۆشێ بە سوێندی درۆ

**٤٤٥٨-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ، وَلَا يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فَقَرَأَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قَالَ أَبُو ذَرٍّ: خَابُوا وَخَسِرُوا، قَالَ: الْمُسْبِلُ إِزَارَهُ، وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ، وَالْمَنَّانُ عَطَاءَهُ»[١].

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سێ كەس هەن خوا لە ڕۆژی دوایی دا نە قسەیان لەگەڵدا دەكات و نە پاكیان دەكاتەوەو، سزایەكی بە ئێشیان بۆ هەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ (ئایەتەكەی) خوێندەوە، جا ئەبو زەڕ وتی: ڕیسواو زەرەرمەند بوون، فەرمووی: ئەو كەسەی كە دەرقاچەكەی درێژەو دەخشێ بە زەویدا، (بەهۆی فیزو خۆبەزل زانیەوە) وە ئەو كەسەی ماڵ و سامانەكەی دەفرۆشێ بە سوێندی درۆ، وە ئەو كەسەی كە منەت دەكات بەسەر خەڵكی (هەژاردا دوای ئەوەی چاكەی لەگەڵ كردوون).**

**٤٤٥٩-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: ثَلَاثَةٌ لَا يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَا يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: الَّذِي لَا يُعْطِي شَيْئاً إِلَّا مَنَّهُ، وَالْمُسْبِلُ إِزَارَهُ، وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْكَذِبِ»[٢].

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سێ كەس هەن خوا لە ڕۆژی دواییدا نە قسەیان لەگەڵدا دەكات و، نە پاكیان دەكاتەوەو، سزایەكی بە ئێشیان بۆ هەیە: ئەو كەسەی هەر شتێك ببەخشێ منەت دەكات (بەسەر ئەو كەسەی پێی بەخشراوە)، ئەو كەسەی كە دەرقاچەكەی درێژەو دەخشێ بە زەویدا، وە ئەو كەسەی ماڵ و سامانەكەی دەفرۆشێ بە سوێندی درۆ.**

**٤٤٦٠-** «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِيَّاكُمْ وَكَثْرَةَ الْحَلِفِ فِي الْبَيْعِ، فَإِنَّهُ يُنَفِّقُ، ثُمَّ يَمْحَقُ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٠٧، وإبن ماجه: ٢٢٠٩.




واتە: ئەبو قەتادەی ئەنصاری ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئاگادارو وریابن زۆر سوێند مەخۆن لە کڕین و فرۆشتندا، چونکە سوێند خواردن کەلوپەلی پێ دەفرۆشرێت، دواتر بەرەکەت ناهێڵێ.

**٤٤٦١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْحَلِفُ مَنْفَقَةٌ لِلسِّلْعَةِ مَمْحَقَةٌ لِلْكَسْبِ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سوێند خواردن کەلوپەلی پێ دەفرۆشرێت، بەڵام بەرەکەت ناهێڵێت.

## سوێند خواردنی درۆ بۆ هەڵخەڵەتاندنی (خەڵک) لە کڕین و فرۆشتندا

**٤٤٦٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ ﷻ، وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَا يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: رَجُلٌ عَلَى فَضْلِ مَاءٍ بِالطَّرِيقِ يَمْنَعُ ابْنَ السَّبِيلِ مِنْهُ، وَرَجُلٌ بَايَعَ إِمَاماً لِدُنْيَا إِنْ أَعْطَاهُ مَا يُرِيدُ وَفَّى لَهُ، وَإِنْ لَمْ يُعْطِهِ لَمْ يَفِ لَهُ، وَرَجُلٌ سَاوَمَ رَجُلاً عَلَى سِلْعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ، فَحَلَفَ لَهُ بِاللَّهِ لَقَدْ أُعْطِيَ بِهَا كَذَا وَكَذَا فَصَدَّقَهُ الْآخَرُ»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ کەس هەن خوا لە ڕۆژی دواییدا نە قسەیان لەگەڵدا دەکات و، نە بە چاوی میهرەبانی تەماشایان دەکات و، نە پاکیان دەکاتەوەو، سزایەکی بە ئێشیان بۆ هەیە: پیاوێک لەسەر ئاوێک بێت ئاوەکە لە بەشی خۆی زیاتر بێت ڕێگری بکات لە ڕێبواران سوودی لێوەربگرن، هەروەها پیاوێک بەیعەتی دابێت بە ئیمامێک لەبەر دنیا ئەگەر پێی بەخشی بە وەفاو سەر ڕاست بێت لەگەڵیدا، ئەگەر پێی نەبەخشی بێ وەفاو ناڕاست بێت، پیاوێکیش مامەڵەی لەگەڵ پیاوێکی تردا کردبێت لەسەر کەل و پەلێک لە دوای عەسر، سوێندی بۆ بخوات ئەوەندو ئەوەندەی پێداوە ئەویش بڕوای پێ بکات.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٨٧، ومسلم: ١٦٠٦، وأبو داود: ٣٣٣٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٥٨ و ٢٣٦٩ و ٢٦٧٢ و ٧٢١٢ و ٧٤٤٦، ومسلم: ١٧٣ و ١٠٨/١٧٤، وأبو داود: ٣٤٧٤ و ٣٤٧٥، والترمذي: ١٥٩٥، وإبن ماجه: ٢٢٠٧ و ٢٨٧٠.




## فەرمان کردن بە بەخشین بۆ کەسێک بە دڵ سوێند نەخوات لە کاتی مامەڵەکەیدا

**٤٤٦٣-** «عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي غَرَزَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا بِالْمَدِينَةِ نَبِيعُ الْأَوْسَاقَ وَنَبْتَاعُهَا، وَنُسَمِّي أَنْفُسَنَا السَّمَاسِرَةَ، وَيُسَمِّينَا النَّاسُ، فَخَرَجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَسَمَّانَا بِاسْمٍ هُوَ خَيْرٌ لَنَا مِنَ الَّذِي سَمَّيْنَا بِهِ أَنْفُسَنَا، فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ التُّجَّارِ، إِنَّهُ يَشْهَدُ بَيْعَكُمُ الْحَلِفُ وَاللَّغْوُ فَشُوبُوهُ بِالصَّدَقَةِ»[١].

**واتە: قەیسی کوڕی ئەبی غەرەزە ﷺ دەڵێ: ئێمە لە مەدینە بووین بارمان دەکڕی و دەفرۆشت، خۆمان بە (السَّماسِرَةَ)دا دەنا، (واتە: دەڵاڵ یان ڕێکخەر) خەڵکیش هەر بەو شێوەی ناویان لێنا بووین، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان ناوی لێناین بە شتێک لەوەی خۆمان چاکتر بوو، فەرمووی: ئەی کۆمەڵی (التُّجَّار) بازرگانەکان، بەڕاستی ئەم کڕین و فرۆشتنە سوێند و درۆی تێدەکەوێ، تێکەڵی بکەن بە بەخشین. (بێگومان سوێندی درۆ بەرەکەی ماڵ و سامان ناهێڵێ، بەخشینیش خەشم و تووڕەیی خوا دادەمرکێنێ، چاکەکانیش گوناهەکان لادەبەن).**

## واجب بوونی سەرپشک کردنی کڕیارو فرۆشیار لە مامەڵەدا پێش جیابوونەوەیان لە یەکتر

**٤٤٦٤-** «عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَفْتَرِقَا، فَإِنْ بَيَّنَا وَصَدَقَا بُورِكَ لَهُمَا فِي بَيْعِهِمَا، وَإِنْ كَذَبَا وَكَتَمَا مُحِقَ بَرَكَةُ بَيْعِهِمَا»[٢].

**واتە: حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کڕیارو فرۆشیار سەرپشکن مادام لە یەک جیانەبووبێتنەوە، (واتە: کڕیارو فرۆشیار بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە لەو ماوەی کە لە یەکتر جیانەبووبنەوە) جا ئەگەر لەگەڵ یەکتردا کەم و کوڕیەکان بۆ یەکتری ڕوون بکەنەوەو ڕاستگۆبن، بەرەکەت و پیرۆزی دەکەوێتە مامەڵەکانیانەوە، وە ئەگەر درۆیان کرد لەگەڵ یەکداو کەم و کوڕیەکانیان لە یەکتری شاردەوە ئەوە خێرو بەرەکەتی مامەڵەکەیان دەڕوات.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




## باسی جیاوازی لەسەر نافع لە دەستەواژەی فەرموودەکەی

**٤٤٦٥-** «عَنْ مالك عن نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْمُتَبَايِعَانِ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِالْخِيَارِ عَلَى صَاحِبِهِ مَا لَمْ يَفْتَرِقَا إِلَّا بَيْعَ الْخِيَارِ»[1].

**واتە: مالیک دەگێڕێتەوە، لە نافع، لە ئیبنو عومەرەوە (خوا لێی ڕزی بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کڕیارو فرۆشیار هەریەکەیان سەرپشکن مادەم لەیەک جیانەبووبێتنەوە، (واتە: کڕیارو فرۆشیار بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە لە مامەڵەکە هەتا لەیەکتر جیانەبووبێتنەوە) جگە لە کڕین و فرۆشتنێ نەبێ مەرجی پەشیمان بوونەوە دابنێن.**

**٤٤٦٦-** «عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ قال حدثني نَافِعٌ عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْبَيْعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَفْتَرِقَا أَوْ يَكُونَ خِيَاراً»[2].

**واتە: عوبەیدوڵڵا دەڵێ: نافع بۆی باس کردم، لە ئیبنو عومەر، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کڕیارو فرۆشیار سەرپشکن مادەم لە یەک جیانەبووبێتنەوە،(واتە: کڕیارو فرۆشیار بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە لەو ماوەی کە لە یەکتر جیا نەبووبنەوە) یان مەرجی پەشیمان بوونەوەی تێدا بێت.**

**٤٤٦٧-** «عَنْ إسماعيل عن نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْمُتَبَايِعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَفْتَرِقَا، إِلَّا أَنْ يَكُونَ الْبَيْعُ كَانَ عَنْ خِيَارٍ، فَإِنْ كَانَ الْبَيْعُ عَنْ خِيَارٍ فَقَدْ وَجَبَ الْبَيْعُ»[3].

**واتە: ئیسماعیل دەگێڕێتەوە، لە نافع، لە ئیبنو عومەرەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کڕیارو فرۆشیار سەرپشکن مادەم لەیەک جیانەبووبێتنەوە، (واتە: کڕیارو فرۆشیار بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە لەو ماوەی کە لە یەکتر جیانەبووبنەوە)**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٠٧ و ٢١٠٩ و ٢١١١ و ٢١١٢ و ٢١١٣، ومسلم: ٤٣ و ٤٤ و ٤٥ و ١٥٣١/٤٦، وأبو داود: ٣٤٥٤ و ٣٤٥٥، والترمذي: ١٢٤٥، وإبن ماجه: ٢١٨١.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

مەگەر کڕین و فرۆشتنەکە سەرپشک کردنی تێدا بێت، جا ئەگەر کڕین و فرۆشتنەکە سەرپشک بوون تێدا بوو، ئەوە مامەڵەکە دادەمەزرێ.

**٤٤٦٨-** «عَنْ ابن جُرَيْجٍ قال أَمْلَى عليَّ نَافِعٌ عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا تَبَايَعَ الْبَيِّعَانِ فَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِالْخِيَارِ مِنْ بَيْعِهِ، مَا لَمْ يَفْتَرِقَا أَوْ يَكُونَ بَيْعُهُمَا عَنْ خِيَارٍ، فَإِنْ كَانَ عَنْ خِيَارٍ فَقَدْ وَجَبَ الْبَيْعُ»[١].

واتە: ئیبنو جورەیج دەڵێ: نافع بۆمی خوێندەوە لە ئیبنو عومەرەوە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ دوو کەس کڕین و فرۆشتنیان کرد، هەر یەک لەو دووانە سەرپشکە لە مامەڵەکەیدا، بە مەرجێ لە یەکتر جیا نەبووبێتنەوە، جا ئەگەر بە ویستی هەردوولا بوو ئەوە مامەڵەکە دامەزراوە.

**٤٤٦٩-** «عَنْ أيوب عَن نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَفْتَرِقَا أَوْ يَقُولَ أَحَدُهُمَا لِلْآخَرِ: اخْتَرْ»[٢].

واتە: ئەیوب دەگێڕێتەوە، لە نافع، لە ئیبنو عومەرەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کڕیارو فرۆشیار سەرپشکن مادەم لەیەک جیانەبووبێتنەوە، (واتە: کڕیارو فرۆشیار بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە لەو ماوەی کە لە یەکتر جیا نەبووبنەوە) یان یەکێکیان بەوی تر بڵێ: بە ویستی خۆت هەڵیبژێرە.

**٤٤٧٠-** «عَنْ أيوب عَن نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ حَتَّى يَفْتَرِقَا أَوْ يَكُونَ بَيْعَ خِيَارٍ»[٣].

واتە: ئەیوب دەگێڕێتەوە، لە نافع، لە ئیبنو عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کڕیارو فرۆشیار سەرپشکن مادەم لەیەک جیانەبووبێتنەوە، (واتە: کڕیارو فرۆشیار بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە لەو ماوەی کە لە یەکتر جیا نەبووبنەوە) یان مامەڵەکەیان لەسەر سەرپشک کردن بێت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**٤٤٧١-** «عَنْ الليث عن نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ حَتَّى يَفْتَرِقَا أَوْ يَكُونَ بَيْعَ خِيَارٍ وَرُبَّمَا قَالَ نَافِعٌ: أَوْ يَقُولَ أَحَدُهُمَا لِلْآخَرِ: اخْتَرْ»[١].

**واتە: لەیث دەگێڕێتەوە، لە نافع، لە ئیبنو عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کڕیارو فرۆشیار سەرپشکن مادەم لەیەک جیانەبووبێتنەوە، (واتە: کڕیارو فرۆشیار بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە لەو ماوەی کە لە یەکتر جیا نەبووبنەوە) یان مامەڵەکەیان لەسەر سەرپشک کردن بێت، پێدەچێ نافع وتبێتی: یان یەکێکیان بەوی تر بڵێ: بە ویستی خۆت هەڵیبژێرە.**

**٤٤٧٢-** «عَنْ الليث عن نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا تَبَايَعَ الرَّجُلَانِ فَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِالْخِيَارِ حَتَّى يَفْتَرِقَا، وَقَالَ مَرَّةً أُخْرَى: مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا، وَكَانَا جَمِيعاً، أَوْ يُخَيِّرَ أَحَدُهُمَا الْآخَرَ، فَإِنْ خَيَّرَ أَحَدُهُمَا الْآخَرَ فَتَبَايَعَا عَلَى ذَلِكَ فَقَدْ وَجَبَ الْبَيْعُ، فَإِنْ تَفَرَّقَا بَعْدَ أَنْ تَبَايَعَا وَلَمْ يَتْرُكْ وَاحِدٌ مِنْهُمَا الْبَيْعَ فَقَدْ وَجَبَ الْبَيْعُ»[٢].

**واتە: لەیث دەگێڕێتەوە، لە نافع، لە ئیبنو عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دوو پیاو کڕین و فرۆشتنیان کرد ئەوە هەر یەکێکیان سەرپشکە تا جیادەبنەوە، جارێکی تر وتی: تا جیانەبنەوە، جا هەردووکیان یان یەکێکیان ئەوی دیکەیان سەرپشک دەکات، ئەگەر یەکێکیان ئەوی دیکەی سەرپشک کردو مامەڵەیان لە سەر ئەوە کرد، ئەوە گرێبەستەکەیان دامەزراوە، جا ئەگەر جیابوونەوە دوای ئەوەی مامەڵەیان کرد یەکێکیان دەست بەرداری مامەڵەکە نەبوو ئەوە کڕین و فرۆشتنەکە دادەمەزرێ.**

**٤٤٧٣-** «عَنْ يحيى بن سَعِيدٍ يقول سمعت نَافِعاً يُحدث عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ الْمُتَبَايِعَيْنِ بِالْخِيَارِ فِي بَيْعِهِمَا مَا لَمْ يَفْتَرِقَا، إِلَّا أَنْ يَكُونَ الْبَيْعُ خِيَاراً، قَالَ نَافِعٌ: فَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ إِذَا اشْتَرَى شَيْئاً يُعْجِبُهُ فَارَقَ صَاحِبَهُ»[٣].

**واتە: یەحیای کوڕی سەعید دەڵێ: گوێم لە نافع بوو لە ئیبنو عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) باسی دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان کڕیار و**

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) صحيح.**

فرۆشیار سەرپشکن لە کڕین و فرۆشتنەکەیاندا هەتا لە یەکتر جیادەبنەوە، نافع وتی: عەبدوڵڵا ئەگەر شتێکی بکڕیایەو پێی سەرسام بوایە فرۆشیارەکەی بەجێ دەهێشت.

**٤٤٧٤-** «عَنْ يحيى بن سَعِيدٍ قال حدثنا نَافِعٌ عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْمُتَبَايِعَانِ لَا بَيْعَ بَيْنَهُمَا حَتَّى يَتَفَرَّقَا إِلَّا بَيْعَ الْخِيَارِ»(١).

واتە: یەحیای کوڕی سەعید دەڵێ: نافع بۆی باس کردم لە ئیبنو عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کڕیارو فرۆشیار کڕین لە نێوانیاندا نیە هەتا جیا دەبنەوە جگە لە کڕین و فرۆشتنێ نەبێ مەرجی پەشیمان بوونەوەی تێدا بێت.

## باسی جیاوازی لەسەر عەبدوڵڵای کوڕی دینار لە دەستەواژەی ئەم فەرموودەدا

**٤٤٧٥-** «عَنْ إسماعيل عن عبدِ اللَّهِ بن دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كُلُّ بَيِّعَيْنِ لَا بَيْعَ بَيْنَهُمَا حَتَّى يَتَفَرَّقَا إِلَّا بَيْعَ الْخِيَارِ»(٢).

واتە: ئیسماعیل دەگێڕێتەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی دینار، لە ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کڕیارو فرۆشیار هیچ فرۆشتنێک لە نێوانیاندا نیە (واتە: نابێ هەر لەو شوێنەی کە کڕیویەتی دەستبەجێ بیفرۆشێ) هەتا لە یەکتر جیادەبنەوە، جگە لە کڕین و فرۆشتنێ نەبێ مەرجی پەشیمان بوونەوەی تێدا بێت.

**٤٤٧٦-** «عَنْ ابن الْهَادِ عن عبدِ اللَّهِ بن دِينَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّهُ: سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: كُلُّ بَيِّعَيْنِ فَلَا بَيْعَ بَيْنَهُمَا حَتَّى يَتَفَرَّقَا إِلَّا بَيْعَ الْخِيَارِ»(٣).

واتە: ئیبنولهاد دەگێڕێتەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی دینار، لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، ئەو بیستی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: کڕیارو

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

فرۆشیار هیچ فرۆشتنێک لە نێوانیاندا نیە (واتە: نابێ هەر لەو شوێنەی کە کڕیویەتی دەستبەجێ بیفرۆشێ) هەتا لە یەکتر جیا دەبنەوە، جگە لە کڕین و فرۆشتنێ نەبێ مەرجی پەشیمان بوونەوەی تێدا بێت.

٤٤٧٧- «عَنْ سفيان عن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : كُلُّ بَيِّعَيْنِ لَا بَيْعَ بَيْنَهُمَا حَتَّى يَتَفَرَّقَا إِلَّا بَيْعَ الْخِيَارِ»[١].

واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی دینار، لە ئیبنو عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کڕیارو فرۆشیار هیچ فرۆشتنێک لە نێوانیاندا نیە (واتە: نابێ هەر لەو شوێنەی کە کڕیویەتی دەستبەجێ بیفرۆشێ) هەتا لە یەکتر جیادەبنەوە، جگە لە کڕین و فرۆشتنێ نەبێ مەرجی پەشیمان بوونەوەی تێدا بێت.

٤٤٧٨- « عَنْ يَزِيدِ بن عبد اللَّهِ عن عبدِ اللَّهِ بن دِينَارٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ: سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: كُلُّ بَيِّعَيْنِ لَا بَيْعَ بَيْنَهُمَا حَتَّى يَتَفَرَّقَا إِلَّا بَيْعَ الْخِيَارِ»[٢].

واتە: یەزیدی کوڕی عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی دینار، لە ئیبنو عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) ئەو بیستی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: (کڕیارو فرۆشیار هیچ فرۆشتنێک لە نێوانیاندا نیە (واتە: نابێ هەر لەو شوێنەی کە کڕیویەتی دەستبەجێ بیفرۆشێ) هەتا لە یەکتر جیادەبنەوە، جگە لە کڕین و فرۆشتنێ نەبێ مەرجی پەشیمان بوونەوەی تێدا بێت.

٤٤٧٩- « عَنْ شُعْبَةَ قال حدثنا عبدُ اللَّهِ بن دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كُلُّ بَيِّعَيْنِ فَلَا بَيْعَ بَيْنَهُمَا حَتَّى يَتَفَرَّقَا إِلَّا بَيْعَ الْخِيَارِ»[٣].

واتە: شوعبە دەڵێ: لە عەبدوڵڵای کوڕی دینار، لە ئیبنو عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کڕیارو فرۆشیار هیچ فرۆشتنێک لە نێوانیاندا نیە (واتە: نابێ هەر لەو شوێنەی کە کڕیویەتی دەستبەجێ بیفرۆشێ)

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.



هەتا لە یەکتر جیادەبنەوە، جگە لە کڕین و فرۆشتنێ نەبێ مەرجی پەشیمان بوونەوەی تێدا بێت.

**٤٤٨٠-** «عَنْ سفيان عن عبدِ اللَّهِ بن دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا أَوْ يَكُونَ بَيْعُهُمَا عَنْ خِيَارٍ»[١].

**واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی دینار، لە ئیبنو عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) ئەو بیستی پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: کڕیارو فرۆشیار سەرپشکن هەتا لە یەکتر جیادەبنەوە، (واتە: کڕیارو فرۆشیار بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە لەو ماوەی کە لەیەکتر جیانەبووبنەوە) یان کڕین و فرۆشتنەکەیان ئارەزوومەندانە دەبێت.**

**٤٤٨١-** «عَنِ الْحَسَنِ، عَنْ سَمُرَةَ ﷺ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ حَتَّى يَتَفَرَّقَا، أَوْ يَأْخُذَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِنَ الْبَيْعِ مَا هَوِيَ، وَيَتَخَايَرَانِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ»[٢].

**واتە: حەسەن دەگێڕێتەوە، لە سەمورەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کڕیارو فرۆشیار سەرپشکن هەتا لە یەکتر جیادەبنەوە،(واتە: کڕیارو فرۆشیار بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە لەو ماوەی کە لە یەکتر جیا نەبووبنەوە) یان هەریەکەیان ئەوەی پێی خۆشە لە مامەڵەکە وەریدەگرێ، وە سێجار یەکتر سەرپشک دەکەن.**

**٤٤٨٢-** «عَنِ الْحَسَنِ، عَنْ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا، وَيَأْخُذْ أَحَدُهُمَا مَا رَضِيَ مِنْ صَاحِبِهِ أَوْ هَوِيَ»[٣].

**واتە: حەسەن دەگێڕێتەوە، لە سەمورەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کڕیارو فرۆشیار سەرپشکن هەتا لە یەکتر جیادەبنەوە، (واتە: کڕیارو فرۆشیار بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە لەو ماوەی کە لە یەکتر جیا نەبووبنەوە) وە یەکێکیان ئەوەی پێی ڕازیە یان پێی خۆشە وەریدەگرێ لە هاوەڵەکەی.**

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف. أخرجه إبن ماجه: ٢١٨٣.

(٣) ضعيف.




## واجب بوونی مامەڵە بە پەشیمانی بۆ کڕیارو فرۆشیار پێش جیابوونەوەیان بە جەستەیان

**٤٤٨٣-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: الْمُتَبَايِعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا، إِلَّا أَنْ يَكُونَ صَفْقَةَ خِيَارٍ، وَلَا يَحِلُّ لَهُ أَنْ يُفَارِقَ صَاحِبَهُ خَشْيَةَ أَنْ يَسْتَقِيلَهُ»[١].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیرەیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کڕیارو فرۆشیار سەرپشکن مادام لەیەک جیانەبووبێتنەوە، (واتە: کڕیارو فرۆشیار بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە لەو ماوەی کە لەیەکتر جیانەبووبنەوە) مەگەر کڕیارو فرۆشیار یەکێکیان یان هەردووکیان مەرجی پەشیمانی دابنێن، دروست نیە بۆ هەریەکێک لە کڕیارو فرۆشیار بە جەستە لە هاوەڵەکەی جیا ببێتەوە لە ترسی ئەوەی پەشیمان ببێتەوە.

## فێڵ کردن و هەڵخەڵەتاندن لە کڕین و فرۆشتندا

**٤٤٨٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً ذَكَرَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ يُخْدَعُ فِي الْبَيْعِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا بِعْتَ فَقُلْ: لَا خِلَابَةَ، فَكَانَ الرَّجُلُ إِذَا بَاعَ يَقُولُ: لَا خِلَابَةَ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک باسی ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە لە کڕین و فرۆشتندا دەخەڵەتێ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەگەر مامەڵەت کرد بڵێ: بەبێ فڕو فێڵ، جا ئەو پیاوە ئەگەر مامەڵەی بکردایە دەیوت: بەبێ فڕوفێڵ.

**٤٤٨٥-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً كَانَ فِي عُقْدَتِهِ ضَعْفٌ كَانَ يُبَايِعُ، وَأَنَّ أَهْلَهُ أَتَوْا النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، احْجُرْ عَلَيْهِ، فَدَعَاهُ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ فَنَهَاهُ، فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، إِنِّي لَا أَصْبِرُ عَنِ الْبَيْعِ، قَالَ: إِذَا بِعْتَ، فَقُلْ: لَا خِلَابَةَ»[٣].

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٤٥٦، والترمذي: ١٢٤٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١١٧ و ٢٤٠٧ و ٢٤١٤ و ٦٩٦٤، ومسلم: ١٥٣٣، وأبو داود: ٣٥٠٠.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٠١، والترمذي: ١٢٥٠، وإبن ماجه: ٢٣٥٤.




واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک لە بەڕێوەبردنی کارو باری خۆیدا لاواز بوو، کڕین و فرۆشتنی دەکرد، کەسوکارەکەی هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ڕێگری لێ بکە، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد و ڕێگری لێکرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من خۆم ڕاناگرم کڕین و فرۆشتن نەکەم، فەرمووی: ئەگەر مامەڵەت کرد بڵێ: بەبێ فڕو فێڵ.

## بەستنی گوانی مەڕو ماڵات

**٤٤٨٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا بَاعَ أَحَدُكُمُ الشَّاةَ أَوِ اللَّقْحَةَ فَلَا يُحَفِّلْهَا»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە مەڕێک یان وشترێکی شیر دەری فرۆشت با گوانی نەبەستێ (بۆ ئەوەی لە کاتی فرۆشتن وا بێتە پێش چاو شیری زۆرە).

## قەدەغەکردنی (الْمُصَرَّاة)

تێبینی: (الْمُصَرَّاة) بریتیە لە بەستنەوەی گوانی وشتر یان مەڕو ماڵات، دوو ڕۆژ و سێ ڕۆژ شیرەکەی تیادا بهێڵێتەوە تا شیری تێدا کۆببێتەوە بۆ ئەوەی لای کڕیارەکانی نرخی زیاد بکات، لەبەر زۆری شیرەکەی

**٤٤٨٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا تَلَقَّوْا الرُّكْبَانَ لِلْبَيْعِ، وَلَا تُصَرُّوا الْإِبِلَ وَالْغَنَمَ، مَنِ ابْتَاعَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئاً فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ، فَإِنْ شَاءَ أَمْسَكَهَا، وَإِنْ شَاءَ أَنْ يَرُدَّهَا رَدَّهَا، وَمَعَهَا صَاعُ تَمْرٍ»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەرەو پیری قافڵەو کاروانی مەچن (تا لە دەرەوەی شار مامەڵەیان لەگەڵ بکەن، لە کاتێکدا ئەوان بێئاگان لە نرخی بازار) وە شیر لە گوانی وشترو مەڕو ماڵات مەبەستن (بۆ ئەوەی شیری زۆری تێبێت بۆ کاتی فرۆشتن) هەر کەس شتێک لەوەی کڕی دوو ڕێگای لەبەردەمدایە دوای ئەوەی کە دۆشی، ئەگەر ویستی ئەوە با بیهێڵێتەوە، وە ئەگەر

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٤٨ و ٢١٥٠، ومسلم: ١٥١٥/١١، وأبو داود: ٣٤٤٣.





**ویستی با بیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی، لەگەڵ صاعێک خورمادا (لەبری ئەو شیرەی دۆشیویەتی).**

**٤٤٨٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنِ اشْتَرَى مُصَرَّاةً، فَإِنْ رَضِيَهَا إِذَا حَلَبَهَا فَلْيُمْسِكْهَا، وَإِنْ كَرِهَهَا فَلْيَرُدَّهَا، وَمَعَهَا صَاعٌ مِنْ تَمْرٍ»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس ئاژەڵێکی کڕی شیرەکەی نەدۆشرابوو، کاتێ کە دۆشی، ئەگەر پێی ڕازی بوو، ئەوە با لای خۆی بیهێڵێتەوە، وە ئەگەر پێی باش نەبوو با بیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی، لەگەڵ صاعێک خورمادا، (لە بری ئەو شیرەی دۆشیویەتی).**

**٤٤٨٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ ﷺ: مَنِ ابْتَاعَ مُحَفَّلَةً، أَوْ مُصَرَّاةً فَهُوَ بِالْخِيَارِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، إِنْ شَاءَ أَنْ يُمْسِكَهَا أَمْسَكَهَا، وَإِنْ شَاءَ أَنْ يَرُدَّهَا رَدَّهَا وَصَاعاً مِنْ تَمْرٍ لَا سَمْرَاءَ»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئەبولقاسم ﷺ وتوویەتی: هەرکەس ئاژەڵێکی کڕی شیرەکەی نەدۆشرابوو، ئەوە سێ ڕۆژ مامەڵە پەشیمانی بۆ هەیە، ئەگەر ویستی بیهێڵێتەوە با بیهێڵێتەوە، وە ئەگەر ویستی با بیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی، لەگەڵ صاعێک خورمادا نەک جۆ، (لەبری ئەو شیرەی دۆشیویەتی)**

## قازانج بە زامنی و گرنتی

**٤٤٩٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَنَّ الْخَرَاجَ بِالضَّمَانِ»[3].

**عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دادوەری کرد بەوەی بەڕاستی قازانج بە زامنیە.**

**تێبینی: بۆ نموونە: قازانجی ئاژەڵ شیرەکەیەتی، خوریەکەیەتی. فرۆشیار پێویستە لەسەری گرنتی فرۆشراوەکە بدات لەو کاتەی فرۆشتویەتی.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٥١، ومسلم: ٢٣ و ١٥٢٤/٢٨، وأبو داود: ٣٤٤٤ و ٣٤٤٥، والترمذي: ١٢٥١ و ١٢٥٢، وإبن ماجه: ٢٢٣٩.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٥٠٨ و ٣٥٠٩ و ٣٥١٠، والترمذي: ١٢٨٥ و ١٢٨٦، وإبن ماجه: ٢٢٤٣.




یاخود کەسێک سیارەیەکی کڕییە بە دە ملیۆن دینار، بەو مەرجەی مەکینەکەی نەکرابێتەوە، بۆ ماوە یەک هەفتە لای مایەوە، هەموو ڕۆژێک دە هەزار دیناری بۆ دەردەهێنا، لە یەک هەفتەدا حەفتا هەزاری دەرهێنا، لە دوای هەفتەکە دەرکەوت سیارەکە مەکینەکەی کراوەتەوە، ویستی بیگەڕێنێتەوە، کە گەڕاندیەوە بۆ فرۆشیار، ئایا حەفتا هەزارەکەیش لەگەڵیدا دەگەڕێنێتەوە؟ نەخێر، نایگەڕێنێتەوە، بۆچی؟ چونکە ئەگەر لە ماوەی ئەو حەوت ڕۆژە سیارەکە لەناو بچوایە فرۆشیارەکە نەیدەبژارد، کەواتە: کڕیار دەتوانێ سەیارەکە بگەڕێنێتەوە.

## کەسێکی شاری کەلوپەل بۆ گوند نشینک بفرۆشێ

**٤٤٩١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ التَّلَقِّي، وَأَنْ يَبِيعَ مُهَاجِرٌ لِلْأَعْرَابِيِّ، وَعَنِ التَّصْرِيَةِ، وَالنَّجْشِ، وَأَنْ يَسْتَامَ الرَّجُلُ عَلَى سَوْمِ أَخِيهِ، وَأَنْ تَسْأَلَ الْمَرْأَةُ طَلَاقَ أُخْتِهَا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە: ڕۆیشتن بەرەو پیری قافڵەو کاروانی (تا لە دەرەوەی شار مامەڵەیان لەگەڵ بکەن و ئەوان بێئاگابن لە نرخی بازار)، وە لە شار نشینێک (وەکو دەلاڵ) کەلوپەل بۆ گوند نشینێک بفرۆشێت، وە لە بەستنی گوانی مەڕو ماڵات بە مەبەستی هێشتنەوەی شیرەکەی، وە لە زەمکاری کردن (واتە: کەسێکی تر بەبێ ئەوەی نیازی کڕینی هەبێت نرخی ماڵەکە بەرزبکاتەوە) وەلە مامەڵە کردن بەسەر مامەڵەی براکەیدا (واتە: ئەگەر خاوەن ماڵ و کڕیار ڕێککەوتن لەسەر مامەڵەکەو گرێبەستیان نەکردبوو دروستە نیە بۆ کەسێکی تر بڵێ من دەیکڕم و مامەڵەی بکات) وە لە ئافرەت داوای تەڵاقدانی خوشکەکەی بکات بۆ ئەوەی خۆی بچێتە جێگای.

## شارنشین کەلوپەل بۆ گوندنشین بفرۆشێت

**٤٤٩٢-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى أَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ، وَإِنْ كَانَ أَبَاهُ أَوْ أَخَاهُ»[٢].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە شار نشین (وەکو دەلاڵ) شتو وەمەک بۆ گوندنشین بفرۆشێت، ئەگەرچی باوکی یان برای بێت. (بۆ ئەوەی کڕیار بەهەرزانتر دەستی بکەوێت)

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٢٧، ومسلم: ١٥١٥/١٢.

(٢) صحيح.




**٤٤٩٣-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: نُهِينَا أَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ، وَإِنْ كَانَ أَخَاهُ أَوْ أَبَاهُ»[١].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالک ﷺ دەڵێ: قەدەغەمان لێکراوە شار نشین (وەکو دەلاڵ) شتو ومەک بۆ گوندنشین بفرۆشێت، ئەگەرچی برا، یان باوک بێت.**

**٤٤٩٤-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: نُهِينَا أَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: قەدەغەمان لێکراوە شار نشین (وەکو دەلاڵ) شتو ومەک بۆ گوندنشین بفرۆشێت.**

**٤٤٩٥-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يَبِيعُ حَاضِرٌ لِبَادٍ، دَعُوا النَّاسَ يَرْزُقُ اللَّهُ بَعْضَهُمْ مِنْ بَعْضٍ»[٣].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با شار نشین (وەکو دەلاڵ) شتو ومەک بۆ گوندنشین نەفرۆشێت، واز لە خەڵکی بهێنن خوا ڕزق و ڕۆزی هەندێکیان بە هۆی هەندێکی دیکەیانەوە دەدات.**

**٤٤٩٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا تَلَقَّوْا الرُّكْبَانَ لِلْبَيْعِ، وَلَا يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وَلَا تَنَاجَشُوا، وَلَا يَبِيعُ حَاضِرٌ لِبَادٍ»[٤].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕووبەڕووی کاروانی و قافڵە مەڕۆن (پێش ئەوەی بێنە ناو بازاڕەوە شتومەکەکانیان لێ بکڕن)، وە با هەندێکتان مامەڵە لەسەر مامەڵەی هەندێکتان نەکات، زەمکاری مەکەن (واتە: کەسێکی تر بەبێ ئەوەی نیازی کڕینی هەبێت نرخی ماڵەکە بەرزبکاتەوە)، وە با شار نشینێک (وەکو دەلاڵ) شتو ومەک بۆ گوندنشینێک نەفرۆشێت. (لەبەر ئەوەی ئەو کەسانەی کە دەیکڕن خێریان بۆ بمێنێتەوە).**

**٤٤٩٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ: نَهَى عَنِ النَّجْشِ وَالتَّلَقِّي، وَأَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ»[٥].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٦١، ومسلم: ٢١ و ١٥٢٣/٢٢، وأبو داود: ٣٤٤٠.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٢٢، وأبو داود: ٣٤٤٢، والترمذي: ١٢٢٣، وإبن ماجه: ٢١٧٦.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح.




**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە: زەمکاری کردن و ڕۆیشتن بەرەوڕووی کاروانی و قافڵە پێش ئەوەی بێتە ناو بازاڕەوە، وە شارنشینێک (وەکو دەلاڵ) شتو مەک بۆ گوندنشینێک بفرۆشێت.**

## ڕۆیشتن بەرەوڕووی کاروانی و قافڵە پێش ئەوەی بێنە ناو بازاڕەوە شتومەکەکانیان لێ بکڕن

**٤٤٩٨-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ التَّلَقِّي»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە ڕۆیشتن بەرەوڕووی کاروانی و قافڵە پێش ئەوەی بێنە ناو بازاڕەوە شتومەکەکانیان لێ بکڕن.**

**٤٤٩٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ تَلَقِّي الْجَلْبِ حَتَّى يَدْخُلَ بِهَا السُّوقِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەوڕووی کاروانی و قافڵەی قەدەغەکردوە تا دەیباتە ناو بازاڕەوە.**

**٤٥٠٠-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُتَلَقَّى الرُّكْبَانُ، وَأَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ، قُلْتُ: لِابْنِ عَبَّاسٍ مَا قَوْلُهُ حَاضِرٌ لِبَادٍ؟ قَالَ: لَا يَكُونُ لَهُ سِمْسَارٌ»[٣].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەوڕووی کاروانی و قافڵەی قەدەغەکردوە، وە شار نشینێک (وەکو دەلاڵ) شتو مەک بۆ گوند نشینێک بفرۆشێت، بە ئیبنو عەبباسم وت: مەبەست چیە لەوەی با شار نشینێک (وەکو دەلاڵ) شتو مەک بۆ گوندنشینێک نە فرۆشێت، وتی: تا نەبێت بە دەلاڵ بۆی.**

**٤٥٠١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَلَقَّوْا الْجَلْبَ فَمَنْ تَلَقَّاهُ فَاشْتَرَى مِنْهُ، فَإِذَا أَتَى سَيِّدُهُ السُّوقَ فَهُوَ بِالْخِيَارِ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٦٥، ومسلم: ١٥١٧، وأبو داود: ٣٤٣٦، وإبن ماجه: ٢١٧١ و ٢١٧٣ و ٢١٧٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٥٨ و ٢١٦٣ و ٢٢٧٤، ومسلم: ١٥٢١، وأبو داود: ٣٤٣٩، وإبن ماجه: ٢١٧٧.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦ و ١٥١٩/١٧، وأبو داود: ٣٤٣٧، والترمذي: ١٢٢١، وإبن ماجه: ٢١٧٨.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەرەوڕووی کاروانی و قافڵە مەڕۆن بۆ ئەوەی لە ڕێگا شتەکەیان لێ بکڕن، هەرکەس بەرەوڕووی برِواو شتێکی لێ بکڕێ، ئەگەر خاوەنەکەی هاتە ناو بازاڕەوە (بینی فێڵی لێکراوە و نرخەکە جیاوازە) ئەوە سەرپشکە لە پەشیمان بوونەوە.

## مامەڵە لەسەر مامەڵەی براکەی (بۆ ئەوەی خۆی بیکڕێ)

**٤٥٠٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يَبِيعَنَّ حَاضِرٌ لِبَادٍ، وَلَا تَنَاجَشُوا، وَلَا يُسَاوِمِ الرَّجُلُ عَلَى سَوْمِ أَخِيهِ، وَلَا يَخْطُبْ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ، وَلَا تَسْأَلِ الْمَرْأَةُ طَلَاقَ أُخْتِهَا لِتَكْتَفِئَ مَا فِي إِنَائِهَا وَلِتُنْكَحَ، فَإِنَّمَا لَهَا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَهَا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (با شار نشینێک (وەکو دەلاڵ) شتو ومەک بۆ گوند نشینێک نەفرۆشێت)، (لەبەر ئەوەی ئەو کەسانەی کە دەیکڕن هەرزانتر دەستیان بکەوێت) زەمکاری مەکەن (واتە: کەسێکی تر بەبێ ئەوەی نیازی کڕینی هەبێت نرخی ماڵەکە بەرزبکاتەوە)، با هیچ کەسێک مامەڵە لەسەر مامەڵەی براکەی نەکات، (واتە: ئەگەر خاوەن ماڵ و کڕیار ڕیککەوتن لەسەر مامەڵەکە و گرێبەستیان نەکردبوو دروستە نیە بۆ کەسێکی تر بڵێ من دەیکڕم و مامەڵەی بکات) وە با یەکێک لە ئێوە خوازبێنی بەسەر خوازبێنی براکەیدا نەکات، وە با هیچ ئافرەتێک داوای تەڵاقدانی خوشکەکەی نەکات بۆ ئەوەی چی لە قاپەکەیایەتی قەڵپی بکاتەوەو شوو بکات (بە پیاوەکەی ئەو، واتە: با داوای تەڵاقی هەوێکەی نەکات، چونکە خوشک لێرەدا مەبەست پێی خوشکی دینییە بۆ ئەوە لە ناز نیعمەتی مێردی بکات) ئەو ئافرەتە ئەوەی خوا بۆی داناوە هەر ئەوەیە.

## مامەڵەکردنی پیاوێک بەسەر مامەڵەی براکەیدا

**٤٥٠٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: لَا يَبِيعُ أَحَدُكُمْ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: یەکێکتان مامەڵە بەسەر مامەڵەی براکەیدا نەکات.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**٤٥٠٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَبِيعُ الرَّجُلُ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ حَتَّى يَبْتَاعَ أَوْ يَذَرَ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با پیاوێک مامەڵە بەسەر مامەڵەی براکەیدا نەکات، تا دەیکڕێ یان وازی لێدێنێ.**

## زەمکاری کردن (واتە: کەسێکی تر بێ ئەوەی نیازی کڕینی هەبێ نرخی شتەکە بەرزبکاتەوە)

**٤٥٠٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ النَّجْشِ»[٢].

**ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ زەمکاری قەدەغەکرد.**

**٤٥٠٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا يَبِيعُ الرَّجُلُ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ، وَلَا يَبِيعُ حَاضِرٌ لِبَادٍ، وَلَا تَنَاجَشُوا، وَلَا يَزِيدُ الرَّجُلُ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ، وَلَا تَسْأَلِ الْمَرْأَةُ طَلَاقَ الْأُخْرَى لِتَكْتَفِئَ مَا فِي إِنَائِهَا»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: با پیاوێک مامەڵە لەسەر مامەڵەی براکەی نەکات، با شارنشینێک (وەکو دەڵاڵ) شتو مەک بۆ گوند نشینێک نەفرۆشێت، (لەبەر ئەوەی ئەو کەسانەی کە دەیکڕن خێریان بۆ بمێنێتەوە) زەمکاری مەکەن، (واتە: کەسێکی تر بێ ئەوەی نیازی کڕینی هەبێ نرخی ماڵەکە بەرزبکاتەوە)، وە با یەکێکتان موزیادە نەکات بەسەر کڕینی براکەی بۆ ئەوەی خۆی بیکڕێ، وە با هیچ ئافرەتێک داوای تەڵاقدانی خوشکەکەی نەکات بۆ ئەوەی چی لە قاپەکەیایەتی قەڵپی بکاتەوە، (واتە: با داوای تەڵاقی هەوێکەی نەکات، چونکە خوشک لێرەدا مەبەست پێی خوشکی دینییە بۆ ئەوە لە نازو نیعمەتی مێردی بکات).**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**٤٥٠٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا يَبِيعُ حَاضِرٌ لِبَادٍ، وَلَا تَنَاجَشُوا، وَلَا يَزِيدُ الرَّجُلُ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ، وَلَا تَسْأَلِ الْمَرْأَةُ طَلَاقَ أُخْتِهَا لِتَسْتَكْفِئَ بِهِ مَا فِي صَحْفَتِهَا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: با شار نشینێک (وەکو دەڵاڵ) شتو ومەک بۆ گوندنشینێک نەفرۆشێت)، (لەبەر ئەوەی ئەو کەسانەی کە دەیکڕن هەرزانتر دەستیان بکەوێت) زەمکاری مەکەن (واتە: کەسێکی تر بێ ئەوەی نیازی کڕینی هەبێت نرخی ماڵەکە بەرزبکاتەوە)، وە با یەکێکتان موزیادە نەکات بەسەر کڕینی براکەی بۆ ئەوەی خۆی بیکڕێ، وە با هیچ ئافرەتێک داوای تەڵاقدانی ئافرەتێکی تر نەکات بۆ ئەوەی خۆی بچێتە جێگای و خێرو بێری بۆ خۆی بەرێت.

## کڕین و فرۆشتن بەوەی کێ زیاتر دەدات، (واتە: موزایەدە)

**٤٥٠٨-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَاعَ قَدَحاً وَحِلْساً فِيمَنْ يَزِيدُ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قاپێک و ڕاخەرێکی سەر وشتری فرۆشت بە موزایەدە.

## کڕین و فرۆشتنی (الْمُلَامَسَةِ)

تێبینی: (الْمُلَامَسَة) واتە: مامەڵەیەکە تەنها بە دەست لێدان دادەمەزرێ بەبێ بینینی شتەکە.

**٤٥٠٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُلَامَسَةِ وَالْمُنَابَذَةِ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەی (الْمُلَامَسَةِ) و (وَالْمُنَابَذَةِ)ی قەدەغەکردوە.

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٦٤١، والترمذي: ١٢١٨، وإبن ماجه: ٢١٩٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٦٨ و ٢١٤٦ و ٥٨٢١، ومسلم: ١١٥١، والترمذي: ١٣١٠، وإبن ماجه: ٢١٦٩.

## لێکدانەوەو شیکردنەوەی کڕین و فرۆشتنی (الْمُلَامَسَة)

**٤٥١٠-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُلَامَسَةِ: لَمْسِ الثَّوْبِ لَا يَنْظُرُ إِلَيْهِ، وَعَنِ الْمُنَابَذَةِ: وَهِيَ طَرْحُ الرَّجُلِ ثَوْبَهُ إِلَى الرَّجُلِ بِالْبَيْعِ، قَبْلَ أَنْ يُقَلِّبَهُ أَوْ يَنْظُرَ إِلَيْهِ»[١].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەی (الْمُلَامَسَة) قەدەغەکرد، (الْمُلَامَسَة) ئەوەیە: بە دەست لێدانی ببێتەماڵی بەبێ ئەوەی سەیری بکات، وە مامەڵەی (الْمُنَابَذَة) قەدەغەکرد، وە (الْمُنَابَذَة): بریتیە لەوەی پیاوێک جلەکەی هەڵدا بۆ پیاوێکی تر بە مەبەستی فرۆشتن، پێش ئەوەی ئەم دیوو ئەو دیوی بکات یاخود سەیری بکات.**

## کڕین و فرۆشتنی (الْمُنَابَذَة)

**تێبینی: (الْمُنَابَذَة) بریتیە لەوەی پیاوێک جلەکەی هەڵدا بۆ پیاوێکی تر بە مەبەستی فرۆشتن، پێش ئەوەی ئەم دیوو ئەو دیوی بکات، یاخود سەیری بکات.**

**٤٥١١-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمُلَامَسَةِ وَالْمُنَابَذَةِ فِي الْبَيْعِ»[٢].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەی (الْمُلَامَسَة)و (الْمُنَابَذَة) قەدەغەکرد.**

**٤٥١٢-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعَتَيْنِ: عَنِ الْمُلَامَسَةِ وَالْمُنَابَذَةِ»[٣].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو مامەڵەی قەدەغەکرد؛ (الْمُلَامَسَة) و (الْمُنَابَذَة).**

---

**(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٤٤ و ٢١٤٧ و ٥٨٢٠ و ٦٢٨٤، ومسلم: ١٥١٢، وأبو داود: ٣٣٧ و ٣٣٧٨ و ٣٣٧٩، وإبن ماجه: ٢١٧٠ و ٣٥٥٩.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) صحيح.**




## لێکدانەوەو شیکردنەوەی (الْمُنَابَذَة)

**٤٥١٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمُلَامَسَةِ، وَالْمُنَابَذَةِ، وَالْمُلَامَسَةُ: أَنْ يَتَبَايَعَ الرَّجُلَانِ بِالثَّوْبَيْنِ تَحْتَ اللَّيْلِ، يَلْمِسُ كُلُّ رَجُلٍ مِنْهُمَا ثَوْبَ صَاحِبِهِ بِيَدِهِ، وَالْمُنَابَذَةُ: أَنْ يَنْبِذَ الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ الثَّوْبَ، وَيَنْبِذَ الْآخَرُ إِلَيْهِ الثَّوْبَ، فَيَتَبَايَعَا عَلَى ذَلِكَ»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەی (الْمُلَامَسَة) و (الْمُنَابَذَة) ی قەدەغەکرد، وە (الْمُلَامَسَة) ئەوەیە: دوو کەس کڕین و فرۆشتن بکەن بە دوو جلەوە لە تاریکیدا هەریەکەیان دەست بدات لە جلی ئەوی تر. وە (الْمُنَابَذَة): بریتیە لەوەی پیاوێک جلەکەی هەڵدا بۆ پیاوێکی تر، پیاوەکەی تریش جلەکە بۆ ئەو فرێدەدا، هەردووکیان لەسەر ئەوە مامەڵە دەکەن.**

**٤٥١٤-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمُلَامَسَةِ وَالْمُلَامَسَةُ: لَمْسُ الثَّوْبِ لَا يَنْظُرُ إِلَيْهِ، وَعَنِ الْمُنَابَذَةِ، وَالْمُنَابَذَةُ: طَرْحُ الرَّجُلِ ثَوْبَهُ إِلَى الرَّجُلِ قَبْلَ أَنْ يُقَلِّبَهُ»[2].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەی (الْمُلَامَسَة) ی قەدەغە کرد، (الْمُلَامَسَة) ئەوەیە: پیاوێک دەست دەدا لە کراسێک و دەبێتە کڕیاری بەبێ ئەوەی تەماشای بکات، وە (الْمُنَابَذَة)شی قەدەغە کرد، (الْمُنَابَذَة)ش بریتیە لەوەی پیاوێک جلەکەی فڕێ دەدا بۆ پیاوێکی تر پێش ئەوەی ئەم دیو ئەو دیوی بکات.**

**٤٥١٥-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ لُبْسَتَيْنِ، وَعَنْ بَيْعَتَيْنِ، أَمَّا الْبَيْعَتَانِ: فَالْمُلَامَسَةُ وَالْمُنَابَذَةُ، وَالْمُنَابَذَةُ أَنْ يَقُولَ: إِذَا نَبَذْتُ هَذَا الثَّوْبَ فَقَدْ وَجَبَ يَعْنِي الْبَيْعَ، وَالْمُلَامَسَةُ: أَنْ يَمَسَّهُ بِيَدِهِ، وَلَا يَنْشُرَهُ، وَلَا يُقَلِّبَهُ إِذَا مَسَّهُ فَقَدْ وَجَبَ الْبَيْعُ»[3].

**واتە: : ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشینی دوو شێوە جلی قەدەغە کردوە، (یەکەمینیان هەموو جەستە دابپۆشی و شوێنێک نەبێ باڵەکانی لێوە دەربکات، دووەمینیان لەبەرکردنی جلێکە لە کاتی دانیشتن یان پاڵدانەوە**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




عەوڕەتی دەربکەوێ)، هەروەها دوو مامەڵەکردنیش، جا دوو مامەڵەکە بریتین لە (الْمُلَامَسَة) و (الْمُنَابَذَة)، (الْمُنَابَذَة) ئەوەیە: کەسێک بڵێ: ئەگەر ئەم جلەم فڕێدا ئەوە مامەڵەکە دادەمەزرێ، وە (الْمُلَامَسَة)ش ئەوەیە: تەنها دەستی لێدەدا، ئەم دیو ئەو دیوی پێناکات، ئەگەر دەستی لێدا ئەوە مامەڵەکە دادەمەزرێ.

**٤٥١٦-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ لُبْسَتَيْنِ، وَنَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعَتَيْنِ: عَنِ الْمُنَابَذَةِ، وَالْمُلَامَسَةِ، وَهِيَ بُيُوعٌ، كَانُوا يَتَبَايَعُونَ بِهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ»[1].

**واتە: سالم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشینی دوو شێوە جلی قەدەغەکردوە، (یەکەمینیان هەموو جەستە دابپۆشی و شوێنێک نەبێ باڵەکانی لێوە دەربکات، دووەمینیان لەبەرکردنی جلێکە لە کاتی دانیشتن یان پاڵدانەوە عەوڕەتی دەربکەوێ) هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دوو مامەڵەکردنیشی لێ قەدەغەکردین: (الْمُنَابَذَة) و (الْمُلَامَسَة)، کە دوو مامەڵەن لە سەردەمی نەفامی دەیانکرد.**

**٤٥١٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ: نَهَى عَنْ بَيْعَتَيْنِ، أَمَّا الْبَيْعَتَانِ: فَالْمُنَابَذَةُ وَالْمُلَامَسَةُ، وَزَعَمَ أَنَّ الْمُلَامَسَةَ أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: أَبِيعُكَ ثَوْبِي بِثَوْبِكَ، وَلَا يَنْظُرُ وَاحِدٌ مِنْهُمَا إِلَى ثَوْبِ الْآخَرِ، وَلَكِنْ يَلْمِسُهُ لَمْساً، وَأَمَّا الْمُنَابَذَةُ أَنْ يَقُولَ: أَنْبِذُ مَا مَعِي، وَتَنْبِذُ مَا مَعَكَ لِيَشْتَرِيَ أَحَدُهُمَا مِنَ الْآخَرِ، وَلَا يَدْرِي كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا كَمْ مَعَ الْآخَرِ، وَنَحْواً مِنْ هَذَا الْوَصْفِ»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دوو مامەڵەی لێ قەدەغەکردین: ئەو دووانەش بریتین لە: (الْمُنَابَذَة) و (الْمُلَامَسَة)، جا دەیوت (الْمُلَامَسَة) ئەوەیە: پیاوێک بە پیاوێک بڵێ: جلەکانم پێت دەفرۆشم بە جلەکانت، هیچ کامەیان بۆی نیە تەماشای جلی ئەوی تر بکات، بەڵکو تەنها دەتوانێ دەستی لێبدات، بەڵام (الْمُنَابَذَة) ئەوەیە بڵێ: ئەوەی لە لامە فڕێی دەدەم، تۆش ئەوەی لە لاتە فڕێی بدە، هەریەکەیان هی کەسی بەرانبەر دەبات، بەبێ ئەوەی هیچ کامیان بزانن چەندی تێدایە، وەکو شتێکی لەم جۆرە.**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٤ و ٥٨١٩، ومسلم: ١٥١١، وأبو داود: ٤٠٨٠، والترمذي: ١٢٢٤ و ١٧٥٨، وإبن ماجه: ١٢٤٨ و ٢١٦٩ و ٣٥٦٠.




## کڕین و فرۆشتن بە (الْحَصَاة)

تێبینی: (الْحَصَاة): بریتیە لەوەی بەرد فڕێ دەدات بۆ سەر کۆمەڵە شتێک کەوتە سەر هەرکامەیان ئەوە هی ئەوە.

**٤٥١٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الْحَصَاةِ، وَعَنْ بَيْعِ الْغَرَرِ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە مامەڵە کردنی (الْحَصَاة)، وە لە مامەڵە کردنی شتێکیش فریودان و هەڵخەڵەتاندنی تێدابێت.**

## فرۆشتنی بەروبووم پێش ئەوەی پێبگات

**٤٥١٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا تَبِيعُوا الثَّمَرَ حَتَّى يَبْدُوَ صَلَاحُهُ نَهَى الْبَائِعَ وَالْمُشْتَرِيَ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەروبووم مەفرۆشن تا تەواو پێ دەگات، قەدەغەی کرد لە فرۆشیارو کڕیار.**

**٤٥٢٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلَاحُهُ»[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە فرۆشتنی بەرووبووم تا تەواو پێدەگات.**

**٤٥٢١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَبِيعُوا الثَّمَرَ حَتَّى يَبْدُوَ صَلَاحُهُ، وَلَا تَبْتَاعُوا الثَّمَرَ بِالتَّمْرِ»[٤].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەروبووم مەفرۆشن تا تەواو پێدەگات، هەروەها بەروبوومی خورمای تەڕو تازە بە خورمای وشک مەدەن (وەک ترێ بە مێوژ یان خورمای تەڕ بە وشک).**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥١٣، وأبو داود: ٣٣٧٦، والترمذي: ١٢٣٠، وإبن ماجه: ٢١٩٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٨٦ و ٢١٩٤، ومسلم: ١٥٣٤، وأبو داود: ٣٣٦٧، وإبن ماجه: ٢٢١٤.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٦ و ١٥٣٨/٥٨، وإبن ماجه: ٢٢١٥.




**٤٥٢٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: لَا تَبِيعُوا الثَّمَرَ حَتَّى يَبْدُوَ صَلَاحُهُ»[١].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوماندا هەڵساو فەرمووی: بەروبووم مەفرۆشن تا تەواو پێ دەگات.**

**٤٥٢٣-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ: نَهَى عَنِ الْمُخَابَرَةِ، وَالْمُزَابَنَةِ، وَالْمُحَاقَلَةِ، وَأَنْ يُبَاعَ الثَّمَرُ حَتَّى يَبْدُوَ صَلَاحُهُ، وَأَنْ لَا يُبَاعَ إِلَّا بِالدَّنَانِيرِ وَالدَّرَاهِمِ، وَرَخَّصَ فِي الْعَرَايَا»[٢].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا دەگێڕێتەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێغەمبەر ﷺ (الْمُخَابَرَة) و (الْمُزَابَنَة) و (الْمُحَاقَلَة)ی قەدەغەکرد، وە فرۆشتنی بەروبووم پێش ئەوەی پێ بگات، هەروەها با هیچ نەفرۆشترێ تەنها بە دینارو درهەم نەبێت (چونکە ئاشنا بوون لای هەموو خەڵکی) وە ڕێگەیدا بە مامەڵە بە شێوەی عەرایا.**

**تێبینی: (الْمُخَابَرَة) واتە: کەسێک زەویەکی هەبێت بە کەسێکی تر بڵێت: بیکێڵەو تۆوی بکە، دوای بەشێکت دەدەمێ، ئەمە دروست نیە، لەوانەیە ئەو بەرهەمە نەبێت، بەڵام لە سەرەتاوە لە کێڵان و تۆو کردن و هەموو شتێکدا هاوبەش بن ئەوە دروستە.**

**وە (الْمُزَابَنَة): بریتیە لە فرۆشتنی ئەو خورما تەڕەی بەسەر دارخورماکەوەیە بە ئەوەندەو ئەوەندە باری خورمای وشک، ئەگەر زیاتر بوو بۆ من، وە ئەگەر کەمتر بوو ئەوە لەسەر خۆمە.**

**(الْمُحَاقَلَة): واتە: بریتیە لە فرۆشتنی گەنم بە گوڵەوە بە گەنمی ساغ و پاککراو، ئەمەش دروست نیە، لەوانەیە گەنمی ناو ئەو گوڵە پوکاوەو خراپ بێت.**

**٤٥٢٤-** «عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُخَابَرَةِ، وَالْمُزَابَنَةِ، وَالْمُحَاقَلَةِ، وَبَيْعِ الثَّمَرِ حَتَّى يُطْعَمَ إِلَّا الْعَرَايَا»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٨٧ و ٢١٨٩ و ٢١٩٦ و ٢٣٨١، ومسلم: ١٥٣٦، وأبو داود: ٣٣٧٣ و ٣٣٧٥ و ٣٤٠٤ و ٣٤٠٥، والترمذي: ١٢٩٠ و ١٣١٣، وإبن ماجه: ٢٢١٦ و ٢٢٦٦.

(٣) صحيح.




واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ (الْمُخَابَرَة) و (الْمُزَابَنَة) و (الْمُحَاقَلَة)ی قەدەغەکرد، وە فرۆشتنی بەروبووم تا بە کەڵک خواردن دێت جگە لە عەرایا نەبێت.

**٤٥٢٥-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ النَّخْلِ حَتَّى يُطْعَمَ»(١).

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد لە فرۆشتنی بەرووبووم تا بە کەڵک خواردن دێت.

## کڕینی بەروبووم پێش ئەوەی پێ بگات لەسەر ئەوەی بیبڕێ، وە وازی لێناهێنێ تا کاتی پێگەیشتی

**٤٥٢٦-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ حَتَّى تُزْهِيَ قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا تُزْهِيَ؟، قَالَ: حَتَّى تَحْمَرَّ، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَرَأَيْتَ إِنْ مَنَعَ اللَّهُ الثَّمَرَةَ، فَبِمَ يَأْخُذُ أَحَدُكُمْ مَالَ أَخِيهِ»(٢).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کڕینی بەروبوومی قەدەغەکرد تا پێدەگات، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، چۆن پێدەگات؟ فەرمووی: هەتا سور دەبێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا ئەگەر خوا بەروبوومەکە نەهێنێتە بەرهەم (واتە: تووشی ئافەتێکی بکات)، بە چی حەقێ یەکێک لە ئێوە مافی براکەی دەخوات.

## دانــانی (الْجَوَائِح)

تێبینی: (الْجَوَائِحِ) واتە: ئەو کەسەی کە ئافەت بەسەر بەروبوومەکەیدا دێت، ئەوەی لە توانایدا نەبوو لێی وەرناگیرێ، دەبێ چاوەڕوان بکرێ تا باری دارایی باش دەبێت.

**٤٥٢٧-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنْ بِعْتَ مِنْ أَخِيكَ ثَمَراً، فَأَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ، فَلَا يَحِلُّ لَكَ أَنْ تَأْخُذَ مِنْهُ شَيْئاً، بِمَ تَأْخُذُ مَالَ أَخِيكَ بِغَيْرِ حَقٍّ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٨٨ و ٢١٩٥ و ٢١٩٧ و ٢١٩٨ و ٢٢٠٨، ومسلم: ١٥ و ١٥٥٥/١٦.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٥٤، وأبو داود: ٣٤٧٠، وإبن ماجه: ٢٢١٩.




واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بەروبوومێکت فرۆشت بە براکەت، تووشی ئافەتێک بوو، ئەوە حەڵاڵ نیە بۆ تۆ هیچ لە بەرهەمی فرۆشراوەکە بخۆیت، بە چ حەقێک ماڵی براکەت دەخۆی بە ناحەق.

**٤٥٢٨-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ بَاعَ ثَمَراً فَأَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ، فَلَا يَأْخُذْ مِنْ أَخِيهِ، وَذَكَرَ شَيْئاً عَلَى مَا يَأْكُلُ أَحَدُكُمْ مَالَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ»[١].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس بەروبوومێک بفرۆشێت تووشی ئافەتێک ببێت، با هیچ لە براکەی وەرنەگرێ کە پێی فرۆشتووە، وە باسی شتێکی کرد بەچی حەقێک یەکێک لە ئێوە ماڵی برا مسوڵمانەکەی دەخوات.

**٤٥٢٩-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَضَعَ الْجَوَائِحَ»[٢].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ جەوائیحی دانا، (واتە: ئەو کەسەی کە ئافەت بەسەر بەروبوومەکەیدا دێت، ئەوەی لە توانایدا نەبوو لێی وەرناگیرێ، دەبێ چاوەڕوان بکرێ تا باری دارایی باش دەبێت).

**٤٥٣٠-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: أُصِيبَ رَجُلٌ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي ثِمَارٍ ابْتَاعَهَا، فَكَثُرَ دَيْنُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَصَدَّقُوا عَلَيْهِ فَتَصَدَّقَ النَّاسُ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ وَفَاءَ دَيْنِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: خُذُوا مَا وَجَدْتُمْ، وَلَيْسَ لَكُمْ إِلَّا ذَلِكَ»[٣].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بەروبوومێکی کڕیبوو هەمووی تیاچوو، قەرزێکی زۆر کەوتە سەری، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خێرو بەخششی بۆ کۆبکەنەوە، خەڵکەکەش بۆیان کۆکردەوە، ئەوەی کۆکرابوویەوە نەگەیشتە ئەو ئەندازەیەی قەرزەکەی پێ پڕبکاتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئەوەی لەبەر دەستدایە وەری بگرن جگە لەوە هیچی ترتان بۆ نیە).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٥٤، وأبو داود: ٣٤٧٠، وإبن ماجه: ٢٢١٩.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٥٤/١٧، وأبو داود: ٣٣٧٤.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٥٦/١٨، وأبو داود: ٣٤٦٩، والترمذي: ٦٥٥، وإبن ماجه: ٢٣٥٦.




## فرۆشتنی بەروبووم بۆ ماوەی چەند ساڵێک

**٤٥٣١-** «عَنْ جَابِرٍ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: نَهَى عَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ سِنِينَ»[1].

واتە: جابر  دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لە فرۆشتنی بەرووبووم بۆ ماوەی چەند ساڵێک (بۆ نموونە بڵێ: خورمای ئەو دارخورمایانە لە دوو ساڵی داهاتوو بۆ تۆیە بەو ئەوەندە پارەیە، ئەمە دروست نیە، چونکە لە ئێستادا شتێک بوونی نیە).

## فرۆشتنی بەروبوومی تەڕو تازە بە بەروبوومی وشک (وەک ڕوتاب بە قەسپ، یان ترێ بە مێوژ)

**٤٥٣٢-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ بِالتَّمْرِ»[2].

واتە: سالم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ، پێغەمبەر ﷺ فرۆشتنی خورمای تەڕو تازە بە وشک.

«عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَخَّصَ فِي الْعَرَايَا»[3].

واتە: زەیدی کوڕی ثابت  دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوە بە عەرایا.

تێبینی: (الْعَرَايَا): واتە: کڕینی خورمای تەڕ بە خورمای وشک بە خەملاندن، جا ئەم ئاڵوگۆڕە زۆرینەی زانایان دەڵێن: تایبەتە بە خورماوە، چونکە جاران لە مەدینە دەکرا، بەڵام کۆمەڵێک لە زانایان بە ئیبنو تەیمیەشەوە دەڵێن: خورما میوەی مەدینەیە، وە بۆ هەر شارێک میوەیەکی تایبەت بە خۆیان هەیە، بۆیە ڕێگەدانەکە گشتییە، واتە: هەموو شارەکان دەتوانن لە میوەی سەرەکی خۆیاندا بیکەن، بەڵام بە چەند مەرجێک کە ئەو مەرجانە بۆ خورماشە:

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٤٣، وأبو داود: ٣٣٧٤ مطولًا، وإبن ماجه: ٢٢١٨.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

١- دەبێت پێویستی بە خورمای تەڕ هەبێ.

٢- دەبێت پارەی پێ نەبێ.

٣- دەبێت بیخەمڵێنێت بەرانبەر خورما وشکەکە.

٤- دەبێت لە یەکتری وەربگرن دەست بە دەست پێش جیابوونەوە.

٥- دەبێت لە پێنج ویسق زیاتر نەبێت (کە دەکاتە شەست سەدو پەنجاو دوو کغم).

**٤٥٣٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُزَابَنَةِ، وَالْمُزَابَنَةُ، أَنْ يُبَاعَ مَا فِي رُءُوسِ النَّخْلِ بِتَمْرٍ بِكَيْلٍ مُسَمًّى، إِنْ زَادَ لِي، وَإِنْ نَقَصَ فَعَلَيَّ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ (الْمُزَابَنَة)ی قەدەغەکرد، (الْمُزَابَنَة)ـەش بریتیە لە فرۆشتنی ئەو خورما تەڕەی بەسەر دارخورماکەوەیە بە ئەوەندەو ئەوەندە باری خورمای وشک، ئەگەر زیاتر بوو بۆ من، وە ئەگەر کەمتر بوو ئەوە لەسەر خۆمە.

## فرۆشتنی مێوژ بە ترێ

**٤٥٣٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُزَابَنَةِ وَالْمُزَابَنَةُ: بَيْعُ الثَّمَرِ بِالتَّمْرِ كَيْلاً، وَبَيْعُ الْكَرْمِ بِالزَّبِيبِ كَيْلاً»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ (الْمُزَابَنَة)ی قەدەغەکرد، (الْمُزَابَنَة)ـەش بریتیە لە فرۆشتنی خورمای تەڕ بە خورمای وشک بە پێوانە، وە فرۆشتنی مێوژ بە ترێ بە پێوانە.

**٤٥٣٥-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمُحَاقَلَةِ، وَالْمُزَابَنَةِ»[٣].

واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (الْمُحَاقَلَة) و (الْمُزَابَنَة)ی قەدەغە کرد.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٧١ و ٢١٧٢ و ٢١٧٥، ومسلم: ٧٢ و ١٥٤٢/٧٥، وأبو داود: ٣٣٦١، وإبن ماجه: ٢٢٦٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح




٤٥٣٦- «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَخَّصَ فِي الْعَرَايَا»[١].

واتە: زەیدی کوڕی ثابت ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوە بە عەرایا. (واتە: کڕینی خورمای تەڕ بە خورمای وشک بە مەرجەکانی خۆی).

٤٥٣٧- «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَخَّصَ فِي الْعَرَايَا بِالتَّمْرِ وَالرُّطَبِ»[٢].

واتە: زەیدی کوڕی ثابت ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوە بە عەرایا بە خورمای وشک و تەڕ.

## بابەت: فرۆشتنی خورمای تەڕ بە خورمای وشک بە (الْعَرَايَا) بە خەمڵاندن

٤٥٣٨- «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَخَّصَ فِي بَيْعِ الْعَرَايَا تُبَاعُ بِخِرْصِهَا»[٣].

واتە: زەیدی کوڕی ثابت ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوە بە فرۆشتنی خورمای تەڕ بە خورمای وشک بە خەمڵاندن.

٤٥٣٩- «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَخَّصَ فِي بَيْعِ الْعَرِيَّةِ بِخِرْصِهَا تَمْراً»[٤].

واتە: زەیدی کوڕی ثابت ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوە بە فرۆشتنی خورمای تەڕ بە خورمای وشک بە خەمڵاندن.

## مامەڵەکردن بە شێوەی عەرایا بە خورمای تەڕ

٤٥٤٠- «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَخَّصَ فِي بَيْعِ الْعَرَايَا بِالرُّطَبِ، وَبِالتَّمْرِ، وَلَمْ يُرَخِّصْ فِي غَيْرِ ذَلِكَ»[٥].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٧٣ و ٢١٨٤ و ٢١٨٨ و ٢١٩٢ و ٢٣٨٠، ومسلم: ٥٩ و ١٥٣٩/٦٦، وأبو داود: ٣٣٦٢، والترمذي: ١٣٠٢، وإبن ماجه: ٢٢٦٨ و ٢٢٦٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح.

**واتە: زەیدی کوڕی ثابت ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوە بە فرۆشتنی خورمای تەڕ بە خورمای وشک بە عەرایا، جگە لەوە مۆڵەتی بە هیچی تر نەدا.**

**٤٥٤١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَخَّصَ فِي الْعَرَايَا أَنْ تُبَاعَ بِخِرْصِهَا فِي خَمْسَةِ أَوْسُقٍ أَوْ مَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ»(١).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی داوە لە عەرایادا کە بە خەمڵاندن بفرۆشرێت، لە پێنج ویسق، یان کەمتر لە پێنج ویسق. (تێبینی: ئەگەر لە پێنج ویسق زیاتر بوو ئەوە دەبێت بە ڕیبا).**

**٤٥٤٢-** «عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلَاحُهُ، وَرَخَّصَ فِي الْعَرَايَا أَنْ تُبَاعَ بِخِرْصِهَا يَأْكُلُهَا أَهْلُهَا رُطَباً»(٢).

**واتە: سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فرۆشتنی بەروبوومی قەدەغەکردوە تا پێدەگات، وە مۆڵەتی بە عەرایا داوە (بەوەی خاوەنی خورمای وشک خورمای تەڕی پێ بکڕێ) کە بفرۆشرێ بە خەمڵاندن خاوەنەکەی بە تەڕی بیخوات.**

**٤٥٤٣-** «عَنْ رَافِعَ بْنِ خَدِيجٍ، وَسَهْلَ بْنَ أَبِي حَثْمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُزَابَنَةِ بَيْعُ الثَّمَرِ بِالتَّمْرِ، إِلَّا لِأَصْحَابِ الْعَرَايَا، فَإِنَّهُ أَذِنَ لَهُمْ»(٣).

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج و سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕنەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ (الْمُزَابَنَة)ی قەدەغە کرد، کە فرۆشتنی بەروبوومی تەڕە بە بەروبوومی وشک (وەک خورمای تەڕ بە قەسپ، یان ترێ بە مێوژ)، جگە لەوانە نەبێ کە عەرایا دەکەن (کە خورمای تەڕ بە خورمای وشک دەگۆڕنەوە بە مەرجەکانی خۆی) بێگومان مۆڵەتی بە ئەوان داوە.**

**٤٥٤٤-** «عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، عَنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُمْ قَالُوا: رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي بَيْعِ الْعَرَايَا بِخَرْصِهَا»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٩٠ و ٢٣٨٢، ومسلم: ١٥٤١، وأبو داود: ٣٣٦٤، والترمذي: ١٣٠١.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٩١ و ٢٣٨٣، ومسلم: ٦٧ و ١٥٤٠/٧٠، وأبو داود: ٣٣٦٣، والترمذي: ١٣٠٣.

(٤) صحيح.

واتە: بەشیری کوڕی یەسار ﷺ دەگێڕێتەوە: لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان وتویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوە بە مامەڵەی عەرایا بە خەملاندن.

## کڕینی خورمای وشک بە خورمای تەڕ

٤٥٤٥- «عَنْ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ التَّمْرِ بِالرُّطَبِ، فَقَالَ: لِمَنْ حَوْلَهُ أَيَنْقُصُ الرُّطَبُ إِذَا يَبِسَ؟ قَالُوا: نَعَمْ، فَنَهَى عَنْهُ»[١].

واتە: سەعد ﷺ دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە فرۆشتنی خورمای وشک بە تەڕ، بە دەورووبەرەکەی فەرموو: ئایا خورمای تەڕ کەم دەکات ئەگەر وشک ببێتەوە؟ وتیان: بەڵێ، کەم دەکات، ئەویش ڕێگری لێکرد.

٤٥٤٦- «عَنْ سَعْدِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الرُّطَبِ بِالتَّمْرِ، فَقَالَ: أَيَنْقُصُ إِذَا يَبِسَ؟ قَالُوا: نَعَمْ، فَنَهَى عَنْهُ»[٢].

واتە: سەعدی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی فرۆشتنی خورمای تەڕ بە وشک، فەرمووی: ئایا کەم دەکات ئەگەر وشک بوویەوە؟ وتیان: بەڵێ، قەدەغەی لێکرد.

## فرۆشتنی خورما بە گۆترە پێوانەی نەزانرێ چەندە بە خورمایێک پێوانەی بزانرێ

٤٥٤٧- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الصُّبْرَةِ مِنَ التَّمْرِ، لَا يُعْلَمُ مَكِيلُهَا بِالْكَيْلِ الْمُسَمَّى مِنَ التَّمْرِ»[٣].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد لە فرۆشتنی خورما بە گۆترە،کە پێوانەی دیاری کراوی خورماکە نەزانرێ چەندە.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٥٩ و ٣٣٦٠، والترمذي: ١٢٢٥، وإبن ماجه: ٢٢٦٤.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٣٠.

## فرۆشتنی خواردن بە گۆترە بە خواردن بە گۆترە

**٤٥٤٨-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَا تُبَاعُ الصُّبْرَةُ مِنَ الطَّعَامِ بِالصُّبْرَةِ مِنَ الطَّعَامِ، وَلَا الصُّبْرَةُ مِنَ الطَّعَامِ بِالْكَيْلِ الْمُسَمَّى مِنَ الطَّعَامِ»(١).

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: با خواردن بە گۆترە نەفرۆشرێ بە خواردن بە گۆترە، هەروەها خواردنێک بە گۆترە بە خواردنێکی پێوانەکراو.**

## فرۆشتنی کشتوکاڵ بە خواردن

**٤٥٤٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمُزَابَنَةِ أَنْ يَبِيعَ ثَمَرَ حَائِطِهِ، وَإِنْ كَانَ نَخْلاً بِتَمْرٍ كَيْلاً، وَإِنْ كَانَ كَرْماً أَنْ يَبِيعَهُ بِزَبِيبٍ كَيْلاً، وَإِنْ كَانَ زَرْعاً أَنْ يَبِيعَهُ بِكَيْلِ طَعَامٍ، نَهَى عَنْ ذَلِكَ كُلِّهِ»(٢).

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (الْمُزَابَنَة)ی قەدەغەکرد، ئەویش ئەوەیە بەرووبوومی باخەکەی بفرۆشێ، ئەگەر خورمای تەڕ بوو بە خورمای وشک بە پێوانە، ئەگەر ترێ بێت بیفرۆشی بە مێوژ بە پێوانە، وە ئەگەر کشتوکاڵ بێت بیفرۆشێت بە پێوانەی خواردن، هەموو ئەمانەی قەدەغەکردوە. (چونکە فرۆشتنی شتێکی دیاری کراوە بە شتێکی نادیارو بەرهەمە تەڕو تازەکە چەند کەم دەکات کاتێ وەک بەرهەمە وشکەکە وشک دەبێتەوە).**

**٤٥٥٠-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُخَابَرَةِ وَالْمُزَابَنَةِ، وَالْمُحَاقَلَةِ، وَعَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ قَبْلَ أَنْ يُطْعَمَ، وَعَنْ بَيْعِ ذَلِكَ إِلَّا بِالدَّنَانِيرِ وَالدَّرَاهِمِ»(٣).

**واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ (الْمُخَابَرَة) و (الْمُزَابَنَة) و (الْمُحَاقَلَة) ی قەدەغەکرد. وە فرۆشتنی بەرووبووم پێش ئەوەی بە کەڵکی خوردن بێت، هەروەها لە فرۆشتنی ئەوانە مەگەر بە دینارو درهەم.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٠٥، ومسلم: ١٥٤٢/٧٦.

(٣) صحيح.




(الْمُخَابَرَةِ) (واتە: کەسێک زەویەکی هەبێت بە کەسێکی تر بڵێت: بیکێڵەو تۆوی بکە، دوای بەشێکت دەدەمێ، ئەمە دروست نیە، لەوانەیە ئەو بەرهەمە نەبێت، بەڵام لە سەرەتاوە لە کێڵان و تۆ و کردن و هەموو شتێکدا هاوبەش بن ئەوە دروستە).

## فرۆشتنی گوڵەگەنم یان جۆ یان هەر شتێکی تر تا سپی دەبێت (بە تەواوی پێ دەگات).

**٤٥٥١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ النَّخْلَةِ حَتَّى تَزْهُوَ، وَعَنِ السُّنْبُلِ حَتَّى يَبْيَضَّ، وَيَأْمَنَ الْعَاهَةَ، نَهَى الْبَائِعَ وَالْمُشْتَرِيَ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە فرۆشتنی بەرهەمی دارخورما تا پێدەگات، هەروەها لە گوڵەگەنم تا سپی دەبێت و ئەمین دەبێت لە ئافەت، قەدەغەی کردوە لە کڕیارو فرۆشیار.**

**٤٥٥٢-** «عَنْ أَبِي صَالِحٍ، أَنَّ رَجُلاً مَنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ أَخْبَرَهُ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا لَا نَجِدُ الصَّيْحَانِيَّ، وَلَا الْعِذْقَ بِجَمْعِ التَّمْرِ حَتَّى نَزِيدَهُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: بِعْهُ بِالْوَرِقِ، ثُمَّ اشْتَرِ بِهِ»[٢].

**واتە: ئەبو صاڵیح دەگێڕێتەوە، پیاوێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە خورمای (الصَّيْحَانِيِّ) و (الْعِذْقَ)مان لا نیە (کە دوو خورمای چاک بوون)، ئەوان ڕازی نابن بە بەرانبەر لەگەڵ خورمای تێکەڵدا تا بۆیان زیاد نەکەین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خورماکەت بفرۆشە بە پارە و پاشان خورمای چاکی پێ بکڕە.**

## فرۆشتنی خورما بە خورما بەزیادە

**٤٥٥٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: اسْتَعْمَلَ رَجُلاً عَلَى خَيْبَرَ، فَجَاءَ بِتَمْرٍ جَنِيبٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَكُلُّ تَمْرِ خَيْبَرَ هَكَذَا؟، قَالَ: لَا وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا لَنَأْخُذُ الصَّاعَ مِنْ هَذَا بِصَاعَيْنِ، وَالصَّاعَيْنِ بِالثَّلَاثِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَفْعَلْ بِعِ الْجَمْعَ بِالدَّرَاهِمِ، ثُمَّ ابْتَعْ بِالدَّرَاهِمِ جَنِيباً»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٣٥، وأبو داود: ٣٣٦٨، والترمذي: ١٢٢٦ و ١٢٢٧.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٠١ و ٢٣٠٢ و ٤٢٤٤ و ٧٣٠٥، ومسلم: ١٥٩٣.




**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی لەسەر خەیبەر دانا (بۆ ڕایی کردنی کاروبارەکانی)، خورمایەکی چاکی هێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا هەموو خورمای خەیبەر وەکو ئەمەیە؟ وتی: نا، سوێند بەخوا، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە یەک صاع دەگۆڕینەوە بە دوو صاع و سێ صاع، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کاری وا مەکە هەمووی بفرۆشە بە پارە، پاشان بە پارە خورمای جوان بکڕە.**

**٤٥٥٤-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُتِيَ بِتَمْرٍ رَيَّانَ، وَكَانَ تَمْرُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بَعْلاً فِيهِ يُبْسٌ، فَقَالَ: أَنَّى لَكُمْ هَذَا؟ قَالُوا: ابْتَعْنَاهُ صَاعاً بِصَاعَيْنِ مِنْ تَمْرِنَا، فَقَالَ: لَا تَفْعَلْ، فَإِنَّ هَذَا لَا يَصِحُّ، وَلَكِنْ بِعْ تَمْرَكَ، وَاشْتَرِ مِنْ هَذَا حَاجَتَكَ»[١].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، خورمایەکیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا زۆر ئاودرا بوو، جا باخە خورماکانی پێغەمبەر بە ئاوی ڕوبار ئاو نەدەدرا بۆیە هی وشکی تێدا بوو، فەرمووی: ئەمەتان لە کوێ هێناوە؟ وتیان: صاعێکمان بە دوو صاعی خورمای خۆمان کڕیوە، فەرمووی: کاری وا مەکە، چونکە ئەمە دروست نیە، بەڵکو خورماکەت بفرۆشە و بە پارەکەی پێویستیەکەت بکڕە.**

**٤٥٥٥-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُرْزَقُ تَمْرَ الْجَمْعِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَنَبِيعُ الصَّاعَيْنِ بِالصَّاعِ، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: لَا صَاعَيْ تَمْرٍ بِصَاعٍ، وَلَا صَاعَيْ حِنْطَةٍ بِصَاعٍ، وَلَا دِرْهَماً بِدِرْهَمَيْنِ»[٢].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: ئێمە خورمای (الْجَمْع)مان هەبوو لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو مەنمان دەکڕی بە مەنێک، ئەوە هەواڵە گەیشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نە دوو مەن خورما بە مەنێک، نە دوو مەن گەنم بە مەنێک، نە دوو درهەمیش بە درهەمێک.**

**٤٥٥٦-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَبِيعُ تَمْرَ الْجَمْعِ صَاعَيْنِ بِصَاعٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَا صَاعَيْ تَمْرٍ بِصَاعٍ، وَلَا صَاعَيْ حِنْطَةٍ بِصَاعٍ، وَلَا دِرْهَمَيْنِ بِدِرْهَمٍ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٨٠، ومسلم: ١٥٩٥، وإبن ماجه: ٢٢٥٦.

(٣) صحيح.




**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷛ دەڵێ: ئێمە خورمای (الْجَمْع)مان دەفرۆشت دوو صاع بە صاعێک، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نە دوو صاع خورما بە صاعێک، نە دوو صاع گەنم بە صاعێک، نە دوو درهەمیش بە درهەمێک دروست نیە.**

**٤٥٥٧-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷛ قَالَ: أَتَى بِلَالٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِتَمْرٍ بَرْنِيٍّ، فَقَالَ: مَا هَذَا؟، قَالَ: اشْتَرَيْتُهُ صَاعاً بِصَاعَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَوَّهْ عَيْنُ الرِّبَا لَا تَقْرَبْهُ»[1].

**واتە: ئەبو سەعید ﷛ دەڵێ: بیلال هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ خورمای بەرەنیەی بۆی هێنا (جۆرە خورمایەکی زەردەو مەیلەو درێژە) فەرمووی: ئەمەت لە کوێ بوو؟ وتی: صاعێکم کڕیوە بە دوو صاع، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی هاوار خودی ڕیبا ئەوەیە نزیکی مەکەوەرەوە.**

**٤٥٥٨-** «عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷛ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الذَّهَبُ بِالْوَرِقِ رِباً، إِلَّا هَاءَ وَهَاءَ، وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ رِباً إِلَّا هَاءَ وَهَاءَ، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ رِباً إِلَّا هَاءَ وَهَاءَ، وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ رِباً إِلَّا هَاءَ وَهَاءَ»[2].

**واتە: عومەری کوڕی خەطاب ﷛ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زێڕ بە زیو ڕیبایە مەگەر دەست بە دەست بێت، خورما بە خورما ڕیبایە مەگەر دەست بە دەست، گەنم بە گەنم ڕیبایە مەگەر دەست بە دەست، جۆ بە جۆ ڕیبایە مەگەر دەست بەدەست.**

## فرۆشتنی خورما بە خورما

**٤٥٥٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷛ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: التَّمْرُ بِالتَّمْرِ، وَالْحِنْطَةُ بِالْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ، وَالْمِلْحُ بِالْمِلْحِ يَداً بِيَدٍ، فَمَنْ زَادَ أَوِ ازْدَادَ فَقَدْ أَرْبَى، إِلَّا مَا اخْتَلَفَتْ أَلْوَانُهُ»[3].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷛ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خورما بە خورما، گەنم بە گەنم، جۆ بە جۆ، خوێ بە خوێ، دەست بەدەست، هەرکەس زیادە بدات یان زیادە وەربگرێ ئەوا ڕیبای کردوە، مەگەر جۆرەکانیان لە یەکتر جیابێت.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣١٢، ومسلم: ١٥٩٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٣٤ و ٢١٧٠ و ٢١٧٤، ومسلم: ١٥٨٦، وأبو داود: ٣٣٤٨، والترمذي: ١٢٤٣، وإبن ماجه: ٢٢٥٣ و ٢٢٥٩ و ٢٢٦٠.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٨٨.




## فرۆشتنی گەنم بە گەنم

**٤٥٦٠-** «عَنْ مُوعَاوِيَةَ وعُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ قَالا: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الذَّهَبِ بِالذَّهَبِ، وَالْوَرِقِ بِالْوَرِقِ، وَالْبُرِّ بِالْبُرِّ، وَالشَّعِيرِ بِالشَّعِيرِ، وَالتَّمْرِ بِالتَّمْرِ، قَالَ أَحَدُهُمَا: وَالْمِلْحِ بِالْمِلْحِ، وَلَمْ يَقُلْهُ الْآخَرُ: إِلَّا مِثْلاً بِمِثْلٍ يَداً بِيَدٍ، وَأَمَرَنَا أَنْ نَبِيعَ الذَّهَبَ بِالْوَرِقِ، وَالْوَرِقَ بِالذَّهَبِ، وَالْبُرَّ بِالشَّعِيرِ، وَالشَّعِيرَ بِالْبُرِّ، يَداً بِيَدٍ، كَيْفَ شِئْنَا، قَالَ أَحَدُهُمَا: فَمَنْ زَادَ أَوِ ازْدَادَ فَقَدْ أَرْبَى»[١].

**واتە: موعاویە وعوبادەی کوڕی صامیت دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردین لە فرۆشتنی زێر بە زێر، زیو بە زیو، گەنم بە گەنم، جۆ بە جۆ، خورما بە خورما، یەکێکیان وتیان: خوێ بە خوێ، ئەویتر نەیوت، مەگەر وەکو یەک وابێت و دەست بەدەست بێت، وە فەرمانی پێکردین زێر بدەین بە زیو، زیو بدەین بەزێڕ، گەنم بدەین بە جۆ، جۆ بدەین بە گەنم، دەست بە دەست هەرچۆنێ ویستمان، یەکێکیان وتی: هەرکەس زیادە بدات یان زیادە وەربگرێ ئەوە ڕیبای کردوە.**

**٤٥٦١-** «عن مُوعَاوِيَةَ وعُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ قَالا: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الذَّهَبِ بِالذَّهَبِ، وَالْفِضَّةِ بِالْفِضَّةِ، وَالتَّمْرِ بِالتَّمْرِ، وَالْبُرِّ بِالْبُرِّ، وَالشَّعِيرِ بِالشَّعِيرِ، قَالَ أَحَدُهُمَا: وَالْمِلْحِ بِالْمِلْحِ وَلَمْ يَقُلْهُ الْآخَرُ: إِلَّا سَوَاءً بِسَوَاءٍ مِثْلاً بِمِثْلٍ، قَالَ أَحَدُهُمَا: مَنْ زَادَ أَوِ ازْدَادَ فَقَدْ أَرْبَى وَلَمْ يَقُلْهُ الْآخَرُ وَأَمَرَنَا أَنْ نَبِيعَ الذَّهَبَ بِالْفِضَّةِ، وَالْفِضَّةَ بِالذَّهَبِ، وَالْبُرَّ بِالشَّعِيرِ، وَالشَّعِيرَ بِالْبُرِّ، يَداً بِيَدٍ كَيْفَ شِئْنَا»[٢].

**واتە: موعاویەو عوبادەی کوڕی صامیت دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردین لە فرۆشتنی زێر بە زێر، زیو بە زیو، خورما بە خورما، گەنم بە گەنم، جۆ بە جۆ، یەکێکیان وتیان: خوێ بە خوێ، ئەویتر نەیوت، مەگەر وەکو یەک وابێت و هاو وێنەی یەک بێت، یەکێکیان وتی: هەرکەس زیادە بدات یان زیادە وەربگرێ ئەوە ڕیبای کردوە، ئەوی تر نەیوت، وە فەرمانی پێکردین زێر بدەین بە زیو، زیو بدەین بەزێڕ، گەنم بدەین بە جۆ، جۆ بدەین بە گەنم، دەست بە دەست هەرچۆنێ ویستمان.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




## فرۆشتنی جۆ بە جۆ

**٤٥٦٢-** «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ وعن مُعَاوِيَةَ، فَقَالَ عُبَادَةُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَبِيعَ الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ، وَالْوَرِقَ بِالْوَرِقِ، وَالْبُرَّ بِالْبُرِّ، وَالشَّعِيرَ بِالشَّعِيرِ، وَالتَّمْرَ بِالتَّمْرِ، قَالَ أَحَدُهُمَا: وَالْمِلْحَ بِالْمِلْحِ، وَلَمْ يَقُلِ الْآخَرُ: إِلَّا سَوَاءً بِسَوَاءٍ مِثْلاً بِمِثْلٍ، قَالَ أَحَدُهُمَا: مَنْ زَادَ أَوِ ازْدَادَ فَقَدْ أَرْبَى وَلَمْ يَقُلِ الْآخَرُ وَأَمَرَنَا أَنْ نَبِيعَ الذَّهَبَ بِالْوَرِقِ، وَالْوَرِقَ بِالذَّهَبِ، وَالْبُرَّ بِالشَّعِيرِ، وَالشَّعِيرَ بِالْبُرِّ، يَداً بِيَدٍ كَيْفَ شِئْنَا، فَبَلَغَ هَذَا الْحَدِيثُ مُعَاوِيَةَ فَقَامَ فَقَالَ: مَا بَالُ رِجَالٍ يُحَدِّثُونَ أَحَادِيثَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَدْ صَحِبْنَاهُ، وَلَمْ نَسْمَعْهُ مِنْهُ، فَبَلَغَ ذَلِكَ عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ فَقَامَ فَأَعَادَ الْحَدِيثَ، فَقَالَ: لَنُحَدِّثَنَّ بِمَا سَمِعْنَاهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَإِنْ رَغِمَ مُعَاوِيَةُ»[١].

**واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیت و موعاویەوە، عوبادە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردین لە فرۆشتنی زێڕ بە زێڕ، زیو بە زیو، وە گەنم بە گەنم، جۆ بە جۆ، خورما بە خورما، یەکێکیان وتی: خوێ بە خوێ، ئەویتر نەیوت: مەگەر وەکو یەک وابێت و هاووێنەی یەک بێت، یەکێکیان وتی: هەرکەس زیادە بدات یان زیادە وەربگرێت ئەوە ڕیبای کردوە، ئەوی تر نەیوت، وە فەرمانی پێکردین زێڕ بدەین بە زیو، زیو بدەین بەزێڕ، گەنم بدەین بە جۆ، جۆ بدەین بە گەنم، دەست بە دەست هەرچۆنێ ویستمان، ئەم فەرموودەیە گەیشت بە موعاویە هەڵساو وتی: ئەوە چیانە خەڵکانێک فەرموودە لە پێغەمبەرەوە دەگێڕنەوە ئێمە هاوەڵی بووینەو لێمان نەبیستووە، هەروەها ئەوە گەیشت بە عوبادەی کوڕی صامیت هەڵساو هەمان قسەی دووبارە کردەوە، وتی: ئەوە باس دەکەین کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوومانە، ئەگەر مەعاویەیش پێی ناخۆش بێت.**

**٤٥٦٣-** «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، وَكَانَ بَدْرِيّاً، وَكَانَ بَايَعَ النَّبِيَّ ﷺ أَنْ لَا يَخَافَ فِي اللَّهِ لَوْمَةَ لَائِمٍ، أَنَّ عُبَادَةَ قَامَ خَطِيباً فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّكُمْ قَدْ أَحْدَثْتُمْ بُيُوعاً لَا أَدْرِي مَا هِيَ، أَلَا إِنَّ الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ، وَزْناً بِوَزْنٍ تِبْرُهَا وَعَيْنُهَا، وَإِنَّ الْفِضَّةَ بِالْفِضَّةِ، وَزْناً بِوَزْنٍ تِبْرُهَا وَعَيْنُهَا، وَلَا بَأْسَ بِبَيْعِ الْفِضَّةِ بِالذَّهَبِ يَداً بِيَدٍ، وَالْفِضَّةُ أَكْثَرُهُمَا، وَلَا تَصْلُحُ النَّسِيئَةُ أَلَا إِنَّ الْبُرَّ بِالْبُرِّ، وَالشَّعِيرَ بِالشَّعِيرِ مُدْياً بِمُدْيٍ، وَلَا بَأْسَ بِبَيْعِ الشَّعِيرِ بِالْحِنْطَةِ يَداً بِيَدٍ، وَالشَّعِيرُ أَكْثَرُهُمَا، وَلَا يَصْلُحُ نَسِيئَةً، أَلَا وَإِنَّ التَّمْرَ بِالتَّمْرِ مُدْياً بِمُدْيٍ حَتَّى ذَكَرَ الْمِلْحَ مُدّاً بِمُدٍّ، فَمَنْ زَادَ أَوِ اسْتَزَادَ فَقَدْ أَرْبَى»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**واتە: عوبادەی کوڕی صامت ﷺ دەگێڕێتەوە، کە یەکێک بووە لە بەشداربووانی بەدرو بەیعەتی دا بوو بە پێغەمبەر ﷺ کە لە لۆمەی لۆمەکار نەترسێت، عوبادە هەڵساو وتارێکی دا وتی: ئەی خەڵکینە، ئێوە کڕین و فرۆشتنێکتان داهێناوە نازانم ئەوە چیە، مەگەر ئەوە نەبێ زێڕ بە زێڕ، پێوانە بە پێوانە یەکسان بێت، وە زیو بە زیو، پێوانە بە پێوانە یەکسان بێت، هیچ گرفتێکی تێدا نیە فرۆشتنی زیو بە زێڕ دەست بە دەست با زیوەکەیش زۆرتر بێ، دواخستن دروست نیە، ئاگادار بن بێگومان گەنم بە گەنم و جۆ بە جۆ دەبێ مشت بە مشت بێت، هیچ گرفتێکی تێدا نیە جۆ بە گەنم و دەست بە دەست با جۆکەیش زیاتر بێت، دواخستنیشی دروست نیە، ئاگادار بن بێگومان خورما بە خورما دەبێ مشت بە مشت بێ، تەنانەت باسی خوێیشی کرد مشت بە مشت، جا هەرکەس زیادە بدات یان زیادە وەربگرێت ئەوە ڕیبای کردوە.**

**٤٥٦٤-** «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ تِبْرُهُ وَعَيْنُهُ وَزْناً بِوَزْنٍ، وَالْفِضَّةُ بِالْفِضَّةِ تِبْرُهُ وَعَيْنُهُ وَزْناً بِوَزْنٍ، وَالْمِلْحُ بِالْمِلْحِ، وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ، وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ، سَوَاءً بِسَوَاءٍ مِثْلاً بِمِثْلٍ، فَمَنْ زَادَ أَوِ ازْدَادَ فَقَدْ أَرْبَى»[١].

**واتە: عوبادەی کوڕی صامت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زێڕ بە زێڕ کێشانە بە کێشانە یەکسان بێت، وە زیو بە زیو، کێشانیان یەکسان بێت، خوێ بە خوێ و خورما بە خورما وگەنم بە گەنم و جۆ بە جۆ، وەکو یەک وابێت و هاووێنەی یەک بێت، جا هەرکەس زیادە بدات یان زیادە وەربگرێت ئەوە بۆ ڕیبای کردوە.**

**٤٥٦٥-** «عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ عَلِيٍّ، أَنَّ أَبَا الْمُتَوَكِّلِ، مَرَّ بِهِمْ فِي السُّوقِ، فَقَامَ إِلَيْهِ قَوْمٌ أَنَا مِنْهُمْ قَالَ: قُلْنَا: أَتَيْنَاكَ لِنَسْأَلَكَ عَنِ الصَّرْفِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ قَالَ لَهُ رَجُلٌ: مَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، غَيْرُ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ: لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ غَيْرُهُ، قَالَ: فَإِنَّ الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقَ بِالْوَرِقِ، قَالَ سُلَيْمَانُ: أَوْ قَالَ: وَالْفِضَّةَ بِالْفِضَّةِ، وَالْبُرَّ بِالْبُرِّ، وَالشَّعِيرَ بِالشَّعِيرِ، وَالتَّمْرَ بِالتَّمْرِ، وَالْمِلْحَ بِالْمِلْحِ، سَوَاءً بِسَوَاءٍ، فَمَنْ زَادَ عَلَى ذَلِكَ أَوِ ازْدَادَ فَقَدْ أَرْبَى، وَالْآخِذُ وَالْمُعْطِي فِيهِ سَوَاءٌ»[٢].

**واتە: سولەیمانی کوڕی عەلی دەگێڕێتەوە ئەبو موتەوکیل تێپەڕی بەلایاندا لە ناو بازاردا، خەڵکەکە هەڵسان چوون بۆ لای منیش لەناویاندا بووم، وتی: وتمان:**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٠ و ١٥٨٧/٨١، وأبو داود: ٣٣٤٩ و ٣٣٥٠، والترمذي: ١٢٤٠، وابن ماجه: ٢٢٥٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٧٦ و ٢١٧٧، ومسلم: ٧٥ و ١٥٨٤/٧٧، والترمذي: ١٢٤١.




هاتوین پرسیارت لێ بکەین لەبارەی پارە گۆڕینەوەوە؟ وتی: گوێم لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ بوو پیاوێک پێی وت: لە نێوانی تۆو پێغەمبەری خوادا ﷺ کەس نیە جگە لە خۆت، وتی: لە نێوان من و ئەودا کەس نیە غەیری من، وتی: زێڕ بە زێڕ و زیو بە زیو، گەنم بە گەنم و جۆ بە جۆ و خورما بە خورما خوێ بە خوێ، وەکو یەک وابێت، جا هەرکەس زیادە بدات یان زیادە وەربگرێت ئەوە ڕیبای کردوە، ئەوەی وەری دەگرێ و ئەوەشی دەیدات تێیدا وەکو یەک وایە.

**٤٥٦٦-** «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: الذَّهَبُ الْكِفَّةُ بِالْكِفَّةِ، وَلَمْ يَذْكُرْ يَعْقُوبُ الْكِفَّةُ بِالْكِفَّةِ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: إِنَّ هَذَا لَا يَقُولُ شَيْئاً، قَالَ عُبَادَةُ: إِنِّي وَاللَّهِ مَا أُبَالِي أَنْ لَا أَكُونَ بِأَرْضٍ يَكُونُ بِهَا مُعَاوِيَةُ، إِنِّي أَشْهَدُ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ ذَلِكَ»(١).

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: زێڕ لاتەرازوو بە لاتەرازووە، یەعقوب (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودە) باسی لاتەرازوو بە لاتەرازووی نەکرد، موعاویە وتی: بەڕاستی ئەوە هیچ ناڵێت، عوبادە وتی: سوێند بەخوا گوێم لێ نیە (واتە: حەز دەکەم) لە خاکێکدا نەبم موعاویەی تێدا بێت، من شایەتی دەدەم بیستوومە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی فەرمووە.

## فرۆشتنی دینار بە دینار

**٤٥٦٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الدِّينَارُ بِالدِّينَارِ، وَالدِّرْهَمُ بِالدِّرْهَمِ لَا فَضْلَ بَيْنَهُمَا»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دینار بە دینار و درهەم بە درهەم زیادە لە نێوانیاندا دروست نیە.

## فرۆشتنی درهەم بە درهەم

**٤٥٦٨-** «عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: قَالَ عُمَرُ ﷺ الدِّينَارُ بِالدِّينَارِ، وَالدِّرْهَمُ بِالدِّرْهَمِ، لَا فَضْلَ بَيْنَهُمَا هَذَا عَهْدُ نَبِيِّنَا ﷺ إِلَيْنَا»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٨٨/٨٥.

(٣) صحيح لغيره.




واتە: موجاهد دەڵێ: عومەر ﷺ وتویەتی: دینار بە دینار و درهەم بە درهەم زیادە لە نێوانیاندا دروست نیە، ئەمە وەسێتی پێغەمبەرەکەمانە ﷺ بۆمان.

**٤٥٦٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ، وَزْناً بِوَزْنٍ مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَالْفِضَّةُ بِالْفِضَّةِ، وَزْناً بِوَزْنٍ مِثْلاً بِمِثْلٍ، فَمَنْ زَادَ أَوِ ازْدَادَ فَقَدْ أَرْبَى»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زێر بە زێر، کێشانەیان وەک یەک بێت، زیو بە زیو کێشانەیان وەک یەک بێت، هەرکەس زیادە بدات یان زیادە وەربگرێت ئەوە بۆ ڕیبای کردوە.

## فرۆشتنی زێڕ بە زێڕ

**٤٥٧٠-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ إِلَّا مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَلَا تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ، وَلَا تَبِيعُوا الْوَرِقَ بِالْوَرِقِ إِلَّا مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَلَا تَبِيعُوا مِنْهَا شَيْئاً غَائِباً بِنَاجِزٍ»[٢].

واتە: ئەبو سەعید خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زێڕ بە زێڕ مەفرۆشن مەگەر وەک یەک بن، وە فەزلی هەندێکیان مەدەن بەسەر هەندێکیاندا، (واتە: هەریەکە بڵێ ئەوەی من چاکترە لەوەی تۆ بۆیە زیادە وەردەگرم) وە زیو بە زیویش مەفرۆشن مەگەر وەک یەک بن، وە کڕین و فرۆشتنی دوورو پەنهان لەمانە بە حازر مەکەن. (چونکە دەست بە دەستی تێدا نیە).

**٤٥٧١-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: بَصُرَ عَيْنِي، وَسَمِعَ أُذُنِي، مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرَ: النَّهْيَ عَنِ الذَّهَبِ بِالذَّهَبِ، وَالْوَرِقِ بِالْوَرِقِ، إِلَّا سَوَاءً بِسَوَاءٍ مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَلَا تَبِيعُوا غَائِباً بِنَاجِزٍ، وَلَا تُشِفُّوا أَحَدَهُمَا عَلَى الْآخَرِ»[٣].

واتە: ئەبو سەعید خودری ﷺ دەڵێ: بە چاوی خۆم بینیم و بە گوێی خۆم بیستم، لە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی قەدەغەکردنی کرد لە: زێڕ بە زێڕ و زیو بە زیو مەگەر

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٨٨/٨٤، وإبن ماجه: ٢٢٥٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

یەکسان بن و وەکو یەکتر وابن، وە کڕینی فرۆشتنی دورو پەنهان لەمانەدا بە حازر مەکەن، وە فەزڵی یەکێکیان مەدەن بەسەر هەندێکیاندا.

**٤٥٧٢-** «عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، أَنَّ مُعَاوِيَةَ، بَاعَ سِقَايَةً مِنْ ذَهَبٍ أَوْ وَرِقٍ بِأَكْثَرَ مِنْ وَزْنِهَا، فَقَالَ: أَبُو الدَّرْدَاءِ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: يَنْهَى عَنْ مِثْلِ هَذَا، إِلَّا مِثْلاً بِمِثْلٍ»[١].

واتە: عەطائی کوڕی یەسار ﷺ دەگێڕێتەوە، موعاویە کوپێکی زێر یان زیوی فرۆشت بە زیاتر لە کێشانەکەی خۆی، ئەبو دەرداء وتی: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی دەکرد لە هاوشێوەی ئەم مامەڵە، مەگەر وەکو یەکتر بوایە.

## فرۆشتنی ملوانکەیەک مووروی تێدا بێت، وە زێر بە زێڕ

**٤٥٧٣-** «عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ ﷺ قَالَ: اشْتَرَيْتُ يَوْمَ خَيْبَرَ قِلَادَةً فِيهَا ذَهَبٌ وَخَرَزٌ بِاثْنَيْ عَشَرَ دِينَاراً، فَفَصَّلْتُهَا، فَوَجَدْتُ فِيهَا أَكْثَرَ مِنَ اثْنَيْ عَشَرَ دِينَاراً، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: لَا تُبَاعُ حَتَّى تُفَصَّلَ»[٢].

واتە: فەضالەی کوڕی عوبەید ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی خەیبەردا ملوانکەیەکمان کڕی زێڕو مورووی تێدابوو بە دوازدە درهەم، زێڕو موروەکەم لە یەکتر جیا کردەوە، بینیم زیاتر بوو لە دوازدە دینار، ئەوە باس کرا بۆ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نابێ بفرۆشرێ تا موروو زێڕەکە لەیەکتر جیا نەکرێتەوە.

**٤٥٧٤-** «عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ ﷺ قَالَ: أَصَبْتُ يَوْمَ خَيْبَرَ قِلَادَةً فِيهَا ذَهَبٌ وَخَرَزٌ، فَأَرَدْتُ أَنْ أَبِيعَهَا، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: افْصِلْ بَعْضَهَا مِنْ بَعْضٍ، ثُمَّ بِعْهَا»[٣].

واتە: فەضالەی کوڕی عوبەید ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژ خەیبەر ملوانکەیەکم دەستکەوت زێڕو مورووی تێدا بوو، ویستم بیفرۆشم، ئەوە باس کرا بۆ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لێکی جیا بکەرەوە، پاشان بیفرۆشە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٩١/٩٠، وأبو داود: ٣٣٥١ و ٣٣٥٢، والترمذي: ١٢٥٥.

(٣) صحيح.




## فرۆشتنی زیو بە زێڕ بە قەرز

**٤٥٧٥-** «عَنْ أَبِي الْمِنْهَالِ قَالَ: بَاعَ شَرِيكٌ لِي وَرِقاً بِنَسِيئَةٍ، فَجَاءَنِي، فَأَخْبَرَنِي، فَقُلْتُ: هَذَا لَا يَصْلُحُ، فَقَالَ: قَدْ وَاللَّهِ بِعْتُهُ فِي السُّوقِ، وَمَا عَابَهُ عَلَيَّ أَحَدٌ، فَأَتَيْتُ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ ﷺ فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: قَدِمَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ وَنَحْنُ نَبِيعُ هَذَا الْبَيْعَ، فَقَالَ: مَا كَانَ يَداً بِيَدٍ فَلَا بَأْسَ، وَمَا كَانَ نَسِيئَةً فَهُوَ رِباً، ثُمَّ قَالَ لِي: ائْتِ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ فَأَتَيْتُهُ، فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ»[١].

**واتە: ئەبو مینهال دەڵێ: هاوبەشێکم زیوی فرۆشت بە قەرز، هات بۆ لام هەواڵی پێدام، وتم: ئەمە دروست نیە، وتی: سوێند بەخوا لە بازاڕدا فرۆشتم کەس ڕەخنەی لێ نەگرتم، هاتم بۆ لای بەڕاء ﷺ پرسیارم لێکرد؟ وتی: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ ناومان لە مەدینە ئێمەش ئەم کڕین و فرۆشتنەمان دەکرد، فەرمووی: ئەوەی دەست بە دەست بێت هیچ گرفتێکی تێدا نیە، ئەوەیشی قەرز بێت ئەوە ڕیبایە، پاشان پێمی وت: بڕۆ بۆ لای زەیدی کوڕی ئەرقەم، ڕۆیشتم بۆ لای و پرسیارم لێ کرد ئەویش هەمان شتی پێ وتم.**

**٤٥٧٦-** « عَنْ أَبِي الْمِنْهَالِ قَالَ: سَأَلْتُ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ، وَزَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ فَقَالَا: كُنَّا تَاجِرَيْنِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلْنَا نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ عَنِ الصَّرْفِ فَقَالَ: إِنْ كَانَ يَداً بِيَدٍ فَلَا بَأْسَ، وَإِنْ كَانَ نَسِيئَةً فَلَا يَصْلُحُ»[٢].

**واتە: ئەبو مینهال دەڵێ: پرسیارم کرد لە بەرائی کوڕی عازب و زەیدی کوڕی ئەرقەم، ئێمە دوو بازرگان بووین لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیارمان لێ کرد لە بارەی پارە گۆڕینەوە، فەرمووی: ئەگەر دەست بەدەست بێت هیچ گرفتێکی تێدا نیە، ئەگەر قەرزیش بێت ئەوە دروست نیە.**

**٤٥٧٧-** «عَنْ أَبِي الْمِنْهَالِ قَالَ: سَأَلْتُ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ ﷺ، عَنِ الصَّرْفِ، فَقَالَ: سَلْ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ فَإِنَّهُ خَيْرٌ مِنِّي وَأَعْلَمُ، فَسَأَلْتُ زَيْداً فَقَالَ: سَلِ الْبَرَاءَ فَإِنَّهُ خَيْرٌ مِنِّي وَأَعْلَمُ، فَقَالَا جَمِيعاً: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْوَرِقِ بِالذَّهَبِ دَيْناً»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٦٠ و ٢١٨٠ و ٢٤٩٧ و ٣٩٣٩، ومسلم: ٨٦ و ١٥٨٩/٨٧.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: ئەبو مینهال دەڵێ: پرسیارم لە بەرائی کوڕی عازب ﷺ کرد لە بارەی پارە گۆڕینەوە، وتی: پرسیار لە زەیدی کوڕی ئەرقەم بکە چونکە ئەو لەمن زیاتر و شارەزاترە، پرسیارم لە زەید کرد وتی: پرسیار لە بەراء بکە چونکە ئەو لەمن چاکتر و شارەزاترە، هەردووکیان وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە فرۆشتنی زیو بەزێڕ بە قەرز.

## فرۆشتنی زیو بە زێڕ و فرۆشتنی زێڕ بە زیو

**٤٥٧٨-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الْفِضَّةِ بِالْفِضَّةِ، وَالذَّهَبِ بِالذَّهَبِ إِلَّا سَوَاءً بِسَوَاءٍ، وَأَمَرَنَا أَنْ نَبْتَاعَ الذَّهَبَ بِالْفِضَّةِ كَيْفَ شِئْنَا، وَالْفِضَّةَ بِالذَّهَبِ كَيْفَ شِئْنَا»[١].

واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە فرۆشتنی زیو بە زیو و زێڕ بە زێڕ مەگەر وەکو یەک بێت، وە فەرمانی پێ کردوین زێڕ بکڕین بە زیو هەرچۆنێک بمانەوێ، وە زیویش بە زێڕ هەر چۆنێ بمانەوێ.

**٤٥٧٩-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَبِيعَ الْفِضَّةَ بِالْفِضَّةِ إِلَّا عَيْناً بِعَيْنٍ سَوَاءً بِسَوَاءٍ، وَلَا نَبِيعَ الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ إِلَّا عَيْناً بِعَيْنٍ سَوَاءً بِسَوَاءٍ بِسَوَاءٍ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ تَبَايَعُوا الذَّهَبَ بِالْفِضَّةِ كَيْفَ شِئْتُمْ، وَالْفِضَّةَ بِالذَّهَبِ كَيْفَ شِئْتُمْ»[٢].

واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردوین کە زیو بە زیو و زێڕ بە زێڕ بفرۆشین مەگەر وەکو یەک بێت و یەکسان بێت، وە زێڕ بە زێڕ نەفرۆشین مەگەر وەکو یەک بێت و یەکسان بێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زێڕ بە زیو بفرۆشن هەرچۆنێک دەتانەوێ، هەروەها زیویش بە زێڕ هەر چۆنێ دەتانەوێ.

**٤٥٨٠-** «عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا رِباً إِلَّا فِي النَّسِيئَةِ»[٣].

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕیبا لە هیچ شتێکدا نیە جگە لە (النَّسِيئَة): (بریتیە لەوەی کەسێک هەزار دینار دەدات بە کەسێکی تر بۆ مانگێک بەو مەرجەی سەر مانگ هەزار دوو سەد دیناری بداتێ).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٧٥ و ٢١٨٢، ومسلم: ١٥٩٠.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٧٨ و ٢١٧٩، ومسلم: ١٠١ و ١٥٩٦/١٠٤، وإبن ماجه: ٢٢٥٧.




**٤٥٨١-** «عَنْ أَبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ يَقُولُ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: أَرَأَيْتَ هَذَا الَّذِي تَقُولُ أَشَيْئاً وَجَدْتَهُ فِي كِتَابِ اللَّهِ ﷻ، أَوْ شَيْئاً سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: مَا وَجَدْتُهُ فِي كِتَابِ اللَّهِ ﷻ، وَلَا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلَكِنْ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ أَخْبَرَنِي، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا الرِّبَا فِي النَّسِيئَةِ»[1].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: بە ئیبنو عەبباسم وت: ئایا ئەمەی کە دەیڵێی ئایا لە کتێبی خوادا بینیوتە، یان شتێکی لەو جۆرەت لە پێغەمبەرەوە بیستووە؟ وتی: نە لە کتێبی خوادا بینیومەو نە لە پێغەمبەریشەوە بیستوومە، بەڵکو ئوسامەی کوڕی زەید هەواڵی پێدام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ڕیبا لە هیچ شتێکدا نیە جگە لە (النَّسِيئَة).**

**٤٥٨٢-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كُنْتُ أَبِيعُ الْإِبِلَ بِالْبَقِيعِ، فَأَبِيعُ بِالدَّنَانِيرِ وَآخُذُ الدَّرَاهِمَ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي بَيْتِ حَفْصَةَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكَ: إِنِّي أَبِيعُ الْإِبِلَ بِالْبَقِيعِ، فَأَبِيعُ بِالدَّنَانِيرِ وَآخُذُ الدَّرَاهِمَ، قَالَ: لَا بَأْسَ أَنْ تَأْخُذَهَا بِسِعْرِ يَوْمِهَا مَا لَمْ تَفْتَرِقَا وَبَيْنَكُمَا شَيْءٌ»[2].

**واتە: ئیبنو عومەر دەڵێ: من وشترم لە بەقیع دەفرۆشت بە دینارو پارەکەیم بە درهەم وەردەگرت، هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی حەفصە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من دەمەوێ پرسیارێکت لێ بکەم: من وشتر لە بەقیع دەفرۆشم بە دینارو لە بری ئەوە درهەم وەردەگرم، فەرمووی: هیچ گرفتێکی تێدا نیە کە درهەم لە بری وەربگری بە نرخی ئەو ڕۆژە بە مەرجێ لە یەک جیانەبنەوەو شتێک لە نێوانتاندا مابێت.**

## وەرگرتنی زیو لەجیاتی زێڕ، وە زێڕیش لەجیاتی زیو، وە باسی جیاوازی دەستەواژەی ئەو کەسانەی فەرموودەکەی ئیبنو عومەریان گواستۆتەوە تیایدا.

**٤٥٨٣-** «عَنِ ابْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كُنْتُ أَبِيعُ الذَّهَبَ بِالْفِضَّةِ أَوِ الْفِضَّةَ بِالذَّهَبِ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرْتُهُ بِذَلِكَ، فَقَالَ: إِذَا بَايَعْتَ صَاحِبَكَ فَلَا تُفَارِقْهُ، وَبَيْنَكَ وَبَيْنَهُ لَبْسٌ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٣٥٤ و ٣٣٥٥، والترمذي: ١٢٤٢، وإبن ماجه: ٢٢٦٢.

(٣) ضعيف.




**واتە: ئیبنو جوبەیر دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو عومەرەوە دەڵێ: من زێڕم بە زیو دەفرۆشت یان زیو بە زێڕ، هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی ئەوەم پێدا، فەرمووی: ئەگەر شتێکت فرۆشت بە هاوەڵەکەت لێی جیامەبەرەوە لەکاتێکدا لە نێوان تۆو ئەودا نادیاریەک هەیە.**

**٤٥٨٤-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، أَنَّهُ كَانَ يَكْرَهُ أَنْ يَأْخُذَ الدَّنَانِيرَ مِنَ الدَّرَاهِمِ، وَالدَّرَاهِمَ مِنَ الدَّنَانِيرِ»[١].

**واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەگێڕێتەوە، ئەو پێی باش نەبووە لە بری دینار درهەم وەربگیرێ و لە بری درهەمیش دینار وەربگیرێ.**

**٤٥٨٥-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ: كَانَ لَا يَرَى بَأْساً، يَعْنِي فِي قَبْضِ الدَّرَاهِمِ مِنَ الدَّنَانِيرِ، وَالدَّنَانِيرِ مِنَ الدَّرَاهِمِ»[٢].

**واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو عومەرەوە، ئەو وەرگرتنی درهەم لە بری دینار، وە دیناریش لە بری درهەمی بە گرفت نەدەزانی.**

**٤٥٨٦-** «عَنْ أَبِي الْهُذَيْلِ عن إِبْرَاهِيمَ فِي قَبْضِ الدَّنَانِيرِ مِنَ الدَّرَاهِمِ: أَنَّهُ كَانَ يَكْرَهُهَا إِذَا كَانَ مِنْ قَرْضٍ»[٣].

**واتە: ئەبو هوزەیل دەگێڕێتەوە، لە ئیبراهیمەوە، لە بارەی وەرگرتنی دیناری لە بری درهەم: ئەو پێی باش نەبووە ئەگەر قەرز بوایە.**

**٤٥٨٧-** «عَنْ ابن شهاب عن سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، أَنَّهُ كَانَ لَا يَرَى بَأْساً وَإِنْ كَانَ مِنْ قَرْضٍ»[٤].

**واتە: ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە، لە سەعیدی کوڕی جوبەیر، ئەو وەرگرتنی دینار لە بری درهەم بە گرفت نەدەزانی، ئەگەر چی قەرزیش بوایە.**

**٤٥٨٨-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ بِمِثْلِهِ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: كَذَا وَجَدْتُهُ فِي هَذَا الْمَوْضِعِ»[٥].

---

(١) صحيح مقطوع.

(٢) صحيح موقوف.

(٣) صحيح مقطوع.

(٤) صحيح مقطوع.

(٥) صحيح مقطوع.




واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەگێڕێتەوە هەروەکو ئەوەی پێشوو.

## وەرگرتنی زیو لە بری زێڕ

**٤٥٨٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ: رُوَيْدَكَ أَسْأَلُكَ: إِنِّي أَبِيعُ الْإِبِلَ بِالْبَقِيعِ بِالدَّنَانِيرِ وَآخُذُ الدَّرَاهِمَ، قَالَ: لَا بَأْسَ أَنْ تَأْخُذَ بِسِعْرِ يَوْمِهَا مَا لَمْ تَفْتَرِقَا، وَبَيْنَكُمَا شَيْءٌ»[1].

واتە: ئیبنو عومەر دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتم: مۆڵەتم بدە پرسیارێکت لێ دەکەم: من وشتر لە بەقیع دەفرۆشم بە دینارو لە بری ئەوە درهەم وەردەگرم، فەرمووی: هیچ گرفتێکی تێدا نیە کە درهەم لە بری وەربگری بە نرخی ئەو ڕۆژە بە مەرجێ لە یەک جیانەبنەوەو شتێک لە نێوانتاندا مابێت.

## قەرزدانەوە بە زیاتر لە کێشانەی خۆی

**٤٥٩٠-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ دَعَا بِمِيزَانٍ فَوَزَنَ لِي وَزَادَنِي»[2].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەدینە داوای کێشانەیەکی کرد پێی کێشانە کرد بۆم و زیادیشی کرد. (لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە جابر قەرزی لای پێغەمبەر ﷺ بوو، ئەویش بۆی پێوانە کردو زیاتریشی پێیدا، بەبێ ئەوەی جابر داوای زیادەی کردبێت).

**٤٥٩١-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَضَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَزَادَنِي»[3].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەرزەکەی پێدامەوەو بۆی زیادکردم.

## قورسکردن لە کێشانە

**٤٥٩٢-** «عَنْ سُوَيْدِ بْنِ قَيْسٍ ﷺ قَالَ: جَلَبْتُ أَنَا وَمَخْرَفَةُ الْعَبْدِيُّ بَزًّا مِنْ هَجَرَ، فَأَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ بِمِنًى، وَوَزَّانٌ يَزِنُ بِالْأَجْرِ، فَاشْتَرَى مِنَّا سَرَاوِيلَ، فَقَالَ لِلْوَزَّانِ: زِنْ وَأَرْجِحْ»[4].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٤٣ و ٢٣٩٤ و ٢٦٠٤ و ٣٠٨٩، ومسلم: ٧١ و ٧١٥/٧٢، وأبو داود: ٣٣٤٧.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٣٦، والترمذي: ١٣٠٥، وإبن ماجه: ٢٢٢٠ و ٣٥٧٩.




واتە: سوەیدی کوڕی قەیس ﷺ دەڵێ: من و مەخرەمەی عەبدی جل و بەرگێکمان دەستکەوت لە هەجەر، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان و ئێمە لە مینا بووین، کێشانەکەرێکیش هەبوو بە پارە دەیکێشا، شەروالێکی لێمان کڕی، بە کێشانەکەرەکەی فەرموو: کێشانەی بکە و با قورس بێت.

**٤٥٩٣-** «عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا صَفْوَانَ ﷺ قَالَ: بِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ سَرَاوِيلَ قَبْلَ الْهِجْرَةِ، فَأَرْجَحَ لِي»[١].

واتە: سیماکی کوڕی حەرب دەڵێ: گوێم لە ئەبو صەفوان ﷺ بوو وتی: پێش کۆچکردن بۆ مەدینە شەروالێکم فرۆشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ، شەڕوالێکی قورسترو چاکتری بۆ کڕیمەوە لە نرخی خۆی زیاتر.

**٤٥٩٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْمِكْيَالُ عَلَى مِكْيَالِ أَهْلِ الْمَدِينَةِ، وَالْوَزْنُ عَلَى وَزْنِ أَهْلِ مَكَّةَ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پێوانە بە پێوانەی خەڵکی مەدینەیە (واتە: بە پێوانەی خەڵکی مەدینە کەفارەتەکان و سەرفترە دەردەکرێن)، کێشانەش بە کێشانەی خەڵکی مەککەیە، (بە دەرکردنی زەکاتی زێڕو زیو).

## فرۆشتنەوەی خواردن پێش ئەوەی وەربگیرێ

**٤٥٩٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ ابْتَاعَ طَعَاماً فَلَا يَبِعْهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس خۆراکێکی کڕی ئەوا با نەیفرۆشێت هەتا وەریدەگرێ.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٣٧، وإبن ماجه: ٢٢٢١.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٢٤ و ٢١٢٦ و ٢١٣٦، ومسلم: ٣٢ و ١٥٢٦/٣٥، وأبو داود: ٣٤٩٢ و ٣٤٩٥، وإبن ماجه: ٢٢٢٦.

٤٥٩٦- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ ابْتَاعَ طَعَاماً فَلَا يَبِعْهُ حَتَّى يَقْبِضَهُ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس خۆراکێکی کڕی ئەوا با نەیفرۆشێت تا وەریدەگرێ.

٤٥٩٧- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنِ ابْتَاعَ طَعَاماً فَلَا يَبِيعُهُ حَتَّى يَكْتَالَهُ»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس خۆراکێکی کڕی ئەوا با نەیفرۆشێت تا دەیپێوێ.

٤٥٩٨- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِمِثْلِهِ، وَالَّذِي قَبْلَهُ حَتَّى يَقْبِضَهُ»[3].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو هەروەکو ئەوەی باس کرد، وە ئەوەی پێشەوە، تا وەریدەگرێ.

٤٥٩٩- «عَنْ طَاوُسٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: أَمَّا الَّذِي نَهَى عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُبَاعَ حَتَّى يُسْتَوْفَى: الطَّعَامُ»[4].

واتە: طاوس دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عەبباس بوو دەیوت: ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردوە کە بفرۆشرێ تا وەریدەگرێ: خواردنە.

٤٦٠٠- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنِ ابْتَاعَ طَعَاماً فَلَا يَبِيعُهُ حَتَّى يَقْبِضَهُ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَأَحْسَبُ أَنَّ كُلَّ شَيْءٍ بِمَنْزِلَةِ الطَّعَامِ»[5].

واتە: ئیبنو عەبباس دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس خواردنێ بکڕێ با نەیفرۆشێ تا وەریدەگرێ، ئیبنو عەبباس دەڵێ: پێم وایە هەموو شتێک وەکو خواردن وایە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٣٣، ومسلم: ١٥٢٦/٣٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٣٢ و ٢١٣٥، ومسلم: ٢٩ و ١٥٢٥/٣١، وأبو داود: ٣٤٩٦ و ٣٤٩٧، والترمذي: ١٢٩١، وإبن ماجه: ٢٢٢٧.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح.




**٤٦٠١-** «عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَبِعْ طَعَاماً حَتَّى تَشْتَرِيَهُ وَتَسْتَوْفِيَهُ»[١].

**واتە: حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ خواردەمەنیەک مەفرۆشە تا دەیکڕی و وەریدەگری.**

**٤٦٠٢-** «عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ»[٢].

**واتە: حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ هەمان فەرموودە دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ.**

**٤٦٠٣-** «عَنْ حَكِيمُ بْنُ حِزَامٍ ﷺ قَالَ: ابْتَعْتُ طَعَاماً مِنْ طَعَامِ الصَّدَقَةِ، فَرَبِحْتُ فِيهِ قَبْلَ أَنْ أَقْبِضَهُ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: لَا تَبِعْهُ حَتَّى تَقْبِضَهُ»[٣].

**واتە: حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ دەڵێ: خواردنێکم کڕی لە خواردنی زەکات، (لە پێغەمبەر ﷺ) پێش ئەوەی وەریبگرم قازانجم لێکرد، هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەم بۆی باس کرد، فەرمووی: مەیفرۆشە هەتا وەریدەگری.**

## قەدەغەکرنی فرۆشتنی ئەوەی کڕیویەتی لە خواردەمەنی بە پێوانە تا وەریدەگری

**٤٦٠٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى أَنْ يَبِيعَ أَحَدٌ طَعَاماً اشْتَرَاهُ بِكَيْلٍ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ»[٤].

**واتە: ئیبن و عومەر دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە کەسێک خواردنێک بفرۆشێ کە کڕیویەتی بە پێوانە هەتا وەریدەگرێ.**

---

(١) صحيح.

(٢) .صحيح

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

## فرۆشتنی ئەوەی دەکڕدرێ لە خواردەمەنی بە گۆترە پێش ئەوەی بگوازرێتەوە لە شوێنەکەی

**٤٦٠٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: كُنَّا فِي زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نَبْتَاعُ الطَّعَامَ، فَيَبْعَثُ عَلَيْنَا مَنْ يَأْمُرُنَا، بِانْتِقَالِهِ مِنَ الْمَكَانِ الَّذِي ابْتَعْنَا فِيهِ إِلَى مَكَانٍ سِوَاهُ قَبْلَ أَنْ نَبِيعَهُ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خواردنمان دەکڕی، کەسێکی دەنارد فەرمانی پێدەکرین لەو شوێنەی کە کڕیومانە بیگوازینەوە بۆ شوێنێکی تر پێش ئەوەی بیفرۆشین.**

**٤٦٠٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّهُمْ كَانُوا يَبْتَاعُونَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي أَعْلَى السُّوقِ جُزَافاً، فَنَهَاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَبِيعُوهُ فِي مَكَانِهِ حَتَّى يَنْقُلُوهُ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر دەگێڕێتەوە: ئەوان لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەروی بازاڕەوە شتیان دەکڕی بە گۆترە، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردن لەوەی لە شوێنەکەی خۆیاندا بیفرۆشن هەتا دەیگوازنەوە.**

**٤٦٠٧-** «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُمْ، أَنَّهُمْ كَانُوا يَبْتَاعُونَ الطَّعَامَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الرُّكْبَانِ، فَنَهَاهُمْ أَنْ يَبِيعُوا فِي مَكَانِهِمُ الَّذِي ابْتَاعُوا فِيهِ حَتَّى يَنْقُلُوهُ إِلَى سُوقِ الطَّعَامِ»[٣].

**واتە: نافع دەگێڕێتەوە، ئیبنو عومەر بۆی باسکردن، ئەوان لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنیان لە سوارەکان دەکڕی، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی لێکردن لە شوێنەکەی خۆیاندا بیفرۆشن کە تیایدا کڕیویانە هەتا دەیگوازنەوە بۆ بازاڕی خواردەمەنی.**

**٤٦٠٨-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّاسَ يُضْرَبُونَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذَا اشْتَرَوْا الطَّعَامَ جُزَافاً أَنْ يَبِيعُوهُ حَتَّى يُؤْوُوهُ إِلَى رِحَالِهِمْ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٢٣ و ٢١٦٦ و ٢١٦٧، ومسلم: ١٥٢٧، وأبو داود: ٣٤٩٣ و ٣٤٩٤، وإبن ماجه: ٢٢٢٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٣١ و ٢١٣٧ و ٧٨٥٢، ومسلم: ٣٧ و ١٥٢٧/٣٨، وأبو داود: ٣٤٩٨.

واتە: سالم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: خەڵکیم دەبینی لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ خواردنێکی بە گۆترەیان بکڕیایە و بیان فرۆشتایە لێیان دەدرا هەتا دەیانبردە شوێنەکانی خۆیان.

## پیاو خواردنێک دەکڕێ تا ماوەیەک لەبری نرخەکەیدا شتێک لای فرۆشیار بە ڕەهن دادەنێت

٤٦٠٩- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: فَاشْتَرَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ يَهُودِيٍّ طَعَاماً إِلَى أَجَلٍ وَرَهَنَهُ دِرْعَهُ»[1].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خواردەمەنی لە جولەکەیەک کڕی زرێیەکەی خۆی بە ڕەهن لای دانا هەتا ماوەیەک.

## ڕەهن کردن لە شوێنی نیشتەجێ.

٤٦١٠- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّهُ: مَشَى إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِخُبْزِ شَعِيرٍ، وَإِهَالَةٍ سَنِخَةٍ قَالَ: وَلَقَدْ رَهَنَ دِرْعاً لَهُ عِنْدَ يَهُودِيٍّ بِالْمَدِينَةِ وَأَخَذَ مِنْهُ شَعِيراً لِأَهْلِهِ»[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ، ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ نانی جۆی بۆی برد لەگەڵ ڕۆنێک ئەوەندە مابوویەوە بۆنی گۆڕا بوو، وتی: زرێیەکی هەبوو لای جولەکەیەک داینا لە مەدینە، لە بەرانبەریدا جۆی وەرگرت بۆ خانەوادەکەی.

## فرۆشتنی ئەو شتەی لای فرۆشیار نیە

٤٦١١- «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَحِلُّ سَلَفٌ وَبَيْعٌ، وَلَا شَرْطَانِ فِي بَيْعٍ، وَلَا بَيْعُ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٦٨ و ٢٠٩٦ و ٢٢٠٠ و ٢٢٥١ و ٢٢٥٢ و ٢٣٨٦ و ٢٤٦٧ و ٢٥٠٩ و ٢٩١٦ و ٤٤٦٧، ومسلم: ١٢٤ و ١٦٠٣/١٢٥، وإبن ماجه: ٢٤٣٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٦٩ و ٢٥٠٨، والترمذي: ١٢١٥، وإبن ماجه: ٢٤٣٧.

(٣) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٠٤، والترمذي: ١٢٣٤، وإبن ماجه: ٢١٨٨.




**واتە: عەمرى کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیرەی ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە قەرز و فرۆشتن پێکەوە (وەک بڵێ: ئەم خانوەم پێ فرۆشتی بە مەرجێ هەزار دینار قەرزم پێبدەی)، هەروەها دانانی دوو مەرجیش لە فرۆشتندا، وە فرۆشتنی ئەو شتەش کە لای تۆ نیە.**

**٤٦١٢-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيْسَ عَلَى رَجُلٍ بَيْعٌ فِيمَا لَا يَمْلِكُ»[١].

**واتە: عەمرى کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیرەیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پیاو نابێ شتێ بفرۆشێ موڵکی ئەو نەبێت.**

**٤٦١٣-** «عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، يَأْتِينِي الرَّجُلُ، فَيَسْأَلُنِي الْبَيْعَ لَيْسَ عِنْدِي أَبِيعُهُ مِنْهُ، ثُمَّ أَبْتَاعُهُ لَهُ مِنَ السُّوقِ، قَالَ: لَا تَبِعْ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ»[٢].

**واتە: حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر ﷺ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پیاوێک دێت بۆ لام پرسیاری فرۆشتنی شتێکم لێ دەکات لام نیە، پاشان لە بازاڕ بۆی دەکڕم، فەرمووی: شتێ مەفرۆشە لات نەبێت.**

## (السَّلَمُ) لە خواردەمەنیدا

**تێبینی: (السَّلَمُ) فرۆشتنی ماڵێکە لە پێش چاو نەبێت، بەڵام وەسف بکرێت، پارەکەیشی لەو دانیشتنەدا وەربگیرێ، بۆ نموونە: کەسێکی خاوەن پارە بە کەسێکی جوتیار دەڵێ: ئەوە من پێنج سەد هەزارم پێدای بە سەلەمی دوو تەن گەنمی قەناری لە فڵانە ڕۆژ و لە فڵانە شوێن بمدەیتێ ئەویش پارەکە وەربیگرێ قبوڵی بکات)**

**٤٦١٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي الْمُجَالِدِ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ عَنِ السَّلَفِ قَالَ: كُنَّا نُسْلِفُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ فِي الْبُرِّ وَالشَّعِيرِ وَالتَّمْرِ إِلَى قَوْمٍ لَا أَدْرِي أَعِنْدَهُمْ أَمْ لَا»[٣].

---

(١) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٢١٩٠ و ٢١٩١ و ٢١٩٢ و ٣٢٧٣، والترمذي: ١١٨١، وإبن ماجه: ٢٠٤٧ و ٢١١١.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٠٣، والترمذي: ١٢٣٢ و ١٢٣٣، وإبن ماجه: ٢١٨٧.

(٣) صحيح.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو موجالید دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئیبنو ئەبی ئەوفی ﷺ لە بارەی سەلەم، وتی: ئێمە سەلەمان دەکرد لە سەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکرو عومەر لە گەنم و جۆو خورما لەگەڵ خەڵکدا، نەمدەزانی لایان هەیە یان نا.

## (السَّلَمُ) لە مێوژ

**٤٦١٥-** «عَنِ شُعْبَةَ قال حدثنا ابْنُ أَبِي الْمُجَالِدِ، وَقَالَ مَرَّةً: عَبْدُ اللَّهِ، وَقَالَ مَرَّةً: مُحَمَّدٌ، قَالَ: تَمَارَى أَبُو بُرْدَةَ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ شَدَّادٍ فِي السَّلَمِ، فَأَرْسَلُونِي إِلَى ابْنِ أَبِي أَوْفَى فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: كُنَّا نُسْلِمُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَعَلَى عَهْدِ أَبِي بَكْرٍ، وَعَلَى عَهْدِ عُمَرَ فِي الْبُرِّ، وَالشَّعِيرِ، وَالزَّبِيبِ، وَالتَّمْرِ إِلَى قَوْمٍ مَا نُرَى عِنْدَهُمْ، وَسَأَلْتُ ابْنَ أَبْزَى فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ»[1].

واتە: شوعبە دەڵێ: ئیبنو ئەبی موجالید بۆی باس کردین، جارێک وتی: عەبدوڵڵا دەڵێ، جارێکیش وتی: موحەممەد، دەڵێ: ئەبو بوردەو عەبدوڵڵای کوڕی شەداد مشت ومڕیان بوو لە بارەی سەلەمەوە، منیان نارد بۆ لای ئیبنو ئەبی ئەوفی، پرسیارم لێکرد، وتی: ئێمە سەلەمان دەکرد لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ و سەردەمی ئەبو بەکرو سەردەمی عومەر لە گەنم و جۆو مێوژو خورماو لەگەڵ خەڵکێکدا هیچمان لایان نەبینی (شتەکەیان نەبوو دواتر بۆیان دادەناین بە هەمان وسف) پرسیاریشم کرد لە ئیبنو ئەبزی هەمان قسەی کرد.

## (السَّلَمُ) لە بەربوومەکان

**٤٦١٦-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ وَهُمْ يُسْلِفُونَ فِي التَّمْرِ السَّنَتَيْنِ وَالثَّلَاثَ فَنَهَاهُمْ، وَقَالَ: مَنْ أَسْلَفَ سَلَفاً فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ، وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە، خەڵکی سەلەمیان دەکرد لە خورمادا بۆ دوو ساڵ و بۆ سێ ساڵ ڕێگری لێ

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٤٢ و ٢٢٤٣، وأبو داود: ٣٤٦٤ و ٣٤٦٥، وإبن ماجه: ٢٢٨٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٣٩ و ٢٢٤٠ و ٢٢٤١ و ٢٢٥٣، ومسلم: ١٢٧ و ١٦٠٤/١٢٨، وأبو داود: ٤٣٦٣، والترمذي: ١٣١١، وإبن ماجه: ٢٢٨٠.




کردن، فەرمووی: هەرکەس سەلەم لە شتێکدا دەکات، ئەوا با سەلەم لە پێوانەیەکی دیاردا بکات، وە کێشێکی دیاریکرا و بۆ ماوەیەکی دیاریکراو.

## (السَّلَمْ) کردن و بەقەرزدان لە ئاژەڵدا

**٤٦١٧-** «عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اسْتَسْلَفَ مِنْ رَجُلٍ بَكْراً، فَأَتَاهُ يَتَقَاضَاهُ بَكْرَهُ، فَقَالَ لِرَجُلٍ: انْطَلِقْ فَابْتَعْ لَهُ بَكْراً. فَأَتَاهُ فَقَالَ: مَا أَصَبْتُ إِلَّا بَكْراً رَبَاعِياً خِيَاراً، فَقَالَ: أَعْطِهِ، فَإِنَّ خَيْرَ الْمُسْلِمِينَ أَحْسَنُهُمْ قَضَاءً»[1].

**واتە: ئەبو ڕافع ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ وشترێکی لاوی لە پیاوێک وەرگرت بە سەلەم، پیاوەکە هات داوای بکات، بە پیاوێکی فەرموو: بڕۆ وشترێکی گەنجی بۆ بکڕە، پیاوەکە هاتەوە بۆ لای وتی: هیچم دەستنەکەوت جگە لە وشترێکی زۆر چاک نەبێت، فەرمووی: پێی بدە، بەڕاستی چاکترینی مسوڵمانان ئەو کەسەیە کە بە باشترین شێوە قەرزەکەی بداتەوە.**

**٤٦١٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: كَانَ لِرَجُلٍ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ سِنٌّ مِنَ الْإِبِلِ، فَجَاءَ يَتَقَاضَاهُ، فَقَالَ: أَعْطُوهُ. فَلَمْ يَجِدُوا إِلَّا سِنّاً فَوْقَ سِنِّهِ قَالَ: أَعْطُوهُ، فَقَالَ: أَوْفَيْتَنِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ خِيَارَكُمْ أَحْسَنُكُمْ قَضَاءً»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پیاوێک وشترێکی لای پێغەمبەر ﷺ بوو، هات داوای کردەوە، فەرمووی: بیدەنەوە پێی، گەڕان وشترێکیان وەکو ئەوەی خۆی نەدۆزیەوە جگە لە وشترێک نەبێت لەوەی خۆی چاکتر بوو، فەرمووی: بیدەن پێی، کابراش وتی: بەوەفا بووی لەگەڵم، فەرمووی: چاکترینتان ئەوکەسەیە کە بە چاکترین شێوە قەرزەکەی دەداتەوە.**

**٤٦١٩-** «عَنْ عِرْبَاضِ بْنَ سَارِيَةَ ﵁ يَقُولُ: بِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بَكْراً، فَأَتَيْتُهُ أَتَقَاضَاهُ، فَقَالَ: أَجَلْ، لَا أَقْضِيكَهَا إِلَّا نَجِيبَةً، فَقَضَانِي، فَأَحْسَنَ قَضَائِي، وَجَاءَهُ أَعْرَابِيٌّ يَتَقَاضَاهُ سِنَّهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَعْطُوهُ سِنّاً، فَأَعْطَوْهُ يَوْمَئِذٍ جَمَلاً، فَقَالَ: هَذَا خَيْرٌ مِنْ سِنِّي، فَقَالَ: خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ قَضَاءً»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٠٠، وأبو داود: ٣٣٤٦، والترمذي: ١٣١٨، وإبن ماجه: ٢٢٨٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٠٥ و ٢٣٠٦ و ٢٣٩٠ و ٢٣٩٢ و ٢٣٩٣ و ٢٤٠١ و ٢٦٠٦ و ٢٦٠٩، ومسلم: ١٢٠ و ١٦٠١/١٢٢، والترمذي: ١٣١٦ و ١٣١٧، وإبن ماجه: ٢٣٢٣.

(٣) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٢٢٨٦.




واتە: عیرباضی کوڕی ساریە ﷛ دەڵێ: وشترێکی لاوم فرۆشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ، هاتم بۆ لای داوای نرخەکەم لێکرد، فەرمووی: بەڵێ، دانەیەکی چاکت دەدەمەوە، بۆی بژاردم بە دانەیەکی چاکتر لەوەی خۆم، کابرایەکی دەشتەکیش هات داوای وشترەکەی خۆی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وشترێکی بدەنێ، ئەو ڕۆژە وشترێکی چاکتریان پێدا، فەرمووی: ئەمە لە وشترەکەی خۆم چاکترە، فەرمووی: چاکترینتان ئەوانەن کە بە باشترین شێوە قەرزەکانیان دەدەنەوە.

## فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵ بە قەرز

**٤٦٢٠-** «عَنْ سَمُرَةَ ﷛، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: نَهَى عَنْ بَيْعِ الْحَيَوَانِ بِالْحَيَوَانِ نَسِيئَةً»[١].

واتە: سەمورە ﷛ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵی قەدەغەکرد بە شێوەی قەرز.

## فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵ دەست بە دەست و نرخی یەکێکیان لەویتر زیاتر بێت.

**٤٦٢١-** «عَنْ جَابِرٍ ﷛ قَالَ: جَاءَ عَبْدٌ فَبَايَعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْهِجْرَةِ، وَلَا يَشْعُرُ النَّبِيُّ ﷺ أَنَّهُ عَبْدٌ، فَجَاءَ سَيِّدُهُ يُرِيدُهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: بِعْنِيهِ فَاشْتَرَاهُ بِعَبْدَيْنِ أَسْوَدَيْنِ، ثُمَّ لَمْ يُبَايِعْ أَحَداً بَعْدُ حَتَّى يَسْأَلَهُ: أَعَبْدٌ هُوَ؟»[٢].

واتە: جابر ﷛ دەڵێ: کۆیلەیەک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بەیعەتی پێدا لەسەر هیجرەت، پێغەمبەر ﷺ نەیزانی ئەوە کۆیلەیە، گەورەکەی هات دەیویستەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پێم بفرۆشە، بە دوو کۆیلەی ڕەش کڕی، پاشان بەیعەتی وەرنەدەگرت لە هیچ کەسێک تا پرسیاری دەکرد: ئایا ئەوە کۆیلەیە؟

فرۆشتنی بێچووی ئاژەڵی دووگیان (دوو جۆرە:

یەکەم: بریتیە لە فرۆشتنی بێچوویەک هێشتا لە سکی دایکیدایە، ئەمە پێی دەوترێ: (حمل الحوامل).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٥٦، والترمذي: ١٢٣٧، وإبن ماجه: ٢٢٧٠.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٠٢، وأبو داود: ٣٣٥٨، والترمذي: ١٢٣٩ و ١٥٩٦، وإبن ماجه: ٢٨٦٩.




دووەم: بریتیە لە فرۆشتنی بێچووی ئەو بێچووەی کە لە سکی دایکیدایە، واتە: ئەم بێچووەی لە سکی دایکیدایە مێ بێت، پاشان لە دایک بێت، دواتر ئاوس بێت بێچویەکی تری ببێت، ئەمە پێی دەوترێ: (حمل المحمول).

## کڕین و فرۆشتنی بێچووی ئاژەڵی ئاوس

**٤٦٢٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: السَّلَفُ فِي حَبَلِ الْحَبَلَةِ رِباً»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سەلەم (قەرز) لە بێچووی ئاژەڵی ئاوسدا ڕیبایە.

**٤٦٢٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ حَبَلِ الْحَبَلَةِ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد لە فرۆشتنی بێچووی ئاژەڵی ئاوس.(کەهێشتا لە سکیدایە).

**٤٦٢٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ حَبَلِ الْحَبَلَةِ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد لە فرۆشتنی بێچووی ئاژەڵی ئاوس.(کە هێشتا لە سکیدایە).

## شیکردنەوەی فرۆشتنی بێچووی دوو گیان

**٤٦٢٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: نَهَى عَنْ بَيْعِ حَبَلِ الْحَبَلَةِ، وَكَانَ بَيْعاً يَتَبَايَعُهُ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ، كَانَ الرَّجُلُ يَبْتَاعُ جَزُوراً إِلَى أَنْ تُنْتِجَ النَّاقَةُ، ثُمَّ تُنْتِجُ الَّتِي فِي بَطْنِهَا»[٤].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد لە فرۆشتنی بێچووی ئاژەڵی ئاوس، ئەوە کڕین و فرۆشتنێک بوو خەڵکانی سەردەمی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٤٣ و ٢٢٥٦ و ٣٨٤٣، ومسلم: ٥ و ١٥١٤/٦، وأبو داود: ٣٣٨٠ و ٣٣٨١، والترمذي: ١٢٢٩، وإبن ماجه: ٤١٩٧.

(٤) صحيح.




نەفامی دەیانکرد، کەسێک وشترێکی دەکڕی (کە لە سکی وشترێک دایە)، تا وشترەکە بێچووی دەبوو، پاشان ئەوەش کە لە سکی ئەویشدا دروست دەبێت و لەدایک دەبێت.

## فرۆشتن بۆ ماوەی چەند ساڵێک (وەک ئەوەی بڵێ: بەرهەمی ئەم باخە هەنارەت پێدەفرۆشم بۆ ماوەی سێ ساڵ بە ئەوەندە هەزار دینار، دوای سێ ساڵەکە زەوی و باخەکەو ئەوەی لەناویدایە هەمووی هی خۆمە).

**٤٦٢٦-** «عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ السِّنِينَ»[١].

واتە: جابر رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فرۆشتنی بۆ ماوەی چەند ساڵێکی قەدەغە کرد. (بۆ نموونە: بڵێ: بەرهەمی باخەکەمت پێدەفرۆشم بۆ ماوەی دوو ساڵ).

**٤٦٢٧-** «عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ السِّنِينَ»[٢].

واتە: جابر رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فرۆشتنی بۆ ماوەی چەند ساڵێکی قەدەغە کرد. (بۆ نموونە: بڵێ: بەرهەمی باخەکەمت پێدەفرۆشم بۆ ماوەی دوو ساڵ).

## فرۆشتن بۆ ماوەیەکی دیاریکراو

**٤٦٢٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بُرْدَيْنِ قِطْرِيَّيْنِ، وَكَانَ إِذَا جَلَسَ فَعَرِقَ فِيهِمَا ثَقُلَا عَلَيْهِ، وَقَدِمَ لِفُلَانٍ الْيَهُودِيِّ بَزٌّ مِنَ الشَّأْمِ، فَقُلْتُ: لَوْ أَرْسَلْتَ إِلَيْهِ فَاشْتَرَيْتَ مِنْهُ ثَوْبَيْنِ إِلَى الْمَيْسَرَةِ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: قَدْ عَلِمْتُ مَا يُرِيدُ مُحَمَّدٌ، إِنَّمَا يُرِيدُ أَنْ يَذْهَبَ بِمَالِي أَوْ يَذْهَبَ بِهِمَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَذَبَ، قَدْ عَلِمَ أَنِّي مِنْ أَتْقَاهُمْ لِلَّهِ، وَآدَاهُمْ لِلْأَمَانَةِ»[٣].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو کراسی خەت داری لەلا بوو سور دەیڕوانی، زبریەکی تێدا بوو کاتێ دانیشتایە بێزاری دەکرد، فڵانە کەسی جولەکە لە شامەوە کراسی هێنابوو، وتم: ئەگەر بنێری بە دواییدا دوو کراسی لێ بکڕی تا کاتێکی دیاریکراو و بارودۆخ چاکتر دەبێت، ئەویش ناردی

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٢١٣.




بە دوایدا، وتی: دەزانم موحەممەد چی دەوێ، یان هەموو ماڵەکەم ببات یان دوو کراس ببات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: درۆی کرد، چاک زانیویەتی من لە خواترسترین کەسیانم و لە هەموویان زیاتر ئەسپاردە دەپارێزم.

## قەرزو فرۆشتن پێکەوە، ئەویش بریتیە لەوەی کەلو پەلێ بفرۆشێ بە مەرجێ کڕیارەکە قەرزێکی پێبدات.

**٤٦٢٩-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ سَلَفٍ وَبَيْعٍ، وَشَرْطَيْنِ فِي بَيْعٍ، وَرِبْحِ مَا لَمْ يُضْمَنْ»[١].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیرەی ، پێغەمبەری خوا ﷺ قەرز و فرۆشتنی پێکەوە قەدەغە کرد (وەک بڵێ: ئەم خانووەم پێ فرۆشتی بە مەرجێ هەزار دینار قەرزم پێبدەی)، وە دوو مەرجیش لە فرۆشتنێکدا، (وەک بڵێ: ئەو شتەت پێ دەفرۆشم بە نەقد بە ئەوەندە و بە قست و قەرزیش بەوەندە، یەکێکیشیان دیاری نەکرێت) وە لە فرۆشتنی شتێک کە زەمانەتی نیە (ئەویش قازانجی شتێکی فرۆشراوە، کریویەتی پاشان لەو شوێنەدا فرۆشتویەتی پێش ئەوەی لە ژێر دەستی فرۆشیاری یەکەم بگوازێتەوە بۆ ژێر دەستی خۆی).

## دوو مەرج لە فرۆشتنێکدا، ئەویش ئەوەیە کە بڵێ: ئەم کەلوپەلەت پێدەفرۆشم هەتا مانگێک بە ئەوەندە، وە تا دوو مانگ بە ئەوەندە.

**٤٦٣٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يَحِلُّ سَلَفٌ وَبَيْعٌ، وَلَا شَرْطَانِ فِي بَيْعٍ، وَلَا رِبْحُ مَا لَمْ يُضْمَنْ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵا کوڕی عەمر دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (قەرزو فرۆشتن پێکەوە حەڵاڵ نیە،(وەک بڵێ: ئەم خانووەم پێ فرۆشتی بە مەرجێ هەزار دینار قەرزم پێبدەی)، وە دوو مەرجیش لە فرۆشتنێکدا، (وەک بڵێ: ئەو شتەت پێ دەفرۆشم بە نەقد بە ئەوەندە و بە قست و قەرزیش بەوەندە، یەکێکیشیان

---

(١) حسن صحيح.

(٢) حسن صحيح.




دیاری نەکرێت) وە فرۆشتنی شتێک هێشتا زەمانەتی نیە (ئەویش قازانجی شتێکی فرۆشراوە، کریویەتی پاشان لەو شوێنەدا فرۆشتویەتی پێش ئەوەی لە ژێر دەستی فرۆشیاری یەکەم بگوازێتەوە بۆ ژێر دەستی خۆی).

**٤٦٣١-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ سَلَفٍ وَبَيْعٍ، وَعَنْ شَرْطَيْنِ فِي بَيْعٍ وَاحِدٍ، وَعَنْ بَيْعِ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ، وَعَنْ رِبْحِ مَا لَمْ يُضْمَنْ»[١].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیرەیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەرز و فرۆشتن پێکەوە قەدەغە کرد، وە دوو مەرجیش لە فرۆشتنیکدا، وە فرۆشتنی شتێک لەلات نیە، وە فرۆشتنی شتێک هێشتا زەمانەتی نەکەوتوەتە ئەستۆی.

## دوو فرۆشتن لە فرۆشتنێکدا، وەک ئەوەی بڵێ: ئەم کەلوپەلەت پێدەفرۆشم بە سەد درهەم حازرو دووسەد درهەم قەرز.

**٤٦٣٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَةٍ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو فرۆشتنی لە فرۆشتنێکدا قەدەغە کرد.

## قەدەغە کردن لەو کڕین و فرۆشتنەی بەرەو نادیاری دەڕوات تا یەکلا دەبێتەوە.

**٤٦٣٣-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُحَاقَلَةِ، وَالْمُزَابَنَةِ، وَالْمُخَابَرَةِ، وَعَنِ الثُّنْيَا إِلَّا أَنْ تُعْلَمَ»[٣].

---

(١) حسن صحيح.

(٢) حسن صحيح. أخرجه الترمذي: ١٢٣١.

(٣) صحيح.

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ (الْمُخَابَرَة) و (الْمُزَابَنَة) و (الْمُحَاقَلَة) ی قەدەغە کرد، هەروەها لەو کڕین و فرۆشتنەی کە جیاکردنەوەیەکی نەزانراوی تێدایە، بەڵام ئەگەر زانرا ئەوە دروستە.

(ڕونکردنەوە: (الثُّنْيَا): بریتیە لەوەی کەسێک شتێک بفرۆشێت و هەندێکی لێ جیا بکاتەوە بۆ نموونە: بڵێ ئەم باخەت پێ دەفرۆشم جگە لەو دارانە نەبێت، ئەو دارانەش دیاریکراو نین، ئەمەش ناکۆکی دەخاتە نێوان کڕیار و فرۆشیار، لەبەر ئەوە قەدەغەکراوە چونکە مەرجێکی پووچی تێدایە).

**٤٦٣٤-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمُحَاقَلَةِ، الْمُزَابَنَةِ، وَالْمُخَابَرَةِ، وَالْمُعَاوَمَةِ، وَالثُّنْيَا، وَرَخَّصَ فِي الْعَرَايَا»[١].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ (الْمُحَاقَلَة) و (الْمُزَابَنَة) و (الْمُخَابَرَة) و (الْمُعَاوَمَة) و (الثُّنْيَا)، وە مۆڵەتیشی داوە بە عەرایا.( الْمُعَاوَمَة): (بریتیە لەوەی بەرهەمی باخەکەی بفرۆشێت بۆ ماوەی دوو ساڵ یان سێ ساڵ ئەم کڕین و فرۆشتنە بە یەکدەنگی زانایان پووچە، چونکە فرۆشتنێکی نادیارە توانای وەرگرتنەوەی نرخەکەی نیە).

## باخی دار خورما بنچینەکەی دەفرۆشرێ، بەڵام کڕیار بەرهەمەکەی جیادەکاتەوە بۆ ئەوکەسەی فرۆشتویەتی

**٤٦٣٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا امْرِئٍ أَبَّرَ نَخْلاً، ثُمَّ بَاعَ أَصْلَهَا فَلِلَّذِي أَبَّرَ ثَمَرُ النَّخْلِ إِلَّا أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس باخە دار خورمایەک موتوربە بکات، پاشان بنچینەکەی فرۆشت ئەوە بەرهەمی ئەو دارخورما بۆ ئەو کەسەیە کە موتوربەی کردوە، مەگەر کڕیارەکە لە کاتی کڕیندا مەرجی دابنێت.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٣٦/٨٥، وأبو داود: ٣٣٧٥ و ٣٤٠٤، والترمذي: ١٣١٣، وإبن ماجه: ٢٢٦٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٠٣ و ٢٢٠٤ و ٢٢٠٦ و ٢٧١٦، ومسلم: ٧٧ و ١٥٤٣/٧٩، وأبو داود: ٣٤٣٤ و ٣٩٦٢، وإبن ماجه: ٢٢١٠ و ١٢١٢ و ٢٥٢٩.




## کۆیلە دەفرۆشرێ، بەڵام کڕیار ماڵ و سامانەکەی جیادەکاتەوە لە فرۆشیار

٤٦٣٦- «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنِ ابْتَاعَ نَخْلاً بَعْدَ أَنْ تُؤَبَّرَ فَثَمَرَتُهَا لِلْبَائِعِ، إِلَّا أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ، وَمَنْ بَاعَ عَبْداً وَلَهُ مَالٌ فَمَالُهُ لِلْبَائِعِ إِلَّا أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ»[١].

واتە: سالم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس باخە دارخورمایەک بکڕێ دوای ئەوەی موتوربەکراوە ئەوە بەرهەمەکەی بۆ فرۆشیارە، مەگەر کڕیارەکە لە کاتی کڕیندا مەرجی دانابێت، هەرکەسیش کۆیلەیەک بفرۆشێ ئەو کۆیلەیە ماڵ و سامانی هەبێ ئەوە ماڵەکەی بۆ فرۆشیارە، مەگەر کڕیارەکە مەرجی دانابێت (لەسەرەتای مامەڵەکە).

## کڕین و فرۆشتن مەرجی تێدا بێت، ئەوە هەم کڕین و فرۆشتنەکە و هەم مەرجەکەیش دروستن.

٤٦٣٧- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَأَعْيَا جَمَلِي، فَأَرَدْتُ أَنْ أُسَيِّبَهُ، فَلَحِقَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَدَعَا لَهُ، فَضَرَبَهُ، فَسَارَ سَيْراً لَمْ يَسِرْ مِثْلَهُ، فَقَالَ: بِعْنِيهِ بِوُقِيَّةٍ؟، قُلْتُ: لَا. قَالَ: بِعْنِيهِ؟ فَبِعْتُهُ بِوُقِيَّةٍ، وَاسْتَثْنَيْتُ حُمْلَانَهُ إِلَى الْمَدِينَةِ، فَلَمَّا بَلَغْنَا الْمَدِينَةَ أَتَيْتُهُ بِالْجَمَلِ، وَابْتَغَيْتُ ثَمَنَهُ، ثُمَّ رَجَعْتُ فَأَرْسَلَ إِلَيَّ، فَقَالَ: أَتُرَانِي إِنَّمَا مَاكَسْتُكَ لِآخُذَ جَمَلَكَ، خُذْ جَمَلَكَ وَدَرَاهِمَكَ»[٢].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: من لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە گەشتێکدا بووم، وشترەکەم ماندوو بوو ویستم وازی لێ بهێنم، پێغەمبەری خوا ﷺ پێمگەیشت و دوعای بۆ کردو لێیدا، پاشان بەشێوەیەک دەڕۆیشت هەرگیز وا نەڕۆیشتبوو، فەرمووی: پێم بفرۆشە بە ئوقیەیەک؟ وتم: نا (با بێ بەرامبەر بۆ تۆ بێت)، فەرمووی: پێم بفرۆشە، پێم فرۆشت بە ئوقیەیەک، بە مەرجێک بارەکەم لەسەری بێ تا مەدینە، کاتێ گەیشتینە مەدینە وشترەکەم بۆی هێنا، نرخەکەیم وەرگرت، پاشان گەڕامەوە ناردی بە دوامدا، فەرمووی: ئایا وا دەزانی لەبەر ئەوە نرخی وشترەکەتم کەمکرد بۆ ئەوەی بیبەم، وشترەکەو درهەمەکانت ببەرەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٧٩، ومسلم: ١٥٤٣/٨٠، وأبو داود: ٣٤٣٣، والترمذي: ١٢٤٤، وإبن ماجه: ٢٢١١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٩٧، ومسلم: ٧١٥، وأبو داود: ٣٥٠٥، والترمذي: ١٢٥٣، وإبن ماجه: ٢٢٠٥.




**٤٦٣٨-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: غَزَوْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى نَاضِحٍ لَنَا، ثُمَّ ذَكَرْتُ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، ثُمَّ ذَكَرَ كَلَاماً مَعْنَاهُ، فَأُزْحِفَ الْجَمَلُ فَزَجَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَانْتَشَطَ حَتَّى كَانَ أَمَامَ الْجَيْشِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: يَا جَابِرُ، مَا أَرَى جَمَلَكَ إِلَّا قَدْ انْتَشَطَ، قُلْتُ: بِبَرَكَتِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: بِعْنِيهِ، وَلَكَ ظَهْرُهُ حَتَّى تَقْدَمَ فَبِعْتُهُ، وَكَانَتْ لِي إِلَيْهِ حَاجَةٌ شَدِيدَةٌ، وَلَكِنِّي اسْتَحْيَيْتُ مِنْهُ، فَلَمَّا قَضَيْنَا غَزَاتَنَا وَدَنَوْنَا اسْتَأْذَنْتُهُ بِالتَّعْجِيلِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي حَدِيثُ عَهْدٍ بِعُرْسٍ، قَالَ: أَبِكْراً تَزَوَّجْتَ أَمْ ثَيِّباً؟ قُلْتُ: بَلْ ثَيِّباً يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو أُصِيبَ، وَتَرَكَ جَوَارِيَ أَبْكَاراً، فَكَرِهْتُ أَنْ آتِيَهُنَّ بِمِثْلِهِنَّ، فَتَزَوَّجْتُ ثَيِّباً تُعَلِّمُهُنَّ وَتُؤَدِّبُهُنَّ، فَأَذِنَ لِي، وَقَالَ لِي: ائْتِ أَهْلَكَ عِشَاءً. فَلَمَّا قَدِمْتُ، أَخْبَرْتُ خَالِي بِبَيْعِي الْجَمَلَ فَلَامَنِي، فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ غَدَوْتُ بِالْجَمَلِ، فَأَعْطَانِي ثَمَنَ الْجَمَلِ وَالْجَمَلَ، وَسَهْماً مَعَ النَّاسِ»[1].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ غەزام کرد لەسەر وشترێکی خۆمان کە بە ڕۆژ کاری پێ دەکراو نەیدەتوانی بە شەو ڕێگای دوروو درێژ ببڕێ، دواتر باسی فەرموودەکەم کرد بە دورو و درێژی،-پاشان شتێکی باسکرد ماناکەی ئەوەبوو- وشترەکە ماندوو بوو وەستا پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی کرد، پاشان چالاک بوویەوە بە جۆرێک کەوتە پێش لەشکرەکە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی جابر، وا دەبینم وشترەکەت چالاک بوەتەوە، وتم: بە بەرەکەتی تۆیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: پێم بفرۆشە، پشتیشی بۆ تۆ تا دەگەیت بە شوێنی مەبەست، منیش پێم فرۆشت، من زۆر پێویستم پێی بوو بەڵام شەرمم لێی کرد، کاتێ غەزاکەمان تەواو کردو نزیک بوینەوە مۆڵەتم لێ خواست بە پەلەکردن، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من تازە ژنم هێناوە، فەرمووی: کچە یان بێوەژنە؟ وتم: بەڵکو بێوەژنە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، باوکم عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ (لە ڕۆژی ئوحودا) شەهید بوو، کۆمەڵە کچێکی تازە پێگەیشتووی بەجێهێشتووە، حەزم نەکرد کچێک بخوازم هاوتەمەنی ئەوان بێت، بێوەژنێکم خواست تا فێریان بکات و پەروەردەیان بکات، مۆڵەتی پێ دام و پێمی فەرموو: بۆ عیشا بڕۆرەوە بۆ ماڵ، کاتێ کە گەیشتم هەواڵمدا بە خاڵۆم بەوەی وشترەکەم فرۆشتووە، ئەویش سەرزەنشتی کردم، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت، سەر لە بەیانی نرخی وشترەکەو وشترەکەیشی پێم دایەوە، وە بەشێکی دەستکەوتیش لەگەڵ خەڵکەکەدا.**

---

(١) صحيح.

**٤٦٣٩-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، وَكُنْتُ عَلَى جَمَلٍ، فَقَالَ: مَا لَكَ فِي آخِرِ النَّاسِ؟ قُلْتُ: أَعْيَا بَعِيرِي، فَأَخَذَ بِذَنَبِهِ، ثُمَّ زَجَرَهُ، فَإِنْ كُنْتُ إِنَّمَا أَنَا فِي أَوَّلِ النَّاسِ يُهِمُّنِي رَأْسُهُ، فَلَمَّا دَنَوْنَا مِنَ الْمَدِينَةِ، قَالَ: مَا فَعَلَ الْجَمَلُ، بِعْنِيهِ؟، قُلْتُ: لَا، بَلْ هُوَ لَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: لَا، بَلْ بِعْنِيهِ، قُلْتُ: لَا، بَلْ هُوَ لَكَ، قَالَ: لَا، بَلْ بِعْنِيهِ، قَدْ أَخَذْتُهُ بِوُقِيَّةٍ ارْكَبْهُ، فَإِذَا قَدِمْتَ الْمَدِينَةَ فَأْتِنَا بِهِ، فَلَمَّا قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ جِئْتُهُ بِهِ، فَقَالَ لِبِلَالٍ: يَا بِلَالُ زِنْ لَهُ أُوقِيَّةً، وَزِدْهُ قِيرَاطاً، قُلْتُ: هَذَا شَيْءٌ زَادَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَلَمْ يُفَارِقْنِي، فَجَعَلْتُهُ فِي كِيسٍ فَلَمْ يَزَلْ عِنْدِي حَتَّى جَاءَ أَهْلُ الشَّامِ يَوْمَ الْحَرَّةِ، فَأَخَذُوا مِنَّا مَا أَخَذُوا»[١].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: من لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتێکدا بووم، لەسەر وشترێک بووم، فەرمووی: ئەوە چیە لە دواوەی خەڵکەکەی؟ وتم: وشترەکەم ماندوو بووە، کلکی گرت و ڕای تەکاند، کاتێک خۆم دۆزیەوە لە پێشی هەموو خەڵکەکەوە بووم، کاتێ نزیک بوینەوە لە مەدینە، فەرمووی: وشترەکەت چی کرد، پێم بفرۆشە؟ وتم: نا، بەڵکو پێشکەش بە تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: نا، پێم بفرۆشە، وتم: نا بەڵکو بۆ تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: نا، پێم بفرۆشە، ئەوە بە ئوقیەیەک کڕیم خۆت سواری ببە، کاتێ گەیشتیتە مەدینە بێ بۆ لامان، کاتێ کە گەیشتمە مەدینە چوومە خزمەتی، بە بیلالی فەرموو: ئەی بیلال ئوقیەیەکی بۆ بکێشەو قیراتێکیش زیاتر، وتم: ئەمە شتێکە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی زیادکردووم لێم جیانابێتەوە بۆیە خستمە ناو کیسەیەکەوەو بە بەردەوام لە لام بوو، تا خەڵکی شام لە ڕۆژی (الْحَرَّة)دا هاتن و ئەوەی هەمبوو بردیان.**

**٤٦٤٠-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: أَدْرَكَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَكُنْتُ عَلَى نَاضِحٍ لَنَا سَوْءٍ، فَقُلْتُ: لَا يَزَالُ لَنَا نَاضِحُ سَوْءٍ يَا لَهْفَاهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: تَبِيعُنِيهِ يَا جَابِرُ؟ قُلْتُ: بَلْ هُوَ لَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ، قَدْ أَخَذْتُهُ بِكَذَا وَكَذَا، وَقَدْ أَعَرْتُكَ ظَهْرَهُ إِلَى الْمَدِينَةِ. فَلَمَّا قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ، هَيَّأْتُهُ، فَذَهَبْتُ بِهِ إِلَيْهِ، فَقَالَ: يَا بِلَالُ، أَعْطِهِ ثَمَنَهُ، فَلَمَّا أَدْبَرْتُ، دَعَانِي، فَخِفْتُ أَنْ يَرُدَّهُ، فَقَالَ: هُوَ لَكَ»[٢].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) ضعيف الإسناد، منكر المتن.**




واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمگەیشت وشترێکی خۆمانم لەلا بوو ماندوو بوو بوو چونکە بە ڕۆژ کاری پێ دەکراو نەیدەتوانی بە شەو ڕێگای دوورو درێژ ببڕێ، قیافەی بە خۆوە نەبوو، وتم: بە بەردەوام ئێمە وشتری بێ قیافەی لەو جۆرەمان هەیە، ئاخ لە تۆ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی جابر، پێم دەفرۆشی؟ وتم: بەڵکو ئەوە پێشکەشە بە تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: خوایە لێی خۆشبەو ڕەحمی لێ بکە، ئەوە بە ئەوەندەو ئەوەندە وەرم گرت، فەرمووی: پشتیشیم بە ئەمانەت دا بە تۆ هەتا مەدینە، کاتێ گەیشتمە مەدینە وشترەکەم ئامادەکردو بردم بۆی، فەرمووی: ئەی بیلال نرخەکەی پێ بدە، کاتێ پشتم هەڵکرد ترسام لەوەی بیگەڕێنێتەوە، فەرمووی: وشترەکەش بۆ تۆ.

**٤٦٤١-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كُنَّا نَسِيرُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا عَلَى نَاضِحٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَتَبِيعُنِيهِ بِكَذَا وَكَذَا، وَاللَّهُ يَغْفِرُ لَكَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، هُوَ لَكَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ، قَالَ: أَتَبِيعُنِيهِ بِكَذَا وَكَذَا، وَاللَّهُ يَغْفِرُ لَكَ، قُلْتُ: نَعَمْ، هُوَ لَكَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ، قَالَ: أَتَبِيعُنِيهِ بِكَذَا وَكَذَا، وَاللَّهُ يَغْفِرُ لَكَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، هُوَ لَكَ، قَالَ أَبُو نَضْرَةَ: وَكَانَتْ كَلِمَةً يَقُولُهَا الْمُسْلِمُونَ، افْعَلْ كَذَا وَكَذَا وَاللَّهُ يَغْفِرُ لَكَ»[١].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوین، منیش لە سەر وشترێکی خۆمان بووم کە بە ڕۆژ کاری پێ دەکراو نەیدەتوانی بە شەو ڕێگای دوورو درێژ ببڕێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا پێم دەفرۆشی بە ئەوەندەو ئەوەندە، خوا لێت خۆش بێت؟ وتم: بەڵێ، ئەوە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئایا پێم دەفرۆشی بە ئەوەندەو ئەوەندە، خوا لێت خۆش بێت؟ وتم: بەڵێ، ئەوە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئایا پێم دەفرۆشی بە ئەوەندەو ئەوەندە، خوا لێت خۆش بێت؟ وتم: بەڵێ، ئەوە بۆ تۆ، ئەبو نەضرە دەڵێ: ئەمە وشەیەک بوو کە مسوڵمانان (لە کاتی مامەڵەدا) دەیانوت بیفرۆشە بە ئەوەندەو ئەوەندە، خوا لێت خۆش بێت.

---

(١) صحيح.




## ئەو فرۆشتنەی مەرجێکی خراپی تێدایە، فرۆشتنەکە دروستە و مەرجەکەش پووچە

**٤٦٤٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: اشْتَرَيْتُ بَرِيرَةَ، فَاشْتَرَطَ أَهْلُهَا وَلَاءَهَا، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: أَعْتِقِيهَا، فَإِنَّ الْوَلَاءَ لِمَنْ أَعْطَى الْوَرِقَ، قَالَتْ: فَأَعْتَقْتُهَا، قَالَتْ: فَدَعَاهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَخَيَّرَهَا مِنْ زَوْجِهَا، فَاخْتَارَتْ نَفْسَهَا وَكَانَ زَوْجُهَا حُرّاً»[1].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بەریرەم کڕی، کەسوکارەکەی مەرجی ئەوەیان هەبوو وەلائی بۆ ئەوان بێت، ئەوەم باس کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئازادی بکە، بێگومان وەلاء بۆ ئەو کەسەیە ئازادی دەکات، وتی: منیش ئازادم کرد، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردو سەرپشکی کرد کە ئاخۆ لای مێردەکەی دەمێنێتەوە یان نا، بۆیە خۆی هەڵبژاردو لە مێردەکەی جیابویەوە لە کاتێکدا مێردی ئازاد بوو.**

**٤٦٤٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا أَرَادَتْ أَنْ تَشْتَرِيَ بَرِيرَةَ لِلْعِتْقِ، وَأَنَّهُمُ اشْتَرَطُوا وَلَاءَهَا، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اشْتَرِيهَا فَأَعْتِقِيهَا، فَإِنَّ الْوَلَاءَ لِمَنْ أَعْتَقَ وَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِلَحْمٍ فَقِيلَ: هَذَا تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ فَقَالَ: هُوَ لَهَا صَدَقَةٌ، وَلَنَا هَدِيَّةٌ، وَخُيِّرَتْ»[2].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە:ئەو ویستی بەریرە بکڕێ بۆ ئەوەی ئازادی بکات، ئەوانیش مەرجی ئەوەیان هەبوو وەلائی بۆ ئەوان بێت، ئەوەی باس کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیکڕەو ئازادی بکە، چونکە وەلاء بۆ ئەو کەسەیە ئازادی دەکات، پێغەمبەری خوا ﷺ گۆشتی بۆ هێنرا، وترا: ئەمە بەخشیویانە بە بەریرە، فەرمووی: ئەوە بۆ ئەو بەخشینە و بۆ ئێمەش دیاریە، هەروەها سەرپشکی کرد (لەوەی کە ئاخۆ لای مێردەکەی دەمێنێتەوە یان نا).**

**٤٦٤٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ عَائِشَةَ، أَرَادَتْ أَنْ تَشْتَرِيَ جَارِيَةً تَعْتِقُهَا، فَقَالَ أَهْلُهَا: نَبِيعُكِهَا عَلَى أَنَّ الْوَلَاءَ لَنَا، فَذَكَرَتْ ذَلِكِ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: لَا يَمْنَعُكِ ذَلِكِ، فَإِنَّ الْوَلَاءَ لِمَنْ أَعْتَقَ»[3].

---

(١) صحيح دون قوله: «وَكَانَ زَوْجُهَا حُرّاً» فإنه شاذ، والمحفوظ أنه كان عبداً.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٥٦ و ٢١٦٩ و ٢٥٦٢ و ٦٧٥٢ و ٦٧٥٧ و ٦٧٥٩، وأبو داود: ٢٩١٥.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە، عائیشە ویستی کەنیزەکێک بکڕێ و ئازادی بکات، کەسوکارەکەی وتیان: پێت دەفرۆشین بەو مەرجەی وەلائی بۆ ئێمە بێت، ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، فەرمووی: ئەوە ڕێگریت لێ ناکات بیکڕیت و ئازادی بکەیت، چونکە وەلاء بۆ ئەو کەسەیە ئازادی دەکات.

## فرۆشتنی دەستکەوت و غەنیمەتەکان پێش دابەشکردنیان

**٤٦٤٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الْمَغَانِمِ حَتَّى تُقْسَمَ، وَعَنِ الْحَبَالَى أَنْ يُوطَأْنَ حَتَّى يَضَعْنَ مَا فِي بُطُونِهِنَّ، وَعَنْ لَحْمِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ»(١).

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە فرۆشتنی دەستکەوت تا دابەش دەکرێ، وە لە فرۆشتنی بێچوو لە سکی دایکەکەیدا تا ئەوەی لەناو سکیدایە دایدەنێت، وە لە گۆشتی هەموو خاوەن کەڵپەیەک لە درندەکان.

## فرۆشتنی (الْمَشَاع)

تێبینی: (الْمَشَاع) واتە بڵاو، بەڵام لێرەدا مەبەستی ئەوەیە تۆماڵێکت هەیە شەریکی لەگەڵ کەسێکی تردا، دەتەوێ بەشەکەی خۆت بفرۆشیت)

**٤٦٤٦-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الشُّفْعَةُ فِي كُلِّ شِرْكٍ رَبْعَةٍ أَوْ حَائِطٍ، لَا يَصْلُحُ لَهُ أَنْ يَبِيعَ حَتَّى يُؤْذِنَ شَرِيكَهُ، فَإِنْ بَاعَ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ حَتَّى يُؤْذِنَهُ»(٢).

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شوفعە: (مافێکی ڕاستەقینەی شەریکە کۆنەکەیە بەسەر شەریکە تازەکەدا، لەو شتەی کە لەنێوان هەردووکیاندایە بۆ نموونە: ئەگەر دوو کەس پێکەوە زەویەکیان کڕی بێت بە (١٠) ملیۆن دینار یەکێکیان ویستی بەشەکەی خۆی بفرۆشێت پێویستە سەرەتا پرسی شەریکەکەی بکات و بیفرۆشێت بە ئەو چونکە ئەو لەپێشترە) لە هەموو شەریکیەکدا هەیە وەک خانوو یان باخ، دروست نیە بیفرۆشی هەتا شریکەکەی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٣ و ١٦٠٨/١٣٥، وأبو داود: ٣٥١٣، وإبن ماجه: ٢٤٩٢.




ئاگادار نەکاتەوە، ئەگەر هاتوو فرۆشتی شەریکەکەی لە پێشترە پێی بفرۆشێ.

## ئاسنکاری لە وازهێنانی بە شایەت گرتن لەسەر کڕین و فرۆشتن

**٤٦٤٧-** «عَنْ عُمَارَةَ بْنِ خُزَيْمَةَ، أَنَّ عَمَّهُ حَدَّثَهُ، وَهُوَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ ابْتَاعَ فَرَساً مِنْ أَعْرَابِيٍّ، وَاسْتَتْبَعَهُ لِيَقْبِضَ ثَمَنَ فَرَسِهِ، فَأَسْرَعَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَبْطَأَ الْأَعْرَابِيُّ، وَطَفِقَ الرِّجَالُ يَتَعَرَّضُونَ لِلْأَعْرَابِيِّ، فَيَسُومُونَهُ بِالْفَرَسِ، وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ ابْتَاعَهُ حَتَّى زَادَ بَعْضُهُمْ فِي السَّوْمِ عَلَى مَا ابْتَاعَهُ بِهِ مِنْهُ، فَنَادَى الْأَعْرَابِيُّ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: إِنْ كُنْتَ مُبْتَاعاً هَذَا الْفَرَسَ وَإِلَّا بِعْتُهُ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ حِينَ سَمِعَ نِدَاءَهُ، فَقَالَ: أَلَيْسَ قَدِ ابْتَعْتُهُ مِنْكَ؟، قَالَ: لَا وَاللَّهِ، مَا بِعْتُكَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: قَدِ ابْتَعْتُهُ مِنْكَ، فَطَفِقَ النَّاسُ يَلُوذُونَ بِالنَّبِيِّ ﷺ وَبِالْأَعْرَابِيِّ، وَهُمَا يَتَرَاجَعَانِ، وَطَفِقَ الْأَعْرَابِيُّ يَقُولُ: هَلُمَّ شَاهِداً يَشْهَدُ أَنِّي، قَدْ بِعْتُكَهُ، قَالَ خُزَيْمَةُ بْنُ ثَابِتٍ: أَنَا أَشْهَدُ أَنَّكَ قَدْ بِعْتَهُ، قَالَ: فَأَقْبَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى خُزَيْمَةَ فَقَالَ: لِمَ تَشْهَدُ؟ قَالَ: بِتَصْدِيقِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ شَهَادَةَ خُزَيْمَةَ شَهَادَةَ رَجُلَيْنِ»[1].

واتە: عومارەی کوڕی خوزەیمە دەگێڕێتەوە لە مامیەوە، ئەو یەکێک بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ ئەسپێکی لە دەشتەکیەک کڕی، ئەویش شوێنی کەوت هەتا نرخی ئەسپەکەی وەربگرێ، پێغەمبەر ﷺ پەلەی کرد و دەشتەکیەکەش خاوەخاوی دەکرد، پیاوەکانیش لێی کۆبوونەوە ئەسپەکەی لێ بکڕن، نەیاندەزانی پێغەمبەر ﷺ کڕیویەتی، هەتا هەندێکیان لەوەی پێغەمبەرە ﷺ زیاتریان پێدا کە پێی کڕی بوو، کابرای دەشتەکی هاواری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، وتی: ئەگەر تۆ دەتەوێ ئەم وشترە بکڕی بیکڕە ئەگەرنا دەیفرۆشم، پێغەمبەر ﷺ کاتێ گوێی لە هاوارەکەی بوو فەرمووی: ئایا من ئەسپەکەم لێت نەکڕی؟ وتی: نەخێر سوێند بەخوا لە منت نەکڕیوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بێگومان لە تۆم کڕی، خەڵکەکەیش نزیک بوونەوە لێیان و گوێیان لە قسەکانیان دەگرت، کابرای دەشتەکی وتی: شایەتێک بێنە شایەتی بدات کە تۆ لە منت کڕیوە، خوزەیمەی کوڕی ثابت وتی: من شایەتی دەدەم کە تۆ فرۆشتووتە، وتی: پێغەمبەر ﷺ ڕووی کردە خوزەیمەو فەرمووی: بۆچی شایەتی دەدەی؟ وتی: لەبەر بە ڕاستدانانی تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: پێغەمبەر ﷺ شایەتی خوزەیمەی بە دوو شایەتی پیاو وەرگرت.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٦٠٧.




## ناکۆکی کڕیار و فرۆشیار لە نرخدا

**٤٦٤٨-** «عَنْ عَبْدُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِذَا اخْتَلَفَ الْبَيِّعَانِ، وَلَيْسَ بَيْنَهُمَا بَيِّنَةٌ فَهُوَ مَا يَقُولُ: رَبُّ السِّلْعَةِ أَوْ يَتْرُكَا»[١].

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر کڕیار و فرۆشیار لە ئەندازەی نرخەکە ناکۆکیان هەبوو، هیچ بەڵگەیەکیش لەنێوانیاندا نەبوو ئەوە قسەی خاوەن کەل و پەلەکە گوێی لێ دەگیرێ یان مامەڵەکە هەڵدەوەشێنرێتەوە، یان واز لە هەردووکیان دەهێنرێ.**

**٤٦٤٩-** «عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُبَيْدٍ قَالَ: حَضَرْنَا أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ أَتَاهُ رَجُلَانِ تَبَايَعَا سِلْعَةً، فَقَالَ أَحَدُهُمَا: أَخَذْتُهَا بِكَذَا وَبِكَذَا، وَقَالَ: هَذَا بِعْتُهَا بِكَذَا وَكَذَا، فَقَالَ أَبُو عُبَيْدَةَ: أُتِيَ ابْنُ مَسْعُودٍ فِي مِثْلِ هَذَا، فَقَالَ: حَضَرْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُتِيَ بِمِثْلِ هَذَا: فَأَمَرَ الْبَائِعَ أَنْ يَسْتَحْلِفَ، ثُمَّ يَخْتَارَ الْمُبْتَاعُ، فَإِنْ شَاءَ أَخَذَ، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ»[٢].

**واتە: عەبدولمەلیکی کوڕی عوبەید دەڵێ: ئامادە بووین لەگەڵ ئەبو عوبەیدەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دوو پیاو هاتن شمەکێکیان بە یەکتر فرۆشتبوو، یەکێکیان وتی: بە ئەوەندەو ئەوەندە کڕیومە، ئەوی تریشیان وتی: بە ئەوەندەو ئەوەندە فرۆشتوومە، ئەبو عوبەیدەیش وتی: کێشەیەکی لەم جۆرە هێنرا بۆ لای ئیبنو مەسعود، وتی: ئامادە بووین لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ شتێکی لەم جۆرە هێنرا بۆ لای: فەرمانی کرد بە فرۆشیار سوێند بخوات، پاشان کڕیاری سەرپشک کرد، ئەگەر ویستی وەریبگرێ، وە ئەگەر ویستی وازی لێ بهێنێ.**

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٥١١ و ٣٥١٢، والترمذي: ١٢٧٠، وإبن ماجه: ٢١٨٦.

(٢) حسن.





## کڕین و فرۆشتن لەگەڵ خاوەن کتێبەکان

**٤٦٥٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: اشْتَرَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ يَهُودِيٍّ طَعَاماً بِنَسِيئَةٍ، وَأَعْطَاهُ دِرْعاً لَهُ رَهْناً»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خواردەمەنی لە جولەکەیەک کڕی بە قەرز، زرێیەکەی خۆی (کە لە ئاسن دروست کرابوو) بە بارمتە لای داینا.**

**٤٦٥١-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَدِرْعُهُ مَرْهُونَةٌ عِنْدَ يَهُودِيٍّ بِثَلَاثِينَ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ لِأَهْلِهِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد زرێیەکەی بە بارمتە دانرابوو لە لای جولەکەیەک، لە بری سێ صاع لە جۆ بۆ خانەوادەکەی.**

## فرۆشتنی (المَدَبّر)

**تێبینی: (الْمُدَبِّر) واتە بریتیە لەو کۆیلەی کە خاوەنەکەی ئازادکردنی بەستووە بە مردنی خۆیەوە)**

**٤٦٥٢-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: أَعْتَقَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي عُذْرَةَ عَبْداً لَهُ عَنْ دُبُرٍ، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: أَلَكَ مَالٌ غَيْرُهُ؟ قَالَ: لَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ يَشْتَرِيهِ مِنِّي؟ فَاشْتَرَاهُ نُعَيْمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الْعَدَوِيُّ بِثَمَانِ مِائَةِ دِرْهَمٍ، فَجَاءَ بِهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: ابْدَأْ بِنَفْسِكَ فَتَصَدَّقْ عَلَيْهَا، فَإِنْ فَضَلَ شَيْءٌ فَلِأَهْلِكَ، فَإِنْ فَضَلَ مِنْ أَهْلِكَ شَيْءٌ فَلِذِي قَرَابَتِكَ، فَإِنْ فَضَلَ مِنْ ذِي قَرَابَتِكَ شَيْءٌ فَهَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا يَقُولُ: بَيْنَ يَدَيْكَ وَعَنْ يَمِينِكَ وَعَنْ شِمَالِكَ»[٣].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە بەنی عوزرە کۆیلەیەکی هەبوو ئازادکردنی بەستبوو بە مردنی خۆیەوە، هەواڵ گەیشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٢١٤، وإبن ماجه: ٢٤٣٩.

(٣) صحيح.




جگە لەوە ماڵ و سامانی ترت هەیە؟ وتی: نەخێر، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێ لە منی دەکڕێ، نوعەیمی کوڕی عەبدوڵڵای عەدەوی بە هەشت درهەمی کڕی، پێغەمبەری خوا ﷺ پارەکەی بۆی هێناو پێیدا، پاشان فەرمووی: لە خۆتەوە دەستی پێبکە، ببەخشە بە خۆت، ئەگەر شتێ زیاتر بوو بۆ خانەوادەکەت، ئەگەر زیاتر بوو لە خانەوادەکەت، ئەوە بۆ خزمە نزیکەکانتە، ئەگەر زیاتر بوو لە خزمەنزیکەکانت، ئا بەو شێوەیەو بەو شێوەیە و بەوشێوەیە ببەخشە بەوانە لەبەر دەستت دان و ئەوانەی لای ڕاست و چەپتن.

**٤٦٥٣-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً مِنَ الْأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ: أَبُو مَذْكُورٍ أَعْتَقَ غُلَاماً لَهُ عَنْ دُبُرٍ يُقَالُ لَهُ: يَعْقُوبُ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُ، فَدَعَا بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: مَنْ يَشْتَرِيهِ؟ فَاشْتَرَاهُ نُعَيْمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بِثَمَانِ مِائَةِ دِرْهَمٍ، فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ وَقَالَ: إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ فَقِيراً فَلْيَبْدَأْ بِنَفْسِهِ، فَإِنْ كَانَ فَضْلاً فَعَلَى عِيَالِهِ، فَإِنْ كَانَ فَضْلاً فَعَلَى قَرَابَتِهِ، أَوْ عَلَى ذِي رَحِمِهِ، فَإِنْ كَانَ فَضْلاً فَهَا هُنَا وَهَا هُنَا»[١].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک لە ئەنصارەکان پێی دەوترا: ئەبو مەزکور کۆیلەیەکی هەبوو ئازادکردنی بەستبوو بە مردنی خۆیەوە پێی دەوترا: یەعقوب هیچ سەروەت و سامانێکی نەبوو جگە لەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد کۆیلەکەی بۆ بێنێ پاشان فەرمووی: کێ لە منی دەکڕێ؟ نوعەیمی کوڕی عەبدوڵڵا بە هەشت سەد درهەم کڕی، پێغەمبەر ﷺ پارەکەی پێیدا، پاشان فەرمووی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە هەژار بوو با سەرەتا لە نەفسی خۆیەوە دەستی پێ بکات، ئەگەر زیاتری هەبوو بیدا بە خانەوادەکەی، ئەگەر زیاتر بوو لە خانەوادەکەی با بیدا بە خزمە نزیکەکانی، ئەگەر زیاتر بوو لە خزمە نزیکەکانی، ئەوە بەملاو بەولادا بیبەخشێ.

**٤٦٥٤-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَاعَ الْمُدَبَّرَ»[٢].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەو کۆیلەی فرۆشت کە خاوەنەکەی ئازادکردنی بەستبوو بە مردنی خۆیەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٤١، ومسلم: ٩٩٧، وأبو داود: ٣٩٥٥ و ٣٩٥٦، وإبن ماجه: ٢٥١٢.

## فرۆشتنی (الْمُکَاتَب)
## (ئەو کۆیلەیەی کە خاوەنەکەی نوسراوی ئازادکردنی بۆ کردوە)

**٤٦٥٥-** «عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَخْبَرَتْهُ أَنَّ بَرِيرَةَ جَاءَتْ عَائِشَةَ تَسْتَعِينُهَا فِي كِتَابَتِهَا شَيْئاً، فَقَالَتْ لَهَا عَائِشَةُ: ارْجِعِي إِلَى أَهْلِكِ، فَإِنْ أَحَبُّوا أَنْ أَقْضِيَ عَنْكِ كِتَابَتَكِ، وَيَكُونَ وَلَاؤُكِ لِي، فَعَلْتُ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ بَرِيرَةُ لِأَهْلِهَا، فَأَبَوْا، وَقَالُوا: إِنْ شَاءَتْ أَنْ تَحْتَسِبَ عَلَيْكِ فَلْتَفْعَلْ، وَيَكُونَ لَنَا وَلَاؤُكِ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ابْتَاعِي وَأَعْتِقِي، فَإِنَّ الْوَلَاءَ لِمَنْ أَعْتَقَ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطاً لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللَّهِ، فَمَنِ اشْتَرَطَ شَيْئاً لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ، فَلَيْسَ لَهُ، وَإِنِ اشْتَرَطَ مِائَةَ شَرْطٍ، وَشَرْطُ اللَّهِ أَحَقُّ وَأَوْثَقُ»[(١)].

**واتە: عوروە دەگێڕێتەوە، عائیشە هەواڵی پێداوە کە بەریرە هات بۆ لای عائیشە داوای کرد یارمەتی بدات لەو نوسراوەی، (کە لەگەڵ گەورەکەیدا کردوویەتی بۆ ئازادکردنی) عائیشە پێی وت: بگەڕێرەوە بۆ لای کەس و کارەکەت، ئەگەر پێیان باش بوو پارەی کڕینەکەی لە بری تۆدا بدەم بەڵام وەلائت بۆ من بێت، ئەوە دەیکەم، بەریرە ئەوەی بۆ کەس و کارەکەی باس کرد، ئەوانیش ڕازی نەبوون، وتیان: ئەگەر دەیەوێت پارەکەت بۆ بدات با بیدات، بەڵام دەبێ ولائت بۆ ئێمە بێت، عائیشە ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، پێی فەرموو: بیکڕەو ئازادی بکە، چونکە وەلاء بۆ ئەو کەسەیە ئازادی کردوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە چیانە خەڵکانێک کۆمەڵە مەرجێک دادەنێن کە لە کتێبی خوای گەورەدا نیە، جا هەرکەس مەرجێک دابنێ لە کتێبی خوادا نەبێت ئەوە بۆ ئەو نیە، ئەگەر سەد مەرجیش بێت، مەرجی خوا لە پێشترو پتەوترە.**

## ئەو کەسەی نوسراوی ئازادکردنی لەگەڵدا کراوە دەفرۆشرێ پێش ئەوەی شتێ لە نوسراوەکەی بداتەوە.

**٤٦٥٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّهَا قَالَتْ: جَاءَتْ بَرِيرَةُ إِلَيَّ، فَقَالَتْ: يَا عَائِشَةُ، إِنِّي كَاتَبْتُ أَهْلِي عَلَى تِسْعِ أَوَاقٍ فِي كُلِّ عَامٍ أُوقِيَّةٌ فَأَعِينِينِي، وَلَمْ تَكُنْ قَضَتْ مِنْ كِتَابَتِهَا شَيْئاً، فَقَالَتْ

---

(١) صحيح.

لَهَا عَائِشَةُ وَنَفِسَتْ فِيهَا: ارْجِعِي إِلَى أَهْلِكِ، فَإِنْ أَحَبُّوا أَنْ أُعْطِيَهُمْ ذَلِكَ جَمِيعاً، وَيَكُونَ وَلَاؤُكِ لِي، فَعَلْتُ، فَذَهَبَتْ بَرِيرَةُ إِلَى أَهْلِهَا، فَعَرَضَتْ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ، فَأَبَوْا وَقَالُوا: إِنْ شَاءَتْ أَنْ تَحْتَسِبَ عَلَيْكِ فَلْتَفْعَلْ، وَيَكُونَ ذَلِكِ لَنَا، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ عَائِشَةُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: لَا يَمْنَعُكِ ذَلِكِ مِنْهَا، ابْتَاعِي وَأَعْتِقِي، فَإِنَّ الْوَلَاءَ لِمَنْ أَعْتَقَ فَفَعَلَتْ، وَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي النَّاسِ فَحَمِدَ اللَّهَ تَعَالَى، ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ، فَمَا بَالُ النَّاسِ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطاً لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللَّهِ، مَنِ اشْتَرَطَ شَرْطاً لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ فَهُوَ بَاطِلٌ، وَإِنْ كَانَ مِائَةَ شَرْطٍ، قَضَاءُ اللَّهِ أَحَقُّ، وَشَرْطُ اللَّهِ أَوْثَقُ، وَإِنَّمَا الْوَلَاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ»[1].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بەریرە هات بۆ لام وتی خۆم کڕیوەتەوە لە گەورەکەم بە نۆ ئوقیە (هەر ئوقیەیەک چل درهەم دەکات، واتە: ٣٦٠ درهەم) بۆ هەر ساڵێک ئوقیەیەک، جا یارمەتیم بدە، بریرە هیچ بەشێکی لەپارەی ئازادکردنی خۆی نەدابوو،عائیشەش حەزی کرد ئازادی بکات پێی وت: ئەگەر گەورەکەت پێی خۆشە ئەوا من پارەکەیان دەدەمێ و وەلائت بۆ من بێت، بەریرە چوو بۆ لای گەورەکەی پێی وتن، ئەوانیش ڕازی نەبوون، وتیان ئەگەر دەیەوێت پارەکەت بۆ بدات با بیدات، بەڵام دەبێ وەلائی بۆ ئێمە بێت، عائیشە ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، فەرمووی: ئەوە نابێتە ڕێگر لەپێشتدا، بیکڕەو ئازادی بکە، چونکە وەلاء بۆ ئەوکەسەیە ئازادی دەکات، ئەویش ئەوەی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵساو هاتە ناو خەڵکەکە سوپاس و ستایشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: حاڵ و بیری ئەو پیاوانە چۆنە کۆمەڵە مەرجێک دادەنێن کە لە کتێبی خوای گەورەدا نیە، هەرکەس مەرجێک دابنێ لە کتێبی خوادا نەبێت ئەوە بەتاڵە، ئەگەر سەد مەرجیش بێت، حوکم و بڕیاری خوا لەپێشترە، وە مەرجی خوا پتەوترە، وە وەلائیش تەنها بۆ ئەوکەسەیە کە ئازادی دەکات (واتە:) ئەو ماڵەی لە دوای مردنی بەندەی ئازاد کراو دەمێنێتەوە بەشێکی بۆ ئەو کەسەیە کە ئازادی کردوە.**

---

(١) صحيح.




## فرۆشتنی (الْوَلَاءِ): (مافی سەرپەرشتیاری ئەو کەسەی کە کۆیلەکەی ئازاد دەکات)

**٤٦٥٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الْوَلَاءِ، وَعَنْ هِبَتِهِ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە فرۆشتنی وەلائی ئەو کۆیلەی کە ئازادی کردوە، هەروەها لە بەخشینیشی.**

**٤٦٥٨-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الْوَلَاءِ وَعَنْ هِبَتِهِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە فرۆشتنی وەلائی ئەو کۆیلەی کە ئازادی کردوە، هەروەها لە بەخشینیشی.**

**٤٦٥٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الْوَلَاءِ، وَعَنْ هِبَتِهِ»[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە فرۆشتنی وەلائی ئەو کۆیلەی کە ئازادی کردوە، هەروەها لە بەخشینیشی.**

## فرۆشتنی ئاو

**٤٦٦٠-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الْمَاءِ»[٤].

**واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فرۆشتنی ئاوی قەدەغە کردوە.**

**٤٦٦١-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا الْمِنْهَالِ يَقُولُ: سَمِعْتُ إِيَاسَ بْنَ عُمَرَ، وَقَالَ مَرَّةً: ابْنَ عَبْدٍ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: يَنْهَى عَنْ بَيْعِ الْمَاءِ، قَالَ قُتَيْبَةُ: لَمْ أَفْقَهْ عَنْهُ بَعْضَ حُرُوفِ أَبِي الْمِنْهَالِ كَمَا أَرَدْتُ»[٥].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٣٥ و ٦٧٥٦، ومسلم: ١٥٠٦، وأبو داود: ٢٩١٩، والترمذي: ١٢٣٦ و ٢١٢٦، وإبن ماجه: ٢٧٤٧ و ٢٧٤٨.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٦٥، وإبن ماجه: ٢٤٧٧.

(٥) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٤٧٨، والترمذي: ١٢٧١، وإبن ماجه: ٢٤٧٦.




**واتە: عەمری کوڕی دینار دەڵێ: گوێم لە ئەبو مینهال بوو دەیوت: گوێم لە ئیاسی کوڕی عومەر بوو وتی: جارێکی تر وتی: ئیبنو عەبد دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فرۆشتنی ئاوی قەدەغە کرد، قوتەیبە وتی: لە هەندێ پیتی ئەبو مینهال تێنەگەیشتم وەک ئەوەی مەبەستم بوو**

## فرۆشتنی ئاوی زیادە

**٤٦٦٢-** «عَنْ إِيَاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ فَضْلِ الْمَاءِ، وَبَاعَ قَيِّمُ الْوَهَطِ فَضْلَ مَاءِ الْوَهَطِ فَكَرِهَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو»(١).

**واتە: ئیاس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فرۆشتنی ئاوی زیادەی قەدەغەکرد، وە خاوەنی (الْوَهَطِ) (کە ناوچەیەکە لە طائیف)، ئاوی زیادەی ئەو شوێنەی فرۆشت عەبدوڵلای کوڕی عەمرٍ پێی باش نەبوو.**

**٤٦٦٣-** «عَنْ إِيَاسِ بْنِ عَبْدٍ ﷺ، صَاحِبَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا تَبِيعُوا فَضْلَ الْمَاءِ فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ فَضْلِ الْمَاءِ»(٢).

**واتە: ئیاسی کوڕی عەبد ﷺ، هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ وتی: زیادەی ئاو مەفرۆشن، چونکە پێغەمبەر ﷺ فرۆشتنی زیادەی ئاوی قەدەغەکردوە.**

## فرۆشتنی ئارەق

**٤٦٦٤-** «عَنِ ابْنِ وَعْلَةَ الْمِصْرِيِّ أَنَّهُ: سَأَلَ ابْنَ عَبَّاسٍ عَمَّا يُعْصَرُ مِنَ الْعِنَبِ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَهْدَى رَجُلٌ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَاوِيَةَ خَمْرٍ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: هَلْ عَلِمْتَ أَنَّ اللَّهَ ﷻ حَرَّمَهَا؟ فَسَارَّ، وَلَمْ أَفْهَمْ مَا سَارَّ كَمَا أَرَدْتُ، فَسَأَلْتُ إِنْسَاناً إِلَى جَنْبِهِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: بِمَ سَارَرْتَهُ، قَالَ: أَمَرْتُهُ أَنْ يَبِيعَهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّ الَّذِي حَرَّمَ شُرْبَهَا، حَرَّمَ بَيْعَهَا، فَفَتَحَ الْمَزَادَتَيْنِ حَتَّى ذَهَبَ مَا فِيهِمَا»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٧٩.

واتە: ئیبنو وەعلەی میصری پرسیاری كرد لە ئیبنو عەبباس لەبارەی ئەو كەسەی ئاوی ترێ دەگرێتەوە و (دەیكات بە شەربەت)، ئیبنو عەبباس وتی: پیاوێك بە دیاری كونەیەك لە ئارەقی هێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا زانیوتە خوا ﷻ قەدەغەی كردوە؟ چپەیەكی كرد، تێنەگەیشتم ئەو چپەیەی چی بوو، پرسیارم لە كەسێك كرد لە تەنیشتی ئەو، پێغەمبەر پێی فەرموو: چپەی چیت بۆی كرد، وتی: وتم : بیفرۆشە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو خوایەی كەخواردنەوەی قەدەغە كردوە، فرۆشتنیشی قەدەغە كردوە، هەردوو سەری كونەكەی كردەوە تا هەرچی تیایدا بوو ڕژا.

**٤٦٦٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَتْ آيَاتُ الرِّبَا قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَتَلَاهُنَّ عَلَى النَّاسِ، ثُمَّ حَرَّمَ التِّجَارَةَ فِي الْخَمْرِ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: كاتێ كە ئایەتەكانی ڕیبا دابەزین پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسایە سەر مینبەرو ئەو ئایەتانەی بەسەر خەڵكیدا خوێندەوە، پاشان بازرگانی كردنی بە ئارەق قەدەغەكرد.

## بابەت: فرۆشتنی سەگ

**٤٦٦٦-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَمَهْرِ الْبَغِيِّ، وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ»[٢].

واتە: عوقبەی كوڕی عەمرٍ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرتنی پارەی سەگ و پارەی ئافرەتی زیناكەر و پێدانی پارە بە فاڵچی لەبری فاڵگرتنەوەكەی قەدەغەكردوە.

**٤٦٦٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فِي أَشْيَاءَ حَرَّمَهَا، وَثَمَنُ الْكَلْبِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٩ و ٢٠٨٤ و ٢٢٢٦ و ٤٥٤٠ و ٤٥٤١ و ٤٥٤٢ و ٤٥٤٣، ومسلم: ٦٩ و ١٥٨٠/٧٠، وأبو داود: ٣٤٩٠ و ٣٤٩١، وإبن ماجه: ٣٣٨٢.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٤٨٢.




واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە بارەی کۆمەڵە شتێکەوە قەدەغەی کرد، هەروەها وەرگرتنی پارەی سەگ.

## ئەوەی جیاکراوەتەوە لە فرۆشتنی نرخی سەگ

**٤٦٦٨-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَالسِّنَّوْرِ، إِلَّا كَلْبَ صَيْدٍ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: هَذَا مُنْكَرٌ»[١].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرتنی پارەی سەگ و پشیلەی قەدەغەکرد، جگە لە سەگی ڕاو نەبێت، ئەبو عەبدوڕحمان دەڵێ: ئەم فەرموودە (مُنْكَر)ـە.**

## فرۆشتنی بەراز

**٤٦٦٩-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ عَامَ الْفَتْحِ، وَهُوَ بِمَكَّةَ: إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ، وَالْمَيْتَةِ، وَالْخِنْزِيرِ، وَالْأَصْنَامِ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ شُحُومَ الْمَيْتَةِ، فَإِنَّهُ يُطْلَى بِهَا السُّفُنُ، وَيُدَّهَنُ بِهَا الْجُلُودُ، وَيَسْتَصْبِحُ بِهَا النَّاسُ؟ فَقَالَ: لَا، هُوَ حَرَامٌ، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ ذَلِكَ: قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ، إِنَّ اللَّهَ ﷻ لَمَّا حَرَّمَ عَلَيْهِمْ شُحُومَهَا جَمَّلُوهُ، ثُمَّ بَاعُوهُ، فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ»[٢].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا، گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە ساڵی ئازاد کردنی مەککەدا، لە مەککە فەرمووی: بێگومان خواو پێغەمبەرەکەی فرۆشتنی ئارەق و مردارەوە بوو بەرازو بتیان قەدەغە کرد، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ڕات چیە بەرانبەر بەزو پیوی مردارەوە بوو، چونکە دیواری کەشتی پێ سواغ دەدرێت، وە پێستەی پێ چەور دەکرێت، خەڵکیش بۆ چرا بەکاری دەهێنن و ڕۆژی پێدەکەنەوە؟ فەرمووی: نەخێر، ئەوە حەرامە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێدا فەرمووی: خوا جولەکەکان بکوژێت و لە سۆزی خۆی دەریان بکات، کاتێک خوا بەزو پیوی لێ قەدەغەکردن، تواندیانەوە، پاشان دەیانفرۆشت و پارەکەیان دەخوارد.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٢٩٦، ومسلم: ١٥٨١.




## فرۆشتنی بە كەڵدانی وشتر

**٤٦٧٠-** «عن جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ ضِرَابِ الْجَمَلِ، وَعَنْ بَيْعِ الْمَاءِ، وَبَيْعِ الْأَرْضِ لِلْحَرْثِ، يَبِيعُ الرَّجُلُ أَرْضَهُ وَمَاءَهُ، فَعَنْ ذَلِكَ نَهَى النَّبِيُّ ﷺ»[١].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە لە فرۆشتنی بەكەڵدانی وشتر، وە لە فرۆشتنی ئاو، وە فرۆشتنی زەوی بۆ كێڵان، ئەویش ئەوەیە كەسێک زەوی و ئاوەكەی بفرۆشێت، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی كردوە لەو كارە.**

**٤٦٧١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ عَسْبِ الْفَحْلِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە لە فرۆشتنی تۆوی ئاژەڵ.**

**٤٦٧٢-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي الصَّعْقِ أَحَدِ بَنِي كِلَابٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلَهُ عَنْ عَسْبِ الْفَحْلِ، فَنَهَاهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: إِنَّا نُكْرَمُ عَلَى ذَلِكَ»[٣].

**واتە: ئەنەسی كوڕی مالک ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە بەنی صەعب كە یەكێک بوو لە بەنی كیلاب هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێكرد لە بارەی تۆوی ئاژەڵەوە، ئەویش ڕێگری ئەو كارەی لێكرد، فەرمووی: خاوەنی وشترە مێینەكە شتێكمان پێ دەدات نەک لە بری تۆوەكەی، بەڵكو وەكو ڕێزێک.**

**٤٦٧٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ كَسْبِ الْحَجَّامِ، وَعَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَعَنْ عَسْبِ الْفَحْلِ»[٤].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە لە پارەی كەڵەشاخ گر و وەرگرتنی كرێی سەگ و تۆوی ئاژەڵی نێرینە.**

**٤٦٧٤-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ عَسْبِ الْفَحْلِ»[٥].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٦٥/٣٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٨٤، وأبو داود: ٣٤٢٩، والترمذي: ١٢٧٣.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٢٧٤.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٨٣ و ٥٣٤٨، وأبو داود: ٣٤٢٥، وابن ماجه: ٢١٦٠.

(٥) صحيح.

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (پارەی) تۆوی ئاژەڵی نێرینەی قەدەغەکرد.

**٤٦٧٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَعَسْبِ الْفَحْلِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە وەرگرتنی پارەی سەگ و تۆوی ئاژەڵی نێرینە.

## پیاوێک کەلوپەلێک دەکڕێ و دواتر مایەپووچ دەبێ، خودی کەل و پەلەکەیش لەلای دەبینرێتەوە

**٤٦٧٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا امْرِئٍ أَفْلَسَ ثُمَّ وَجَدَ رَجُلٌ عِنْدَهُ سِلْعَتَهُ بِعَيْنِهَا، فَهُوَ أَوْلَى بِهِ مِنْ غَيْرِهِ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس کەلوپەلێکی فرۆشت بە کەسێکی تر، (بەبێ ئەوەی پارەکەی وەربگرێت) دواتر ئەوکەسەی پێی فرۆشراوە مایە پووچ بوو (قەرزی کەسانی تریشی لەسەر بوو)، پاشان فرۆشیارەکە کەلوپەلەکەی خۆی لەلای دۆزیەوە، ئەوە ئەو لەپێشترە لە وەرگرتنی کەلوپەلەکەی لە کەسێکی تر.

**٤٦٧٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، عَنِ الرَّجُلِ يُعْدِمُ إِذَا وُجِدَ عِنْدَهُ الْمَتَاعُ بِعَيْنِهِ، وَعَرَفَهُ أَنَّهُ لِصَاحِبِهِ الَّذِي بَاعَهُ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە بارەی پیاوێک هەژار دەکەوێت (لەکاتێکدا شتێکی کڕی بوو پارەی نەدابوو) ئەگەر کەل و پەلەکە لەلای بینرایەوە وەکو خۆی، وە زانی ئەو کەلوپەلە هی ئەو کەسەیە کە پێی فرۆشتووە. (ئەوە فرۆشیارەکە لەپێشترە لە وەرگرتنی کەلوپەلەکەی لە کەسێکی تر).

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٠٢، ومسلم: ٢٢ و ٣٥٢٢٣٥١٩/٢٥ و ٣٥٢٢، والترمذي: ١٢٦٢، وإبن ماجه: ٢٣٥٨ و ٢٣٥٩.

(٣) صحيح.




٤٦٧٨- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: أُصِيبَ رَجُلٌ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي ثِمَارٍ ابْتَاعَهَا، وَكَثُرَ دَيْنُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَصَدَّقُوا عَلَيْهِ فَتَصَدَّقُوا عَلَيْهِ، وَلَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ وَفَاءَ دَيْنِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: خُذُوا مَا وَجَدْتُمْ، وَلَيْسَ لَكُمْ إِلَّا ذَلِكَ»(١).

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بەروبوومێكی كڕیبوو هەمووی تیاچوو، قەرزێكی زۆر كەوتە سەری، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خێرو بەخششی بۆ كۆ بكەنەوە، خەڵكەكەش بۆیان كۆكردەوە، ئەوەی كۆكرابوویەوە نەگەیشتە ئەو ئەندازەیەی قەرزەكەی پێ پڕبكاتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەی لەبەر دەستدایە (لە ماڵەكەی) وەری بگرن جگە لەوە هیچی ترتان بۆ نیە.**

## پیاوێک كەل و پەلێک دەفرۆشێ دواتر بۆی دەركەوت ماڵی كەسێكی ترە

٤٦٧٩- «عَنْ أُسَيْدِ بْنِ حُضَيْرِ بْنِ سِمَاكٍ ﷺ قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى أَنَّهُ إِذَا وَجَدَهَا فِي يَدِ الرَّجُلِ غَيْرِ الْمُتَّهَمِ، فَإِنْ شَاءَ أَخَذَهَا بِمَا اشْتَرَاهَا، وَإِنْ شَاءَ اتَّبَعَ سَارِقَهُ، وَقَضَى بِذَلِكَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ»(٢).

**واتە: ئوسەیدی كوڕی خوضەیری كوڕی سیماک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دادوەری كرد ئەگەر كەسێک ماڵەكەی (دزرا بوو) لە دەستی پیاوێكدا بینیەوە تۆمەتبار نەكرابوو (واتە: ئەوكەسە نەیدزی بوو بەڵكو لە دزەكە كڕی بوویەوە) ئەوە ئەگەر ویستی بەو نرخەی كڕیویەتی وەریدەگرێتەوە، وە ئەگەر ویستی با شوێنی دزەكە بكەوێت، ئەبو بەكر و عومەریش بەو شێوەیە دادوەریان كردوە.**

٤٦٨٠- «عَنْ عِكْرِمَةَ بْنِ خَالِدٍ، أَنَّ أُسَيْدِ بْنِ حُضَيْرِ الْأَنْصَارِيَّ ﷺ، ثُمَّ أَحَدَ بَنِي حَارِثَةَ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ كَانَ عَامِلاً عَلَى الْيَمَامَةِ، وَأَنَّ مَرْوَانَ كَتَبَ إِلَيْهِ، أَنَّ مُعَاوِيَةَ كَتَبَ إِلَيْهِ: أَنَّ أَيَّمَا رَجُلٍ سُرِقَ مِنْهُ سَرِقَةٌ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا حَيْثُ وَجَدَهَا، ثُمَّ كَتَبَ بِذَلِكَ مَرْوَانُ إِلَيَّ، فَكَتَبْتُ إِلَى مَرْوَانَ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَضَى بِأَنَّهُ إِذَا كَانَ الَّذِي ابْتَاعَهَا مِنَ الَّذِي سَرَقَهَا غَيْرُ مُتَّهَمٍ، يُخَيَّرُ سَيِّدُهَا، فَإِنْ شَاءَ أَخَذَ الَّذِي سُرِقَ مِنْهُ بِثَمَنِهَا، وَإِنْ شَاءَ اتَّبَعَ سَارِقَهُ، ثُمَّ قَضَى بِذَلِكَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ، فَبَعَثَ مَرْوَانُ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح الإسناد.




بِكِتَابِي إِلَى مُعَاوِيَةَ، وَكَتَبَ مُعَاوِيَةُ إِلَى مَرْوَانَ: إِنَّكَ لَسْتَ أَنْتَ وَلَا أُسَيْدٌ تَقْضِيَانِ عَلَيَّ، وَلَكِنِّي أَقْضِي فِيمَا وُلِّيتُ عَلَيْكُمَا، فَأَنْفِذْ لِمَا أَمَرْتُكَ بِهِ، فَبَعَثَ مَرْوَانُ بِكِتَابِ مُعَاوِيَةَ، فَقُلْتُ: لَا أَقْضِي بِهِ مَا وُلِّيتُ بِمَا قَالَ مُعَاوِيَةُ»[١].

**واتە: عیکریمەی کوڕی خالد دەگێڕێتەوە، ئوسەیدی کوڕی خوضەیری ئەنصاری ﷺ و پیاوێک لە نەوەکانی حاریثە هەواڵی پێداوە ئەو کرابووە دەسەڵاتداری یەمامە، مەڕوان نوسراوی بۆم کرد کە مەعاویە نوسراوی بۆ کردوە: هەرکەسماڵێکی دزرا، ئەوە ئەو لە پێشترە لە هەرکوێ دۆزرایەوە، پاشان مەڕوان نوسراوی بۆ کردم، منیش نوسراوم بۆ مەڕوان کرد، پێغەمبەر ﷺ دادوەری کردوە بەوەی کە ئەم کەسەی لە دزەکەی کڕیوە تۆمەتبار نیە، خاوەنەکەی سەرپشک دەکرێ ئەگەر ویستی بە نرخی خۆی ماڵەکەی دەباتەوە کە لێی دزراوە، وە ئەگەر ویستی شوێنی دزەکە دەکەوێت، پاشان ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان دادوەریان بەوە کرد، مەڕوان نوسراوەکەی منی نارد بۆ لای مەعاویە، مەعاویەیش نوسراوێکی بۆ مەروان نارد: تۆ و ئوسەید فەرمان بەسەر مندا ناکەن، بەڵکو من فەرمان دەکەم بەسەرتاندا بەوەی کراوم بە دەسەڵاتداری ئێوە، ئەوەی فەرمانت پێ دەکەم جێبەجێی بکە، وتم: تا من لە دەسەڵاتدا بم دادوەری ناکەم بەوەی موعاویە وتویەتی.**

**٤٦٨١-** «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الرَّجُلُ أَحَقُّ بِعَيْنِ مَالِهِ إِذَا وَجَدَهُ وَيَتْبَعُ الْبَائِعُ مَنْ بَاعَهُ»[٢].

**واتە: سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پیاو لە پێشترە بە خودی ماڵەکەی ئەگەر بینیەوە، فرۆشیار شوێنی ئەو کەسە دەکەوێ کە لێی کڕیوە.**

**٤٦٨٢-** «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ زَوَّجَهَا وَلِيَّانِ فَهِيَ لِلْأَوَّلِ مِنْهُمَا وَمَنْ بَاعَ بَيْعاً مِنْ رَجُلَيْنِ فَهُوَ لِلْأَوَّلِ مِنْهُمَا»[٣].

**واتە: سەمورە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر ئافرەتێک دوو سەرپەرشتیار بیدەن بە شوو، ئەوە (جێبەجێ کردنی بابەتەکە) بۆ یەکەمینی ئەو دوو**

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف الإسناد.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٠٨٨، والترمذي: ١١١٠، وإبن ماجه: ٢١٩٠ و ٢١٩١ و ٢٣٤٤.




کەسەیە کە لێی مارەبڕاوە، یان یەکەمینی ئەو دوو سەرپەرشتیارەی بە شووی داوە، وە هەرکەس شتێ بفرۆشێ بە دوو پیاو ئەوە بۆ یەکەمینیانە.

## قەرز وەرگرتن

**٤٦٨٣-** «عَنْ إِسْمَعِيلَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: اسْتَقْرَضَ مِنِّي النَّبِيُّ ﷺ أَرْبَعِينَ أَلْفاً، فَجَاءَهُ مَالٌ فَدَفَعَهُ إِلَيَّ، وَقَالَ: بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِي أَهْلِكَ وَمَالِكَ، إِنَّمَا جَزَاءُ السَّلَفِ الْحَمْدُ وَالْأَدَاءُ»[١].

**واتە: ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ڕەبیعە، لە باوکی، لە باپیرەیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چل هەزاری بە قەرز لێم وەرگرت، دواتر ماڵ و سامانی بۆ هات، قەرزەکەی پێدامەوە و فەرمووی: خوا بەرەکەت بخاتە ناو خانەوادەو ماڵ و سامانت، بەڕاستی پاداشتی قەرز سوپاس کردن و دانەوەیەتی.**

## ترسناکی و گرانی قەرز کردن

**٤٦٨٤-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جَحْشٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا جُلُوساً عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَرَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ، ثُمَّ وَضَعَ رَاحَتَهُ عَلَى جَبْهَتِهِ، ثُمَّ قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ، مَاذَا نُزِّلَ مِنَ التَّشْدِيدِ فَسَكَتْنَا وَفَزِعْنَا، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ، سَأَلْتُهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا هَذَا التَّشْدِيدُ الَّذِي نُزِّلَ؟ فَقَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ أَنَّ رَجُلاً قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ أُحْيِيَ، ثُمَّ قُتِلَ ثُمَّ أُحْيِيَ، ثُمَّ قُتِلَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ، مَا دَخَلَ الْجَنَّةَ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ دَيْنُهُ»[٢].

**واتە: موحەممەدی کوڕی جەحش ﷺ دەڵێ: ئێمە لەخزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دانیشتبووین، سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان، پاشان دەستی خستە سەر ڕوخساری، پاشان فەرمووی: پاک و بێگەردی بۆ خوا، چی دابەزێنراوە لە سەختی و گرانی؟ ئێمەش بێدەنگ و بووین و پەشۆکاین، کاتێ بەیانی بوویەوە پرسیارم لێکرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو سەختی و گرانیە چیە کە دابەزیوە؟ فەرمووی: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر پیاوێک لە پێناوی خوادا بکوژرێ**

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٢٤٢٤.

(٢) حسن.

**پاشان زیندو بکرێتەوە، پاشان بکوژرێ و قەرزی لەسەر بێت، ناچێتە بەهەشتەوە تا قەرزەکەی بۆ نەدرێ.**

**٤٦٨٥-** «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي جِنَازَةٍ فَقَالَ: أَهَا هُنَا مِنْ بَنِي فُلَانٍ أَحَدٌ؟ ثَلَاثاً، فَقَامَ رَجُلٌ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: مَا مَنَعَكَ فِي الْمَرَّتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ أَنْ لَا تَكُونَ أَجَبْتَنِي؟ أَمَا إِنِّي لَمْ أُنَوِّهْ بِكَ إِلَّا بِخَيْرٍ، إِنَّ فُلَاناً لِرَجُلٍ مِنْهُمْ مَاتَ مَأْسُوراً بِدَيْنِهِ»[١].

**واتە: سەمورە ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین لە بەڕێکردنی تەرمێکدا، سێ جار فەرمووی: ئایا لێرەدا کەسێک هەیە لە نەوەکانی فڵانەکەس؟ پیاوێک هەڵسا، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووی: چی ڕێگری لێکرد دوو جارەکەی تر وەڵامت نەدامەوە؟ من جگە لە خێر هیچت بۆ باس ناکەم، فڵانەکەس مردوە دیلی قەرزی کەسێکە لە ئەوانە کە بەسەریوەیەتی (واتە: ڕێگری بەهەشتی لێکراوە).**

## ئاسانکاری لە قەرزدا

**٤٦٨٦-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُذَيْفَةَ قَالَ: كَانَتْ مَيْمُونَةُ تَدَّانُ، وَتُكْثِرُ، فَقَالَ لَهَا أَهْلُهَا فِي ذَلِكَ وَلَامُوهَا، وَوَجَدُوا عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: لَا أَتْرُكُ الدَّيْنَ وَقَدْ سَمِعْتُ خَلِيلِي وَصَفِيِّي ﷺ يَقُولُ: مَا مِنْ أَحَدٍ يَدَّانُ دَيْناً فَعَلِمَ اللَّهُ أَنَّهُ يُرِيدُ قَضَاءَهُ إِلَّا أَدَّاهُ اللَّهُ عَنْهُ فِي الدُّنْيَا»[٢].

**واتە: عیمرانی کوڕی حوزیفە دەڵێ: مەیمونە قەرزی زۆری دەکرد، کەسوکارەکەی لەو بارەیەوە قسەیان لەگەڵیدا کرد و سەرزەنشتیان کرد، وتی: وازناهێنم لە قەرز چونکە گوێم لە خۆشەویستم موحەممەد ﷺ بوو دەیفەرموو: هیچ کەسێک نیە قەرزێ بکات خوا دەزانێ ئەو دەیەوێ قەرزەکەی بداتەوە ئیللا خوا قەرزەکەی بۆ دەداتەوە لە دنیادا.**

**٤٦٨٧-** «عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ مَيْمُونَةَ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ اسْتَدَانَتْ فَقِيلَ لَهَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، تَسْتَدِينِينَ وَلَيْسَ عِنْدَكِ وَفَاءٌ، قَالَتْ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ أَخَذَ دَيْناً وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يُؤَدِّيَهُ، أَعَانَهُ اللَّهُ ﷻ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٤١.

(٢) صحيح دون قوله: «فِي الدُّنْيَا». أخرجه إبن ماجه: ٢٤٠٨.

(٣) صحيح.




**واتە: عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە دەگێڕێتەوە، مەیموونەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ قەرزی کرد، پێی وترا: ئەی دایکی ئیمانداران قەرز دەکەیت و هیچت نیە بیدەیتەوە، وتی: من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرمووی: هەرکەس قەرزێ بکات مەبەستی ئەوە بێت بیداتەوە، خوا ﷻ یارمەتی دەدات لەسەر دانەوەی.**

## قەرز کوێری دەوڵەمەند

**٤٦٨٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيءٍ فَلْيَتْبَعْ، وَالظُّلْمُ مَطْلُ الْغَنِيِّ»(١).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە نێردرا بۆ لای دەوڵەمەندێک (تا قەرزەکە لە بری قەرزارەکە بداتەوە و قەرزارەکە فەرمانی بەوە کرد) با بچێت ( بۆ لای و قەرزەکەی لێ وەربگرێتەوە) قەرز کوێری کەسی دەوڵەمەند ستەمە**

**٤٦٨٩-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيُّ الْوَاجِدِ يُحِلُّ عِرْضَهُ وَعُقُوبَتَهُ»(٢).

**واتە: عەمڕی کوڕی شەرید دەگێڕێتەوە، لە باوکی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قەرز کوێری ئەو کەسە ماڵ و سامانی هەیە، حەڵاڵە بۆ قەرزدەر بڵێ ستەمی لێکردوم و پیاوێکی قەرز کوێرە، وە دەبێ تەمێش بکرێ.**

**٤٦٩٠-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَيُّ الْوَاجِدِ يُحِلُّ عِرْضَهُ وَعُقُوبَتَهُ»(٣).

**واتە: عەمڕی کوڕی شەرید دەگێڕێتەوە، لە باوکی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قەرز کوێری ئەو کەسەی ماڵ و سامانی هەیە، حەڵاڵە بۆ قەرزدەر بڵێ ستەمی لێکردوم و پیاوێکی قەرز کوێرە، وە دەبێ تەمێش بکرێ.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٨٧ و ٢٢٨٨ و ٢٤٠٠، ومسلم: ١٥٦٤، وأبو داود: ٣٣٤٥، والترمذي: ١٣٠٨، وإبن ماجه: ٢٤٠٣.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٦٢٨، وإبن ماجه: ٢٤٢٧.

(٣) حسن.




## (الْحَوَالَةُ): واتە: گواستنەوەی قەرز لە ئەستۆی قەرزارێک بۆ ئەستۆی قەرزارێکی تر

**٤٦٩١**- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ، وَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيءٍ فَلْيَتْبَعْ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قەرز کوێری (دواخستنی قەرز لەلایەن کەسێک کە هەیبێت) دەوڵەمەند ستەمە، ئەگەر یەکێک لە ئێوە نێردرا بۆ لای دەوڵەمەندێک (تا قەرزەکە لە بری قەرزارەکە بداتەوە و قەرزارەکە فەرمانی بەوە کرد) با بچێت ( بۆ لای و قەرزەکەی لێ وەربگرێتەوە).**

## کەفالەتکردنی قەرز

**٤٦٩٢**- «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ أُتِيَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ لِيُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: إِنَّ عَلَى صَاحِبِكُمْ دَيْناً؟ فَقَالَ أَبُو قَتَادَةَ: أَنَا أَتَكَفَّلُ بِهِ، قَالَ: بِالْوَفَاءِ، قَالَ: بِالْوَفَاءِ»[٢].

**واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە، تەرمی پیاوێکی ئەنصاری هێنرا بۆ خزمەتە پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بکات، فەرمووی: هاوەڵەکەتان قەرزی لەسەرە؟ ئەبو قەتادە وتی: من کەفالەتی قەرزەکەی دەکەم، فەرمووی: بەتەواوی وتی: بە تەواوی.**

## هاندان لە قەرزدانەوە بە چاکترین شێوە

**٤٦٩٣**- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: خِيَارُكُمْ أَحْسَنُكُمْ قَضَاءً»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترینتان ئەو کەسەتانە بەجوانی قەرزەکەی دەداتەوە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




## هەڵسوکەوتی جوان لەکاتی داواکردنی قەرز

**٤٦٩٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ رَجُلاً لَمْ يَعْمَلْ خَيْراً قَطُّ، وَكَانَ يُدَايِنُ النَّاسَ، فَيَقُولُ لِرَسُولِهِ: خُذْ مَا تَيَسَّرَ، وَاتْرُكْ مَا عَسُرَ وَتَجَاوَزْ، لَعَلَّ اللَّهَ تَعَالَى أَنْ يَتَجَاوَزَ عَنَّا، فَلَمَّا هَلَكَ قَالَ اللَّهُ ﷿ لَهُ: هَلْ عَمِلْتَ خَيْراً قَطُّ؟ قَالَ: لَا. إِلَّا أَنَّهُ كَانَ لِي غُلَامٌ وَكُنْتُ أُدَايِنُ النَّاسَ، فَإِذَا بَعَثْتُهُ لِيَتَقَاضَى قُلْتُ لَهُ: خُذْ مَا تَيَسَّرَ، وَاتْرُكْ مَا عَسُرَ، وَتَجَاوَزْ لَعَلَّ اللَّهَ يَتَجَاوَزُ عَنَّا. قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: قَدْ تَجَاوَزْتُ عَنْكَ»[1].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پیاوێک هیچ چاکەیەکی نەبوو، قەرزی دەدا بە خەڵکی، بە نێردراوەکەی دەوت: قەرز وەربگرە لەو کەسەی بۆی ئاسانە و دەیداتەوە، وازبێنە لەوەش توانای دانەوەی نیە، چاوپۆشی لێ بکە، بەڵکو خوا چاوپۆشیان لێ بکات، کاتێ مرد، خوا پێی فەرموو: ئایا تۆ لە ژیانتدا کارێکی چاکت کردوە؟ وتی: نەخێر، ئەوە نەبێ منداڵێ یان خزمەتکارێکم هەبوو، قەرزم دەدا بە خەڵکی کاتێ بمناردایە بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەکەم، پێم دەوت: لە کەسێک وەریبگرە توانای هەبێت، واز لەوە بێنە ناتوانێ بیداتەوە، چاوپۆشی لێ بکە، بەڵکو خوا چاوپۆشیان لێ بکات، خوا ﷻ فەرمووی: بێگومان چاوپۆشیم لێکردی.

**٤٦٩٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ يَقُولُ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: كَانَ رَجُلٌ يُدَايِنُ النَّاسَ، وَكَانَ إِذَا رَأَى إِعْسَارَ الْمُعْسِرِ قَالَ لِفَتَاهُ: تَجَاوَزْ عَنْهُ، لَعَلَّ اللَّهَ تَعَالَى يَتَجَاوَزُ عَنَّا، فَلَقِيَ اللَّهَ فَتَجَاوَزَ عَنْهُ»[2].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پیاوێک هەبوو قەرزی دەدا بە خەڵکی ئەگەر بیبینایە کەسەکە ناتوانێ قەرزەکەی بداتەوە بە نێردراوەکەی دەوت: چاوپۆشی لێ بکە، بەڵکو خوا چاوپۆشیان لێ بکات، کاتێ گەیشتە لای خوا چاوپۆشی لێکرد.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٧٨ و ٣٤٨٠، ومسلم: ١٥٦٢.

(٢) صحيح.




**٤٦٩٦-** «عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَدْخَلَ اللَّهُ ﷻ رَجُلاً كَانَ سَهْلاً مُشْتَرِياً، وَبَائِعاً، وَقَاضِياً، وَمُقْتَضِياً الْجَنَّةَ»(١).

**واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا ﷻ پیاوێکی خستە بەهەشتەوە کاتێ شتێکی بکڕیایەو بفرۆشتایەو بڕیارێکی بدایەو بڕیارێکی بەسەر جێبەجێ بکرایە ئاسانکارو بەخشندە بوو.**

## شەریکی بەبێ ماڵ و سامان

**٤٦٩٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: اشْتَرَكْتُ أَنَا وَعَمَّارٌ، وَسَعْدٌ يَوْمَ بَدْرٍ، فَجَاءَ سَعْدٌ بِأَسِيرَيْنِ، وَلَمْ أَجِئْ أَنَا وَعَمَّارٌ بِشَيْءٍ»(٢).

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: من و عەمار و سەعد لە ڕۆژی بەدردا شەریک بووین، سەعد دوو دیلی هێنا، من و عەماریش هیچمان نەهێنا.**

**٤٦٩٨-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ أَعْتَقَ شِرْكاً لَهُ فِي عَبْدٍ أُتِمَّ مَا بَقِيَ فِي مَالِهِ، إِنْ كَانَ لَهُ مَالٌ يَبْلُغُ ثَمَنَ الْعَبْدِ»(٣).

**واتە: سالم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس کۆیلەیەکی هەبێ بە شەریکی لەگەڵ کەسانی ترو، بیەوێ لە بەشی خۆی ئازادی بکات، ئەو ئەگەر پارەی هەبوو نرخی بەشە شەریکەکانی تریش بدات بە تەواوی ئازادی بکات.**

## شەریکایەتی لە کۆیلەدا

**٤٦٩٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ أَعْتَقَ شِرْكاً لَهُ فِي مَمْلُوكٍ، وَكَانَ لَهُ مِنَ الْمَالِ مَا يَبْلُغُ ثَمَنَهُ بِقِيمَةِ الْعَبْدِ فَهُوَ عَتِيقٌ مِنْ مَالِهِ»(٤).

---

(١) حسن. أخرجه إبن ماجه: ٢٢٠٢.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٢١، ومسلم: ١٥٠١، وأبو داود: ٣٩٤٦ و ٣٩٤٧، والترمذي: ١٣٤٧.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٠٦، ومسلم: ١٥٠١، وأبو داود: ٣٩٤٠، والترمذي: ١٣٤٦، وإبن ماجه: ٢٥٢٨.




واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس کۆیلەیەکی هەبێ بە شەریکی لەگەڵ کەسانی ترو بیەوێ لە بەشی خۆی ئازادی بکات، ئەوەندە پارەی هەبوو نرخی بەشە شەریکەکانی تریش بدات، ئەوە با بە تەواوی لەماڵی خۆی ئازادی بکات.

## شەریکایەتی لە باخی خورمادا

**٤٧٠٠-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: أَيُّكُمْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ أَوْ نَخْلٌ، فَلَا يَبِعْهَا حَتَّى يَعْرِضَهَا عَلَى شَرِيكِهِ»(١).

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێک لە ئێوە زەویەکی هەبێ یان باخە خورمایەک، با نەیفرۆشێ تا پێشنیاری شەریکەکەی نەکات.

## شەریکایەتی لە چوار یەکدا

**٤٧٠١-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالشُّفْعَةِ فِي كُلِّ شَرِكَةٍ لَمْ تُقْسَمْ رَبْعَةٍ، وَحَائِطٍ لَا يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَبِيعَهُ حَتَّى يُؤْذِنَ شَرِيكَهُ، فَإِنْ شَاءَ أَخَذَ، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ، وَإِنْ بَاعَ وَلَمْ يُؤْذِنْهُ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ»(٢).

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە شوفعە لە هەموو شتێکی شەریکیدا خانوو بێت یان باخ، حەڵاڵ نیە بۆی بیفرۆشێ تا مۆڵەت لە شەریکەکەی وەرنەگرێ، ئەگەر ویستی وەریدەگرێ، وە ئەگەر ویستی وازی لێدێنێ، وە ئەگەر فرۆشتی و مۆڵەتی لێوەرنەگرت ئەوە شەریکەکەی لە پێشترە.

## باسی (الشُّفْعَةِ) و حوکمەکانی

تێبینی: (الشُّفْعَة) بریتیە لەوەی یەکێک لە شەریکەکان بەشەکەی خۆی بفرۆشێ، ئینجا شەریکەکەی تر بچێ شتەکە لە کڕیارەکە بکڕێتەوە بەو پارەیەی پێی کڕیوە، هەرچەندە پێشی خۆش نەبێ.

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح.




**٤٧٠٢-** «عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْجَارُ أَحَقُّ بِسَقَبِهِ»[١].

**واتە: ئەبو ڕافع ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دراوسێ لە پێشترە بە کڕینەوەی (بە هۆی نزیکی).**

**٤٧٠٣-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرْضِي لَيْسَ لِأَحَدٍ فِيهَا شَرِكَةٌ، وَلَا قِسْمَةٌ إِلَّا الْجُوَارَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْجَارُ أَحَقُّ بِسَقَبِهِ»[٢].

**واتە: عەمری کوڕی شەرید دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، زەویەکم هەیە بەشی هیچ کەسی تێدا نیە جگە لە دراوسێیەتی نەبێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دراوسێ لە پێشترە بە کڕینەوەی.**

**٤٧٠٤-** «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الشُّفْعَةُ فِي كُلِّ مَالٍ لَمْ يُقْسَمْ، فَإِذَا وَقَعَتِ الْحُدُودُ، وَعُرِفَتِ الطُّرُقُ فَلَا شُفْعَةَ»[٣].

**واتە: ئەبو سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شوفعە لە هەموو ماڵێکدا هەیە کە بەش نەکرابێ، ئەگەر سنور دیاری کرا، وە ڕێگا دانرا، ئەوە شوفعە نیە.**

**٤٧٠٥-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالشُّفْعَةِ وَالْجِوَارِ»[٤].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە شوفعەو دراوسێیەتی.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٥٨، وأبو داود: ٣٥١٦، وإبن ماجه: ٢٤٩٥ و ٢٤٩٨.

(٢) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٢٤٩٦.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح لغيره.




(الْقَسَامَةِ): بریتیە لەوەی خاوەنی کوژراوەکە سوێند دەخۆن کە فڵانە خێڵ کوشتوویانە، بەو شێوەیە پەنجا وشتر وەردەگرن، ئەگەرنا پەنجا کەس لەو خێڵەی کە گومان دەکرێ بکوژ بن، سوێند دەخۆن کە ئەوان دەستیان لە کوشتنی ئەو کەسەدا نەبووە، یان پەنجا وشتر دەدەن بە حەقی خوێنی کوژراوەکە بە کەس و کارەکەی.

### باسی ئەو (قَسَامَةُ)یە کە لە سەردەمی نەفامیدا هەبووە

**٤٧٠٦-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَوَّلُ قَسَامَةٍ كَانَتْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، كَانَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي هَاشِمٍ اسْتَأْجَرَ رَجُلاً مِنْ قُرَيْشٍ، مِنْ فَخِذِ أَحَدِهِمْ قَالَ: فَانْطَلَقَ مَعَهُ فِي إِبِلِهِ، فَمَرَّ بِهِ رَجُلٌ مِنْ بَنِي هَاشِمٍ قَدِ انْقَطَعَتْ عُرْوَةُ جُوَالِقِهِ، فَقَالَ: أَغِثْنِي بِعِقَالٍ أَشُدُّ بِهِ عُرْوَةَ جُوَالِقِي لَا تَنْفِرُ الْإِبِلُ، فَأَعْطَاهُ عِقَالاً يَشُدُّ بِهِ عُرْوَةَ جُوَالِقِهِ، فَلَمَّا نَزَلُوا، وَعُقِلَتْ الْإِبِلُ إِلَّا بَعِيراً وَاحِداً، فَقَالَ الَّذِي اسْتَأْجَرَهُ: مَا شَأْنُ هَذَا الْبَعِيرِ، لَمْ يُعْقَلْ مِنْ بَيْنِ الْإِبِلِ؟ قَالَ: لَيْسَ لَهُ عِقَالٌ قَالَ: فَأَيْنَ عِقَالُهُ؟ قَالَ: مَرَّ بِي رَجُلٌ مِنْ بَنِي هَاشِمٍ قَدِ انْقَطَعَتْ عُرْوَةُ جُوَالِقِهِ فَاسْتَغَاثَنِي، فَقَالَ: أَغِثْنِي بِعِقَالٍ أَشُدُّ بِهِ عُرْوَةَ جُوَالِقِي، لَا تَنْفِرُ الْإِبِلُ، فَأَعْطَيْتُهُ عِقَالاً فَحَذَفَهُ بِعَصاً كَانَ فِيهَا أَجَلُهُ، فَمَرَّ بِهِ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ فَقَالَ: أَتَشْهَدُ الْمَوْسِمَ؟ قَالَ: مَا أَشْهَدُ، وَرُبَّمَا شَهِدْتُ، قَالَ: هَلْ أَنْتَ مُبَلِّغٌ عَنِّي رِسَالَةً مَرَّةً مِنَ الدَّهْرِ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: إِذَا شَهِدْتَ الْمَوْسِمَ فَنَادِ: يَا آلَ قُرَيْشٍ، فَإِذَا أَجَابُوكَ، فَنَادِ: يَا آلَ هَاشِمٍ، فَإِذَا أَجَابُوكَ، فَسَلْ عَنْ أَبِي طَالِبٍ، فَأَخْبِرْهُ أَنَّ فُلَاناً قَتَلَنِي فِي عِقَالٍ، وَمَاتَ الْمُسْتَأْجَرُ، (كریكارەكە) فَلَمَّا قَدِمَ الَّذِي اسْتَأْجَرَهُ، أَتَاهُ أَبُو طَالِبٍ فَقَالَ: مَا فَعَلَ صَاحِبُنَا؟ قَالَ: مَرِضَ، فَأَحْسَنْتُ الْقِيَامَ عَلَيْهِ، ثُمَّ مَاتَ، فَنَزَلْتُ، فَدَفَنْتُهُ، فَقَالَ كَانَ ذَا أَهْلَ ذَاكَ مِنْكَ، فَمَكُثَ حِيناً، ثُمَّ إِنَّ الرَّجُلَ الْيَمَانِيَّ الَّذِي كَانَ أَوْصَى إِلَيْهِ أَنْ يُبَلِّغَ عَنْهُ، وَافَى الْمَوْسِمَ، قَالَ: يَا آلَ قُرَيْشٍ، قَالُوا: هَذِهِ قُرَيْشٌ، قَالَ: يَا آلَ بَنِي هَاشِمٍ، قَالُوا: هَذِهِ بَنُو هَاشِمٍ، قَالَ: أَيْنَ أَبُو طَالِبٍ؟ قَالَ: هَذَا أَبُو طَالِبٍ، قَالَ: أَمَرَنِي فُلَانٌ أَنْ أُبَلِّغَكَ رِسَالَةً، أَنَّ فُلَاناً قَتَلَهُ فِي عِقَالٍ، فَأَتَاهُ أَبُو طَالِبٍ، فَقَالَ: اخْتَرْ مِنَّا إِحْدَى ثَلَاثٍ إِنْ شِئْتَ أَنْ تُؤَدِّيَ مِائَةً مِنَ الْإِبِلِ، فَإِنَّكَ قَتَلْتَ صَاحِبَنَا خَطَأً، وَإِنْ شِئْتَ يَحْلِفْ خَمْسُونَ مِنْ قَوْمِكَ أَنَّكَ لَمْ تَقْتُلْهُ، فَإِنْ أَبَيْتَ قَتَلْنَاكَ بِهِ. فَأَتَى قَوْمَهُ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُمْ، فَقَالُوا: نَحْلِفُ، فَأَتَتْهُ امْرَأَةٌ مِنْ بَنِي هَاشِمٍ كَانَتْ تَحْتَ رَجُلٍ مِنْهُمْ قَدْ وَلَدَتْ لَهُ. فَقَالَتْ: يَا أَبَا طَالِبٍ، أُحِبُّ أَنْ تُجِيزَ ابْنِي هَذَا بِرَجُلٍ مِنَ الْخَمْسِينَ، وَلَا تُصْبِرْ يَمِينَهُ، فَفَعَلَ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ مِنْهُمْ، فَقَالَ: يَا أَبَا طَالِبٍ، أَرَدْتَ خَمْسِينَ رَجُلاً أَنْ يَحْلِفُوا مَكَانَ مِائَةٍ مِنَ الْإِبِلِ، يُصِيبُ كُلَّ رَجُلٍ بَعِيرَانِ فَهَذَانِ بَعِيرَانِ فَاقْبَلْهُمَا عَنِّي، وَلَا تُصْبِرْ يَمِينِي حَيْثُ تُصْبَرُ الْأَيْمَانُ، فَقَبِلَهُمَا، وَجَاءَ




ثَمَانِيَةٌ وَأَرْبَعُونَ رَجُلاً حَلَفُوا، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا حَالَ الْحَوْلُ وَمِنَ الثَّمَانِيَةِ وَالْأَرْبَعِينَ عَيْنٌ تَطْرِفُ»[1].

واته: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: یەکەم قەسامە لە سەردەمی نەفامیدا بوو، پیاوێک لە بەنی هاشم (ئەویش عەمری کوڕی عەلقەمەی کوڕی عەبدولموطلیب بوو) پیاوێکی بە کرێ گرت لە قورەیش، لە پشتی یەکێکیان بوو، وتی: لەگەڵی ڕۆیشت و وشترەکانی لەگەڵ خۆی برد، پیاوێک لە نەوەی هاشم تێپەڕی بەلای کرێکارەکەدا، پەتی بەستنەوەی وشترەکەی بڕا بوو، وتی: یارمەتیم بدەو پەتێکم بدەرێ قاچی وشترەکەمی پێ ببەستمەوە تا ڕانەکات، ئەویش پەتێکی پێدا قاچی وشترەکەی پێ ببەستێتەوە، کاتێ دابەزین، وە سەرجەم وشترەکان بەسترانەوە جگە لە وشترێک نەبێت، ئەو کەسەی بە کرێ پێیدابوو، وتی: ئەم وشترە چیەتی وانەبەستراوەتەوە؟ وتی: پەتی نیە، وتی: ئەی پەتەکەی کوا؟ وتی: پیاوێک لە نەوەکانی هاشم تێپەڕی بە لامدا پەتی پێی وشترەکەی بڕابوو، داوای یارمەتی کرد وتی: پەتێکم بدەرێ قاچی وشترەکەمی پێ ببەستمەوە هەتا ڕانەکات، منیش پەتێکم پێدا، ئەویش گۆچانەکەی بۆی فڕێداو لێیدا، ئەوە بوو بە هۆی مردنی، پاشان پیاوێکی یەمەنی تێپەڕی بە لایدا وتی: ئامادەی حەجی ئەمساڵ دەبی؟ وتی: ئامادەی نابم، پێدەچێ ئامادەی ببم، وتی: ئایا تۆ دەتوانی جارێک لە هەموو تەمەنتدا نامەیەکی من بگەیەنیتە جێگای خۆی؟ وتی: بەڵێ، وتی: ئەگەر ئەمساڵ ئامادەی مەراسیمی حەج بووی هاوار بکەو بڵێ: ئەی قورەیش، ئەگەر وەڵامیان دایتەوە هاوار بکەو بڵێ: ئەی بنەماڵەی هاشم، ئەگەر وەڵامیان دایتەوە، بڵێ کامە ئەبو طالیبە، هەواڵی بدەرێ کە فلانە کەس منی لەبەر پەتێک کوشتووە، پاشان ئەو پیاوەی وشترەکەی پێدرا بوو بە کرێ مرد، کاتێ ئەو کەسەی کە وشترەکەی دابوو بە کرێ گەڕایەوە ئەبو طالیب هات بۆ لای، وتی: هاوەڵەکەمان چی کردوە؟ وتی: نەخۆش کەوت و زۆر بە چاکی لەگەڵیدا بووم و هاوکاریم کرد، پاشان مرد، دابەزیمە خوارەوەو هەر لەوێ ناشتم، وتی تۆ هەر ئەوەت لێ ئەوەشێتەوە، ماوەیەک بەو شێوەیە مایەوە، پاشان پیاوە یەمەنیەکە کە وەسیەتی بۆ کرابوو هەواڵەکە بگەیەنێ لەکاتی حەجدا هاتوو وتی: ئەی بنەماڵەی قورەیش، وتیان: ئەمە قورەیشە، وتی: ئەی نەوەکانی بەنی

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٨٤٥.

هاشم، وتیان: ئەمەش نەوەکانی بەنی هاشمە، وتی: ئەبو طاڵیب لە کوێیە؟ وتی: ئەمە ئەبو طاڵیبە، وتی: فڵانە کەس فەرمانی پێ کردووم ئەم نامەیەت پێ بگەیەنم، کە فڵانە کەس بەهۆی پەتێکەوە کوشتویەتی، ئەبو طاڵیبیش هات بۆ لای کابرای بکوژ وتی: یەکێک لەم سێ دانەیە هەڵبژێرە: ئەگەر دەتەوێ سەد وشترمان بدەرێ، چونکە تۆ هاوەڵەکەی ئێمەت بە هەڵە کوشتووە، وە ئەگەر دەتەوێ پەنجا کەس لە قەومەکەت سوێند بخۆن کە تۆ نەتکوشتووە، ئەگەر ئەوە نەکەیت ئەوە دەتکوژین، قەومەکەی هاتن بۆ لای ئەوەی بۆ باسکردن، وتیان: سوێند دەخۆین، لەناو ئەواندا ئافرەتێک لە نەوەکانی هاشم هات بۆ لای ژنی یەکێک بوو لەو پیاوانە منداڵیشی لێ بوو بوو، وتی: ئەی ئەبو طاڵیب حەز دەکەم ڕێگا بدەی کوڕەکەم سوێند نەخوات کە یەکێکە لەو پەنجا پیاوەی سوێند دەخۆن، ناتوانم ئارام بگرم لەسەر سوێندەکەی، ئەویش ڕازیبوو، پیاوێکی تر لە ئەوان هات، وتی: ئەی ئەبو طاڵیب دەتەوێ پەنجا پیاو سوێند بخۆن لە بری سەد وشتر، هەریەکیان دوو وشتری بەردەکەوێ، دوو وشتر لەمن وەربگرە چونکە من ئارام ناگرم لەسەر ئەو سوێند خواردنە، ئەبو طاڵیب هەردوکیانی قبوڵ کرد، ئەو چل و هەشتەکەی دیکە هاتن سوێندیان خوارد، ئیبنو عەبباس وتی: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە ئەو چل و هەشت کەسەی سوێندیان خوارد ساڵیان بەسەر نەهاتەوە چاو هەڵبهێنن.

## (دەربارەی): الْقَسَامَةُ

**٤٧٠٧**- «عَنْ أَحْمَدَ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ، وَسُلَيْمَانُ بْنُ يَسَارٍ، عَنْ رَجُلٍ، مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْأَنْصَارِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أَقَرَّ الْقَسَامَةَ عَلَى مَا كَانَتْ عَلَيْهِ فِي الْجَاهِلِيَّةِ»(١).

واتە: ئەحمەدی کوڕی عەمرِ دەڵێ: ئەبو سەلەمەو سولەیمانی کوڕی یەسار (خوا لێیان ڕازی بێ) هەواڵیان پێدام لە پیاوێکی ئەنصاری لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دانینا بە قەسامەدا، بەو شێوەیەی کە خەڵکانی سەردەمی نەفامی لەسەری دەڕۆیشتن (ئەویش بریتیە لەوەی پەنجا کەس لە خێڵی بکوژەکە سوێند دەخۆن کە ئەوان دەستیان لە کوشتنی ئەو کەسەدا نیە، یان پەنجا وشتر دەدەن بە حەقی خوێنی کوژراوەکە بە کەس و کارەکەی).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧ و ١٦٧٠/٨، وأبو داود: ٤٥٣٦.




**٤٧٠٨-** «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، وَسُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أُنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّ الْقَسَامَةَ كَانَتْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَأَقَرَّهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى مَا كَانَتْ عَلَيْهِ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَقَضَى بِهَا بَيْنَ أُنَاسٍ مِنَ الْأَنْصَارِ فِي قَتِيلٍ ادَّعَوْهُ عَلَى يَهُودِ خَيْبَرَ»[١].

**واتە: ئەبو سەلەمەو سولەیمانی کوڕی یەسار (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕنەوە، لە خەڵکانێک لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ: قەسامە لە سەردەمی نەفامیدا هەبووە، پێغەمبەری خوا جێگیری کرد، وەکو چۆن لە سەردەمی نەفامیدا هەبوو، وە دادوەری پێکرد لە نێوانی خەڵکانێک لە ئەنصارەکاندا لە بارەی کوژراوێکەوە کە دابوویانە پاڵ جولەکەکانی خەیبەر.**

**٤٧٠٩-** «عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ قَالَ: كَانَتِ الْقَسَامَةُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، ثُمَّ أَقَرَّهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الْأَنْصَارِيِّ الَّذِي وُجِدَ مَقْتُولاً فِي جُبِّ الْيَهُودِ فَقَالَتِ الْأَنْصَارُ: الْيَهُودُ قَتَلُوا صَاحِبَنَا»[٢].

**واتە: ئیبنو موسەیب دەڵێ: قەسامە لە سەردەمی جاهلیدا هەبوو، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ جێگیری کرد لە بارەی پیاوێکی ئەنصاری کە بە کوژراوی دۆزرایەوە لە نێو بیرێکی جولەکەکاندا، ئەنصارەکان وتیان: جولەکە هاوەڵەکەی ئێمەی کوشتووە (جا ئەگەر پەنجا سوێندیان خوارد، یان پەنجا کەس لەوان سوێندیان خوارد گومانەکە لەسەر ئەوان لادەچێت).**

## دەستپێکردنی سوێند لە لایەن کەسوکاری کوژراو

**٤٧١٠-** «عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ، وَمُحَيِّصَةَ خَرَجَا إِلَى خَيْبَرَ مِنْ جَهْدٍ أَصَابَهُمَا، فَأُتِيَ مُحَيِّصَةُ فَأُخْبِرَ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ قَدْ قُتِلَ وَطُرِحَ فِي فَقِيرٍ أَوْ عَيْنٍ، فَأَتَى يَهُودَ فَقَالَ: أَنْتُمْ وَاللَّهِ قَتَلْتُمُوهُ، فَقَالُوا: وَاللَّهِ مَا قَتَلْنَاهُ، ثُمَّ أَقْبَلَ حَتَّى قَدِمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، ثُمَّ أَقْبَلَ هُوَ وَحُوَيِّصَةُ وَهُوَ أَخُوهُ أَكْبَرُ مِنْهُ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ فَذَهَبَ مُحَيِّصَةُ لِيَتَكَلَّمَ وَهُوَ الَّذِي كَانَ بِخَيْبَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَبِّرْ كَبِّرْ وَتَكَلَّمَ حُوَيِّصَةُ، ثُمَّ تَكَلَّمَ مُحَيِّصَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِمَّا أَنْ يَدُوا صَاحِبَكُمْ، وَإِمَّا أَنْ يُؤْذِنُوا بِحَرْبٍ فَكَتَبَ النَّبِيُّ ﷺ فِي ذَلِكَ، فَكَتَبُوا: إِنَّا وَاللَّهِ مَا قَتَلْنَاهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِحُوَيِّصَةَ وَمُحَيِّصَةَ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ: تَحْلِفُونَ وَتَسْتَحِقُّونَ دَمَ صَاحِبِكُمْ؟ قَالُوا: لَا، قَالَ: فَتَحْلِفُ لَكُمْ يَهُودُ؟ قَالُوا: لَيْسُوا مُسْلِمِينَ. فَوَدَاهُ رَسُولُ

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.

اللَّهِ ﷺ مِنْ عِنْدِهِ فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ بِمِائَةِ نَاقَةٍ حَتَّى أُدْخِلَتْ عَلَيْهِمُ الدَّارَ، قَالَ سَهْلٌ: لَقَدْ رَكَضَتْنِي مِنْهَا نَاقَةٌ حَمْرَاءُ»[١].

**واتە: سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە ﷺ دەگێڕێتەوە: عەبدوڵڵای کوڕی سەهل و موحەییصە دەرچوون بۆ خەیبەر بەهۆی هەژارییەکەوە بەسەریان هاتبوو، هەواڵدرا بە موحەییصە: کە عەبدوڵڵای کوڕی سەهل کوژراوەو فڕی دراوەتە ناو بیرێکی فراوانی نزم، یان کانیاوێک، ئەویش هات بۆ لای جولەکەکان، وتی: سوێند بەخوا ئێوە کوشتوتانە، وتیان: سوێند بەخوا ئێمە نەمانکوشتووە، پاشان ڕۆیشت تا گەیشتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بۆ باس کرد، پاشان خۆی و حویەییصەی کە برا گەورەکەی بوو لەگەڵ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەهلدا پێکەوە هەموویان چوون بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، موحەییصە ویستی قسە بکات کە لە خەیبەر بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (کێ گەورەترە با ئەو قسە بکات، کێ گەوترە با ئەو قسە بکات. ئینجا حویەییصە قسەی کرد پاشان موحەییصە قسەی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: یان ئەوەیە جولەکەکان خوێنی هاوەڵەکەتان دەدەن، یان دەرگای شەڕ بەڕووی خۆیاندا دەکەنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نوسراوێکی بۆ کردن لەو بارەیەوە، ئەوانیش نوسراوێکیان کرد: سوێند بە خوا ئێمە نەمانکوشتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە حویەییصەو موحەییصەو عەبدوڕڕەحمانی فەرموو: ئایا سوێند دەخۆن و مافی هاوەڵەکەتان وەربگرنەوە؟ وتیان: سوێند ناخۆین، فەرمووی: دەی جولەکەکان سوێند بۆ ئێوە دەخوا؟ وتیان: ئەوان مسوڵمان نین، پێغەمبەری خوا ﷺ لە لایەن خۆیەوە سەد وشتری بۆ ناردن تا بردیە ناو ماڵیانەوە، سەهل وتی: وشترێکی سوریان لەقەیەکی لێدام.**

**٤٧١١-** «عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ وَرِجَالٌ كُبَرَاءُ مِنْ قَوْمِهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ وَمُحَيِّصَةَ خَرَجَا إِلَى خَيْبَرَ مِنْ جَهْدٍ أَصَابَهُمْ، فَأَتَى مُحَيِّصَةُ فَأَخْبَرَ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ قَدْ قُتِلَ وَطُرِحَ فِي فَقِيرٍ أَوْ عَيْنٍ، فَأَتَى يَهُودَ. وَقَالَ: أَنْتُمْ وَاللَّهِ قَتَلْتُمُوهُ، قَالُوا: وَاللَّهِ مَا قَتَلْنَاهُ. فَأَقْبَلَ حَتَّى قَدِمَ عَلَى قَوْمِهِ، فَذَكَرَ لَهُمْ، ثُمَّ أَقْبَلَ هُوَ وَأَخُوهُ حُوَيِّصَةُ وَهُوَ أَكْبَرُ مِنْهُ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ، فَذَهَبَ مُحَيِّصَةُ لِيَتَكَلَّمَ وَهُوَ الَّذِي كَانَ بِخَيْبَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِمُحَيِّصَةَ: كَبِّرْ كَبِّرْ يُرِيدُ السِّنَّ فَتَكَلَّمَ حُوَيِّصَةُ، ثُمَّ تَكَلَّمَ مُحَيِّصَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِمَّا أَنْ يَدُوا صَاحِبَكُمْ، وَإِمَّا أَنْ يُؤْذَنُوا بِحَرْبٍ، فَكَتَبَ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي ذَلِكَ، فَكَتَبُوا إِنَّا وَاللَّهِ مَا قَتَلْنَاهُ، فَقَالَ رَسُولُ

---

**(١) صحيح.**




اللَّهِ ﷺ لِحُوَيِّصَةَ وَمُحَيِّصَةَ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ: أَتَحْلِفُونَ وَتَسْتَحِقُّونَ دَمَ صَاحِبِكُمْ؟ قَالُوا: لَا. قَالَ: فَتَحْلِفُ لَكُمْ يَهُودُ، قَالُوا: لَيْسُوا بِمُسْلِمِينَ فَوَدَاهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ عِنْدِهِ فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ بِمِائَةِ نَاقَةٍ حَتَّى أُدْخِلَتْ عَلَيْهِمُ الدَّارَ، قَالَ سَهْلٌ: لَقَدْ رَكَضَتْنِي مِنْهَا نَاقَةٌ حَمْرَاءُ»(١).

**واتە: سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە ﷺ و کۆمەڵێک لە پیاوە گەورەکانی قەومەکەی دەگێڕێتەوە، عەبدوڵڵای کوڕی سەهل و موحەییصە دەرچوون بۆ خەیبەر بە هۆی هەژاریەکەوە تووشیان بوو بوو، موحەییصە هەواڵیدا: کە عەبدوڵڵای کوڕی سەهل کوژراوەو فڕێ دراوەتە ناو بیرێکی فراوانی نزم، یان کانیاوێک، هات بۆ لای جولەکەکان، وتی: سوێند بەخوا ئێوە کوشتوتانە، وتیان: سوێند بەخوا ئێمە نەمانکوشتووە، پاشان ڕۆیشت تا گەیشت بە قەومەکەی ئەوەی بۆ باسکردن، پاشان خۆی و حویەییصەی کە برا گەورەکەی بوو لەگەڵ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەهلدا پێکەوە هەموویان چوون بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، سەرەتا موحەییصە کە لە خەیبەر بوو چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێ گەورەترە با ئەوە بێت، ئینجا حویەییصە قسەی کرد پاشان موحەییصە قسەی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: یان ئەوەیە جولەکەکان خوێنی براکەتان دەدەن، یان دەرگای شەڕ بەڕووی خۆیاندا دەکەنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نوسراوێکی بۆ کردن لەو بارەیەوە، ئەوانیش نوسراوێکیان کرد: سوێند بەخوا ئێمە نەمانکوشتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە حویەییصەو موحەییصەو عەبدوڕڕەحمانی فەرموو: ئایا سوێند دەخۆن و مافی هاوەڵەکەتان وەربگرنەوە؟ وتیان: سوێند ناخۆین، فەرمووی: دەی جولەکە سوێند بۆ ئێوە دەخوا؟ وتیان: ئەوان مسوڵمان نین، پێغەمبەری خوا ﷺ لە لایەن خۆیەوە سەد وشتری بۆ ناردن هەتا بردیە ناوماڵیانەوە، سەهل وتی: وشترێکی سوریان لەقەیەکی لێدام.**

## باسی جیاوازی دەستەواژەی ئەوانەی فەرموودەکەی سەهلیان گواستۆتەوە

**٤٧١٢-** «عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ قَالَ: وَحَسِبْتُ قَالَ: وَعَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، أَنَّهُمَا قَالَا: خَرَجَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَهْلِ بْنِ زَيْدٍ وَمُحَيِّصَةُ بْنُ مَسْعُودٍ حَتَّى إِذَا كَانَا بِخَيْبَرَ تَفَرَّقَا فِي

---

(١) صحيح.





بَعْضِ مَا هُنَالِكَ، ثُمَّ إِذَا بِمُحَيِّصَةَ يَجِدُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ قَتِيلاً فَدَفَنَهُ، ثُمَّ أَقْبَلَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ هُوَ وَحُوَيِّصَةُ بْنُ مَسْعُودٍ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ وَكَانَ أَصْغَرَ الْقَوْمِ، فَذَهَبَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ يَتَكَلَّمُ قَبْلَ صَاحِبَيْهِ. فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَبِّرِ الْكُبْرَ فِي السِّنِّ فَصَمَتَ وَتَكَلَّمَ صَاحِبَاهُ، ثُمَّ تَكَلَّمَ مَعَهُمَا، فَذَكَرُوا لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَقْتَلَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَهْلٍ، فَقَالَ لَهُمْ: أَتَحْلِفُونَ خَمْسِينَ يَمِيناً وَتَسْتَحِقُّونَ صَاحِبَكُمْ أَوْ قَاتِلَكُمْ؟ قَالُوا: كَيْفَ نَحْلِفُ وَلَمْ نَشْهَدْ؟ قَالَ: فَتُبَرِّئُكُمْ يَهُودُ بِخَمْسِينَ يَمِيناً، قَالُوا: وَكَيْفَ نَقْبَلُ أَيْمَانَ قَوْمٍ كُفَّارٍ؟ فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَعْطَاهُ عَقْلَهُ»[١].

**واته: بوشەیری کوڕی یەسار دەگێڕێتەوە، لە سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە دەڵێ: پێم وابوو وتی: لە ڕافعی کوڕی خەدیجەوە، ئەوان وتیان: عەبدوڵڵای کوڕی سەهلی کوڕی زەیدو موحەییصەی کوڕی مەسعود دەرچوون تا گەیشتنە خەیبەر، لەوێ لە یەکتر جیابوونەوە، کاتێ کە حوییصە گەڕایەوە عەبدوڵڵای کوڕی سەهلی بە کوژراوی بینیەوە، پاشان شاردیەوە، پاشان خۆی براکەی حویەییصەی کوڕی مەسعود و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەهل ڕویان کردە پێغەمبەری خوا ﷺ موحەییصە بچوکترینیان بوو، عەبدوڕڕەحمان ڕۆیشت لە پێش ئەوان قسەی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێ گەورەترە لە تەمەندا با ئەوە قسە بکات، پاشان هەردوو هاوەڵەکەی قسەیان کرد، باسی کوشتنی عەبدوڵڵای کوڕی سەهلیان کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش پێی فەرموو: ئایا پەنجا سوێند دەخۆن تا مافی هاوەڵەکەتان یان کوژراوەکەتان وەربگرنەوە؟ وتیان: ئێمە چۆن سوێند بخۆین هیچمان نەبینیوە؟ فەرمووی: جولەکە بە پەنجا سوێند خۆیان بەری دەکەن، وتیان: چۆن ئێمە سوێندی بێبڕوایان قبووڵ بکەین، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بینی خۆی خوێن باییەکەیدا.**

**٤٧١٣-** «عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ، وَرَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، أَنَّهُمَا حَدَّثَاهُ، أَنَّ مُحَيِّصَةَ بْنَ مَسْعُودٍ وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ أَتَيَا خَيْبَرَ فِي حَاجَةٍ لَهُمَا، فَتَفَرَّقَا فِي النَّخْلِ، فَقُتِلَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَهْلٍ، فَجَاءَ أَخُوهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ وَحُوَيِّصَةُ وَمُحَيِّصَةُ ابْنَا عَمِّهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَتَكَلَّمَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ فِي أَمْرِ أَخِيهِ، وَهُوَ أَصْغَرُ مِنْهُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْكُبْرَ لِيَبْدَأِ الأَكْبَرُ فَتَكَلَّمَا فِي أَمْرِ صَاحِبِهِمَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَذَكَرَ كَلِمَةً مَعْنَاهَا: يُقْسِمُ خَمْسُونَ مِنْكُمْ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَمْرٌ لَمْ نَشْهَدْهُ كَيْفَ نَحْلِفُ؟ قَالَ: فَتُبَرِّئُكُمْ يَهُودُ بِأَيْمَانِ خَمْسِينَ مِنْهُمْ، قَالُوا: يَا

---

(١) صحيح.




رَسُولَ اللَّهِ، قَوْمٌ كُفَّارٌ، فَوَدَاهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ قِبَلِهِ، قَالَ: سَهْلٌ فَدَخَلْتُ مِرْبَداً لَهُمْ فَرَكَضَتْنِي نَاقَةٌ مِنْ تِلْكَ الْإِبِلِ»[١].

**واتە: بوشەیری کوڕی یەسار دەگێڕێتەوە، لە سەهلی کوڕی ئەبو حەثمەو ڕافعی کوڕی خەدیج (خوا لە هەموویان ڕازی بێ)، ئەوان هەردووکیان بۆیان باسکرد، موحەییصەی کوڕی مەسعودو عەبدوڵڵای کوڕی سەهل هاتن بۆ خەیبەر بۆ پێویستیەکیان، لەناو دارخورماکاندا لە یەک جیابوونەوە، عەبدوڵڵای کوڕی سەهل کوژرا، براکەی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەهل و حویەییصەو موحەییصە هەردوو کوڕە مامەکەی هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، عەبدوڕڕەحمان لەبارەی براکەیەوە قسەی کرد کە ئەو بچوکترینیان بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با گەورە دەست پێ بکات، ئەوانیش لە بارەی هاوەڵەکەیانەوە قسەیان کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی «باسی وشەیەکی کرد کە ماناکەی»: پەنجا لە ئێوە سوێند دەخوات وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ڕووداوێکە ئێمە نەمانبینیوە ئیتر چۆن سوێند بخۆین؟ فەرمووی: جولەکەکان خۆیان بەری دەکەن بەوەی پەنجا کەس لە ئەوان سوێند دەخۆن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە خەڵکانێکی بێبڕوان، پێغەمبەری خوا ﷺ لە لایەن خۆیەوە خوێن باییەکەیدا، سەهل وتی: چوومە ناو شوێنی بەستنەوەکەیانەوە یەکێک لەو وشترانە لەقەیەکی لێدام.**

**٤٧١٤-** «عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ، وَمُحَيِّصَةَ بْنَ مَسْعُودِ بْنِ زَيْدٍ، أَنَّهُمَا أَتَيَا خَيْبَرَ وَهُوَ يَوْمَئِذٍ صُلْحٌ، فَتَفَرَّقَا لِحَوَائِجِهِمَا، فَأَتَى مُحَيِّصَةُ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَهْلٍ وَهُوَ يَتَشَحَّطُ فِي دَمِهِ قَتِيلاً، فَدَفَنَهُ ثُمَّ قَدِمَ الْمَدِينَةَ، فَانْطَلَقَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ وَحُوَيِّصَةُ وَمُحَيِّصَةُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَهَبَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ يَتَكَلَّمُ وَهُوَ أَحْدَثُ الْقَوْمِ سِنّاً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَبِّرْ الْكُبْرَ فَسَكَتَ، فَتَكَلَّمَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَتَحْلِفُونَ بِخَمْسِينَ يَمِيناً مِنْكُمْ، فَتَسْتَحِقُّونَ دَمَ صَاحِبِكُمْ أَوْ قَاتِلِكُمْ؟ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ نَحْلِفُ وَلَمْ نَشْهَدْ وَلَمْ نَرَ؟ قَالَ: تُبَرِّئُكُمْ يَهُودُ بِخَمْسِينَ يَمِيناً قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ نَأْخُذُ أَيْمَانَ قَوْمٍ كُفَّارٍ؟ فَعَقَلَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ عِنْدِهِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: بوشەیری کوڕی یەسار دەگێڕێتەوە، سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە ﷺ دەگێڕنەوە: عەبدوڵڵای کوڕی سەهل و موحەییصەی کوڕی مەسعودی کوڕی زەید ئەوان هاتن بۆ خەیبەر لەو کاتەدا ئاشتەوایی لە نێوان ئەوان و مسوڵمانادا هەبوو، هەر یەکەو بۆ پێویستی خۆیان لە یەکتر جیابوونەوە، دواتر موحەییصە کە گەڕایەوە تەماشای کرد عەبدوڵڵای کوڕی سەهل کوژراوەو خوێناوی کراوە، پاشان شاردیەوەو هات بۆ مەدینە، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەهل و حویەییصەو موحەییصە هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، عەبدوڕڕەحمان کە منداڵترینیان بوو دەستی کرد بە قسەکردن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با گەورەکەتان قسە بکات، پاشان ئەو دووانەکەی تر قسەیان کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا پەنجا سوێند دەخۆن هەتا شیاوی خوێنی هاوەڵەکەتان یان کوژراوەکەتان ببن؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە چۆن سوێند بخۆین نە ئامادەبووینەو نە بینیومانە؟ فەرمووی: دەی کەواتە پەنجا کەس لە جولەکەکان سوێندتان بۆ دەخۆن و بەری دەبن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە چۆن بڕوا بە سوێندی خەڵکانێکی بێبڕوا بکەین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ لە لایەن خۆیەوە خوێن بابیەکەیدا.

**٤٧١٥-** «عَنْ بُشَيْرِ بن يَسَارٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ قَالَ: انْطَلَقَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَهْلٍ وَمُحَيِّصَةُ بْنُ مَسْعُودِ بْنِ زَيْدٍ إِلَى خَيْبَرَ وَهِيَ يَوْمَئِذٍ صُلْحٌ، فَتَفَرَّقَا فِي حَوَائِجِهِمَا، فَأَتَى مُحَيِّصَةُ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَهْلٍ وَهُوَ يَتَشَحَّطُ فِي دَمِهِ قَتِيلاً، فَدَفَنَهُ، ثُمَّ قَدِمَ الْمَدِينَةَ، فَانْطَلَقَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ وَحُوَيِّصَةُ وَمُحَيِّصَةُ ابْنَا مَسْعُودٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَهَبَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ يَتَكَلَّمُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَبِّرْ الْكُبْرَ وَهُوَ أَحْدَثُ الْقَوْمِ، فَسَكَتَ، فَتَكَلَّمَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَتَحْلِفُونَ بِخَمْسِينَ يَمِيناً مِنْكُمْ، وَتَسْتَحِقُّونَ قَاتِلَكُمْ أَوْ صَاحِبَكُمْ؟ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ نَحْلِفُ، وَلَمْ نَشْهَدْ، وَلَمْ نَرَ؟ فَقَالَ: أَتُبَرِّئُكُمْ يَهُودُ بِخَمْسِينَ؟ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ نَأْخُذُ أَيْمَانَ قَوْمٍ كُفَّارٍ؟ فَعَقَلَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ عِنْدِهِ»[1].

واتە: بوشەیری کوڕی یەسار دەگێڕێتەوە، سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە ﷺ دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی سەهل و موحەییصەی کوڕی مەسعودی کوڕی زەید هاتن بۆ خەیبەر لەو کاتەدا ئاشتەوایی لە نێوان ئەوان و مسوڵمانادا هەبوو، هەر یەکەو بۆ پێویستی خۆیان لە یەکتر جیابوونەوە، دواتر موحەییصە کە گەڕایەوە تەماشای کرد

---

(١) صحيح.

عەبدوڵڵای کوڕی سەهل کوژراوەو خوێناوی کراوە، پاشان شاردیەوەو هات بۆ مەدینە، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەهل و حویەیصەو موحەیصە هەردوو کوڕەکەی مەسعود، هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، عەبدوڕڕەحمان کە منداڵترینیان بوو دەستی کرد بە قسەکردن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با گەورەکەتان قسە بکات، بێ دەنگ بوو، پاشان ئەو دووانەکەی تر قسەیان کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا پەنجا سوێند دەخۆن؟ هەتا شیاوی خوێنی کوژراوەکەتان یان هاوەڵەکەتان ببن؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە چۆن سوێند بخۆین نە ئامادەبووینەو نە بینیومانە؟ فەرمووی: دەی کەواتە جولەکەکان پەنجا سوێند دەخۆن و بەری دەبن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە چۆن بڕوا بە سوێندی خەڵکانێکی بێبڕوا بکەین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ لە لایەن خۆیەوە خوێن بابیەکەیدا.

**٤٧١٦-** «عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ الْأَنْصَارِيَّ، وَمُحَيِّصَةَ بْنَ مَسْعُودٍ، خَرَجَا إِلَى خَيْبَرَ، فَتَفَرَّقَا فِي حَاجَتِهِمَا، فَقُتِلَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَهْلٍ الْأَنْصَارِيُّ، فَجَاءَ مُحَيِّصَةُ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ أَخُو الْمَقْتُولِ وَحُوَيِّصَةُ بْنُ مَسْعُودٍ حَتَّى أَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَذَهَبَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ يَتَكَلَّمُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: الْكُبْرَ الْكُبْرَ فَتَكَلَّمَ مُحَيِّصَةُ وَحُوَيِّصَةُ، فَذَكَرُوا شَأْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَهْلٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَحْلِفُونَ خَمْسِينَ يَمِيناً، فَتَسْتَحِقُّونَ قَاتِلَكُمْ؟ قَالُوا: كَيْفَ نَحْلِفُ، وَلَمْ نَشْهَدْ، وَلَمْ نَحْضُرْ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فَتُبَرِّئُكُمْ يَهُودُ بِخَمْسِينَ يَمِيناً، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ نَقْبَلُ أَيْمَانَ قَوْمٍ كُفَّارٍ؟ قَالَ: فَوَدَاهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: بُشَيْرٌ قَالَ لِي سَهْلُ بْنُ أَبِي حَثْمَةَ: لَقَدْ رَكَضَتْنِي فَرِيضَةٌ مِنْ تِلْكَ الْفَرَائِضِ فِي مِرْبَدٍ لَنَا»[1].

واتە: بوشەیری کوڕی یەسار دەگێڕێتەوە، لە سەهلی کوڕی ئەبو حەثمەوە ﷺ: عەبدوڵڵای کوڕی سەهلی ئەنصاری و موحەیصەی کوڕی مەسعود چوون بۆ خەیبەر، هەریەکەو بۆ پێویستی خۆیان لە یەکتر جیابوونەوە، عەبدوڵڵای کوڕی سەهلی ئەنصاری کوژرا، موحەیصەو عەبدوڕڕەحمانی برای کوژراوەکەو حویەیصەی کوڕی مەسعود هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، عەبدوڕڕەحمان کە منداڵترینیان بوو دەستی کرد بە قسەکردن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با گەورەکەتان قسە بکات، بێ دەنگ بوو، موحەیصەو حویەیصە باسی کوشتنی عەبدوڵڵای کوڕی سەهلیان کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا پەنجا کەس لە ئێوە سوێند دەخوات هەتا

---

(١) صحيح.

شیاوی خوێنی کوژراوەکەتان ببن؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە چۆن سوێند بخۆین نە ئامادە بووینەو نە بینیومانە؟ فەرمووی: دەی کەواتە جولەکەکان پەنجا سوێند دەخۆن و بەری دەبن وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە چۆن بڕوا بە سوێندی خەڵکانێکی بێبڕوا بکەین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ لە لایەن خۆیەوە خوێن باییەکەیدا، بوشەیر وتی: سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە وتی: یەکێک لەو وشترانە لە شوێنی بەستنەوەکەیدا لەقەیەکی لێدام.

**٤٧١٧-** «عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ قَالَ: وُجِدَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَهْلٍ قَتِيلاً، فَجَاءَ أَخُوهُ وَعَمَّاهُ حُوَيِّصَةُ وَمُحَيِّصَةُ وَهُمَا عَمَّا عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَهْلٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَهَبَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ يَتَكَلَّمُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْكُبْرَ الْكُبْرَ، قَالَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا وَجَدْنَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ قَتِيلاً فِي قَلِيبٍ مِنْ بَعْضِ قُلُبِ خَيْبَرَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ تَتَّهِمُونَ؟ قَالُوا: نَتَّهِمُ الْيَهُودَ. قَالَ: أَفَتُقْسِمُونَ خَمْسِينَ يَمِيناً أَنَّ الْيَهُودَ قَتَلَتْهُ؟ قَالُوا: وَكَيْفَ نُقْسِمُ عَلَى مَا لَمْ نَرَ؟ قَالَ: فَتُبَرِّئُكُمُ الْيَهُودُ بِخَمْسِينَ أَنَّهُمْ لَمْ يَقْتُلُوهُ، قَالُوا: وَكَيْفَ نَرْضَى بِأَيْمَانِهِمْ وَهُمْ مُشْرِكُونَ؟ فَوَدَاهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ عِنْدِهِ»[1].

واتە: بوشەیری کوڕی یەسار دەگێڕێتەوە، سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە ﷺ دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی سەهل بە کوژراوی دۆزرایەوە، براکەی و هەردوو مامی حویەییصەو موحەییصە هەردووکیان مامی عەبدوڵڵای کوڕی سەهل بوون هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، عەبدوڕڕەحمان دەستی کرد بە قسەکردن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با گەورەکەتان قسە بکات، موحەییصەو حویەییصە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە عەبدوڵڵای کوڕی سەهلمان بە کوژراوی لەناو بیرێک لە بیرەکانی خەیبەردا دۆزیوەتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: گومانتان لە کێ هەیە؟ وتیان: گومانمان لە جولەکە هەیە، فەرمووی: ئایا پەنجا کەس لە ئێوە سوێند دەخوات کە جولەکە کوشتوویەتی؟ وتیان: ئەی چۆن سوێند بخۆین کە شتێکمان نەبینیوە؟ فەرمووی: دەی کەواتە پەنجا کەس لە جولەکەکان سوێند دەخۆن کە ئەوان نەیانکوشتوەو بەری دەبن وتیان: ئەی چۆن ڕازی بین بە سوێندی ئەوان کە ئەوان هاوبەشدانەرن؟ پێغەمبەری خوا ﷺ لە لایەن خۆیەوە خوێن باییەکەیدا.

---

(١) صحیح.




**٤٧١٨-** «عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَار، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ الْأَنْصَارِيَّ وَمُحَيِّصَةَ بْنَ مَسْعُودٍ خَرَجَا إِلَى خَيْبَرَ، فَتَفَرَّقَا فِي حَوَائِجِهِمَا، فَقُتِلَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَهْلٍ، فَقَدِمَ مُحَيِّصَةُ، فَأَتَى هُوَ وَأَخُوهُ حُوَيِّصَةُ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَهَبَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ لِيَتَكَلَّمَ لِمَكَانِهِ مِنْ أَخِيهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَبِّرْ كَبِّرْ فَتَكَلَّمَ حُوَيِّصَةُ وَمُحَيِّصَةُ، فَذَكَرُوا شَأْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَهْلٍ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَتَحْلِفُونَ خَمْسِينَ يَمِيناً، وَتَسْتَحِقُّونَ دَمَ صَاحِبِكُمْ أَوْ قَاتِلِكُمْ؟»[١].

**واتە: بوشەیری کوڕی یەسار دەگێڕێتەوە، عەبدوڵڵای کوڕی سەهلی ئەنصاری و موحەیصەی کوڕی مەسعود چوون بۆ خەیبەر، هەریەکەو بۆ پێویستی خۆیان لە یەکتر جیابوونەوە، عەبدوڵڵای کوڕی سەهلی ئەنصاری کوژرا، موحەیصە خۆی براکەی حویەیصە و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەهل هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، عەبدوڕڕەحمان ڕۆیشت لەبارەی براکەیەوە قسە بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با گەورەکەتان قسە بکات موحەیصەو حویەیصە باسی کوشتنی عەبدوڵڵای کوڕی سەهلیان کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی فەرموو: ئایا پەنجا کەس لە ئێوە سوێند دەخوات تا شیاوی خوێنی هاوەڵەکەتان یان کوژراوەکەتان بین؟**

**٤٧١٩-** «عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ، زَعَمَ أَنَّ رَجُلاً مِنَ الْأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ: سَهْلُ بْنُ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّ نَفَراً مِنْ قَوْمِهِ انْطَلَقُوا إِلَى خَيْبَرَ، فَتَفَرَّقُوا فِيهَا فَوَجَدُوا أَحَدَهُمْ قَتِيلاً، فَقَالُوا لِلَّذِينَ وَجَدُوهُ عِنْدَهُمْ: قَتَلْتُمْ صَاحِبَنَا. قَالُوا: مَا قَتَلْنَاهُ، وَلَا عَلِمْنَا قَاتِلاً. فَانْطَلَقُوا إِلَى نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ فَقَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، انْطَلَقْنَا إِلَى خَيْبَرَ فَوَجَدْنَا أَحَدَنَا قَتِيلاً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْكُبْرَ الْكُبْرَ، فَقَالَ لَهُمْ: تَأْتُونَ بِالْبَيِّنَةِ عَلَى مَنْ قَتَلَ؟. قَالُوا: مَا لَنَا بَيِّنَةٌ. قَالَ: فَيَحْلِفُونَ لَكُمْ. قَالُوا: لَا نَرْضَى بِأَيْمَانِ الْيَهُودِ، وَكَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَبْطُلَ دَمُهُ فَوَدَاهُ مِائَةً مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ »[٢].

**واتە: بوشەیری کوڕی یەسار دەگێڕێتەوە، پیاوێک لە ئەنصار پێی دەوترا: سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە ﷺ هەواڵی پێدا، چەند کەسێک لە قەومەکەی چوون بۆ خەیبەر، هەر یەکەیان لەوێ لەیەکتر جیابوونەوە، یەکێکیان بە کوژراوی دۆزیبویەوە، بەوانەیان وت کە کوژراوەکەیان لایان دوزیبوویەوە: ئێوە هاوەڵەکەی ئێمەتان کوشت، وتیان: ئێمە نەمانکوشتووە، وە نازانین کێ کوشتویەتی، ڕۆیشتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، چووین بۆ خەیبەر یەکێکمان**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.

بە کوژراوی دۆزیەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با گەورەکەتان قسە بکات، پێیانی فەرموو: دەبێ بەڵگە بهێنن لە سەر ئەوەی کێ کوشتوویەتی؟ وتیان: بەڵگەمان بەدەستەوە نیە، فەرمووی: دەی ئەوان سوێندتان بۆ دەخۆن وتیان: ڕازی نابین بە سوێندی جولەکە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ناخۆش بوو خوێنەکەی بە فیڕۆ بچێ بۆیە سەد وشتریدا لە بری خوێنەکەی.

**٤٧٢٠-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ ابْنَ مُحَيِّصَةَ الْأَصْغَرَ أَصْبَحَ قَتِيلاً عَلَى أَبْوَابِ خَيْبَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَقِمْ شَاهِدَيْنِ عَلَى مَنْ قَتَلَهُ، أَدْفَعْهُ إِلَيْكُمْ بِرُمَّتِهِ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمِنْ أَيْنَ أُصِيبُ شَاهِدَيْنِ، وَإِنَّمَا أَصْبَحَ قَتِيلاً عَلَى أَبْوَابِهِمْ؟ قَالَ: فَتَحْلِفُ خَمْسِينَ قَسَامَةً، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَكَيْفَ أَحْلِفُ عَلَى مَا لَا أَعْلَمُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَنَسْتَحْلِفُ مِنْهُمْ خَمْسِينَ قَسَامَةً، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ نَسْتَحْلِفُهُمْ وَهُمُ الْيَهُودُ؟ فَقَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دِيَتَهُ عَلَيْهِمْ وَأَعَانَهُمْ بِنِصْفِهَا»[1].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە لە باپیرەیەوە ﷺ، کوڕی موحەییصەی بچوک لە دەروازەکانی خەیبەر بە کوژراوی دۆزرایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دوو شاهید بهێنە لە سەر ئەو کەسەی کوشتوویەتی، کەسەکە بە بەندکراوی دەخەمە بەردەستان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو شاهید لە کوێ بهێنم، بێگومان ئەو لە دەروازەی ئەوان کوژراوە؟ فەرمووی: با پەنجا کەستان سوێند بخوات، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن سوێند بخۆم لە سەر شتێک زانیاریم لەسەر نیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەی پەنجا کەس لە ئەوان سوێند دەخۆن) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن سوێندیان بدەین خۆ ئەوان جولەکەن؟ پێغەمبەری خوا ﷺ نیوەی خوێن باییەکەی دابەش کرد بە سەریانداو یارمەتیانیدا لەسەر نیوەکەی دیکە.

## بابەت: تۆڵە سەندنەوە

**٤٧٢١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ، النَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالتَّارِكُ دِينَهُ الْمُفَارِقُ»[2].

---

(١) شاذ. أخرجه إبن ماجه: ٢٦٧٨.

(٢) صحيح.




**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە خوێنی هیچ کەسێکی مسوڵمان برژێ بە یەکێک لەم سێیانە نەبێت: کەسێکی بە ناهەق کوشتبێ، ژنێک یان پیاوێک زینا بکات، کەسێک واز لە ئاینی خۆی بهێنێ و جیابێتەوە لە کۆمەڵی مسوڵمانان (دژایەتیان بکات).**

**٤٧٢٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قُتِلَ رَجُلٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَرُفِعَ الْقَاتِلُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَدَفَعَهُ إِلَى وَلِيِّ الْمَقْتُولِ. فَقَالَ الْقَاتِلُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَا وَاللَّهِ مَا أَرَدْتُ قَتْلَهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِوَلِيِّ الْمَقْتُولِ: أَمَا إِنَّهُ إِنْ كَانَ صَادِقاً، ثُمَّ قَتَلْتَهُ، دَخَلْتَ النَّارَ فَخَلَّى سَبِيلَهُ، قَالَ: وَكَانَ مَكْتُوفاً بِنِسْعَةٍ، فَخَرَجَ يَجُرُّ نِسْعَتَهُ، فَسُمِّيَ ذَا النِّسْعَةِ»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە سەردەمی پێغەمبەردا کوژرا بکوژەکەی هێنرا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش ڕادەستی خاوەن کوژراوەکەی کرد، بکوژەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، سوێند بەخوا مەبەستم کوشتنی نەبوو، پێغەمبەر بە خاوەن کوژراوەکەی فەرموو: ئەگەر ئەو کەسە ڕاست بکات و تۆش بیکوژی دەچیتە ئاگرەوە، ئەویش بەرەڵای کرد، وتی: لە کاتێکدا بە پەتێک بەسترا بویەوە لە چەرم دروست کرابوو (کە وشتری پێ لغاو دەکرا)، جا کە دەرچوو پەتەکەی بە دوای خۆی ڕادەکێشا، بۆیە ناونرا بە خاوەن پەتەکە.**

**٤٧٢٣-** «عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلٍ الْحَضْرَمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: جِيءَ بِالْقَاتِلِ الَّذِي قَتَلَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، جَاءَ بِهِ وَلِيُّ الْمَقْتُولِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَتَعْفُو؟ قَالَ: لَا، قَالَ: أَتَقْتُلُ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: اذْهَبْ، فَلَمَّا ذَهَبَ دَعَاهُ، قَالَ: أَتَعْفُو؟ قَالَ: لَا. قَالَ: أَتَأْخُذُ الدِّيَةَ؟ قَالَ: لَا. قَالَ: أَتَقْتُلُ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: اذْهَبْ، فَلَمَّا ذَهَبَ قَالَ: أَمَا إِنَّكَ إِنْ عَفَوْتَ عَنْهُ، فَإِنَّهُ يَبُوءُ بِإِثْمِكَ وَإِثْمِ صَاحِبِكَ فَعَفَا عَنْهُ، فَأَرْسَلَهُ قَالَ: فَرَأَيْتُهُ يَجُرُّ نِسْعَتَهُ»[2].

**واتە: عەلقەمەی کوڕی وائلی خەضرەمی دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: بکوژێک کە کەسێکی کوشتبوو، خاوەن کوژراوەکە هێنای بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئایا لێی خۆش دەبی؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ئایا دەیکوژی. وتی: بەڵێ، فەرمووی: بڕۆ، کاتێ ڕۆیشت بانگی کردەوە، فەرمووی: ئایا**

---

(١) صحيح الإسناد. أخرجه أبو داود: ٤٤٩٨، والترمذي: ١٤٠٧، وإبن ماجه: ٢٦٩٠.

(٢) صحيح الإسناد.




لێی خۆش دەبی؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ئایا خوێن بایی وەردەگری؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ئایا دەیکوژی؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: برۆ، کاتێ ڕۆیشت، فەرمووی: تۆ ئەگەر لێی خۆش بی ئەوە تاوانی تۆو تاوانی هاوەڵەکەیشت هەڵدەگرێ، ئەویش لێی خۆش بوو، بەرەڵای کرد وتی: بینیم ئەو پەتەی ئەوی پێ بەسترابوویەوە ڕادەکێشا (واتە: پیاوەکەی لێ کردبوویەوەو ئازادی کردبوو).

## باسی جیاوازی ئەوانەی فەرموودەکەی عەلقەمەی کوڕی وائیلیان هێناوە لە فەرموودەکەدا

**٤٧٢٤-** «عَنْ حَمْزَةَ أَبِي عُمَرَ الْعَائِذِيِّ قال: حدثنا عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلٍ، عَنْ وَائِلٍ قَالَ: شَهِدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حِينَ جِيءَ بِالْقَاتِلِ يَقُودُهُ وَلِيُّ الْمَقْتُولِ فِي نِسْعَةٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِوَلِيِّ الْمَقْتُولِ: أَتَعْفُو؟ قَالَ: لَا، قَالَ: أَتَأْخُذُ الدِّيَةَ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَتَقْتُلُهُ؟ قَالَ: نَعَمْ قَالَ: اذْهَبْ بِهِ. فَلَمَّا ذَهَبَ بِهِ فَوَلَّى مِنْ عِنْدِهِ دَعَاهُ، فَقَالَ لَهُ: أَتَعْفُو؟ قَالَ: لَا، قَالَ: أَتَأْخُذُ الدِّيَةَ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَتَقْتُلُهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: اذْهَبْ بِهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ ذَلِكَ: أَمَا إِنَّكَ إِنْ عَفَوْتَ عَنْهُ يَبُوءُ بِإِثْمِهِ وَإِثْمِ صَاحِبِكَ فَعَفَا عَنْهُ وَتَرَكَهُ، فَأَنَا رَأَيْتُهُ يَجُرُّ نِسْعَتَهُ»[1].

واتە: حەمزە ئەبو عومەری عائیزی دەڵێ: عەلقەمەی کوڕی وائیل بۆی باس کردین لە وائیلەوە دەڵێ: ئامادە بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بکوژێکیان هێناو خاوەن کوژراوەکە ڕای دەکێشا پەتێکی لە چەرم دروستکراوی لە مل کردبوو (کە وشتری پێ لغاو دەکرا)، پێغەمبەری خوا ﷺ بە خاوەنی کوژراوەکەی فەرموو: ئایا لێی خۆش دەبی؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ئایا خوێن بایی وەردەگری؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: دەیکوژیتەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ببە لەگەڵ خۆت، کاتێ کە بردی، لێی دوورکەوتەوە بانگی کرد، پێی فەرموو: ئایا لێی خۆش دەبی؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ئایا خوێن بایی وەردەگری؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: دەیکوژیتەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ببە لەگەڵ خۆت، پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەدا فەرمووی: تۆ ئەگەر لێی خۆش بی ئەوە تاوانی خۆی و هاوەڵەکەیشت دەکەوێتە ئەستۆی، ئەویش لێی خۆش بوو وازی لێ هێنا، من بە چاوی خۆم بینیم ئەو پەتەی کابرای پێ

---

(١) صحيح الإسناد. أخرجه مسلم: ٣٢ و ١٦٨٠/٣٣، وأبو داود: ٤٤٩٩ و ٤٥٠٠ و ٤٥٠١.




**بەستبوويەوە، بە تەنها لە دواى خۆى ڕادەكێشا (واتە: لە پياوەكەى كردبوويەوەو ئازادى كردبوو).**

**٤٧٢٥-** «عَنْ جَامِعِ بْنِ مَطَرٍ الْحَبَطِيِّ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِمِثْلِهِ»[١].

**واتە: جامعى كوڕى مەطەرى حوبەطى، لە عەلقەمەى كوڕى وائيلەوە دەگێڕێتەوە، لە باوكيەوە ﷺ، لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەر وەكو فەرموودەكەى پێشوو.**

**٤٧٢٦-** «عَنْ جَامِعِ بْنِ مَطَرٍ الْحَبَطِيِّ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كُنْتُ قَاعِداً عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ جَاءَ رَجُلٌ فِي عُنُقِهِ نِسْعَةٌ. فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ هَذَا وَأَخِي كَانَا فِي جُبٍّ يَحْفِرَانِهَا، فَرَفَعَ الْمِنْقَارَ فَضَرَبَ بِهِ رَأْسَ صَاحِبِهِ فَقَتَلَهُ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: اعْفُ عَنْهُ فَأَبَى وَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، إِنَّ هَذَا وَأَخِي كَانَا فِي جُبٍّ يَحْفِرَانِهَا، فَرَفَعَ الْمِنْقَارَ فَضَرَبَ بِهِ رَأْسَ صَاحِبِهِ فَقَتَلَهُ، فَقَالَ: اعْفُ عَنْهُ فَأَبَى ثُمَّ قَامَ. فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ هَذَا وَأَخِي كَانَا فِي جُبٍّ يَحْفِرَانِهَا، فَرَفَعَ الْمِنْقَارَ أُرَاهُ قَالَ: فَضَرَبَ رَأْسَ صَاحِبِهِ فَقَتَلَهُ. فَقَالَ: اعْفُ عَنْهُ فَأَبَى، قَالَ: اذْهَبْ إِنْ قَتَلْتَهُ كُنْتَ مِثْلَهُ فَخَرَجَ بِهِ حَتَّى جَاوَزَ، فَنَادَيْنَاهُ، أَمَا تَسْمَعُ مَا يَقُولُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَرَجَعَ. فَقَالَ: إِنْ قَتَلْتُهُ كُنْتُ مِثْلَهُ، قَالَ: نَعَمْ أَعْفُ، فَخَرَجَ يَجُرُّ نِسْعَتَهُ حَتَّى خَفِيَ عَلَيْنَا»[٢].

**واتە: جامعى كوڕى مەطەرى حوبەطى، لە عەلقەمەى كوڕى وائيلەوە دەگێڕێتەوە، لە باوكيەوە دەڵێ: من لە خزمەت پێغەمبەرى خوا ﷺ دانيشتبووم، پياوێك هات پەتێكى لە مل كرابوو (كە وشترى پێ لغاو دەكرا)، وتى: ئەى پێغەمبەرى خوا ﷺ ئەم پياوە لەگەڵ براكەم لە نێو بيرێكدا بوون دەريان دەدا، قوڵنگەكەى بەرزكردەوە كێشاى بەسەرى هاوڕێيەكەيداو دەستبەجێ كوشتى، فەرمووى: لێى خۆشبە، ڕازى نەبوو، پاشان هەڵساو، وتى: ئەى پێغەمبەرى خوا ﷺ بەڕاستى ئەم پياوەو براكەم لە نێو بيرێكدا بوون دەريان دەدا، قوڵنگەكەى بەرزكردەوە كێشاى بەسەرى هاوڕێيەكەيداو دەستبەجێ كوشتى، فەرمووى: لێى خۆشبە، ڕازى نەبوو، فەرمووى: بيبە ئەگەر كوشتت تۆيش وەكو ئەو وايت، جا ڕۆيشت تا تيپەڕ بوو، بانگمان كرد، ئايا نەتبيست پێغەمبەر ﷺ چى فەرموو، ئەويش گەڕايەوە. وتى: ئەگەر بيكوژم وەكو ئەو وام، فەرمووى: بەڵێ، لێى خۆشبە، كابرا (لێى خۆش بوو) دەرچوو ئەو چەرمەى پێى بەستابوويەوە بە بەتاڵى ڕايدەكێشا، هەتا لە پێش چاومان ديار نەما.**

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح الإسناد.**





**٤٧٢٧-** «عَنْ سِمَاكٍ، ذَكَرَ أَنَّ عَلْقَمَةَ بْنَ وَائِلٍ، أَخْبَرَهُ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ: أَنَّهُ كَانَ قَاعِداً عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذْ جَاءَ رَجُلٌ يَقُودُ آخَرَ بِنِسْعَةٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَتَلَ هَذَا أَخِي. فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَقَتَلْتَهُ؟ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوْ لَمْ يَعْتَرِفْ، أَقَمْتُ عَلَيْهِ الْبَيِّنَةَ؟ قَالَ: نَعَمْ قَتَلْتُهُ. قَالَ: كَيْفَ قَتَلْتَهُ؟ قَالَ: كُنْتُ أَنَا وَهُوَ نَحْتَطِبُ مِنْ شَجَرَةٍ، فَسَبَّنِي، فَأَغْضَبَنِي، فَضَرَبْتُ بِالْفَأْسِ عَلَى قَرْنِهِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: هَلْ لَكَ مِنْ مَالٍ تُؤَدِّيهِ عَنْ نَفْسِكَ؟ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَالِي إِلَّا فَأْسِي وَكِسَائِي، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَتُرَى قَوْمَكَ يَشْتَرُونَكَ؟ قَالَ: أَنَا أَهْوَنُ عَلَى قَوْمِي مِنْ ذَاكَ، فَرَمَى بِالنِّسْعَةِ إِلَى الرَّجُلِ. فَقَالَ: دُونَكَ صَاحِبَكَ. فَلَمَّا وَلَّى قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنْ قَتَلَهُ فَهُوَ مِثْلُهُ، فَأَدْرَكُوا الرَّجُلَ فَقَالُوا: وَيْلَكَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنْ قَتَلَهُ فَهُوَ مِثْلُهُ فَرَجَعَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، حُدِّثْتُ أَنَّكَ قُلْتَ إِنْ قَتَلَهُ فَهُوَ مِثْلُهُ، وَهَلْ أَخَذْتُهُ إِلَّا بِأَمْرِكَ. فَقَالَ: مَا تُرِيدُ أَنْ يَبُوءَ بِإِثْمِكَ، وَإِثْمِ صَاحِبِكَ، قَالَ: بَلَى. قَالَ: فَإِنْ ذَاكَ. قَالَ: ذَلِكَ كَذَلِكَ»[1].

**واتە: سیماک دەگێڕێتەوە، عەلقەمەی کوڕی وائیل هەواڵی پێدا، لە باوکیەوە ﷺ، ئەو لە خزمەتی پێغەمبەردا دانیشتبوو، پیاوێک هات پیاوێکی تر ڕادەکێشا، پێستێکی لە مل کردبوو (کە وشتری پێ لغاو دەکرا)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەمە براکەمی کوشتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا کوشتووتە؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر دانیپێدا نەنێت، بەڵگە و حوججەی لەسەر پێویست دەکەم، وتی: بەڵێ: کوشتم، فەرمووی: چۆن کوشتت؟ وتی: من و ئەو پێکەوە دارمان دەبڕی لە دارێک، جنێوی پێدام، توڕەی کردم، منیش تەورێکەم دا لەسەری، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا ماڵ و سامانێکت هەیە لە جیاتی نەفسی خۆت بیدەیت؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من هیچم نیە جگە لە تەورەکەم و کراسەکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئایا پێت وایە قەومەکەت خوێنباییەکە بدەن و بتکڕنەوە؟ وتی: من لەوە کەمترم لای قەومەکەم، پاشان پارچە پێستەیەکی بۆ خاوەن کوژراوەکە فڕێدا کە ملی بکوژی پێبەسترابوویەوە، فەرمووی: ئەوە هاوەڵەکەتە بیبە، کاتێ پشتی هەڵکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر بیکوژێتەوە وەکو ئەو وایە، گەیشتن بە پیاوەکە و وتیان: وای بۆ تۆ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر بیکوژێتەوە وەکو ئەو وایە، پیاوەکە گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆم باس کرا تۆ فەرمووتە: ئەگەر بیکوژێتەوە وەکو ئەو وایە،**

---

(١) صحيح.

ئایا من بە فەرمانی خۆت نەمبرد. فەرمووی: تۆ ناتەوێ تاوانی خۆت و هاوەڵە کوژراوەکەت بکەوێتە ئەستۆی، وتی: بەڵێ دەمەوێ، وتی: ئەگەر بەوشێوە بێت ئەوە لێی خۆش بووم، فەرمووی: ئەوە بەو شێوەیە.

**٤٧٢٨**- «عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، أَنَّ عَلْقَمَةَ بْنَ وَائِلٍ حَدَّثَهُ، أَنَّ أَبَاهُ ﷺ حَدَّثَهُ قَالَ: إِنِّي لَقَاعِدٌ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذْ جَاءَ رَجُلٌ يَقُودُ آخَرَ نَحْوَهُ»[١].

**واتە: سیماکی کوڕی حەرب دەگێڕێتەوە، عەلقەمەی کوڕی وائیل هەواڵی پێدا، باوکی ﷺ بۆی باسکرد وتی: من دانیشتبووم لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێک هات پیاوێکی تری ڕادەکێشا، وەکو ئەو فەرموودەی پێشوو.**

**٤٧٢٩**- «عَنْ إِسماعِيلَ بْنِ سَالِمٍ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلٍ، أَنَّ أَبَاهُ ﷺ حَدَّثَهُمْ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أُتِيَ بِرَجُلٍ قَدْ قَتَلَ رَجُلاً، فَدَفَعَهُ إِلَى وَلِيِّ الْمَقْتُولِ يَقْتُلُهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِجُلَسَائِهِ: الْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ، قَالَ: فَاتَّبَعَهُ رَجُلٌ، فَأَخْبَرَهُ، فَلَمَّا أَخْبَرَهُ تَرَكَهُ. قَالَ: فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَجُرُّ نِسْعَتَهُ حِينَ تَرَكَهُ يَذْهَبُ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِحَبِيبٍ فَقَالَ: حَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ أَشْوَعَ قَالَ: وَذَكَرَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ الرَّجُلَ بِالْعَفْوِ»[٢].

**واتە: ئیسماعیلی کوڕی سالم دەگێڕێتەوە، لە عەلقەمەی کوڕی وائیلەوە باوکی ﷺ بۆی باسکردن، پیاوێکیان هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی کوشتبوو، ئەویش دای بە دەستی خاوەن کوژراوەکە بیکوژێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بەوانەی فەرموو کە لە مەجلیسەکدا بوون: بکوژو کوژراو بۆ ناو ئاگرە، دەڵێ پیاوێک شوێنی کەوت هەواڵی پێدا، کاتێ هەواڵی پێدا بکوژەکەی بەرەڵلا کرد، وتی: بینیم کاتێ کە وازی لە بکوژەکە هێنا بۆ ئەوەی ئازاد بێت، بکوژەکە ئەو پەتەی ڕادەکێشا، ئەوەم باس کرد بۆ حەبیب، وتی: سەعیدی کوڕی ئەشوەع بۆی باسکردم وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد لە کابرا خۆش بێت.**

**٤٧٣٠**- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً أَتَى بِقَاتِلِ وَلِيِّهِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: اعْفُ عَنْهُ فَأَبَى. فَقَالَ: خُذِ الدِّيَةَ فَأَبَى. قَالَ: اذْهَبْ فَاقْتُلْهُ، فَإِنَّكَ مِثْلُهُ فَذَهَبَ فَلُحِقَ الرَّجُلُ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: اقْتُلْهُ فَإِنَّكَ مِثْلُهُ فَخَلَّى سَبِيلَهُ، فَمَرَّ بِي الرَّجُلُ وَهُوَ يَجُرُّ نِسْعَتَهُ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح الإسناد. أخرجه إبن ماجه: ٢٦٩١.




واتە: ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک بکوژی خزمەکەی هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: لێی خۆشبە، لێی خۆش نەبوو، فەرمووی: خوێن بایی وەربگرە، ڕازی نەبوو، فەرمووی: بیبەو بیکوژە، تۆش وەکو ئەو وایت، پیاوەکە ڕۆیشت و پیاوێکی پێگەیشت پێی وترا: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیبەو بیکوژە، تۆش وەکو ئەو وایت، ئەویش وازی لێهێنا، جا پیاوەکە تێپەڕی بەلامدا پەتەکەی ڕادەکێشا (کە لە ملی بکوژەکەی کردبوو).

**٤٧٣١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ هَذَا الرَّجُلَ قَتَلَ أَخِي، قَالَ: اذْهَبْ فَاقْتُلْهُ كَمَا قَتَلَ أَخَاكَ. فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: اتَّقِ اللَّهَ، وَاعْفُ عَنِّي، فَإِنَّهُ أَعْظَمُ لِأَجْرِكَ، وَخَيْرٌ لَكَ وَلِأَخِيكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، قَالَ: فَخَلَّى عَنْهُ. قَالَ: فَأُخْبِرَ النَّبِيُّ ﷺ، فَسَأَلَهُ، فَأَخْبَرَهُ بِمَا قَالَ لَهُ، قَالَ: فَأَعْنَفَهُ أَمَا إِنَّهُ كَانَ خَيْراً مِمَّا هُوَ صَانِعٌ بِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، يَقُولُ: يَا رَبِّ، سَلْ هَذَا فِيمَ قَتَلَنِي»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەم پیاوە براکەمی کوشتووە، فەرمووی: بیکوژەرەوە وەکو چۆن براکەتی کوشتووە، پیاوەکە پێی وت: لەخوا بترسە و لێم خۆشبە، بێگومان گەورەترین پاداشتە بۆ تۆ و براکەت لە ڕۆژی دواییدا، وتی: وازی لێ هێنا. وتی: هەواڵدرا بە پێغەمبەر ﷺ، پرسیاری لە پیاوەکە کرد، ئەویش هەواڵی پێدا بەوەی پێی وت، وتی: پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی کرد، ئایا ئەوە لەوە چاکترە لە ڕۆژی قیامەتدا بڵێ: ئەی پەروەردگارم پرسیار لەمە بکە، بۆچی منی کوشت.

## باسی تەفسیری فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿ وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ﴿٤٢﴾ ﴾[٢]، وە باسی جیاوازی لەسەر عیکریمە لە فەرموودەکەدا

**٤٧٣٢-** «عَنْ سِمَاكٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ قُرَيْظَةُ وَالنَّضِيرُ وَكَانَ النَّضِيرُ أَشْرَفَ مِنْ قُرَيْظَةَ وَكَانَ إِذَا قَتَلَ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْظَةَ رَجُلاً مِنَ النَّضِيرِ قُتِلَ بِهِ، وَإِذَا قَتَلَ رَجُلٌ مِنَ النَّضِيرِ رَجُلاً مِنْ قُرَيْظَةَ أَدَّى مِائَةَ وَسْقٍ مِنْ تَمْرٍ، فَلَمَّا بُعِثَ النَّبِيُّ ﷺ قَتَلَ رَجُلٌ مِنَ

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) واتە: وە ئەگەر بڕیارتدا لە نێوانیاندا ئەوە بە دادوەری بڕیار بدە.




النَّضِيرِ رَجُلاً مِنْ قُرَيْظَةَ فَقَالُوا: ادْفَعُوهُ إِلَيْنَا نَقْتُلْهُ. فَقَالُوا: بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ النَّبِيُّ ﷺ، فَأَتَوْهُ فَنَزَلَتْ: ﴿وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ ﴿٤٢﴾﴾ المائدة، وَالْقِسْطُ: النَّفْسُ بِالنَّفْسِ، ثُمَّ نَزَلَتْ: ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ﴿٥٠﴾﴾ المائدة»[1].

**واتە: سیماک دەگێڕێتەوە، لە عیکریمە، لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: نەوەکانی قورەیظەو نەضیر دوو کۆمەڵ بوون، نەوەکانی نەضیر بەڕێزتر بوو لە نەوەکانی قورەیظە، جا ئەگەر پیاوێک لە نەوەکانی قورەیظە پیاوێکی لە نەوەکانی نەضیر بکوشتایە دەکوژرایەوە، وە ئەگەر پیاوێک لە نەوەکانی نەضیر پیاوێکی لە نەوەکانی قورەیظە بکوشتایە ئەوە سەدبار خورمای دەدا، کاتێ پێغەمبەر ﷺ نێردرا پیاوێک لە نەوەکانی نەضیر پیاوێکی لە نەوەکانی قورەیظە کوشت، وتیان: بیدەن بە دەستمانەوە دەیکوژین. وتیان: لە نێوانی ئێمەو ئێوەدا پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە، ڕۆیشتن بۆ لای ئینجا ئەم ئایەتە دابەزیە خوارەوە: ﴿وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ ﴿٤٢﴾﴾، واتە: مانای (الْقِسْطُ): کوشتنی نەفسێکە بە نەفسێک، پاشان ئەمەش دابەزیە خوارەوە: ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ﴿٥٠﴾﴾، (واتە: ئایا ئەوان داوای حوکمی نەفامی دەکەن).**

**٤٧٣٣-** «عَنْ دَاوُدَ بْنِ الْحُصَيْنِ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ الْآيَاتِ الَّتِي فِي الْمَائِدَةِ الَّتِي قَالَهَا اللَّهُ ﷻ: ﴿فَاحْكُم بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ ﴿٤٢﴾﴾ المائدة، إِلَى: ﴿الْمُقْسِطِينَ ﴿٤٢﴾﴾ المائدة، إِنَّمَا نَزَلَتْ فِي الدِّيَةِ بَيْنَ النَّضِيرِ وَبَيْنَ قُرَيْظَةَ وَذَلِكَ أَنَّ قَتْلَى النَّضِيرِ كَانَ لَهُمْ شَرَفٌ يُودَوْنَ الدِّيَةَ كَامِلَةً، وَأَنَّ بَنِي قُرَيْظَةَ كَانُوا يُودَوْنَ نِصْفَ الدِّيَةِ فَتَحَاكَمُوا فِي ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ ذَلِكَ فِيهِمْ، فَحَمَلَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْحَقِّ فِي ذَلِكَ فَجَعَلَ الدِّيَةَ سَوَاءً»[2].

**واتە: داودی کوڕی حوصەین دەگێڕێتەوە، لە عیکریمە، لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ): ئەو ئایەتانەی لە سوورەتی مائیدەدا هاتوون کە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿فَاحْكُم بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ ﴿٤٢﴾﴾ (واتە: ئەوە بڕیاربدە لە نێوانیاندا یان وازیان لێبهێنە، تا دەگاتە: ﴿الْمُقْسِطِينَ ﴿٤٢﴾﴾ (واتە: دادگەران). لە بارەی**

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٥٩١ و ٤٤٩٤.

(٢) حسن صحيح الإسناد.




خوێن بابیەوە دابەزی لە نێوان نەوەکانی نەضیرو قورەیظە دا، ئەویش لەبەر ئەوەی کوژراوەکانی نەضیر ڕێزو حورمەتێکی تایبەتیان هەبوو، خوێنبایی تەواویان وەردەگرت، وە نەوەکانی قورەیظە نیوەی خوێنباییان وەردەگرت، دادگەریان برد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، دواتر خوا ئەوەی لە بارەیانەوە دابەزاند، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر حەق جێگیری کردن خوێنبایی هەردوولای وەکو یەک لێکرد.

## بابەت: تۆڵەسەندنەوە لە نێوان ئازادو کۆیلەکان لە نەفسدا

**٤٧٣٤-** «عَنْ قَيْسِ بْنِ عُبَادٍ ﷺ قَالَ: انْطَلَقْتُ أَنَا وَالْأَشْتَرُ إِلَى عَلِيٍّ فَقُلْنَا: هَلْ عَهِدَ إِلَيْكَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ شَيْئاً لَمْ يَعْهَدْهُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً؟ قَالَ: لَا، إِلَّا مَا كَانَ فِي كِتَابِي هَذَا، فَأَخْرَجَ كِتَاباً مِنْ قِرَابِ سَيْفِهِ، فَإِذَا فِيهِ الْمُؤْمِنُونَ تَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ وَهُمْ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ، وَيَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ أَلَا لَا يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ، وَلَا ذُو عَهْدٍ بِعَهْدِهِ، مَنْ أَحْدَثَ حَدَثاً فَعَلَى نَفْسِهِ، أَوْ آوَى مُحْدِثاً، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ»[1].

واتە: قەیسی کوڕی عوبادە ﷺ دەڵێ: من و ئەشتەر ڕۆیشتین بۆ لای عەلی وتمان: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانێکی بە تۆ داوە بە خەڵکی نەیدابێ بە گشتی؟ وتی: نەخێر، ئەوە نەبێ کە لە ناو ئەم نوسراوەدایە، نوسراوێکی دەرهێنا لە کیفی شمشێرەکەی، ئەوەی تێدابوو بڕواداران خوێنباییان وەکو یەک وایە، هەموویان یەک دەستن لە بەرانبەر دوژمن، بچوکترینیان دەتوانێ داڵدەو پشتیوانی کەسێکی بێبڕوا بدات (کە دەبێتە پارێزراو لەلای گشت مسوڵمانان)، ئەوە نەبێ مسوڵمان بە بێبڕوا ناکوژرێتەوە، هیچ خاوەن پەیمانێک تا پەیمانی هەبێت ناکوژرێتەوە، هەر کەس شتێک دابهێنێ ئەوە لەسەر نەفسی خۆیەتی، یان پەنای کەسێکی تاوانبار بدات، ئەوە نەفرینی خواو فریشتەکان و خەڵکی لەسەرە بە گشتی.

**٤٧٣٥-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: الْمُؤْمِنُونَ تَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ وَهُمْ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ، يَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ، لَا يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ، وَلَا ذُو عَهْدٍ فِي عَهْدِهِ»[2].

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه البخاري: ١٨٧٠، ومسلم: ١٣٧٠، وأبو داود: ٤٥٣٠، والترمذي: ٢١٢٧، وإبن ماجه: ٢٦٥٨.
(٢) صحيح.





واتە: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بڕواداران خوێن باییان وەکو یەک وایە، (جیاوازی نیە لە نێوان کەسێکی بەناوبانگ لەگەڵ کەسێکی بێ نەوا لە جێبەجێکردنی حەدی شەرعی) هەموویان یەک دەستن لە بەرانبەر دوژمن، ئەگەر یەکێکیان ئەمانی دابە بێبڕوایەک خوێنی لەسەر هەموو مسوڵمانان قەدەغە دەبێت، بڕوادار بە بێبڕوا ناکوژرێتەوە، هیچ خاوەن پەیمانێک تا پەیمانی هەبێت ناکوژرێتەوە.

## تۆڵەسەندنەوە لە سەیدو گەورە بە کوشتنی کۆیلەکەی

**٤٧٣٦**- «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَتَلَ عَبْدَهُ قَتَلْنَاهُ، وَمَنْ جَدَعَهُ جَدَعْنَاهُ وَمَنْ أَخْصَاهُ أَخْصَيْنَاهُ»[١].

واتە: سەمورە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس بەندەکەی خۆی بکوژێت دەیکوژینەوە، هەرکەسیش ئەندامێکی ببڕێتەوە ئەندامەکەی دەبڕینەوە، هەرکەسیش بیخەسێنێ دەیخەسێنین.

**٤٧٣٧**- «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ قَتَلَ عَبْدَهُ قَتَلْنَاهُ، وَمَنْ جَدَعَ عَبْدَهُ جَدَعْنَاهُ»[٢].

واتە: سەمورە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس بەندەکەی خۆی بکوژێت دەیکوژینەوە، هەرکەسیش ئەندامێکی بەندەکەی ببڕێتەوە ئەندامەکەی دەبڕینەوە.

**٤٧٣٨**- «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ قَتَلَ عَبْدَهُ قَتَلْنَاهُ، وَمَنْ جَدَعَ عَبْدَهُ جَدَعْنَاهُ»[٣].

واتە: سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس بەندەکەی خۆی بکوژێت دەیکوژینەوە، هەرکەسیش ئەندامێکی بەندەکەی ببڕێتەوە ئەندامەکەی دەبڕینەوە.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٥١٥ و ٤٥١٦ و ٤٥١٧، والترمذي: ١٤١٤، وإبن ماجه: ٢٦٦٣.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف.




## کوشتنەوەی ئافرەت بە ئافرەت

**٤٧٣٩-** «عَنْ عُمَرَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: نَشَدَ قَضَاءَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي ذَلِكَ، فَقَامَ حَمَلُ بْنُ مَالِكٍ فَقَالَ: كُنْتُ بَيْنَ حُجْرَتَيِ امْرَأَتَيْنِ، فَضَرَبَتْ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى بِمِسْطَحٍ، فَقَتَلَتْهَا وَجَنِينَهَا، فَقَضَى النَّبِيُّ ﷺ فِي جَنِينِهَا بِغُرَّةٍ وَأَنْ تُقْتَلَ بِهَا»[١].

**واتە: عومەر ﷺ دەڵێ: فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بارەیەوە درا، حەملی کوڕی مالیک هەڵسا وتی: من لە تەنیشتی دوو ئافرەتدا بووم، یەکێکیان بە ئاسنێکی ژێر دەوار دای لە ئەوی دیکەو کوشتی و منداڵەکەشی کە لەسکیدا بوو مرد، پێغەمبەر ﷺ لەبارەی خوێنبایی کۆرپەلەکەی فەرمانی کرد بە کۆیلەکی چاک، ئافرەتەکەش بکوژرێتەوە لە جیاتی ئافرەتە کوژراوەکە.**

## کۆشتنەوەی پیاو بە ژن

**٤٧٤٠-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ يَهُودِيًا قَتَلَ جَارِيَةً عَلَى أَوْضَاحٍ لَهَا، فَأَقَادَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِهَا»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: جولەکەیەک کەنیزەکێکی کوشت لەسەر ملوانکەیەکی زیو کە هی کەنیزەکەکە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لە تۆڵەیدا کوشتیەوە.**

**٤٧٤١-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّ يَهُودِيًا أَخَذَ أَوْضَاحاً مِنْ جَارِيَةٍ، ثُمَّ رَضَخَ رَأْسَهَا بَيْنَ حَجَرَيْنِ، فَأَدْرَكُوهَا وَبِهَا رَمَقٌ، فَجَعَلُوا يَتَّبِعُونَ بِهَا النَّاسَ، هُوَ هَذَا، هُوَ هَذَا، قَالَتْ: نَعَمْ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَرُضِخَ رَأْسُهُ بَيْنَ حَجَرَيْنِ»[٣].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: جولەکەیەک چەند خشڵ و ملوانکەیەکی زیوی کەنیزەکێکی برد، پاشان سەری خستە نێوان دوو بەردو پانی کردەوە، کاتێک گەیشتنە لای گیانی دەدا، ئەوانیش دەگەڕان بە دوای بکوژەکەدا**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٥٧٢، وإبن ماجه: ٢٦٤١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤١٣ و ٢٧٤٦ و ٦٨٧٦ و ٦٨٧٧ و ٦٨٧٩ و ٦٨٨٤ و ٦٨٨٥، ومسلم: ١٥ و ١٦٧٢/١٧، وأبو داود: ٤٥٢٧ و ٤٥٢٩ و ٤٥٣٥، والترمذي: ١٣٩٤، وإبن ماجه: ٢٦٦٥ و ٢٦٦٦.

(٣) صحيح.





ناوی چەند کەسێکیان بۆی هێنا فڵانە کەس و فڵانە کەسە؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد سەری لە نێوان دوو بەردا پان کرایەوە.

**٤٧٤٢-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: خَرَجَتْ جَارِيَةٌ عَلَيْهَا أَوْضَاحٌ، فَأَخَذَهَا يَهُودِيٌّ فَرَضَخَ رَأْسَهَا، وَأَخَذَ مَا عَلَيْهَا مِنَ الْحُلِيِّ، فَأُدْرِكَتْ وَبِهَا رَمَقٌ، فَأُتِيَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: مَنْ قَتَلَكِ فُلَانٌ؟ قَالَتْ بِرَأْسِهَا: لَا. قَالَ: فُلَانٌ؟ قَالَ: حَتَّى سَمَّى الْيَهُودِيَّ، قَالَتْ بِرَأْسِهَا: نَعَمْ. فَأُخِذَ فَاعْتَرَفَ فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَرُضِخَ رَأْسُهُ بَيْنَ حَجَرَيْنِ»(١).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: کەنیزەکێک دەرچوو ملوانکەی لە ملدا بوو، جولەکەیەک گرتی و سەری پانکردەوە، ئەوەشی لە لای بوو لە خشڵ هەمووی برد، کاتێ گەیشتنە لای گیانی دەدا، هێنایان بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێ کوشتتی فڵانە کەس بوو؟ بەسەری ئاماژەی کرد نەخێر، فەرمووی: فڵان بوو؟ تا ناوی جولەکەکەی هێنا، بە سەری وتی: بەڵێ، پاشان گیراو دانی نا بە تاوانەکەیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد سەری لە نێوان دوو بەردا پانکرایەوە.

## هەڵگرتنی تۆڵە سەندنەوە لە مسوڵمانێک کە کەسێکی بێبڕوای کوشتبێ

**٤٧٤٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: لَا يَحِلُّ قَتْلُ مُسْلِمٍ إِلَّا فِي إِحْدَى ثَلَاثِ خِصَالٍ: زَانٍ مُحْصَنٌ فَيُرْجَمُ، وَرَجُلٌ يَقْتُلُ مُسْلِماً مُتَعَمِّداً، وَرَجُلٌ يَخْرُجُ مِنَ الْإِسْلَامِ فَيُحَارِبُ اللَّهَ ﷻ وَرَسُولَهُ، فَيُقْتَلُ أَوْ يُصَلَّبُ، أَوْ يُنْفَى مِنَ الْأَرْضِ»(٢).

واتە: عائیشە دایکی ئیمانداران (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە کوشتنی هیچ مسوڵمانێک مەگەر بە یەکێک لەم سێ خەصڵەتە نەبێ: زیناکەرێکی ژن یان پیاو بەرد باران دەکرێ، یان پیاوێک بە ئەنقەست پیاوێکی تر بکوژێ ئەوە دەکوژرێتەوە، یان پیاوێک لە ئیسلام دەربچێ و دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکات، جا یان دەکوژرێ، یان هەڵدەواسرێ، یان لەو خاکە دووردەخرێتەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٤٧٤٤-** «عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ ﷺ يَقُولُ: سَأَلْنَا عَلِيّاً فَقُلْنَا: هَلْ عِنْدَكُمْ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَيْءٌ سِوَى الْقُرْآنِ؟ فَقَالَ: لَا، وَالَّذِي فَلَقَ الْحَبَّةَ وَبَرَأَ النَّسَمَةَ، إِلَّا أَنْ يُعْطِيَ اللَّهُ ﷻ عَبْداً فَهْماً فِي كِتَابِهِ أَوْ مَا فِي هَذِهِ الصَّحِيفَةِ، قُلْتُ: وَمَا فِي الصَّحِيفَةِ؟ قَالَ: فِيهَا الْعَقْلُ، وَفِكَاكُ الْأَسِيرِ، وَأَنْ لَا يُقْتَلَ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ»[١].

**واتە: ئەبو جوحەیفە ﷺ دەڵێ: پرسیارمان کرد لە عەلی: ئایا شتێکتان لا هەیە هی پێغەمبەری خوا ﷺ جگە لە قورئان؟ وتی: سوێند بەو خوایەی دانەوێڵەی لەتکردووەو گیانلەبەری دروست کردوە، مەگەر ئەوە نەبێ خوا تێگەیشتنی کتێبەکەی خۆی بەخشی بێت بە بەندەکەی، یان ئەوەی لەناو ئەم پەڕاوە دایە، وتم: ئەو پەڕاوە چی تێدایە؟ وتی: حوکمی خوێنبایی و ئازادکردنی دیل، مسوڵمانیش بە کافر نەکوژرێتەوە.**

**٤٧٤٥-** «عَنْ أَبِي حَسَّانَ قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ ﷺ: مَا عَهِدَ إِلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِشَيْءٍ دُونَ النَّاسِ، إِلَّا فِي صَحِيفَةٍ فِي قِرَابِ سَيْفِي، فَلَمْ يَزَالُوا بِهِ حَتَّى أَخْرَجَ الصَّحِيفَةَ، فَإِذَا فِيهَا: الْمُؤْمِنُونَ تَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ يَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ، وَهُمْ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ، لَا يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ، وَلَا ذُو عَهْدٍ فِي عَهْدِهِ»[٢].

**واتە: ئەبو ئیحسان ﷺ دەڵێ: عەلی وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە هیچ شتێ پەیمانی پێنەداوین جیا لە خەڵکی جگە لە پەڕوایێک نەبێ لەناو کیفی شمشێرەکەم دایە، خەڵکەکە دەستبەرداری نەبوون هەتا پەڕاوەکەی دەرهێنا، کە دەرهێنا تیایدا بوو: بڕواداران خوێن باییان وەکو یەک وایە، (جیاوازی نیە لە نێوان کەسێکی بەناوبانگ لەگەڵ کەسێکی بێ نەوا لە جێبەجێکردنی حەدی شەرعی)، ئەگەر یەکێکیان ئەمانی دابە بێبڕوایەک خوێنی لەسەر هەموو مسوڵمانان قەدەغە دەبێت، هەموویان یەک دەستن لە بەرانبەر دوژمن، مسوڵمان بە بێبڕوا ناکوژرێتەوە، هیچ خاوەن پەیمانێک هەتا پەیمانی هەبێت ناکوژرێتەوە.**

**٤٧٤٦-** «عَنِ الْأَشْتَرِ، أَنَّهُ قَالَ لِعَلِيٍّ ﷺ: إِنَّ النَّاسَ قَدْ تَفَشَّغَ بِهِمْ مَا يَسْمَعُونَ، فَإِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَهِدَ إِلَيْكَ عَهْدَاً، فَحَدِّثْنَا بِهِ، قَالَ: مَا عَهِدَ إِلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَهْداً لَمْ يَعْهَدْهُ إِلَى النَّاسِ،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




غَيْرَ أَنَّ فِي قِرَابِ سَيْفِي صَحِيفَةً، فَإِذَا فِيهَا الْمُؤْمِنُونَ تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ، يَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ، لَا يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ، وَلَا ذُو عَهْدٍ فِي عَهْدِهِ»(١).

**واتە: ئەشتەر دەگێڕێتەوە: بە عەلی ﷺ وت: کە لە نێو خەڵکیدا بڵاوبۆتەوە ئەوەی دەیبیستن، جا ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ پەیانی پێتداوە، ئەوە بۆمان باس بکە؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پەیانێکی بە من نەداوە بە خەڵکی نەدابێت ئەوە نەبێ لە نێو کیفی شمشێرەکەمدا ئەوەی تێدایە مسوڵمانان خوێنباییان وەکو یەک وایە، (جیاوازی نیە لە نێوان کەسێکی بەناوبانگ لەگەڵ کەسێکی بێ نەوا لە جێبەجێکردنی حەدی شەرعی) ئەگەر یەکێکیان ئەمانی دابە بێبڕوایەک خوێنی لەسەر هەموو مسوڵمانان قەدەغە دەبێت، بڕوادار بە بێبڕوا ناکوژرێتەوە، هیچ خاوەن پەیانێک هەتا پەیانی هەبێت ناکوژرێتەوە.**

## گەورەیی کوشتنی بێبڕوای خاوەن پەیمان

**٤٧٤٧-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ قَتَلَ مُعَاهِداً فِي غَيْرِ كُنْهِهِ، حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ»(٢).

**واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەس هاوپەیانێک بکوژێ بە ناحەق، خوا بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات.**

**٤٧٤٨-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ قَتَلَ نَفْسَاً مُعَاهِدَةً بِغَيْرِ حِلِّهَا، حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ أَنْ يَشُمَّ رِيحَهَا»(٣).

**واتە: ئەبی بەکرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەس هاوپەیانێک بکوژێ لە غەیری کاتی خۆی بە ناحەق، خوا بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات لەوەی بوونیشی بکات.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٧٦٠.

(٣) صحيح.




**٤٧٤٩-** «عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُخَيْمِرَةَ، عَنْ رَجُلٍ، مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَتَلَ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الذِّمَّةِ لَمْ يَجِدْ رِيحَ الْجَنَّةِ، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ سَبْعِينَ عَاماً»[١].

**واتە: قاسمی کوڕی موخەیمیرە دەگێڕێتەوە: لە پیاوێکەوە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس بێبڕوایەکی خاوەن پەیمان بکوژێ، بۆنی بەهەشت ناکات، بێگومان بۆنی بەهەشت بە درێژایی حەفتا ساڵ هەستی پێدەکرێ.**

**٤٧٥٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً مِنْ أَهْلِ الذِّمَّةِ، لَمْ يَجِدْ رِيحَ الْجَنَّةِ، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ أَرْبَعِينَ عَاماً»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس بێبڕوایەکی خاوەن پەیمان بکوژێ، بۆنی بەهەشت ناکات، بێگومان بۆنی بەهەشت بە درێژایی چل ساڵ هەستی پێدەکرێ.**

## هەڵگرتنی تۆڵەسەندنەوە لە نێوان کۆیلەکان لەو شتەی لە خوار نەفسەوەیە

**٤٧٥١-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﵁، أَنَّ غُلَاماً لِأُنَاسٍ فُقَرَاءَ قَطَعَ أُذُنَ غُلَامٍ لِأُنَاسٍ أَغْنِيَاءَ، فَأَتَوْا النَّبِيَّ ﷺ فَلَمْ يَجْعَلْ لَهُمْ شَيْئاً»[٣].

**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﵁ دەگێڕێتەوە: منداڵی هەژارێک گوێی منداڵی پیاوێکی دەوڵەمەندی بڕی، ئەوانیش هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ هیچی بۆ دانەنان (چونکە ڕووداوەکە بەهەڵە ڕوویدابوو بنەماڵەکەشی نەدار بوون).**

**تێبینی: پێدەچێ (غُلَام) بە مانای منداڵی بچووکی ئازاد بێت، هەروەها بە واتای منداڵی کۆیلەش بێت، خوا زاناترە.**

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٦٦ وو ٦٩١٤، وإبن ماجه: ٢٦٨٦.**

**(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٥٩٠.**




## تۆڵەسەندنەوە لە دداندا

**٤٧٥٢-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى بِالْقِصَاصِ فِي السِّنِّ وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كِتَابُ اللَّهِ الْقِصَاصُ»[١].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە تۆڵەسەندنەوە لە دداندا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کتێبی خوا تۆڵەسەندنەوەیە.**

**٤٧٥٣-** «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَتَلَ عَبْدَهُ قَتَلْنَاهُ، وَمَنْ جَدَعَ عَبْدَهُ جَدَعْنَاهُ»[٢].

**واتە: سەمورە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس کویلەیەکی خۆی بکوژێت دەیکوژینەوە، هەرکەسیش ئەندامێکی ببڕێتەوە ئەندامەکەی دەبڕینەوە.**

**٤٧٥٤-** «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ خَصَى عَبْدَهُ خَصَيْنَاهُ، وَمَنْ جَدَعَ عَبْدَهُ جَدَعْنَاهُ»[٣].

**واتە: سەمورە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس کۆیلەیەکی خۆی بخەسێنێ دەیخەسێنین، هەر کەسیش ئەندامێکی ببڕێتەوە ئەندامەکەی دەبڕینەوە.**

**٤٧٥٥-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ أُخْتَ الرُّبَيِّعِ أُمَّ حَارِثَةَ جَرَحَتْ إِنْسَاناً، فَاخْتَصَمُوا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْقِصَاصَ الْقِصَاصَ، فَقَالَتْ أُمُّ الرَّبِيعِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُقْتَصُّ مِنْ فُلَانَةَ؟ لَا وَاللَّهِ لَا يُقْتَصُّ مِنْهَا أَبَداً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: سُبْحَانَ اللَّهِ، يَا أُمَّ الرَّبِيعِ، الْقِصَاصُ كِتَابُ اللَّهِ، قَالَتْ: لَا وَاللَّهِ لَا يُقْتَصُّ مِنْهَا أَبَداً، فَمَا زَالَتْ حَتَّى قَبِلُوا الدِّيَةَ قَالَ: إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ مَنْ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لَأَبَرَّهُ»[٤].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، خوشکی ڕەبیع دایکی حاریثە کەسێکی بریندارکرد، کێشەکەیان برد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: تۆڵەسەندنەوە تۆڵەسەندنەوە،**

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٧٥.




دایکی ڕەبیع وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا فڵانە کەس تۆڵەی لێدەکرێتەوە؟ نە سوێند بە خوا هەرگیز تۆڵەی لێناکرێتەوە، بەردەوام دووبارەی دەکردەوە تا خوێنباییان قبوڵ کرد، فەرمووی: لە ناو بەندەکانی خوادا کەسی وا هەیە ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوا (بۆ ئەنجامدانی کارێک، یان بۆ ئەنجام نەدانی) سوێندەکەی ناشکێنێ بۆی جێبەجێ دەکات.

## تۆڵەسەندنەوە لە دوو ددانەکەی پێشەوە

**٤٧٥٦-** «عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: ذَكَرَ أَنَسٌ ﷺ أَنَّ عَمَّتَهُ كَسَرَتْ ثَنِيَّةَ جَارِيَةٍ، فَقَضَى نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ بِالْقِصَاصِ، فَقَالَ أَخُوهَا أَنَسُ بْنُ النَّضْرِ: أَتُكْسَرُ ثَنِيَّةُ فُلَانَةَ، لَا وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لَا تُكْسَرُ ثَنِيَّةُ فُلَانَةَ. قَالَ: وَكَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ، سَأَلُوا أَهْلَهَا الْعَفْوَ وَالْأَرْشَ، فَلَمَّا حَلَفَ أَخُوهَا وَهُوَ عَمُّ أَنَسٍ، وَهُوَ الشَّهِيدُ يَوْمَ أُحُدٍ، رَضِيَ الْقَوْمُ بِالْعَفْوِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ مَنْ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لَأَبَرَّهُ»[١].

واتە: حومەید دەڵێ: ئەنەس باسی کرد پووری (واتە: خوشکی باوکی) ددانی پێشەوەی کچێکی شکاند، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە تۆڵەسەندنەوە، براکەی ئەنەسی کوڕی نەضر وتی: ئایا ددانی فڵانە ئافرەت دەشکێنرێ، نا سوێند بەو خوایەی تۆی بە حەق ناردوە ددانی ناشکێنرێ، وتی: ئەوان پێشتر داوایان کردبوو لە کەسوکارەکەی بە لێخۆشبوون و خوێنبایی، کاتێ براکەی سوێندی خوارد کە مامی ئەنەس بوو، لە ڕۆژی ئوحوددا شەهید بوو، کەسوکارەکەی ڕازیبوون بەوەی لێی خۆش بن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستی لە ناو بەندەکانی خوادا کەسی وا هەیە ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات (بۆ ئەنجامدانی کارێک، یان بۆ ئەنجام نەدانی) سوێندەکەی ناشکێنێ بۆی جێبەجێ دەکات.

**٤٧٥٧-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَسَرَتِ الرُّبَيِّعُ ثَنِيَّةَ جَارِيَةٍ، فَطَلَبُوا إِلَيْهِمُ الْعَفْوَ، فَأَبَوْا، فَعُرِضَ عَلَيْهِمُ الْأَرْشُ، فَأَبَوْا، فَأَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ فَأَمَرَ بِالْقِصَاصِ، قَالَ أَنَسُ بْنُ النَّضْرِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تُكْسَرُ ثَنِيَّةُ الرُّبَيِّعِ لَا وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لَا تُكْسَرُ. قَالَ: يَا أَنَسُ، كِتَابُ اللَّهِ الْقِصَاصُ فَرَضِيَ الْقَوْمُ، وَعَفَوْا. فَقَالَ: إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ مَنْ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لَأَبَرَّهُ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٠٣ و ٢٨٠٦ و ٤٤٩٩ و ٤٥٠٠ و ٤٦١١ و ٦٨٩٤، وأبو داود: ٤٥٩٥، وإبن ماجه: ٢٦٤٩.

(٢) صحيح.




واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: ڕوبەیع ددانی پێشەوەی کچێکی شکاند، ئەوانیش داوایان کرد لێیان خۆش بن، لێی خۆش نەبوون، ئینجا خوێنباییان پێشنیاز کرد، ڕازی نەبوون، هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمانی کرد بە تۆڵەسەندنەوە، ئەنەسی کوڕی نەضر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ددانی ڕەبیع دەشکێنرێ، نا، سوێند بەو خوایەی تۆی بە حەق ناردوە ددانی ناشکێنرێ، وتی: ئەی ئەنەس کتێبی خوا تۆڵەکردنەوەیە، دواتر کەسوکارەکەی ڕازیبوون بەوەی لێی خۆش بن، فەرمووی: بەڕاستی لە ناو بەندەکانی خوادا کەسی وا هەیە ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات (بۆ ئەنجامدانی کارێک، یان بۆ ئەنجام نەدانی) سوێندەکەی ناشکێنێ بۆی جێبەجێ دەکات.

## تۆڵەسەندنەوە لە گازگرتن و باسی جیاوازی ئەوانەی فەرموودەکەی عیمرانی کوڕی حوصەینیان گواستۆتەوە

**٤٧٥٨-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً عَضَّ يَدَ رَجُلٍ فَانْتَزَعَ يَدَهُ، فَسَقَطَتْ ثَنِيَّتُهُ، أَوْ قَالَ ثَنَايَاهُ، فَاسْتَعْدَى عَلَيْهِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا تَأْمُرُنِي، تَأْمُرُنِي أَنْ آمُرَهُ أَنْ يَدَعَ يَدَهُ فِي فِيكَ تَقْضَمُهَا كَمَا يَقْضَمُ الْفَحْلُ، إِنْ شِئْتَ فَادْفَعْ إِلَيْهِ يَدَكَ حَتَّى يَقْضَمَهَا ثُمَّ انْتَزِعْهَا إِنْ شِئْتَ»[١].

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک گازی گرت لە دەستی پیاوێکی تر، ئەویش دەستی دەرهێنا لە دەمی ددانێک یان وتی: دوو ددانی پێشەوەی کەوت، ناکۆکیەکەی گەڕاندەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: داوای چیم لێ دەکەی، دەتەوێ فەرمانی پێ بکەم دەستی لە دەمتا بێ تا دەستی دەقرتێنی وەک و چۆن وشتری نێرە گازدەگرێ و دەیقرتێنێ، ئەگەر دەتەوێ دەستت بخەرە دەمی تا بیقرتێنێ، پاشان دەستت دەربهێنە.

**٤٧٥٩-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً عَضَّ آخَرَ عَلَى ذِرَاعِهِ فَاجْتَذَبَهَا، فَانْتَزَعَتْ ثَنِيَّتَهُ، فَرُفِعَ ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَأَبْطَلَهَا وَقَالَ: أَرَدْتَ أَنْ تَقْضَمَ لَحْمَ أَخِيكَ كَمَا يَقْضَمُ الْفَحْلُ؟»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٨٩٢، ومسلم: ١٨ و ١٦٧٣/١٩، والترمذي: ١٤١٦، وإبن ماجه: ٢٦٥٧.

(٢) صحيح.

**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک گازیگرت لە دەستی پیاوێکی تر، ئەویش دەستی ڕاکێشا لە ددانی پێشەوەی کەوت، ئەوە بەرزکرایەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش خوێنباییەکەی پووچ کردەوە، وە فەرمووی: دەتەوێ گۆشتی براکەت بقرتێنی، وەک چۆن وشتری نێرە گاز دەگرێ و دەیقرتێنێ.**

**٤٧٦٠-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: قَاتَلَ يَعْلَى رَجُلاً فَعَضَّ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ، فَانْتَزَعَ يَدَهُ مِنْ فِيهِ، فَنَدَرَتْ ثَنِيَّتُهُ، فَاخْتَصَمَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَعَضُّ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ كَمَا يَعَضُّ الْفَحْلُ؟ لَا دِيَةَ لَهُ»[١].

**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: یەعلا لەگەڵ پیاوێک شەڕی کرد یەکێکیان گازیگرت لە دەستی ئەویتر، ئەویش دەستی دەرهێنا لە دەمی ددانی پێشەوەی کەوت، ئاژاوەکەیان برد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: یەکێک لە ئێوە گاز لە براکەی دەگرێ، هەروەک چۆن وشتری نێرە ِ گاز دەگرێت، هیچ خوێن بایی بۆ نیە.**

**٤٧٦١-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، أَنَّ يَعْلَى قَالَ: فِي الَّذِي عَضَّ فَنَدَرَتْ ثَنِيَّتُهُ، إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَا دِيَةَ لَكَ»[٢].

**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە: یەعلا وتی: لە بارەی ئەو کەسەی گازی لە براکەی گرت و دوو ددانی پێشەوەی کەوتە خوارەوە، پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: هیچ خوێنی بۆ نیە.**

**٤٧٦٢-** «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً عَضَّ ذِرَاعَ رَجُلٍ، فَانْتَزَعَ ثَنِيَّتَهُ، فَانْطَلَقَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: أَرَدْتَ أَنْ تَقْضَمَ ذِرَاعَ أَخِيكَ كَمَا يَقْضَمُ الْفَحْلُ؟ فَأَبْطَلَهَا»[٣].

**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پیاوێک گازیگرد لە باڵی پیاوێکی تر، ئەویش دەستی دەرهێنا لە دەمی دوو ددانی سەرەوەی کەوت، ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بۆی باس کرد، فەرمووی: دەتەوێ باڵی براکەت بقرتێنی وەک**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




چۆن وشتری نێرە گاز دەگرێ لە وشترێکی ترو دەیقرتێنێ، خوێنبابیەکەی پووچ کردەوە.

## بابەت: پیاوێک بەرگری لە خۆی بکات

**٤٧٦٣-** «عَنْ يَعْلَى ابْنِ مُنْيَةَ ، أَنَّهُ قَاتَلَ رَجُلاً، فَعَضَّ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ، فَانْتَزَعَ يَدَهُ مِنْ فِيهِ، فَقَلَعَ ثَنِيَّتَهُ، فَرُفِعَ ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَعَضُّ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ كَمَا يَعَضُّ الْبَكْرُ؟ فَأَبْطَلَهَا»[1].

**واتە: یەعلای کوڕی مونەیە  دەگێڕێتەوە: ئەو لەگەڵ پیاوێک شەڕی کرد، یەکێکیان گازی گرت لە دەستی ئەویتر، ئەویش دەستی دەرهێنا لە دەمی و دوو ددانی سەرەوەی کەوت، ئەو کێشەیە بەرزکرایەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: یەکێک لە ئێوە گاز لە براکەی دەگرێ، هەروەک چۆن وشتری نێرە گاز لە وشترێکی تر دەگرێت، خوێن بابیەکەی پووچ کردەوە.**

**٤٧٦٤-** «عَنْ يَعْلَى ابْنِ مُنْيَةَ ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ بَنِي تَمِيمٍ قَاتَلَ رَجُلاً، فَعَضَّ يَدَهُ، فَانْتَزَعَهَا فَأَلْقَى ثَنِيَّتَهُ، فَاخْتَصَمَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَعَضُّ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ كَمَا يَعَضُّ الْبَكْرُ؟ فَأَطَلَّهَا أَيْ أَبْطَلَهَا»[2].

**واتە: یەعلای کوڕی مونەیە  دەگێڕێتەوە: پیاوێک لە بەنی تەمیم شەڕی کرد لەگەڵ پیاوێکی تر، گازی گرت لە دەستی، ئەویش دەستی دەرهێنا لە دەمی دوو ددانی سەرەوەی کەوت، کێشەکەیان برد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: یەکێک لە ئێوە گاز لە براکەی دەگرێ، هەروەک چۆن وشتری نێرە گاز لە وشترێکی تر دەگرێت. خوێنبابیەکەی پووچ کردەوە.**

## باسی جیاوازی لەسەر عەطاء لەم فەرموودەدا

**٤٧٦٥-** «عَنْ محمد عن عَطَاءِ بن أبي رَبَاحٍ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ عَمَّيْهِ سَلَمَةَ، وَيَعْلَى ابْنَيْ أُمَيَّةَ قَالَا: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، وَمَعَنَا صَاحِبٌ لَنَا، فَقَاتَلَ رَجُلاً مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَعَضَّ الرَّجُلُ ذِرَاعَهُ، فَجَذَبَهَا مِنْ فِيهِ فَطَرَحَ ثَنِيَّتَهُ، فَأَتَى الرَّجُلُ النَّبِيَّ ﷺ يَلْتَمِسُ

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.




الْعَقْلَ، فَقَالَ: يَنْطَلِقُ أَحَدُكُمْ إِلَى أَخِيهِ فَيَعَضُّهُ كَعَضِيضِ الْفَحْلِ، ثُمَّ يَأْتِي يَطْلُبُ الْعَقْلَ لَا عَقْلَ لَهَا فَأَبْطَلَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[١].

واتە: موحەممەد دەگێڕێتەوە، لە عەطائی کوڕی ئەبو ڕیباح، لە صەفوانی کوڕی عەبدوڵڵا لە هەردوو مامی سەلەمەو یەعلا کوڕانی ئومەیە، وتیان: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرچووین لە غەزای تەبووک، هاوەڵێکیشمان لەگەڵدا بوو، لەگەڵ پیاوێکی مسوڵماندا شەڕی کرد، پیاوەکە گازی لە دەستی گرت، ئەویش دەستی ڕاکێشاو دەریهێنا لە دەمی دوو ددانی سەرەوەی کەوت، پیاوەکە (ئەوەی ددانی کەوتبوو) هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، داوای خوێنبایی دەکرد، فەرمووی: یەکێک لە ئێوە گاز لە براکەی دەگرێ، هەروەک چۆن وشتری نێرە گاز لە وشترێکی تر دەگرێت، پاشان دێت داوای خوێنبایی دەکات، هیچ خوێنبایی بۆ نیە. پێغەمبەری خوا ﷺ خوێنباییەکەی پووچ کردەوە.

**٤٧٦٦-** «عَنْ عَمْرو، عَن عَطَاءِ، عَنْ صَفْوَانَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً عَضَّ يَدَ رَجُلٍ، فَانْتُزِعَتْ ثَنِيَّتُهُ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَأَهْدَرَهَا»[٢].

واتە: عەمر دەگێڕێتەوە، لە عەطاء، لە صەفوان، لە باوکیەوە ﷺ: پیاوێک گازی گرت لە دەستی پیاوێک، دوو ددانی سەرەوەی هاتەخوارەوە، هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ خوێنباییەکەی بە فیڕۆدا.

**٤٧٦٧-** «عَنْ عَمْرو، عَنْ عَطَاءِ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ يَعْلَى، عَنْ يَعْلَى ﷺ: أَنَّهُ اسْتَأْجَرَ أَجِيراً فَقَاتَلَ رَجُلاً، فَعَضَّ يَدَهُ، فَانْتُزِعَتْ ثَنِيَّتُهُ، فَخَاصَمَهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: أَيَدَعُهَا يَقْضَمُهَا كَقَضْمِ الْفَحْلِ؟»[٣].

واتە: عەمر دەگێڕێتەوە، لە عەطاء، لە صەفوانی کوڕی یەعلا، لە یەعلاوە ﷺ: کەسێکی گرت بە کرێ، لەگەڵ پیاوێکد شەڕی کرد، گازی لە دەستی گرت و ددانی پێشەوەی کەوتە خوارەوە، ئەو پیاوەی ددانی کەوت ناکۆکیەکەی برد بۆ لای

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٤٨ و ٢٢٦٥ و ٢٩٧٣ و ٤٤١٧ و ٦٨٩٣، ومسلم: ٢٢ و ١٦٧٤/٢٣، وأبو داود: ٤٥٨٤ و ٤٥٨٥، وإبن ماجه: ٢٦٥٦.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح الإسناد.




**پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: ئەی وازی لێ بهێنێ دەستی بقرتێنێ وەکو چۆن وشتری نێرە دەیقرتێنێ؟**

**٤٧٦٨-** «عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ يَعْلَى، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ فَاسْتَأْجَرْتُ أَجِيراً فَقَاتَلَ أَجِيرِي رَجُلاً، فَعَضَّ الْآخَرُ، فَسَقَطَتْ ثَنِيَّتُهُ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَأَهْدَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ»[١].

**واتە: ئینو جورەیج دەگێڕێتەوە، لە عەطاء، لە صەفوانی کوڕی یەعلا، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ غەزای تەبوکم کرد کەسێکم گرت بە کرێ، کرێکارەکەم شەڕی لەگەڵ پیاوێکدا کرد، پیاوەکەی تر گازی گرت لە دەستی ددانی سەرەوەی کەوتە خوارەوە، هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بۆ باسکرد، ئەویش خوێنەکەی بە فیڕۆدا.**

**٤٧٦٩-** «عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ يَعْلَى، عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ ﷺ قَالَ: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ جَيْشَ الْعُسْرَةِ، وَكَانَ أَوْثَقَ عَمَلٍ لِي فِي نَفْسِي، وَكَانَ لِي أَجِيرٌ فَقَاتَلَ إِنْسَاناً، فَعَضَّ أَحَدُهُمَا إِصْبَعَ صَاحِبِهِ، فَانْتَزَعَ إِصْبَعَهُ، فَأَنْدَرَ ثَنِيَّتَهُ فَسَقَطَتْ، فَانْطَلَقَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَأَهْدَرَ ثَنِيَّتَهُ وَقَالَ: أَفَيَدَعُ يَدَهُ فِي فِيكَ تَقْضَمُهَا؟»[٢].

**واتە: ئینو جورەیج دەگێڕێتەوە، لە عەطاء، لە صەفوانی کوڕی یەعلا، لە یەعلای کوڕی ئومەیە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ غەزام کرد لە سوپای عوسرەدا، ئیشێکی قوڕسم هەبوو،کەسێکم بە کرێ گرتبوو لەگەڵ پیاوێکدا شەڕی کرد، یەکێکیان گازی گرت لە پەنجەی ئەوی دیکە ئەویش پەنجەی ڕاکێشاو ددانی سەرەوەی کەوتە خوارەوە، ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش خوێنبایی ددانەکانی بە فیڕۆدا و فەرمووی: ئەی دەستی لە دەمتدا بێت تا دەیقرتێنی؟**

**٤٧٧٠-** «عَنْ قَتادةَ عن عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ يَعْلَى، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، بِمِثْلِ الَّذِي عَضَّ، فَنَدَرَتْ ثَنِيَّتُهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَا دِيَةَ لَكَ»[٣].

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد.



**واتە: قەتادە دەگێڕێتەوە، لە عەطاء، لە کوڕی یەعلا، لە باوکیەوە ﵁، بە هەمان شێوەی ئەو فەرموودەی کە باسی گاز گرتنی کرد، ددانی سەرەوەی کەوتە خوارەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیچ خوێن بایبەکی بۆ نیە.**

**٤٧٧١-** «عَنْ بُدَيْلِ بن مَيْسَرَةَ، عن عَطَاءٍ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ يَعْلَى ابْنِ مُنْيَةَ ﵁: أَنَّ أَجِيراً لِيَعْلَى ابْنِ مُنْيَةَ عَضَّ آخَرُ ذِرَاعَهُ، فَانْتَزَعَهَا مِنْ فِيهِ، فَرَفَعَ ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَقَدْ سَقَطَتْ ثَنِيَّتُهُ، فَأَبْطَلَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ: أَيَدَعُهَا فِي فِيكَ تَقْضَمُهَا كَقَضْمِ الْفَحْلِ؟»[١].

**واتە: بودەیلی کوڕی مەیسەرە دەگێڕێتەوە لە عەطاء، لە صەفوانی کوڕی یەعلای کوڕی ئومەیە ﵁: کرێکارێکی یەعلای کوڕی ئومەیە گازی گرت لە باڵی کەسێکی تر ئەویش دەستی دەرهێنا لە دەمی، ئەو کێشەی بەرزکردەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کە ددانی سەرەوەی کەوتبووە خوارەوە، پێغەمبەریش خوێنباییەکەی بەتاڵ کردەوە، پاشان فەرمووی: ئەی دەستی لە دەمتدا بهێڵێتەوە تا دەیقرتێنی، وەک چۆن وشتر گاز دەگرێ و دەیقرتێنێ؟**

**٤٧٧٢-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ يَعْلَى: أَنَّ أَبَاهُ ﵁ غَزَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ فَاسْتَأْجَرَ أَجِيراً، فَقَاتَلَ رَجُلاً، فَعَضَّ الرَّجُلُ ذِرَاعَهُ، فَلَمَّا أَوْجَعَهُ نَتَرَهَا فَأَنْدَرَ ثَنِيَّتَهُ، فَرُفِعَ ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَعْمِدُ أَحَدُكُمْ، فَيَعَضُّ أَخَاهُ كَمَا يَعَضُّ الْفَحْلُ فَأَبْطَلَ ثَنِيَّتَهُ»[٢].

**واتە: موحەممەدی کوڕی موسلیم دەگێڕێتەوە، لە صەفوانی کوڕی یەعلا: باوکی ﵁ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ غەزای تەبوکی کرد کەسێکی گرت بە کرێ، لەگەڵ پیاوێدا شەڕی کرد، پیاوەکە گازی گرت لە باڵی، کاتێ کە ئازاری پێگەیشت دەستی ڕاتەکاند لە دەمی و ددانی سەرەوەی کەوتە خوارەوە، ئەو کێشەیە بەرزکرایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەسێک لە ئێوە بە ئەنقەست گاز لە براکەی دەگرێ وەک چۆن وشتری نێرە گاز دەگرێ، بۆیە خوێنەکەی بە هەدەردا.**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.




## تۆڵەسەندنەوە لە لێداندا

**٤٧٧٣-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: بَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْسِمُ شَيْئاً، أَقْبَلَ رَجُلٌ فَأَكَبَّ عَلَيْهِ فَطَعَنَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِعُرْجُونٍ كَانَ مَعَهُ، فَخَرَجَ الرَّجُلُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَعَالَ فَاسْتَقِدْ، قَالَ: بَلْ قَدْ عَفَوْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ»[١].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین شتێکی دابەش دەکرد، لە ناکاو پیاوێک پەلاماری شتەکەیدا (بۆ ئەوەی پێش دابەشکردن بەشێک بۆ خۆی ببات) پێغەمبەری خوا ﷺ بە پەلکی دارخورمایەک لێیدا کە لە لای بوو، پیاوەکەیش هاواری لێ بەرز بوویەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وەرە تۆڵەی خۆت بکەرەوە، ئەویش وتی: بەڵکو لێت خۆش بووم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.**

**٤٧٧٤-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: بَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْسِمُ شَيْئاً إِذْ أَكَبَّ عَلَيْهِ رَجُلٌ، فَطَعَنَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِعُرْجُونٍ كَانَ مَعَهُ، فَصَاحَ الرَّجُلُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَعَالَ فَاسْتَقِدْ، قَالَ: بَلْ عَفَوْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ»[٢].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین شتێکی دابەش دەکرد، لە ناکاو پیاوێک پەلاماری شتەکەیدا (بۆ ئەوەی پێش دابەشکردن بەشێک بۆ خۆی ببات) پێغەمبەری خوا ﷺ بە پەلکی دارخورمایەک لێیدا کە لەلای بوو، پیاوەکەیش هاواری لێ بەرز بوویەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وەرە تۆڵەی خۆت بکەرەوە، ئەویش وتی: بەڵکو لێت خۆش بووم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.**

## تۆڵەسەندنەوە لە زللە یان چەپۆک

**٤٧٧٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً وَقَعَ فِي أَبٍ كَانَ لَهُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَلَطَمَهُ الْعَبَّاسُ، فَجَاءَ قَوْمُهُ فَقَالُوا: لَيَلْطِمَنَّهُ كَمَا لَطَمَهُ، فَلَبِسُوا السِّلَاحَ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ، فَصَعِدَ

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٥٣٦.

(٢) ضعيف.





الْمِنْبَرَ فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ، أَيُّ أَهْلِ الْأَرْضِ تَعْلَمُونَ أَكْرَمُ عَلَى اللَّهِ ﷻ؟ فَقَالُوا: أَنْتَ. فَقَالَ: إِنَّ الْعَبَّاسَ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ، لَا تَسُبُّوا مَوْتَانَا، فَتُؤْذُوا أَحْيَاءَنَا فَجَاءَ الْقَوْمُ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ غَضَبِكَ، اسْتَغْفِرْ لَنَا»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک چووە ناو لەوەڕێکەوە کە لە سەردەمی نەفامیدا هی ئەو بوو، عەبباس زللەیەکی لێدا، کەسوکارەکەی هاتن وتیان: دەبێ زللەیەکی لێبدرێ وەک چۆن زللەیەکی لێداوە، چەکیان هەڵگرت، هەواڵ گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش چووە سەر مینبەرو فەرمووی: ئەی خەڵکینە، ئەی خەڵکی سەر زەوی ئایا دەزانن کێ بەڕێزترینە لە لای خوا ﷻ؟ وتیان: تۆ، فەرمووی: عەبباس لە منەو منیش لە ئەوم، جنێو بە مردووەکانمان مەدەن، زیندووەکانمانی پێ ئازار بدەن، خەڵکەکە هاتن وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پەنا دەگرین بە خوا لە تووڕە بوونت، داوای لێخۆشبوونمان بۆ بکە.**

## تۆڵەسەندنەوە لە ڕاتەکاندن

**٤٧٧٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَقْعُدُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ، فَإِذَا قَامَ قُمْنَا، فَقَامَ يَوْماً وَقُمْنَا مَعَهُ حَتَّى لَمَّا بَلَغَ وَسَطَ الْمَسْجِدِ أَدْرَكَهُ رَجُلٌ فَجَبَذَ بِرِدَائِهِ مِنْ وَرَائِهِ، وَكَانَ رِدَاؤُهُ خَشِناً، فَحَمَّرَ رَقَبَتَهُ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، احْمِلْ لِي عَلَى بَعِيرَيَّ هَذَيْنِ، فَإِنَّكَ لَا تَحْمِلُ مِنْ مَالِكَ وَلَا مِنْ مَالِ أَبِيكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا، وَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ، لَا أَحْمِلُ لَكَ حَتَّى تُقِيدَنِي مِمَّا جَبَذْتَ بِرَقَبَتِي، فَقَالَ الْأَعْرَابِيُّ: لَا وَاللَّهِ لَا أُقِيدُكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ كُلُّ ذَلِكَ يَقُولُ: لَا وَاللَّهِ لَا أُقِيدُكَ، فَلَمَّا سَمِعْنَا قَوْلَ الْأَعْرَابِيِّ، أَقْبَلْنَا إِلَيْهِ سِرَاعَاً، فَالْتَفَتَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: عَزَمْتُ عَلَى مَنْ سَمِعَ كَلَامِي أَنْ لَا يَبْرَحَ مَقَامَهُ حَتَّى آذَنَ لَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِرَجُلٍ مِنَ الْقَوم ﷺ: يَا فُلَانُ، احْمِلْ لَهُ عَلَى بَعِيرٍ شَعِيراً، وَعَلَى بَعِيرٍ تَمْراً، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: انْصَرِفُوا»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئێمە لە مزگەوت لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دادەنیشتین، کاتێ هەڵسایە لەگەڵیدا هەڵدەستاین، ڕۆژێک هەڵسا ئێمەیش لەگەڵیدا هەڵساین،**

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٣٧٥٩.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٢٦٥ و ٤٧٧٥، وإبن ماجه: ٢٠٩٣.




هەتا گەیشتە نێوەڕاستی مزگەوتەکە، پیاوێکی توش بوو کراسەکەی لە پشتەوە ڕاتەکاند، جا کراسەکەی زبر بوو ناوشانی سور کردەوە، وتی: ئەی موحەممەد، خواردنم بدەرێ با لە یەکێک لەم دوو وشترە بار بکەم، خۆ تۆ نە لە ماڵی خۆت و نە لە ماڵی باوکت خواردنم پێ نادەی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەخێر، داوای لێبوردن لە خوا دەکەم، هیچت پێ نادەم هەتا تۆڵەی ئەوەت لێ نەکەمەوە کە شانمت سوورەوە کردۆتەوە، کابرای دەشتەکی وتی: نە سوێند بە خوا تۆڵەم لێناکەیتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار ئەوەی دووبارە کردەوە، هەر جارێک دەیوت: نە سوێند بە خوا تۆڵەم لێناکەیتەوە، کاتێ گوێیان لە قسەی کابرای دەشتەکی بوو بە پەلە هاتین بۆ لای، پێغەمبەری خوا ﷺ لای لێکردینەوە فەرمووی: هەر کەس گوێی لە قسەکەم بوو با لە شوێنی خۆی هەڵنەسێ هەتا مۆڵەتی پێ دەدەم، پێغەمبەری خوا ﷺ بە پیاوێکی ناو خەڵکەکەی فەرموو: ئەی فڵانە کەس، بارێک جۆ بخەرە سەر یەکێک لە وشترەکانی، وە خورمایش بخەرە سەر ئەویتریان، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڵاوەی لێ بکەن.

## تۆڵەسەندنەوە لە دەسەڵاتداران

**٤٧٧٧-** «عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُقِصُّ مِنْ نَفْسِهِ»[١].

**واتە:** عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی تۆڵەی لە نەفسی خۆی دەکردەوە.

## لەسەر دەستی کاربەدەست کەسێک دووچاری لێدان ببێتەوە

**٤٧٧٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ أَبَا جَهْمِ بْنَ حُذَيْفَةَ مُصَدِّقاً، فَلَاحَّهُ رَجُلٌ فِي صَدَقَتِهِ، فَضَرَبَهُ أَبُو جَهْمٍ فَأَتَوْا النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: الْقَوَدُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: لَكُمْ كَذَا وَكَذَا فَلَمْ يَرْضَوْا بِهِ. فَقَالَ: لَكُمْ كَذَا وَكَذَا فَرَضُوا بِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنِّي خَاطِبٌ عَلَى النَّاسِ وَمُخْبِرُهُمْ بِرِضَاكُمْ، قَالُوا: نَعَمْ، فَخَطَبَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ هَؤُلَاءِ أَتَوْنِي يُرِيدُونَ الْقَوَدَ، فَعَرَضْتُ عَلَيْهِمْ كَذَا وَكَذَا فَرَضُوا، قَالُوا: لَا فَهَمَّ الْمُهَاجِرُونَ بِهِمْ، فَأَمَرَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَكُفُّوا، فَكَفُّوا، ثُمَّ

---

(١) ضعيف الإسناد. أخرجه أبو داود: ٤٥٣٧.

دَعَاهُمْ قَالَ: أَرَضِيتُمْ؟ قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ: فَإِنِّي خَاطِبٌ عَلَى النَّاسِ وَمُخْبِرُهُمْ بِرِضَاكُمْ، قَالُوا: نَعَمْ، فَخَطَبَ النَّاسَ ثُمَّ قَالَ: أَرَضِيتُمْ؟ قَالُوا: نَعَمْ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ ئەبو جەهمی کوڕی حوزەیفەی نارد بۆ وەرگرتنی زەکات، پیاوێک دەمەدەمێی لەگەڵدا کرد لەبارەی دەرکردنی زەکاتەکەی، ئەبو جەهم لێیدا، هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: تۆڵەی خۆم دەسەنمەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەوەندەو ئەوەندە بۆ ئێوە لەبری تۆڵەکردنەوە، ئەوان ڕازی نەبوون، فەرمووی: ئەوەندەو ئەوەندە بۆ ئێوە پێی ڕازی بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من خەڵکی ئاگادار دەکەمەوە بە ڕەزامەندیتان، وتیان: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ وتاریداو فەرمووی: ئەوانە هاتوون داوای تۆڵەسەندنەوە دەکەن، منیش ئەوەندەو ئەوەندەم بۆیان پێشنیاز کرد ئەوانیش ڕازی بوون، وتیان: نەخێر، موهاجیرەکان ویستیان پەلاماریان بدەن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردن دەست هەڵبگرن، ئەوانیش دەستیان هەڵگرت، پاشان بانگیانی کرد، فەرمووی: ئایا ڕازین، وتیان بەڵێ، فەرمووی: من خەڵکی ئاگادار دەکەمەوە بە ڕەزامەندیتان، وتیان: بەڵێ، وتاری بۆ خەڵکەکەدا، پاشان فەرمووی: ئایا ڕازین، وتیان بەڵێ.**

## تۆڵەسەندنەوە بە جگە لە ئاسن

**٤٧٧٩-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّ يَهُودِيّاً رَأَى عَلَى جَارِيَةٍ أَوْضَاحاً فَقَتَلَهَا بِحَجَرٍ، فَأُتِيَ بِهَا النَّبِيُّ ﷺ وَبِهَا رَمَقٌ، فَقَالَ: أَقَتَلَكِ فُلَانٌ؟ فَأَشَارَ شُعْبَةُ بِرَأْسِهِ يَحْكِيهَا أَنْ: لَا فَقَالَ: أَقَتَلَكِ فُلَانٌ؟ فَأَشَارَ شُعْبَةُ بِرَأْسِهِ يَحْكِيهَا أَنْ: لَا، قَالَ: أَقْتَلَكِ فُلَانٌ؟ فَأَشَارَ شُعْبَةُ بِرَأْسِهِ يَحْكِيهَا أَنْ: نَعَمْ، فَدَعَا بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَتَلَهُ بَيْنَ حَجَرَيْنِ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: جولەکەیەک ملوانکەیەکی بە ملی کچێکەوە بینی، بە بەرد کوشتی، کچەکە هێنرا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ گیانی دەدا، فەرمووی: فڵانەکەس کوشتتی؟ «شوعبە بەسەری ئاماژەی کرد دەیگێڕایەوە»: نەخێر، فەرمووی: فڵانە کەس کوشتتی؟ «شوعبە بەسەری ئاماژەی کرد دەیگێڕایەوە»: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد (دوای ئەوەی دانی پیانا)، سەری خستە نێوان دوو بەردو کوشتی.**

---

(١) صحيح الإسناد. أخرجه أبو داود: ٤٥٣٤، وإبن ماجه: ٢٦٣٨.

(٢) صحيح.




**٤٧٨٠-** «عَنْ قَيْسٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَ سَرِيَّةً إِلَى قَوْمٍ مِنْ خَثْعَمَ، فَاسْتَعْصَمُوا بِالسُّجُودِ، فَقُتِلُوا فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِنِصْفِ الْعَقْلِ وَقَالَ: إِنِّي بَرِيءٌ مِنْ كُلِّ مُسْلِمٍ مَعَ مُشْرِكٍ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَلَا لَا تَرَاءَى نَارَاهُمَا»[١].

واتە: قەیس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەشکرێکی نارد بۆ گیان قەومێک لە خەثعەم، ویستیان بە ئاشکرا کردنی سوژدە بردن خوێنیان بپارێزن، بەڵام کوژران، پێغەمبەری خوا ﷺ نیوەی خوێنباییەکەیانیدا، وە فەرمووی: من بەریم لە هەر مسوڵمانێک لە نێوان هاوبەشدانەراندا دابنیشێت، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئاگادار بن دروست نیە بۆ مسوڵمان لە نزیک بێبڕوا دابنیشێ، چونکە ئاگری هەر یەکێکیان ئەویتر دەسوتێنێ.

### لێکدانەوەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿فَمَنۡ عُفِيَ لَهُۥ مِنۡ أَخِيهِ شَيۡءٞ فَٱتِّبَاعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيۡهِ بِإِحۡسَٰنٖ ١٧٨﴾ (واتە: ئینجا هەرکەس بەخشرا لە لایەن برایەکی دینیەوە بە بەشێک لە خوێنەکەی، ئەبێ خزمەکانی بە چاکی پەیڕەوی بکەن، بکوژیش بە چاکی خوێنەکە بدات).

**٤٧٨١-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ الْقِصَاصُ وَلَمْ تَكُنْ فِيهِمُ الدِّيَةُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَىۖ ٱلۡحُرُّ بِٱلۡحُرِّ وَٱلۡعَبۡدُ بِٱلۡعَبۡدِ وَٱلۡأُنثَىٰ بِٱلۡأُنثَىٰ ١٧٨﴾ البقرة، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿فَمَنۡ عُفِيَ لَهُۥ مِنۡ أَخِيهِ شَيۡءٞ فَٱتِّبَاعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيۡهِ بِإِحۡسَٰنٖ ١٧٨﴾ البقرة، فَالْعَفْوُ: أَنْ يَقْبَلَ الدِّيَةَ فِي الْعَمْدِ، وَاتِّبَاعٌ بِمَعْرُوفٍ يَقُولُ: يَتَّبِعُ هَذَا بِالْمَعْرُوفِ، وَأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ، وَيُؤَدِّي هَذَا بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ: ﴿تَخۡفِيفٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَرَحۡمَةٞ ١٧٨﴾ البقرة، مِمَّا كُتِبَ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، إِنَّمَا هُوَ الْقِصَاصُ لَيْسَ الدِّيَةَ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: لە نێو جولەکەدا تۆڵەسەندنەوە هەبوو، خوێنبایی نەبوو، خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاندە خوارەوە: ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَىۖ ٱلۡحُرُّ بِٱلۡحُرِّ وَٱلۡعَبۡدُ بِٱلۡعَبۡدِ وَٱلۡأُنثَىٰ بِٱلۡأُنثَىٰ ١٧٨﴾ (واتە: پێویست کراوە لەسەرتان تۆڵەسەندن لە کوژراواندا بە یەکسانی ئازاد بە ئازاد بەندە بە بەندە و

---

(١) صحيح. أخرجه موصولًا، أبو داود: ٢٦٤٥، والترمذي: ١٦٠٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٤٩٨.




ژن بە ژن)، هەتا فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿فَمَنۡ عُفِيَ لَهُۥ مِنۡ أَخِيهِ شَيۡءٞ فَٱتِّبَاعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيۡهِ بِإِحۡسَٰنٖۗ ﴿١٧٨﴾﴾ (الْعَفْو): بریتیە لەوەی خوێنبایی قبوڵ بكات لە كوشتنی ئەنقەست، وە (وَاتِّبَاعٌ بِمَعْرُوف) دەڵێ: بە چاكیش ئەمە ئەنجام دەدات، (وَأَدَاءٌ إِلَيْه بِإِحْسَان) خوێنباییەكە بە چاكی دەدات: ﴿تَخۡفِيفٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَرَحۡمَةٞۗ ﴿١٧٨﴾﴾ (واتە: ئەمە سووككردنە لە پەروەردگارتانەوەو میهرەبانیە)، لەوەی نوسراوە لەسەر ئەوانەی پێشینتان، بێگومان ئەوە تۆڵەیە نەک خوێنبایی.

**٤٧٨٢-** «عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَىۖ ٱلۡحُرُّ بِٱلۡحُرِّ ﴿١٧٨﴾﴾البقرة، قَالَ: كَانَ بَنُو إِسْرَائِيلَ عَلَيْهِمُ الْقِصَاصُ وَلَيْسَ عَلَيْهِمُ الدِّيَةُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ عَلَيْهِمُ الدِّيَةَ، فَجَعَلَهَا عَلَى هَذِهِ الْأُمَّةِ تَخْفِيفاً عَلَى مَا كَانَ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ»[١].

واتە: موجاهید دەڵێ: ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَىۖ ٱلۡحُرُّ بِٱلۡحُرِّ ﴿١٧٨﴾﴾ دەڵێ: نەوەكانی ئیسرائیل تۆڵەسەندنەوەیان لەسەر بوو، بەڵام خوێنباییان لەسەر نەبوو، خوا خوێنبایی بۆیان دابەزاند، وە كردی بە كار ئاسانیەک بۆ ئەم ئوممەتە، وەک چۆن لەسەر بەنی ئیسرائیل دایناا.

## فەرمان كردن بە لێخۆشبوون لە تۆڵەكردنەوە

**٤٧٨٣-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي قِصَاصٍ فَأَمَرَ فِيهِ بِالْعَفْوِ»[٢].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: كەسێک هێنرا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ تۆڵەی لێ بكرێتەوە فەرمانی كرد لێی ببورێت.

**٤٧٨٤-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: مَا أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ فِي شَيْءٍ فِيهِ قِصَاصٌ إِلَّا أَمَرَ فِيهِ بِالْعَفْوِ»[٣].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: هەر كەس بهێنرایە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بۆ تۆڵەسەندنەوە فەرمانی دەكرد بە لێخۆشبوون.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح الإسناد. أخرجه أبو داود: ٤٤٦٧، وإبن ماجه: ٢٦٩٢.

(٣) صحيح.

## ئایا لە بکوژی ئەنقەست خوێن بایی وەردەگیرێ ئەگەر خاوەن کوژراوەکە لە تۆڵەسەندنەوە خۆش بوو

**٤٧٨٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ، إِمَّا أَنْ يُقَادَ وَإِمَّا أَنْ يُفْدَى»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەس یەکێکی لێکوژرا، ئەوە ئەو سەرپشکە لە نێوان دوو شتدا، یان تۆڵەی لێدەکاتەوە، یان خوێنبایی وەردەگرێ.**

**٤٧٨٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ، إِمَّا أَنْ يُقَادَ وَإِمَّا أَنْ يُفْدَى»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەس یەکێکی لێکوژرا، ئەوە ئەو سەرپشکە لە نێوان دوو شتدا، یان تۆڵەی لێ دەکرێتەوە، یان خوێنبایی وەردەگیرێ.**

**٤٧٨٧-** «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ»[٣].

**واتە: ئەبو سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس یەکێکی لێکوژرا... (تا کۆتایی).**

## لێخۆشبوونی ئافرەت لە تۆڵەکردنەوەی خوێن

**٤٧٨٨-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: وَعَلَى الْمُقْتَتِلِينَ أَنْ يَنْحَجِزُوا الْأَوَّلَ فَالْأَوَّلَ، وَإِنْ كَانَتِ امْرَأَةٌ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٥٣٨.

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەسەر خاوەنی بکوژو کوژراو ئەوەیە دەستهەڵگرن لە تۆڵە کردنەوە، ئەگەر چی ئافرەتیش بێت، (کوشتنەوەکە هەڵدەگیرێ و دەبێتە خوێنبایی).

## بابەت: کەسێک بە بەرد کوژرا بێت یان قامچی

**٤٧٨٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ قُتِلَ فِي عِمِّيًا أَوْ رِمِّيًا تَكُونُ بَيْنَهُمْ بِحَجَرٍ أَوْ سَوْطٍ أَوْ بِعَصاً فَعَقْلُهُ عَقْلُ خَطَإٍ، وَمَنْ قَتَلَ عَمْداً فَقَوَدُ يَدِهِ، فَمَنْ حَالَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لَا يُقْبَلُ مِنْهُ صَرْفٌ وَلَا عَدْلٌ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس بە شێوەیەکی نادیار کوژرا یان بە هاوێشتنی بەرد ئەوە لە نێوانیاندا بەرد هەیە یان قامچی یان گۆچان (واتە: بە یەکێک لەمانە کوژراوە) ئەو خوێنەکەی خوێنبایی کوشتنی بەهەڵەیە، هەرکەس بە ئەنقەست کەسێکی کوشت ئەوە تۆڵەی لێدەسەندرێ، هەرکەس ببێتە ڕێگر لەبەردەم کوشتنەوەی بکوژدا ئەوە نەفرینی خواو فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەرە بە گشتی، خوا نە داوای لێخۆشبوونی لێوەردەگرێ و نە فیدیەشی لێوەردەگرێ.

**٤٧٩٠-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَرْفَعُهُ، قَالَ: مَنْ قُتِلَ فِي عِمِّيَّةٍ أَوْ رِمِّيَّةٍ بِحَجَرٍ أَوْ سَوْطٍ أَوْ عَصاً فَعَقْلُهُ عَقْلُ الْخَطَإِ، وَمَنْ قُتِلَ عَمْداً فَهُوَ قَوَدٌ، وَمَنْ حَالَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لَا يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ صَرْفاً وَلَا عَدْلاً»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) ڕەفعی کردوە: هەر کەس بە شێوەیەکی نادیار کوژرا، یان بە هاوێشتنی بەرد یان قامچی یان گۆچان، (واتە: بە یەکێک لەمانە کوژراوە) ئەو خوێنەکەی خوێنبایی کوشتنی بە هەڵەیە، هەر کەس بە ئەنقەست کەسێکی کوشت ئەوە تۆڵەی لێدەسەندرێ، هەرکەس ببێتە ڕێگر لە بەردەم کوشتنەوەی بکوژدا، ئەوە نەفرینی خواو فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەرە بە گشتی، خوا نە داوای لێخۆشبوونی لێوەردەگرێ و نە فیدیەشی لێوەردەگرێ.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٥٤٠ و ٤٥٩١، وإبن ماجه: ٢٦٣٥.

(٢) صحيح.

## خوێنبایی کوشتنی نیمچە هەڵەو باسی جیاوازی لەسەر ئەیوب لە فەرموودەی قاسمی کوڕی ڕەبیعە لە فەرموودەکە

**٤٧٩١-** «عَنْ شُعْبَة، عَنْ أَيُّوبَ السَّخْتِيَانِيِّ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: قَتِيلُ الْخَطَإِ شِبْهِ الْعَمْدِ بِالسَّوْطِ أَوِ الْعَصَا، مِائَةٌ مِنَ الْإِبِلِ أَرْبَعُونَ مِنْهَا فِي بُطُونِهَا أَوْلَادُهَا»[١].

**واتە: شوعبە دەگێڕێتەوە، لە ئەیوبی سەختیانی، لە قاسمی کوڕی ڕەبیعە، لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ، لە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوێن بایی کوشتنی نیمچە هەڵە بە قامچی یان گۆچان، سەد وشترە، چل دانەیان دەبێ ئاوس بن.**

**٤٧٩٢-** «عَنْ حماد عن أَيُّوبَ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ رَبِيعَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَطَبَ يَوْمَ الْفَتْحِ، مرسلٌ»[٢].

**واتە: حەماد دەگێڕێتەوە، لە ئەیوب، لە قاسمی کوڕی ڕەبیعە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککە وتاریدا. فەرموودەکە بە (مرسل)ی هاتووە.**

## باسی جیاوازی لەسەر خالدی (الْحَذَّاء) لە فەرموودەکەدا

**٤٧٩٣-** «عَنْ حماد عن خَالِدٍ يَعْنِي الْحَذَّاءَ، عَنِ الْقَاسِمِ بن رَبِيعَةَ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ أَوْسٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَلَا وَإِنَّ قَتِيلَ الْخَطَإِ شِبْهِ الْعَمْدِ مَا كَانَ بِالسَّوْطِ وَالْعَصَا، مِائَةٌ مِنَ الْإِبِلِ أَرْبَعُونَ فِي بُطُونِهَا أَوْلَادُهَا»[٣].

**واتە: حەماد دەگێڕێتەوە لە خالدی حەذاء، لە قاسمی کوڕی ڕەبیعە، لە عوقبەی کوڕی ئەوس، لە عەبدوڵڵاوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاگادار بن کوشتن بە هەڵە ئەوەیە کە بە قامچی و گۆچان بێت، خوێنباییەکەی سەد وشترە و چل دانەیان ئاوس بێت.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه أبو اود: ٤٥٤٧ و ٤٥٤٨ و ٤٥٨٨ و ٤٥٨٩، وإبن ماجه: ٢٦٢٧.




**٤٧٩٤-** «عَنْ هُشيم عن خَالِدٍ، عَنِ الْقَاسِمِ بن رَبِيعَةَ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ أَوْسٍ، عَنْ رَجُلٍ، مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: خَطَبَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ فَقَالَ: أَلَا وَإِنَّ قَتِيلَ الْخَطَإِ شِبْهِ الْعَمْدِ بِالسَّوْطِ وَالْعَصَا وَالْحَجَرِ، مِائَةٌ مِنَ الْإِبِلِ، فِيهَا أَرْبَعُونَ ثَنِيَّةً إِلَى بَازِلِ عَامِهَا كُلُّهُنَّ خَلِفَةٌ»[١].

**واتە: هوشەیم دەگێڕێتەوە، لە خالد، لە قاسمی کوڕی ڕەبیعە، لە عوقبەی کوڕی ئەوس، لە پیاوێکەوە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککە فەرمووی: ئاگاداربن کوشتنی بە هەڵە ئەوەیە کە بە قامچی و گۆچان و بەرد بێت، خوێنباییەکەی سەد وشترەو چل دانەیان ئاوس بێت بە وشترێک ددانی کاوێژی دەرکردبێ، هەموویان نیوەی ماوەکە ئاوس بووبن.**

**٤٧٩٥-** «عَنِ ابْنِ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ خَالِدٍ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ أَوْسٍ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَلَا إِنَّ قَتِيلَ الْخَطَإِ قَتِيلَ السَّوْطِ وَالْعَصَا، فِيهِ مِائَةٌ مِنَ الْإِبِلِ مُغَلَّظَةٌ، أَرْبَعُونَ مِنْهَا فِي بُطُونِهَا أَوْلَادُهَا»[٢].

**واتە: ئیبنو ئەبی عەدی دەگێڕێتەوە، لە خالد، لە قاسمی کوڕی ڕەبیعە، لە عوقبەی کوڕی ئەوس ﵁، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاگاداربن کوشتن بە هەڵە، ئەوەیە بە قامچی و گۆچان کوژرا بێت، خوێنباییەکەی سەد وشتری گرانبەهایە، چل دانەیان ئاوس بێت.**

**٤٧٩٦-** «عَنْ بِشْرُ بن الْمُفَضَّلِ عن خَالِدٍ الْحَذَّاءِ، عَنِ الْقَاسِمِ بن رَبِيعَةَ، عَنْ يَعْقُوبَ بْنِ أَوْسٍ، عَنْ رَجُلٍ، مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا دَخَلَ مَكَّةَ يَوْمَ الْفَتْحِ قَالَ: أَلَا وَإِنَّ كُلَّ قَتِيلِ خَطَإِ الْعَمْدِ، أَوْ شِبْهِ الْعَمْدِ قَتِيلِ السَّوْطِ وَالْعَصَا، مِنْهَا أَرْبَعُونَ فِي بُطُونِهَا أَوْلَادُهَا»[٣].

**واتە: بیشری کوڕی موفەضەل دەگێڕێتەوە، لە خالدی حەذاء، لە قاسمی کوڕی ڕەبیعە، لە یەعقوبی کوڕی ئەوس، لە پیاوێکەوە، لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ کاتێ هاتە مەککە لە ڕۆژی ئازادکردنیدا، فەرمووی: ئاگاداربن کوشتنی بە هەڵە ئەوەیە بە قامچی و گۆچان بێت کوژرابێت، لە ناو (ئەو سەد وشترەی) خوێنباییەکەدا چل دانەیان ئاوس بێت.**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح لغيره.




**٤٧٩٧-** «عَنْ يَزِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ يَعْقُوبَ بْنِ أَوْسٍ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ حَدَّثَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا قَدِمَ مَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ قَالَ: أَلَا وَإِنَّ قَتِيلَ الْخَطَإِ الْعَمْدِ قَتِيلَ السَّوْطِ وَالْعَصَا، مِنْهَا أَرْبَعُونَ فِي بُطُونِهَا أَوْلَادُهَا»(١).

**واتە: یەزید دەڵێ: خالد بۆی باس کردین، لە قاسمی کوڕی ڕەبیعە، لە یەعقوبی کوڕی ئەوس، پیاوێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بۆی باسکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ هاتە مەککە لە ساڵی ئازاد کردنیدا، فەرمووی: ئاگاداربن کوشتن بە هەڵە، ئەوەیە بە قامچی و گۆچان کوژرابێت، لە ناو خوێنباییەکەدا چل دانەیان ئاوس بێت.**

**٤٧٩٨-** «عَنْ يَزِيدٍ، عَنْ خَالِدٍ، عَنِ الْقَاسِمِ بن رَبِيعَةَ، عَنْ يَعْقُوبَ بْنِ أَوْسٍ: أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ حَدَّثَهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ قَالَ: أَلَا وَإِنَّ قَتِيلَ الْخَطَإِ الْعَمْدِ قَتِيلَ السَّوْطِ وَالْعَصَا، مِنْهَا أَرْبَعُونَ فِي بُطُونِهَا أَوْلَادُهَا»(٢).

**واتە: یەزید دەگێڕێتەوە، لە خالدی حەذاء، لە قاسمی کوڕی ڕەبیعە، لە یەعقوبی کوڕی ئەوس، پیاوێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بۆی باس کرد، پێغەمبەر ﷺ هاتە مەککە لە ساڵی ئازاد کردنیدا، فەرمووی: ئاگاداربن کوشتنی هەڵە، ئەوەیە بە قامچی و گۆچان کوژرابێت، لە ناو خوێنباییەکەدا چل دانەیان ئاوس بێت.**

**٤٧٩٩-** «عَنِ ابْنِ جُدْعَانَ سَمِعَهُ مِنَ الْقَاسِمِ بن رَبِيعَةَ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ عَلَى دَرَجَةِ الْكَعْبَةِ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي صَدَقَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ، أَلَا إِنَّ قَتِيلَ الْعَمْدِ الْخَطَإِ بِالسَّوْطِ وَالْعَصَا شِبْهِ الْعَمْدِ، فِيهِ مِائَةٌ مِنَ الْإِبِلِ مُغَلَّظَةٌ، مِنْهَا أَرْبَعُونَ خَلِفَةً فِي بُطُونِهَا أَوْلَادُهَا»(٣).

**واتە: ئیبنو جەدعان دەگێڕێتەوە، ئەو بیستویەتی لە قاسمی کوڕی ڕەبیعە، لە ئیبنو عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا لەسەر پلیکانەکانی کەعبە وەستا، سوپاس و ستایشی خوای کرد و فەرمووی: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە پەیمانی ڕاستەو بەندەکەی خۆی**

---

**(١) صحيح لغيره.**

**(٢) صحيح لغيره.**

**(٣) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٤٥٤٩، وإبن ماجه: ٢٦٢٨.**




**سەرخست، بە تەنها هەموو حیزبەکانی تێکشکاند، ئاگاداربن کوشتنی نیمچە هەڵە ئەوەیە بە قامچی و گۆچان بێت، خوێن باییەکەی سەد وشتری ئەستورە، چل دانەیان ئاوس بێت.**

**٤٨٠٠-** «عَنْ حُمَيْدٍ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ رَبِيعَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْخَطَأُ شِبْهُ الْعَمْدِ، يَعْنِي بِالْعَصَا وَالسَّوْطِ مِائَةٌ مِنَ الإِبِلِ، مِنْهَا أَرْبَعُونَ فِي بُطُونِهَا أَوْلَادُهَا»[1].

**واتە: حومەید دەگێڕێتەوە، لە قاسمی کوڕی ڕەبیعە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کوشتنی نیمچە هەڵە، واتە: بە قامچی و گۆچان بێت، خوێنباییەکەی سەد وشترەو چل دانەیان ئاوس بێت.**

**٤٨٠١-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قُتِلَ خَطَأً فَدِيَتُهُ مِائَةٌ مِنَ الإِبِلِ ثَلَاثُونَ بِنْتَ مَخَاضٍ، وَثَلَاثُونَ بِنْتَ لَبُونٍ، وَثَلَاثُونَ حِقَّةً، وَعَشَرَةُ بَنِي لَبُونٍ ذُكُورٍ، قَالَ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُقَوِّمُهَا عَلَى أَهْلِ الْقُرَى أَرْبَعَ مِائَةِ دِينَارٍ أَوْ عِدْلَهَا مِنَ الْوَرِقِ، وَيُقَوِّمُهَا عَلَى أَهْلِ الإِبِلِ، إِذَا غَلَتْ رَفَعَ فِي قِيمَتِهَا، وَإِذَا هَانَتْ نَقَصَ مِنْ قِيمَتِهَا عَلَى نَحْوِ الزَّمَانِ، مَا كَانَ فَبَلَغَ قِيمَتُهَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، مَا بَيْنَ الأَرْبَعِ مِائَةِ دِينَارٍ إِلَى ثَمَانِ مِائَةِ دِينَارٍ أَوْ عِدْلِهَا مِنَ الْوَرِقِ، قَالَ: وَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنَّ مَنْ كَانَ عَقْلُهُ فِي الْبَقَرِ عَلَى أَهْلِ الْبَقَرِ مِائَتَيْ بَقَرَةٍ، وَمَنْ كَانَ عَقْلُهُ فِي الشَّاةِ أَلْفَيْ شَاةٍ، وَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنَّ الْعَقْلَ مِيرَاثٌ بَيْنَ وَرَثَةِ الْقَتِيلِ عَلَى فَرَائِضِهِمْ، فَمَا فَضَلَ فَلِلْعَصَبَةِ، وَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَعْقِلَ عَلَى الْمَرْأَةِ عَصَبَتُهَا مَنْ كَانُوا، وَلَا يَرِثُونَ مِنْهُ شَيْئاً إِلَّا مَا فَضَلَ عَنْ وَرَثَتِهَا، وَإِنْ قُتِلَتْ فَعَقْلُهَا بَيْنَ وَرَثَتِهَا وَهُمْ يَقْتُلُونَ قَاتِلَهَا»[2].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیرەی ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس بە هەڵە کوژرا، ئەوە خوێنەکەی سەد وشترە، سی دانەیان مێی یەک ساڵەیە، سی دانەی تریان نێرینەی دوو ساڵەیە، سێ دانەی تریان مێی سێ ساڵەیە، دە وشتری تریان نێرینەی دوو ساڵەیە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەڵکی شار دەیخەمڵاند بە چوارسەد دینار یان بە هاوشێوەی لە زیو، وە بۆ خاوەن**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٥٠٦ و ٤٥٤١ و ٤٥٤٢ و ٤٥٦٣ و ٤٥٦٤ و ٤٥٦٥ و ٤٥٨٣، والترمذي: ١٣٨٧، وإبن ماجه: ٢٦٢٦ و ٢٦٣٠ و ٢٦٤٤ و ٢٦٤٧ و ٢٦٥٣ و ٢٦٠٠.




وشترەکانیش دەیخەملاند، ئەگەر بەرزبوایەتەوە نرخەکەی بەرزدەکردەوە، وە ئەگەر داببەزیایە نرخەکەی دادەبەزاند بە گوێرەی سەردەم، جا لە سەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ نرخەکەی لە نێوان چوارسەد دینار بۆ هەشت سەد دینار بوو، یان هاوشێوەی ئەوە لە زیو، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد هەرکەس خوێنباییەکەی لەسەر مانگا بوو بۆ ئەوانەی کە مانگایان هەیە دووسەد مانگا دەکات، هەرکەسیش خوێنباییەکەی مەڕ بوو دوو هەزار مەڕ دەکات، وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد خوێنبایی میراتە لە نێوان میراتگری بکوژەکەدا بە پێی ئەو بەشانەی بۆیان دیاری کراوە، ئەوەیشی مایەوە بۆ پشتە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد خوێنی ئافرەت ئەو خزمانەی پشتی ئەون لە ئەستۆی دەگرن، وە هیچ لە میراتەکەی نابەن مەگەر بمێنێتەوە لە میراتگرەکانی، وە ئەگەر کوژرا خوێنەکەی لە نێوان میراتگرەکانیدایە، ئەوان بکوژەکەی دەکوژن.

## باسی خوێن بایی شکاندنی ددان بە هەڵە

**٤٨٠٢-** «عَنْ خِشْفِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ ﷺ يَقُولُ: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دِيَةَ الْخَطَإِ عِشْرِينَ بِنْتَ مَخَاضٍ، وَعِشْرِينَ ابْنَ مَخَاضٍ ذُكُوراً، وَعِشْرِينَ بِنْتَ لَبُونٍ، وَعِشْرِينَ جَذَعَةً، وَعِشْرِينَ حِقَّةً»(١).

واتە: خیشفی کوڕی مالیک دەڵێ: گوێم لە ئیبنو مەسعود ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد خوێنبایی کوشتنی هەڵە، بیست وشتری مێی یەک ساڵەو بیست وشتری نێرەی یەک ساڵەو بیست وشتری مێی دوو ساڵەو بیست وشتری مێی چوار ساڵەو بیست وشتری مێی سێ ساڵەیە.

## باسی دانانی خوێنبایی بە زیو

**٤٨٠٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَتَلَ رَجُلٌ رَجُلاً عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ دِيَتَهُ اثْنَيْ عَشَرَ أَلْفاً، وَذَكَرَ قَوْلَهُ: ﴿إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦ ٧٤﴾ التوبة، فِي أَخْذِهِمُ الدِّيَةَ»(٢).

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٥٤٥، والترمذي: ١٣٨٦، وإبن ماجه: ٢٦٣١.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٥٤٦، والترمذي: ١٣٨٨، وإبن ماجه: ٢٦٢٩ و ٢٦٣٢.




واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی کوشت، پێغەمبەر ﷺ خوێنبایی‌یەکەی بە دوازدە هەزار دانا، وە باسی فەرمایشتی خوای کرد: ﴿إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦۚ ٧٤﴾ (واتە: تەنها ئەوە نەبێ کە خواو پێغەمبەرەکەی بڕوادارانیان دەوڵەمەند کردوە لە بەهرەی خۆی). لەوەی خوێنبایی وەربگرن.

**٤٨٠٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَضَى بِاثْنَيْ عَشَرَ أَلْفاً يَعْنِي فِي الدِّيَةِ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە خوێنباییدا فەرمانی کرد بە دوازدە هەزار درهەم.

## خوێنبایی ئافرەت

**٤٨٠٥-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: عَقْلُ الْمَرْأَةِ مِثْلُ عَقْلِ الرَّجُلِ حَتَّى يَبْلُغَ الثُّلُثَ مِنْ دِيَتِهَا»[٢].

واتە: عەمرى کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوێنبایی ئافرەت وەکو خوێنبایی پیاو وایە، هەتا دەگاتە یەک لەسەر سێ لە خوێنبایی‌یەکەی.

## خوێنبایی بێبڕوا چەندە؟

**٤٨٠٦-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: عَقْلُ أَهْلِ الذِّمَّةِ نِصْفُ عَقْلِ الْمُسْلِمِينَ وَهُمُ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى»[٣].

واتە: عەمرى کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوێنبایی ئەو بێبڕوایانەی خاوەن پەیمانن نیوەی خوێنبایی مسوڵمانانە، ئەوانیش جولەکەو گاورەکانە.

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

(٣) حسن.




**٤٨٠٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: عَقْلُ الْكَافِرِ نِصْفُ عَقْلِ الْمُؤْمِنِ»[1].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوێنبایی بێبڕوا نیوەی خوێنبایی بڕوادارە.**

## خوێنبایی کۆیلەی نووسراو پێدراو بۆ ئازاد کردن

**٤٨٠٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الْمُكَاتَبِ يُقْتَلُ بِدِيَةِ الْحُرِّ عَلَى قَدْرِ مَا أَدَّى»[2].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دادگەری کرد لەبارەی کۆیلەی نووسراو پێدراو ئەگەر بکوژرێ خوێنبایی کەسێکی ئازاد وەردەگیرێ (لە بکوژەکە بۆ میراتگرەکانی) بە ئەندازەی ئەوەی داویەتی بە گەورەکەی بۆ ئازاد بوونی. (بۆ نموونە: ئەگەر کۆیلەی نووسراو پێدراو ڕێککەوت لەگەڵ گەورەکەی بە هەزار درهەم ئازادی بکات، دواتر کۆیلەکە پێنج سەد درهەمی دابوو بە گەورەکەی، ئینجا کەسێک کوشتی ئەوە دەبێ بکوژ خوێنبایی کەسێکی ئازاد بدات بە میرات گرەکەی بە ئەندازەی ئەو پارەی داویەتی بۆ ئازاد کردنی، واتە: دەبێ نیوەی خوێنبایی کەسێکی ئازاد بدات بە میرات گرەکەی کە دەکاتە پەنجا وشتر، وە خوێنبایی نیوەکەی تری بدات بە گەورەکە کە دەکاتە پێنج سەد درهەم).**

**٤٨٠٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَضَى فِي الْمُكَاتَبِ أَنْ يُودِي بِقَدْرِ مَا عَتَقَ مِنْهُ دِيَةَ الْحُرِّ»[3].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دادگەری کرد لەبارەی کۆیلەی نووسراو پێدراو بە ئەندازەی ئەوە میراتی کەسێکی ئازاد ببات کە داویەتی بە گەورەکەی. (بۆ نموونە: ئەگەر نیوەی پارەی نوسراوەکەی**

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٥٨١ و ٤٥٨٢، والترمذي: ١٢٥٩.

(٣) صحيح.




**دابوو بە گەورەکەی ئینجا باوکی مرد کەسی بەجێنەهێشتبوو جگە لە ئەو ئەوە نیوەی ماڵەکەی بە میرات دەبات).**

**٤٨١٠-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ في الْمُكَاتَبِ يُودي بِقَدْرِ ما أَدَّى من مُكَاتَبَتِهِ دِيَةَ الْحُرِّ وما بقى دِيَةَ الْعَبْدِ»[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دادگەری کرد لەبارەی کۆیلەی نووسراو پێدراو بە ئەندازەی ئەوە میراتی کەسێکی ئازاد ببات کە داویەتی بە گەورەکەی، ئەوەیشی ماوەتەوە خوێنبایی کویلەیە.**

**٤٨١١-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْمُكَاتَبُ يَعْتِقُ بِقَدْرِ مَا أَدَّى، وَيُقَامُ عَلَيْهِ الْحَدُّ بِقَدْرِ مَا عَتَقَ مِنْهُ، وَيَرِثُ بِقَدْرِ مَا عَتَقَ مِنْهُ»[2].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کۆیلەی نووسراو پێدراو ئازاد دەبێ بە ئەندازەی ئەوەی داویەتی (بە گەورەکەی بۆ ئازاد کردنی) سنوریشی بەسەردا جێبەجێ دەکرێ بە ئەندازەی ئەوەی پێی ئازادکراوە، وە میراتیش دەبات بە ئەندازەی ئەوەی پێی ئازادکراوە.**

**٤٨١٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ مُكَاتَباً قُتِلَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَمَرَ أَنْ يؤدي ما أَدَّى دِيَةَ الْحُرِّ وَمَالاً دِيَةَ الْمَمْلُوكِ»[3].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: کۆیلەیەکی نووسراو پێدراو کوژرا لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد (بکوژەکە) خوێنبایی کەسێکی ئازاد بدات بە ئەندازەی ئەوەی (کۆیلەکە) داویەتی بە گەورەکەی بۆ ئازاد کردنی، ئەوەیشی مایەوە خوێنبایی کۆیلەکە.**

**تێبینی: لە سوننی ئەبو داود هاتووە لە جیاتی وشەی (مالاً) (وما بَقي) هاتووە. بڕوانە یەکەم فەرموودە لە بەشی (دية المكاتب) فەرموودەی ژمارە: (٤٥٨١).**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## بابەت: خوێنبایی کۆرپەیەک لە ناو سکی دایکدا بێت

**٤٨١٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ امْرَأَةً حَذَفَتْ امْرَأَةً فَأَسْقَطَتْ فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي وَلَدِهَا خَمْسِينَ شَاةً، وَنَهَى يَوْمَئِذٍ عَنِ الْخَذْفِ»(١).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، ئافرەتێک بەردی هاوێشت بۆ ئافرەتێکی تر، منداڵەکەی پێ لەبار برد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد پەنجا مەڕ بدرێ لە بری منداڵەکەیدا، ئەو ڕۆژەش بەرد هاوێشتنی قەدەغەکرد.**

**٤٨١٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ ﷺ: أَنَّ امْرَأَةً خَذَفَتْ امْرَأَةً، فَأَسْقَطَتِ الْمَخْذُوفَةُ، فَرُفِعَ ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَجَعَلَ عَقْلَ وَلَدِهَا خَمْسَ مِائَةٍ مِنَ الْغُرِّ، وَنَهَى يَوْمَئِذٍ عَنِ الْخَذْفِ»(٢).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە ﷺ دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک بەردی هاوێشتە ئافرەتێکی دووگیان، گیانی لەدەستدا، ئەو کێشەیە بەرزکرایەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد پەنجا مەڕ بدرێ لەبری منداڵەکەیدا، ئەو ڕۆژەش بەرد هاوێشتنی قەدەغەکرد.**

**٤٨١٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى رَجُلاً يَخْذِفُ فَقَالَ: لَا تَخْذِفْ، فَإِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَنْهَى عَنِ الْخَذْفِ أَوْ يَكْرَهُ الْخَذْفَ»(٣).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موغەفەل ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێکی بینی بەردی دەهاوێشت، وتی: بەرد مەهاوێژە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە بەرد هاوێشتن، یان بەرد هاوێشتنی پێناخۆش بووە.**

**٤٨١٦-** «عَنْ طَاوُسٍ، أَنَّ عُمَرَ ﷺ اسْتَشَارَ النَّاسَ فِي الْجَنِينِ، فَقَالَ حَمَلُ بْنُ مَالِكٍ: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الْجَنِينِ غُرَّةً قَالَ طَاوُسٌ: إِنَّ الْفَرَسَ غُرَّةٌ»(٤).

---

(١) صحيح الإسناد . أخرجه أبو داود: ٤٥٧٨.

(٢) ضعيف الإسناد.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٧٩ و ٦٢٢٠، ومسلم: ٥٤ و ١٩٥٤/٥٦، وأبو داود: ٥٢٧٠، وإبن ماجه: ١٧ و ٣٢٢٦ و ٣٢٢٧.

(٤) صحيح.




**واتە: طاوس دەگێڕێتەوە، عومەر ﷺ ڕاوێژی کرد بە خەڵکی لە بارەی خوێنبایی کۆرپەلەوە، حەملی کوڕی مالیک وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد خوێنبایی کۆرپەلەیەک کۆیلەیەکە، طاوس دەڵێ: ئەسپێکیش دەشێت.**

**٤٨١٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي جَنِينِ امْرَأَةٍ مِنْ بَنِي لِحْيَانَ سَقَطَ مَيِّتاً بِغُرَّةٍ عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ، ثُمَّ إِنَّ الْمَرْأَةَ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا بِالْغُرَّةِ، تُوُفِّيَتْ، فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِأَنَّ مِيرَاثَهَا لِبَنِيهَا وَزَوْجِهَا، وَأَنَّ الْعَقْلَ عَلَى عَصَبَتِهَا»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد لە بارەی خوێنبایی کۆرپەلەی ژنێک لە نەوەکانی لیحیان مرد، بە کۆیلەیەکی چاک یان کەنیزەکێک، پاشان ئەو ئافرەتەی فەرمانی پێکرا بە خوێنبایی کۆیلەیەک، کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد میراتەکەی بۆ منداڵەکانی و مێردەکەیەتی، وە خوێنبابییەکەش لەسەر ئەو خزمانەیەتی کە پشتی ئەون.**

**٤٨١٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: اقْتَتَلَتِ امْرَأَتَانِ مِنْ هُذَيْلٍ، فَرَمَتْ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى بِحَجَرٍ، -وَذَكَرَ كَلِمَةً مَعْنَاهَا-، فَقَتَلَتْهَا وَمَا فِي بَطْنِهَا، فَاخْتَصَمُوا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ دِيَةَ جَنِينِهَا غُرَّةٌ عَبْدٌ أَوْ وَلِيدَةٌ، وَقَضَى بِدِيَةِ الْمَرْأَةِ عَلَى عَاقِلَتِهَا وَوَرَّثَهَا وَلَدَهَا وَمَنْ مَعَهُمْ، فَقَالَ حَمَلُ بْنُ مَالِكِ بْنِ النَّابِغَةِ الْهُذَلِيُّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ أُغَرَّمُ مَنْ لَا شَرِبَ، وَلَا أَكَلَ، وَلَا نَطَقَ، وَلَا اسْتَهَلَّ، فَمِثْلُ ذَلِكَ يُطَلَّ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا هَذَا مِنْ إِخْوَانِ الْكُهَّانِ مِنْ أَجْلِ سَجْعِهِ الَّذِي سَجَعَ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: دوو ئافرەت لە هۆزی هوزەیل شەڕیان کرد یەکێکیان بەردی گرتە ئەوی تریان -باسی وشەیەکی کرد ماناکەی بەم شێوە بوو- کوشتی ئەو منداڵەشی کە لە سکیدا بوو، ناکۆکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد خوێنی کۆرپەلەکەی بەندەیەکە یان کەنیزەکێک، وە فەرمانی کرد خوێنی ژنە کوژراوەکە لەسەر کەسوکاری ژنە بکوژەکەیە، وە خوێنەکەی کرد بە میراتی کوڕەکەی و ئەوانەی لەگەڵیدان، جا حەمەلەی کوڕی نابیغەی هوزەلی وتی: چۆن**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧٤٠ و ٦٩٠٩، ومسلم: ١٦٨١/٣٥، وأبو داود: ٤٥٧٧، والترمذي: ٢١١١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧٥٨ و ٥٧٥٩ و ٦٩٠٤ و ٦٩١٠، ومسلم: ٣٤ و ١٦٨١/٣٦، وأبو داود: ٤٥٧٦ و ٤٥٧٩، والترمذي: ١٤١٠، وإبن ماجه: ٢٦٣٩.




من خوێنی کەسێک بدەم نە ئاوی خواردووەو نە نان و نە قسەی کردوە، وە نەهاواری لێبیستراوە، خوێنی کەسێکی لەو جۆرە بە فیڕۆ چووەو حیسابی بۆ ناکرێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە لە برای جادوگەرەکانە، لەبەر ئەوەی ئەو قسانەی کە ڕێکی خستبوو، (لەبەر ئەوەی وەڵامی پێغەمبەری خوای پێدایەوە بۆیە وای پێ فەرموو).

**٤٨١٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ امْرَأَتَيْنِ مِنْ هُذَيْلٍ فِي زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَمَتْ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى، فَطَرَحَتْ جَنِينَهَا، فَقَضَى فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِغُرَّةٍ عَبْدٍ أَوْ وَلِيدَةٍ»[١].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: دوو ئافرەت لە هوزەیل لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێکیان بەردی هاویشتە ئەوی تریان منداڵەکەی پێ لەبار برد، پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی خوێنبایی کۆرپەلەکەی فەرمانی کرد بەندەیەک یان کەنیزەکێک بدرێت.

**٤٨٢٠-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى فِي الْجَنِينِ يُقْتَلُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ بِغُرَّةٍ عَبْدٍ أَوْ وَلِيدَةٍ فَقَالَ الَّذِي قَضَى عَلَيْهِ: كَيْفَ أُغَرَّمُ مَنْ لَا شَرِبَ، وَلَا أَكَلَ، وَلَا اسْتَهَلَّ، وَلَا نَطَقَ، فَمِثْلُ ذَلِكَ يُطَلَّ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا هَذَا مِنَ الْكُهَّانِ»[٢].

**واتە:** سەعیدی کوڕی موسیب دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی خوێنبایی کۆرپەلەی ناو سکی دایکەوە فەرمانی کرد بەندەیەک یان کەنیزەکێک، ئەو کەسەی فەرمانەکەی بەسەردا درابوو، وتی: خوێنی کەسێک بدەم نە ئاوی خواردووەو نە نان و، نەهاواری لێبیستراوە و نە قسەی کردوە، خوێنی کەسێکی لەو جۆرە بە فیڕۆ چووەو حیسابی بۆ ناکرێ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی ئەمە لە برای جادوگەرەکانە. (لەبەر ئەو قسانەی کە ڕێکی خستبوو، وە وەڵامی پێغەمبەری خوای ﷺ پێدایەوە).

**٤٨٢١-** «عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، أَنَّ امْرَأَةً ضَرَبَتْ ضَرَّتَهَا بِعَمُودِ فُسْطَاطٍ فَقَتَلَتْهَا، وَهِيَ حُبْلَى، فَأُتِيَ فِيهَا النَّبِيُّ ﷺ، فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى عَصَبَةِ الْقَاتِلَةِ بِالدِّيَةِ، وَفِي الْجَنِينِ غُرَّةً، فَقَالَ عَصَبَتُهَا: أَدِي مَنْ لَا طَعِمَ، وَلَا شَرِبَ، وَلَا صَاحَ فَاسْتَهَلَّ، فَمِثْلُ هَذَا يُطَلَّ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَسَجْعٌ كَسَجْعِ الْأَعْرَابِ؟»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٧ و ١٦٨٢/٣٨، وأبو داود: ٤٥٦٨ و ٤٥٦٩، والترمذي: ١٤١١، وإبن ماجه: ٢٦٣٣.




واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک بە کۆڵەکەی چادرێک دای لە هەوێکەی خۆی کوشتنی لەکاتێکدا دووگیان بوو، هێنرا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە کەس و کاری بکوژەکە کرد خوێنبایی بدەن، وە خوێنبایی منداڵەکەیش کۆیلەیەکە، جا کەس و کارەکەی وتیان: خوێنبایی کەسێک بدەین نە نانی خواردووەو نە ئاو نە قسەی کردووەو نە هاواری لێبیستراوە، خوێنی کەسێکی لەو جۆرە بە فیڕۆ چووەو حیسابی بۆ ناکرێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا ئەوە سەجعێک نیە وەک سەجعی دەشتەکیەکان). (واتە: قسەی ڕێکخستبوو وەڵامی پێغەمبەری خوای پێدایەوە).

## سیفاتی کوشتنی بە هەڵە لە خوێنبایی کۆرپەلەو
## باسی جیاوازی ئەوانەی فەرموودەکەی ئیبڕاهیمیان
## گێڕاوەتەوە لە عوبەیدی کوڕی نوزەیلە لە موغیرە

**٤٨٢٢**- «عَنْ جَرِير عَنْ منصور عَن إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ نُضَيْلَةَ الْخُزَاعِيِّ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ قَالَ: ضَرَبَتِ امْرَأَةٌ ضَرَّتَهَا بِعَمُودِ الْفُسْطَاطِ وَهِيَ حُبْلَى فَقَتَلَتْهَا، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دِيَةَ الْمَقْتُولَةِ عَلَى عَصَبَةِ الْقَاتِلَةِ، وَغُرَّةً لِمَا فِي بَطْنِهَا، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ عَصَبَةِ الْقَاتِلَةِ: أَنَغْرَمُ دِيَةَ مَنْ لَا أَكَلْ، وَلَا شَرِبَ، وَلَا اسْتَهَلَّ، فَمِثْلُ ذَلِكَ يُطَلَّ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَسَجْعٌ كَسَجْعِ الْأَعْرَابِ؟ فَجَعَلَ عَلَيْهِمُ الدِّيَةَ»(١).

واتە: جەریر دەگێڕێتەوە، لە مەنصور، لە ئیبڕاهیم، لە عوبەیدی کوڕی نوضەیلەی خوزاعی، لە موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: ئافرەتێک بە کۆڵەکەی چادرێک دای لە هەوێکەی خۆی و کوشتنی لە کاتێکدا دووگیان بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ خوێنی کوژراوەکەی لەسەر کەس و کارەکەی پێویست کرد کە پشتی بکوژەکە بوون، وە کۆیلەیەکیش لە بری ئەو کۆرپەلەی لە زگیدا مرد، پیاوێک لە کەس و کاری بکوژەکە وتی: ئایا خوێنبایی کەسێک بدەین نە نانی خواردووەو نە ئاو، نە هاواری لێبیستراوە، خوێنی کەسێکی لەو جۆرە بە فیڕۆ چووە و حیسابی بۆ ناکرێ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا ئەوە سەجعێک نیە وەک سەجعی دەشتەکیەکان. (واتە: قسەی ڕێکخستبوو وەڵامی پێغەمبەری خوای ﷺ پێدایەوە).

---

(١) صحيح.




**٤٨٢٣-** «عَنْ سفيان عن منصورعن إبْرَاهِيمَ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ نُضَيْلَةَ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، أَنَّ ضَرَّتَيْنِ ضَرَبَتْ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى بِعَمُودِ فُسْطَاطٍ، فَقَتَلَتْهَا، فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالدِّيَةِ عَلَى عَصَبَةِ الْقَاتِلَةِ، وَقَضَى لِمَا فِي بَطْنِهَا بِغُرَّةٍ، فَقَالَ الْأَعْرَابِيُّ: تُغَرِّمُنِي مَنْ لَا أَكَلْ، وَلَا شَرِبَ، وَلَا صَاحَ فَاسْتَهَلَّ، فَمِثْلُ ذَلِكَ يُطَلَّ؟ فَقَالَ: سَجْعٌ كَسَجْعِ الْجَاهِلِيَّةِ؟ وَقَضَى لِمَا فِي بَطْنِهَا بِغُرَّةٍ»[١].

**واته: سوفیان دەگێڕێتەوە، لە مەنصور، لە ئیبراهیم، لە عوبەیدی کوڕی نوضەیلە، لە موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ، دوو هەوێ یەکێکیان دای لە ئەوی تر بە کۆڵەکەی چادرێک و کوشتنی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە کەس و کاری بکوژەکە کرد خوێنبایی بدەن، وە فەرمانی کرد بە پێدانی کۆیلەیەک لە بری خوێنبایی ئەو کۆرپەلەیەی کە لە زگیدا بوو، کابرای دەشتەکی وتی: خوێنبایی کەسێکم لێ دەسەنی نە نانی خواردووەو نە ئاوو نە هاواری لێبیستراوە، خوێنی کەسێکی لەو جۆرە بە فیڕۆ چووە و حیسابی بۆ ناکرێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستی ئەمە سەجەعێکە وەک و سەجەعی سەردەمی نەفامی. (واتە: قسەی ڕێکخستبوو وەڵامی پێغەمبەری خوای ﷺ پێدایەوە).**

**٤٨٢٤-** «عَنْ إِسْرَائِيل، عَنْ مَنْصُور، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ نُضَيْلَةَ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ قَالَ: ضَرَبَتِ امْرَأَةٌ مِنْ بَنِي لِحْيَانَ ضَرَّتَهَا بِعَمُودِ الْفُسْطَاطِ فَقَتَلَتْهَا، وَكَانَ بِالْمَقْتُولَةِ حَمْلٌ، فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى عَصَبَةِ الْقَاتِلَةِ بِالدِّيَةِ، وَلِمَا فِي بَطْنِهَا بِغُرَّةٍ»[٢].

**واته: ئیسرائیل دەگێڕێتەوە، لە مەنصور، لە ئیبراهیم، لە عوبەیدی کوڕی نوضەیلە، لە موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: ئافرەتێک لە بەنی لیحیان دای لە هەوێکەی بە کۆڵەکەی چادرێک و کوشتنی، کوژراوەکەیش دووگیان بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە کەس و کاری بکوژەکە کرد خوێنبایی بدەن، وە کۆیلەیەکی چاکیش بدەن لە خوێنبایی ئەو منداڵەی کە لە سکیدایە.**

**٤٨٢٥-** «عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ نُضَيْلَةَ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، أَنَّ امْرَأَتَيْنِ كَانَتَا تَحْتَ رَجُلٍ مِنْ هُذَيْلٍ، فَرَمَتْ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى بِعَمُودِ فُسْطَاطٍ فَأَسْقَطَتْ، فَاخْتَصَمَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالُوا: كَيْفَ نَدِي مَنْ لَا صَاحَ، وَلَا اسْتَهَلَّ، وَلَا شَرِبَ، وَلَا أَكَلْ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَسَجْعٌ كَسَجْعِ الْأَعْرَابِ فَقَضَى بِالْغُرَّةِ عَلَى عَاقِلَةِ الْمَرْأَةِ»[٣].

---

**(١) صحيح.**
**(٢) صحيح.**
**(٣) صحيح.**




**واتە: شوعبە دەگێڕێتەوە، لە مەنصور، لە ئیبراهیم، لە عوبەیدی کوڕی نوضەیلە، لە موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ، دوو ئافرەت لە هۆزی هوزەیل ژنی پیاوێک بوون، یەکێکیان بە کۆڵەکەی چادرێک دای لە ئەوی تر و کۆرپەلەکەی پێ لەبار برد، ئەوانیش کێشەکەیان برد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وتیان: چۆن خوێنبایی کەسێک بدەین نە هاواری کردوەو نە دەنگی لێوەدەرهاتووەو نە ئاوی خواردوەو نە نان؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەمە سەجەعی کرد وەکو چۆن دەشتەکیەکان سەجەع دەکەن. (واتە: قسەی ڕێکخستبوو وەڵامی پێغەمبەری خوای ﷺ پێدایەوە) فەرمانی کرد بە کەس و کاری ئافرەتەکە لە خوێنبایی کۆرپەلەکە کۆیلەیەکی چاک بدەن.**

**٤٨٢٦-** «عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ مَنْصُورٍ، قَالَ: سمعتُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ نُضَيْلَةَ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ هُذَيْلٍ كَانَ لَهُ امْرَأَتَانِ، فَرَمَتْ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى بِعَمُودِ الْفُسْطَاطِ فَأَسْقَطَتْ، فَقِيلَ: أَرَأَيْتَ مَنْ لَا أَكَلَ، وَلَا شَرِبَ، وَلَا صَاحَ فَاسْتَهَلَّ؟ فَقَالَ: أَسَجْعٌ كَسَجْعِ الْأَعْرَابِ فَقَضَى فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِغُرَّةٍ عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ، وَجُعِلَتْ عَلَى عَاقِلَةِ الْمَرْأَةِ»[١].

**واتە: : شوعبە دەگێڕێتەوە، لە مەنصورەوە دەڵێ: گوێم لە ئیبراهیم بوو، لە عوبەیدی کوڕی نوضەیلە، لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە ﷺ، پیاوێک لە هوزەیل دوو ژنی هەبوو، یەکێکیان بە کۆڵەگەی چادرێک دای لە ئەویترو کۆرپەلەکەی پێ لەبار برد، وترا: ئایا ڕات چیە دەربارەی ئەو منداڵەی نە نانی خواردوەو نە ئاوو نە هاواری کردوەو نە دەنگی لێوە هاتووە؟ فەرمووی: ئەمە سەجەعی کرد وەکو سەجەعی دەشتەکیەکان. (واتە: قسەی ڕێکخستبوو وەڵامی پێغەمبەری خوای ﷺ پێدایەوە) فەرمانی کرد بە کەسوکاری ئافرەتەکە لە خوێن بایی کۆرپەلەکە کۆیلەیەک یان کەنیزەکێکی چاک بدەن.**

**٤٨٢٧-** «عَنْ دَاوُدَ، عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: ضَرَبَتِ امْرَأَةٌ ضَرَّتَهَا بِحَجَرٍ وَهِيَ حُبْلَى فَقَتَلَتْهَا، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَا فِي بَطْنِهَا غُرَّةً، وَجَعَلَ عَقْلَهَا عَلَى عَصَبَتِهَا، فَقَالُوا: نُغَرَّمُ مَنْ لَا شَرِبَ، وَلَا أَكَلَ، وَلَا اسْتَهَلَّ، فَمِثْلُ ذَلِكَ يُطَلُّ؟ فَقَالَ: أَسَجْعٌ كَسَجْعِ الْأَعْرَابِ هُوَ مَا أَقُولُ لَكُمْ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره.




واتە: داود دەگێڕێتەوە، لە ئەعمەش لە ئیبراهیمەوە دەڵێ: ئافرەتێک بە بەردێک دای لە هەوێکەی و کوشتی، لە کاتێکدا ئەو دووگیان بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە پێدانی کۆیلەیەک لە بری ئەو کۆرپەلەی لە زگیدا بوو، خوێن بایەکەیشی لەسەر کەس و کارەکەی پێویست کرد کە پشتی بوون، وتیان: خوێنبایی کەسێک بدەین نە نانی خواردوەو نە ئاوو نە دەنگی لێوەدەرهاتووە، خوێنی کەسێکی لەو جۆرە بە فیڕۆ چووەو حیسابی بۆ ناکرێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا ئەوە سەجعێک نیە وەک سەجعی دەشتەکیەکان، بڕیار هەر ئەوەیە کە پێتان دەڵێم.

**٤٨٢٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَتِ امْرَأَتَانِ جَارَتَانِ كَانَ بَيْنَهُمَا صَخَبٌ، فَرَمَتْ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى بِحَجَرٍ فَأَسْقَطَتْ غُلَاماً، قَدْ نَبَتَ شَعْرُهُ مَيْتاً، وَمَاتَتِ الْمَرْأَةُ، فَقَضَى عَلَى الْعَاقِلَةِ الدِّيَةَ فَقَالَ عَمُّهَا: إِنَّهَا قَدْ أَسْقَطَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ غُلَاماً قَدْ نَبَتَ شَعْرُهُ، فَقَالَ أَبُو الْقَاتِلَةِ: إِنَّهُ كَاذِبٌ، إِنَّهُ وَاللَّهِ مَا اسْتَهَلَّ، وَلَا شَرِبَ، وَلَا أَكَلَ، فَمِثْلُهُ يُطَلّ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَسَجْعٌ كَسَجْعِ الْجَاهِلِيَّةِ، وَكِهَانَتِهَا إِنَّ فِي الصَّبِيِّ غُرَّةً، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: كَانَتْ إِحْدَاهُمَا مُلَيْكَةَ، وَالْأُخْرَى أُمَّ غَطِيفٍ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس دەڵێ: دوو ئافرەت بە شەڕ هاتن و هاواریان لێ هەڵسا، دانەیەکیان بە بەرد دای لە ئەویتریان کۆرپەلەکەی پێ لەبار برد، کۆرپەلەکە قژی دەرهاتبوو، هەروەها ئافرەتەکەیش مرد، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمانی کرد بە کەس و کار و پشتی بکوژەکە خوێنبایی بدەن، مامی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئافرەتە کۆرپەلەیەکی لە بارچووە قژی هاتبوو، باوکی بکوژەکەیش وتی: ئەو درۆ دەکات، سوێند بە خوا ئەو کۆرپەلەیە نە دەنگی لێ هاتبوو، نە ئاوی خواردبوو نە نان، وە هاوشێوەی شتێکی لەو جۆرە حیسابی بۆ ناکرێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا ئەوە سەجعێک نیە وەک سەجعی سەردەمی نەفامی و جادووگەرەکانیان، بێگومان لە بری کۆرپەلەکە کۆیلەیەک دەبێ بدرێ. ئیبنو عەبباس دەڵێ: یەکێکیان مولەیکە بوو ئەویتریان دایکی غەطیف.

**٤٨٢٩-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: كَتَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى كُلِّ بَطْنٍ عُقُولَةً، وَلَا يَحِلُّ لِمَوْلًى أَنْ يَتَوَلَّى مُسْلِماً بِغَيْرِ إِذْنِهِ»[2].

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٤٥٧٤.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٥٨٦، وإبن ماجه: ٢٦٦٣.




واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوسراوێکی کرد بۆ هەر کۆرپەلەیەک خوێنباییەکی دانا، وە حەڵاڵ نیە بۆ کۆیلەیەک مسوڵمانێک بکات بە سەید و سەرپەرشتیاری خۆی بەبێ مۆڵەت لێوەرگرتنی.

**٤٨٣٠-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ تَطَبَّبَ وَلَمْ يُعْلَمْ مِنْهُ طِبٌّ قَبْلَ ذَلِكَ فَهُوَ ضَامِنٌ»[١].

واتە: عەمرِی کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس خۆی بکات بە پزیشک و شارەزایی لێ نەبێ پێش ئەوە، ئەوە دەبێ زەمانەتی (بەرپرسیاریەتی) لە ئەستۆ بگرێ.

**٤٨٣١-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ مِثْلَهُ سَوَاءً»[٢].

واتە: عەمرِی کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باپیرەیەوە ﷺ هەروەکو ئەو فەرموودەی پێشووە.

## ئایا کەسێک تاوانی غەیری خۆی هەڵدەگرێ

**٤٨٣٢-** «عَنْ أَبِي رِمْثَةَ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ مَعَ أَبِي فَقَالَ: مَنْ هَذَا مَعَكَ؟ قَالَ: ابْنِي، أَشْهَدُ بِهِ، قَالَ: أَمَا إِنَّكَ لَا تَجْنِي عَلَيْهِ، وَلَا يَجْنِي عَلَيْكَ»[٣].

واتە: ئەبو ڕەمثە ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ باوکمدا فەرمووی: ئەمە کێیە لەگەڵتدا؟ وتی: کوڕەکەمە، شایەتی دەدەم، فەرمووی: بەڵام نە تۆ تاوانی ئەو هەڵدەگری، وە نە ئەویش تاوانی تۆ هەڵدەگرێ.

**٤٨٣٣-** «عَنْ ثَعْلَبَةَ بْنِ زَهْدَمٍ الْيَرْبُوعِيِّ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ فِي أُنَاسٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَؤُلَاءِ بَنُو ثَعْلَبَةَ بْنِ يَرْبُوعٍ قَتَلُوا فُلَاناً فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ وَهَتَفَ بِصَوْتِهِ: أَلَا لَا تَجْنِي نَفْسٌ عَلَى الْأُخْرَى»[٤].

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٥٨٦، وإبن ماجه: ٣٤٦٦.

(٢) حسن.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




واتە: ثەعلەبەی کوڕی زەهدەمی یەربوعی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو کۆمەڵێک لە ئەنصارەکان وتاری دەدا، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمانە نەوەی ثەعلەبەی کوڕی یەربوعن لە سەردەمی نەفامیدا فلانە کەسیان کوشت، پێغەمبەر ﷺ بە دەنگی بەرز فەرمووی: ئاگادارىن هیچ کەسێک تاوانی کەسێکی تر هەڵناگرێ.

**٤٨٣٤-** «عَنْ ثَعْلَبَةَ بْنِ زَهْدَمٍ ﷺ قَالَ: انْتَهَى قَوْمٌ مِنْ بَنِي ثَعْلَبَةَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يَخْطُبُ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَؤُلَاءِ بَنُو ثَعْلَبَةَ بْنِ يَرْبُوعٍ قَتَلُوا فُلَاناً رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَا تَجْنِي نَفْسٌ عَلَى أُخْرَى»(١).

واتە: ثەعلەبەی کوڕی زەهدەم ﷺ دەڵێ: خەڵکانێک لە نەوەکانی ثەعلەبە هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا ئەو وتاری دەدا، پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە نەوەی ثەعلەبەی کوڕی یەربوعن فلانە کەسیان کوشت کە یەکێک بوو لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیچ کەسێک تاوانی کەسێکی تر هەڵناگرێ.

**٤٨٣٥-** «عَنِ الْأَسْوَدِ بْنِ هِلَالٍ، يُحَدِّثُ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي ثَعْلَبَةَ بْنِ يَرْبُوعٍ، أَنَّ نَاساً مِنْ بَنِي ثَعْلَبَةَ أَتَوْا النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَؤُلَاءِ بَنُو ثَعْلَبَةَ بْنِ يَرْبُوعٍ قَتَلُوا فُلَاناً رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَا تَجْنِي نَفْسٌ عَلَى أُخْرَى»(٢).

واتە: ئەسوەدی کوڕی هیلال دەگێڕێتەوە: لە پیاوێک لە نەوەکانی ثەعلەبەی کوڕی یەربوع، خەڵکانێک لە نەوەکانی ثەعلەبە هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە نەوەی ثەعلەبەی کوڕی یەربوعن فلانە کەسیان کوشت کە یەکێک بوو لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیچ کەسێک تاوانی کەسێکی تر هەڵناگرێ.

**٤٨٣٦-** «عَنِ الْأَسْوَدِ بْنِ هِلَالٍ ﷺ، وَكَانَ قَدْ أَدْرَكَ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي ثَعْلَبَةَ بْنِ يَرْبُوعٍ أَنَّ نَاساً مِنْ بَنِي ثَعْلَبَةَ أَصَابُوا رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَؤُلَاءِ بَنُو ثَعْلَبَةَ قَتَلَتْ فُلَاناً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَجْنِي نَفْسٌ عَلَى أُخْرَى، قَالَ شُعْبَةُ: أَيْ لَا يُؤْخَذُ أَحَدٌ بِأَحَدٍ وَاللَّهُ تَعَالَى أَعْلَمُ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.





**واتە: ئەسوەدی کوڕی هیلال ﷺ دەگێڕێتەوە: یەکێک بوو لەوانەی گەیشتبوو بە پێغەمبەر ﷺ، لە پیاوێک لە نەوەکانی ثەعلەبەی کوڕی یەربوع، خەڵکانێک لە نەوەکانی ثەعلەبە یەکێک لە هاوەڵەکانی پێغەمبەریان کوشت، پیاوێک لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە نەوەی ثەعلەبەن فلانە کەسیان کوشت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ کەسێک تاوانی کەسێکی دیکە هەڵناگرێ. شوعبە وتی: واتە هیچ کەسێک بە کەسێکی دیکە ناکوژرێ. خوا زاناترە.**

**٤٨٣٧-** «عَنِ الْأَشْعَثِ بْنِ سُلَيْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ رَجُلٍ، مِنْ بَنِي ثَعْلَبَةَ بْنِ يَرْبُوعٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ يَتَكَلَّمُ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَؤُلَاءِ بَنُو ثَعْلَبَةَ بْنِ يَرْبُوعٍ الَّذِينَ أَصَابُوا فُلَاناً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يَعْنِي: لَا تَجْنِي نَفْسٌ عَلَى نَفْسٍ»[١].

**واتە: ئەشعەثی کوڕی سولەیم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە پیاوێک لە نەوەکانی ثەعلەبەی کوڕی یەربوع ﷺ، وتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا ئەو قسەی دەکرد، پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە نەوەی ثەعلەبەی کوڕی یەربوعن فلانە کەسیان کوشتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ کەسێک تاوانی کەسێکی تر هەڵناگرێ.**

**٤٨٣٨-** «عَنْ أَشْعَثَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ رَجُلٍ، مِنْ بَنِي يَرْبُوعٍ قَالَ: أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يُكَلِّمُ النَّاسَ، فَقَامَ إِلَيْهِ نَاسٌ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَؤُلَاءِ بَنُو فُلَانٍ الَّذِينَ قَتَلُوا فُلَاناً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَجْنِي نَفْسٌ عَلَى أُخْرَى»[٢].

**واتە: ئەشعەث دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە پیاوێک لە نەوەکانی یەربوع وتی: هاتین بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا ئەو قسەی بۆ خەڵکی دەکرد، خەڵکانێک هەڵسان و وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە نەوەکانی فلانە کەسن کە فلانیان کوشت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ کەسێک تاوانی کەسێکی تر هەڵناگرێ.**

**٤٨٣٩-** «عَنْ طَارِقٍ الْمُحَارِبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَؤُلَاءِ بَنُو ثَعْلَبَةَ الَّذِينَ قَتَلُوا فُلَاناً فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَخُذْ لَنَا بِثَأْرِنَا، فَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى رَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ، وَهُوَ يَقُولُ: لَا تَجْنِي أُمٌّ عَلَى وَلَدٍ، مَرَّتَيْنِ»[٣].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٢٦٧٠.**




واتە: طارِقی موحاریبی ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە نەوەکانی ثەعلەبەن ئەوانەی کە فڵانە کەسیان کوشت لە سەردەمی نەفامیدا ڕێگەمان بدە با تۆڵەی خۆمان بکەینەوە، دەستی بەرز کردەوە هەتا سپیایی بن باڵی دەرکەوت، دەیفەرموو: دایک تاوانی منداڵەکەی هەڵناگرێ، دووجار ئەمەی فەرموو.

## خوێنبایی چاوێک کە کوێر بکرێ بەڵام تێک نەچێت و ڕوخساری تێک نەدات

**٤٨٤٠-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى فِي الْعَيْنِ الْعَوْرَاءِ السَّادَّةِ لِمَكَانِهَا إِذَا طُمِسَتْ بِثُلُثِ دِيَتِهَا، وَفِي الْيَدِ الشَّلَّاءِ إِذَا قُطِعَتْ بِثُلُثِ دِيَتِهَا، وَفِي السِّنِّ السَّوْدَاءِ إِذَا نُزِعَتْ بِثُلُثِ دِيَتِهَا»[1].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەیەوە ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە یەک لەسەر سێی خوێنبایی لە بارەی چاوێکی کوێر کراو، بەڵام لە شوێنی خۆیدا مابێت و جوانی ڕوخساری تێک نەدابێت، هەروەها سێیەکی خوێنبایی لە دەستێکدا بڕابێتەوەو، توانای کاری نەمابێت، وە سێیەکی خوێنباییش لە ددانێکدا ئەگەر دەربهێنرێ.

## خوێنبایی ددانەکان

**٤٨٤١-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فِي الْأَسْنَانِ خَمْسٌ مِنَ الْإِبِلِ»[2].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیریەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوێنبایی (هەر ددانێک لە) ددانەکان پێنج وشترە.

**٤٨٤٢-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْأَسْنَانُ سَوَاءٌ خَمْساً خَمْساً»[3].

---

(١) حسن إن كان العلاء بن الحارث حدص به قبل الاختلاط. أخرجه أبو داود: ٤٥٦٧.

(٢) حسن صحيح.

(٣) حسن صحيح.




واتە: عەمرى كوڕى شوعەيب دەگێڕێتەوە، لە باوكى، لە باپيريەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى: خوێنبايى ددانەكان هەموويان وەكو يەک وايە، بۆ هەر ددانێک پێنج وشترە.

## بابەت: خوێنبایی پەنجەکانی

٤٨٤٣- «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: فِي الْأَصَابِعِ عَشْرٌ عَشْرٌ»[١].

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتى: خوێنبايى لە پەنجەكاندا دە وشتر دە وشتر (واتە: بۆ هەر پەنجەيەک دە وشترە، كە دەكاتە سەد سەر مەڕ).

٤٨٤٤- «عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْأَصَابِعُ سَوَاءٌ عَشْراً عَشْراً»[٢].

واتە: ئەبو موساى ئەشعەرى ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى: خوێنبايى پەنجەكان يەكسانە بۆ پەنجەيەک لە پەنجەكان دە وشترە.

٤٨٤٥- «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ الْأَصَابِعَ سَوَاءٌ عَشْراً عَشْراً مِنَ الْإِبِلِ»[٣].

واتە: ئەبو موساى ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرى خوا ﷺ دادوەرى كرد بەوەى خوێنبايى پەنجەكان يەكسانە بۆ پەنجەيەک لە پەنجەكان دە وشترە.

٤٨٤٦- «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، أَنَّهُ لَمَّا وُجِدَ الْكِتَابُ الَّذِي عِنْدَ آلِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ الَّذِي ذَكَرُوا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَتَبَ لَهُمْ وَجَدُوا فِيهِ: وَفِيمَا هُنَالِكَ مِنَ الْأَصَابِعِ عَشْراً عَشْراً»[٤].

واتە: سەعيدى كوڕى موسەييب دەگێڕێتەوە، كاتێ ئەو كتێبە بينرايەوە كە لاى خانەوادەى عەمرى كوڕى حەزم بوو، كە باسيان كردبوو پێغەمبەرى خوا ﷺ نوسراوى بۆ كردبوون، تيايدا بينيان: خوێنبايى پەنجەكان وەكو يەكترن، بۆ هەر پەنجەيەک دە وشترە بەبێ جياوازى.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٥٥٦ و ٤٥٥٧، وإبن ماجه: ٢٦٥٤.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح.

**٤٨٤٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: هَذِهِ وَهَذِهِ سَوَاءٌ يَعْنِي الْخِنْصَرَ وَالْإِبْهَامَ»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەم پەنجەو ئەو پەنجە لە تۆڵەسەندنەوەدا وەکو یەک وان. واتە: پەنجە تووتەو پەنجە گەورە. (ئەسپێ کوژە).**

**٤٨٤٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: فَهَذِهِ وَهَذِهِ سَوَاءٌ الْإِبْهَامُ وَالْخِنْصَرُ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئەم پەنجەو ئەو پەنجە لە تۆڵەسەندنەوەدا وەکو یەک وان. پەنجە تووتەو پەنجە گەورە (ئەسپێ کوژە).**

**٤٨٤٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: الْأَصَابِعُ عَشْرٌ عَشْرٌ»[٣].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: خوێنبایی هەر دە پەنجەکە وەکو یەکتر وایە. (بۆ هەر پەنجەیەک لە پەنجەکان دە وشترە).**

**٤٨٥٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَمَّا افْتَتَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَكَّةَ قَالَ فِي خُطْبَتِهِ: وَفِي الْأَصَابِعِ عَشْرٌ عَشْرٌ»[٤].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ مەککەی ڕزگار کرد لە وتارەکەیدا فەرمووی: خوێنبایی لە پەنجەکاندا دە وشتر دە وشتر (واتە: بۆ هەر پەنجەیەک دە وشترە).**

**٤٨٥١-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ فِي خُطْبَتِهِ وَهُوَ مُسْنِدٌ ظَهْرَهُ إِلَى الْكَعْبَةِ: الْأَصَابِعُ سَوَاءٌ»[٥].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ پاڵی دابووە کەعبەوە لە وتارەکەیدا فەرمووی: خوێنبایی هەموو پەنجەکان یەکسانن. (بۆ هەر پەنجەیەک لە پەنجەکان دە وشترە).**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٨٩٥، وأبو داود: ٤٥٥٨ و ٤٥٦٠، والترمذي: ١٣٩١ و ١٣٩٢، وإبن ماجه: ٢٦٥٠ و ٢٦٥٢.

(٢) صحيح الإسناد موقوف.

(٣) صحيح الإسناد موقوف.

(٤) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٥٦٢.

(٥) حسن صحيح.

## خوێنبایی (الْمَوَاضِحُ) ئەو برینەی کە گەیشتۆتە سەر ئێسقان و ئێسقانەکەی بەدەرکەوتووە

**٤٨٥٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: لَمَّا افْتَتَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَكَّةَ قَالَ فِي خُطْبَتِهِ: وَفِي الْمَوَاضِحِ خَمْسٌ خَمْسٌ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ مەککەی ڕزگارکرد لە وتارەکەیدا فەرمووی: خوێنبایی ئەو برینەی گەیشتۆتە سەر ئێسقان پێنج وشترە.**

## باسی فەرموودەی عەمری کوڕی حەزم لەبارەی خوێنباییەکان، وە جیاوازی ئەوانەی لێیەوە گواستویانەتەوە.

**٤٨٥٣-** «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَتَبَ إِلَى أَهْلِ الْيَمَنِ كِتَاباً فِيهِ الْفَرَائِضُ وَالسُّنَنُ وَالدِّيَاتُ، وَبَعَثَ بِهِ مَعَ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، فَقُرِأَتْ عَلَى أَهْلِ الْيَمَنِ هَذِهِ نُسْخَتُهَا: مِنْ مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ ﷺ إِلَى شُرَحْبِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ، وَنُعَيْمِ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ، وَالْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ قَيْلِ ذِي رُعَيْنٍ وَمَعَافِرَ وَهَمْدَانَ أَمَّا بَعْدُ، وَكَانَ فِي كِتَابِهِ أَنَّ مَنْ اعْتَبَطَ مُؤْمِناً قَتْلاً عَنْ بَيِّنَةٍ، فَإِنَّهُ قَوَدٌ إِلَّا أَنْ يَرْضَى أَوْلِيَاءُ الْمَقْتُولِ، وَأَنَّ فِي النَّفْسِ الدِّيَةَ مِائَةً مِنَ الْإِبِلِ، وَفِي الْأَنْفِ إِذَا أُوعِبَ جَدْعُهُ الدِّيَةُ وَفِي اللِّسَانِ الدِّيَةُ، وَفِي الشَّفَتَيْنِ الدِّيَةُ وَفِي الْبَيْضَتَيْنِ الدِّيَةُ، وَفِي الذَّكَرِ الدِّيَةُ وَفِي الصُّلْبِ الدِّيَةُ، وَفِي الْعَيْنَيْنِ الدِّيَةُ وَفِي الرِّجْلِ الْوَاحِدَةِ نِصْفُ الدِّيَةِ، وَفِي الْمَأْمُومَةِ ثُلُثُ الدِّيَةِ، وَفِي الْجَائِفَةِ ثُلُثُ الدِّيَةِ، وَفِي الْمُنَقِّلَةِ خَمْسَ عَشْرَةَ مِنَ الْإِبِلِ، وَفِي كُلِّ أُصْبُعٍ مِنْ أَصَابِعِ الْيَدِ وَالرِّجْلِ عَشْرٌ مِنَ الْإِبِلِ، وَفِي السِّنِّ خَمْسٌ مِنَ الْإِبِلِ، وَفِي الْمُوضِحَةِ خَمْسٌ مِنَ الْإِبِلِ، وَأَنَّ الرَّجُلَ يُقْتَلُ بِالْمَرْأَةِ وَعَلَى أَهْلِ الذَّهَبِ أَلْفُ دِينَارٍ، خَالَفَهُ مُحَمَّدُ بْنُ بَكَّارِ بْنِ بِلَالٍ»[٢].

**واتە: ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ نوسراوێکی بۆ خەڵکی یەمەن کرد**

---

(١) حسن صحيح.

(٢) ضعيف.




تیایدا باسی میرات و سنوورەکان و خوێنباییەکانی کرد، لەگەڵ عەمری کوڕی حەزم نوسراوەکەی ڕەوانە کرد، بۆ خەڵکی یەمەن خوێنرایەوە ئەمەش دەقی لەبەرگیراوی نوسراوەکەیەتی: لە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوا بۆ شورەحبیلی کوڕی عەبدو کولال و نوعەیمی کوڕی کولال حارثی کوڕی کولال، سەرپەشتیاری روعەین و مەعافیرو هەمدان، پاشان: لە نوسراوەکەیدا نوسرابوو هەرکەس بە کوێرانە بڕواداریکی کوشت بە بەڵگەوە، ئەوە تۆڵەی لێدەکرێتەوە مەگەر خاوەنی کوژراوەکە ڕازی بن، وە لە جیاتی نەفسێک سەد وشتر خوێنبایی دەدرێت، وە لە بڕینی لووت و زمان و لێوو هەردوو هێلکەی گون و چووک و پشت و هەردوو چاو خوێنبایی تەواو هەیە، وە لە یەک قاچدا نیو خوێنبایی هەیە، وە لە لێدانێک برینەکەی بگاتە مێشک، یان ناو سەر، یان ناو زگ ئەوە خوێنباییەکەی یەک لەسەر سێیە، وە لێدانێک کە ئێسک بشکێنێ دە وشتر خوێنباییەکەیەتی، هەروەها لە هەر پەنجەیەک لە پەنجەکانی دەست و قاچدا دە وشتر خوێنباییە، لە ددانەکانیشدا پێنج وشتر خوێنباییە، وە لێدانێک برینەکەی بگاتە سەر ئێسقان پێنج وشتر خوێنباییە، بێگومان پیاو بە ئافرەت دەکوژرێتەوە، لەسەر ئەوانەی کە خاوەن ئاڵتونن هەزار دینار خوێنباییەکەیەتی.

**٤٨٥٤-** «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَتَبَ إِلَى أَهْلِ الْيَمَنِ بِكِتَابٍ فِيهِ الْفَرَائِضُ وَالسُّنَنُ وَالدِّيَاتُ، وَبَعَثَ بِهِ مَعَ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، فَقُرِئَ عَلَى أَهْلِ الْيَمَنِ هَذِهِ نُسْخَتُهُ فَذَكَرَ مِثْلَهُ إِلَّا أَنَّهُ قَالَ: وَفِي الْعَيْنِ الْوَاحِدَةِ نِصْفُ الدِّيَةِ، وَفِي الْيَدِ الْوَاحِدَةِ نِصْفُ الدِّيَةِ وَفِي الرِّجْلِ الْوَاحِدَةِ نِصْفُ الدِّيَةِ»[1].

واتە: ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم، لە باوکی، لە باپیرەی رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نوسراوی کرد بۆ خەڵکی یەمەن بە نوسراوێک کە میرات و سنوورەکان و خوێنباییەکانی تێدا بوو، لەگەڵ عەمری کوڕی حەزمدا ناردی، بەسەر خەڵکی یەمەندا خوێندرایەوە، ئەمەش لەبەر گیراوەکەیەتی، هەروەکو فەرموودەکەی پێشووی باس کرد ئەوە نەبێ وتی: لە یەک چاودا نیو خوێنبایی هەیە، لە یەک دەستیشدا نیو خوێنبایی، لە یەک قاچیشدا نیو خوێنبایی.

---

(١) ضعيف.




**٤٨٥٥-** «عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: قَرَأْتُ كِتَابَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الَّذِي كَتَبَ لِعَمْرِو بْنِ حَزْمٍ حِينَ بَعَثَهُ عَلَى نَجْرَانَ، وَكَانَ الْكِتَابُ عِنْدَ أَبِي بَكْرِ بْنِ حَزْمٍ، فَكَتَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: هَذَا بَيَانٌ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِ ۝١﴾ المائدة، وَكَتَبَ الْآيَاتِ مِنْهَا حَتَّى بَلَغَ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ۝١٩٩﴾ آل عمران، ثُمَّ كَتَبَ: هَذَا كِتَابُ الْجِرَاحِ فِي النَّفْسِ مِائَةٌ مِنَ الْإِبِلِ نَحْوَهُ»[١].

**واتە: ئیبنو شیهاب دەڵێ: نوسراوی پێغەمبەری خوام ﷺ خوێندەوە کە نوسیبووی بۆ عەمری کوڕی حەزم کاتێک کە ناردی بۆ نەجران، ئەو نوسراوە لای ئەبو بەکری کوڕی حەزم بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ نوسی: ئەمە ڕوونکردنەوەیەکە لە لایەن خواو پێغەمبەرەکەیەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِ ۝١﴾ (واتە: ئەی بڕواداران بەڵێنەکانتان ببەنە سەر)، وە چەند ئایەتێکی نوسی تیایدا هەتا گەیشتە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ۝١٩٩﴾ (واتە: بێگومان خوا لێپرسینەوەی خێرایە)، پاشان نوسی ئەمە نوسراوی ئەوەیە هەرکەس کەسێک بکوژێت سەد وشتر خوێنباییەکەیەتی.**

**٤٨٥٦-** «عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: جَاءَنِي أَبُو بَكْرِ بْنُ حَزْمٍ بِكِتَابٍ فِي رُقْعَةٍ مِنْ أَدَمٍ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: هَذَا بَيَانٌ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِ ۝١﴾ المائدة، فَتَلَا مِنْهَا آيَاتٍ، ثُمَّ قَالَ: فِي النَّفْسِ مِائَةٌ مِنَ الْإِبِلِ، وَفِي الْعَيْنِ خَمْسُونَ، وَفِي الْيَدِ خَمْسُونَ، وَفِي الرِّجْلِ خَمْسُونَ، وَفِي الْمَأْمُومَةِ ثُلُثُ الدِّيَةِ، وَفِي الْجَائِفَةِ ثُلُثُ الدِّيَةِ، وَفِي الْمُنَقِّلَةِ خَمْسَ عَشْرَةَ فَرِيضَةً، وَفِي الْأَصَابِعِ عَشْرٌ عَشْرٌ، وَفِي الْأَسْنَانِ خَمْسٌ خَمْسٌ، وَفِي الْمُوضِحَةِ خَمْسٌ»[٢].

**واتە: زوهری دەڵێ: ئەبو بەکری کوڕی حەزم هات بۆ لام بە نوسراوێک لەسەر پارچە پێستێک نوسرا بوو، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ: ئەوە ڕوونکردنەوەیە لە لایەن خواو پێغەمبەرەکەیەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِ ۝١﴾ (واتە: ئەی بڕواداران بەڵێنەکانتان ببەنە سەر)، چەند ئایەتێکی خوێندەوە پاشان فەرمووی: لە هەر نەفسێکدا سەد وشتر خوێنبایی هەیە، لە چاویشدا پەنجا، لە دەستیشدا پەنجا، لە قاچدا، پەنجا، وە لە لێدانێک برینەکەی بگاتە مێشک، یان ناو سەر یەک لەسەر سێ خوێنبایی هەیە، وە لێدانێک کە ئێسک بشکێنێ پازدە وشتر خوێنباییەکەیەتی،**

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.




هەروەها لە هەر پەنجەیەک لە پەنجەکانی دەست و قاچدا دە وشتر خوێنباییە، وە لە هەر یەکێک لە ددانەکان پێنج وشتر، وە لە برینێک بگاتە سەر ئێسک پێنج وشتر.

**٤٨٥٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: الْكِتَابُ الَّذِي كَتَبَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِعَمْرِو بْنِ حَزْمٍ فِي الْعُقُولِ: إِنَّ فِي النَّفْسِ مِائَةً مِنَ الْإِبِلِ، وَفِي الْأَنْفِ إِذَا أُوعِيَ جَدْعاً مِائَةً مِنَ الْإِبِلِ، وَفِي الْمَأْمُومَةِ ثُلُثُ النَّفْسِ، وَفِي الْجَائِفَةِ مِثْلُهَا، وَفِي الْيَدِ خَمْسُونَ، وَفِي الْعَيْنِ خَمْسُونَ وَفِي الرِّجْلِ خَمْسُونَ، وَفِي كُلِّ إِصْبَعٍ مِمَّا هُنَالِكَ عَشْرٌ مِنَ الْإِبِلِ، وَفِي السِّنِّ خَمْسٌ وَفِي الْمُوضِحَةِ خَمْسٌ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم، لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، باوکی دەڵێ: ئەو نوسراوەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوسیبووی بۆ عەمری کوڕی حەزم لە بارەی خوێنباییەکانەوە: لە هەر نەفسێکدا سەد وشتر خوێنبایی هەیە، لە لوتیشدا ئەگەر ببڕدرێ سەد وشتر خوێنباییەتی، لە لێدانێک برینەکەی بگاتە ناو مێشک، یان ناو سەر یەک لەسەر سێ خوێنبایی هەیە، وە لە دەستیشدا پەنجا، لە چاویشدا پەنجا، لە قاچیشدا پەنجا، وە لە هەر پەنجەیەک لە پەنجەکانی دەست و قاچدا دە وشتر خوێنباییە، وە لە هەر یەکێک لە ددانەکان پێنج وشتر، وە لە برینێک بگاتە سەر ئێسک پێنج وشتر.

**٤٨٥٨-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ أَعْرَابِيّاً أَتَى بَابَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَلْقَمَ عَيْنَهُ خُصَاصَةَ الْبَابِ، فَبَصُرَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ فَتَوَخَّاهُ بِحَدِيدَةٍ أَوْ عُودٍ، لِيَفْقَأَ عَيْنَهُ، فَلَمَّا أَنْ بَصُرَ انْقَمَعَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: أَمَا إِنَّكَ لَوْ ثَبَتَّ لَفَقَأْتُ عَيْنَكَ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: دەشتەکیەک هاتە بەردەرگای ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کونی دەرگاکەوە تەماشای ماڵیانی دەکرد، پێغەمبەر تەماشای کرد ئاسنێک یان بە دارێکی کرد بە کونی دەرگاکەدا بۆ ئەوەی چاوی کوێر بکات، کاتێ بینی خۆی دوور خستەوە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئەگەر بەردەوام تەماشات بکردایە چاوتم کوێر دەکرد.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح الإسناد. أخرجه البخاري: ٦٢٤٢ و ٦٨٨٩ و ٦٩٠٠، ومسلم: ٢١٥٧، وأبو داود: ٥١٧١، والترمذي: ٢٧٠٨.




**٤٨٥٩-** «عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّ رَجُلاً اطَّلَعَ مِنْ جُحْرٍ فِي بَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَمَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِدْرَى يَحُكُّ بِهَا رَأْسَهُ، فَلَمَّا رَآهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَوْ عَلِمْتُ أَنَّكَ تَنْظُرُنِي لَطَعَنْتُ بِهِ فِي عَيْنِكَ، إِنَّمَا جُعِلَ الْإِذْنُ مِنْ أَجْلِ الْبَصَرِ»[1].

**واتە: ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە: سەهلی کوڕی سەعدی ساعدی ﷺ هەواڵی پێدا، پیاوێک لە لای دەرگاکەوە تەماشای ماڵی پێغەمبەری خوای ﷺ دەکرد بە پارچە دارێک یان ئاسنێک لە شانە دەچوو قژی پێ دەخوراند، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو پیاوەی بینی فەرمووی: ئەگەر بمزانیایە تەماشام دەکەی فرێم دەدا بۆ ناو چاوت، چونکە بیستن لە پێناوی بینینداية.**

## بابەت: ئەو کەسەی تۆڵەی سەندو مافی خۆی وەرگرت بەبێ گەڕانەوە بۆ دەسەڵات

**٤٨٦٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنِ اطَّلَعَ فِي بَيْتِ قَوْمٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِمْ فَفَقَئُوا عَيْنَهُ، فَلَا دِيَةَ لَهُ، وَلَا قِصَاصَ»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس تەماشای ناو ماڵی خەڵکێکی کرد بەبێ ئەوەی مۆڵەتی لێیان وەرگرتبێ، ئەوانیش چاوی کوێر بکەن ئەوە نەخوێنبایی بۆ هەیە، نە تۆڵەکردنەوە.**

**٤٨٦١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَوْ أَنَّ امْرَأً اطَّلَعَ عَلَيْكَ بِغَيْرِ إِذْنٍ فَخَذَفْتَهُ فَفَقَأْتَ عَيْنَهُ، مَا كَانَ عَلَيْكَ حَرَجٌ، وَقَالَ مَرَّةً أُخْرَى: جُنَاحٌ»[3].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کەسێک تەماشای ناو ماڵی کردی بەبێ ئەوەی مۆڵەتت لێ وەربگرێ، تۆش چاوت کوێر کرد، ئەوە هیچ گوناهێکت ناگات.**

**٤٨٦٢-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ: أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي، فَإِذَا بِابْنٍ لِمَرْوَانَ يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ فَدَرَأَهُ، فَلَمْ يَرْجِعْ فَضَرَبَهُ، فَخَرَجَ الْغُلَامُ يَبْكِي حَتَّى أَتَى مَرْوَانَ فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ مَرْوَانُ لِأَبِي سَعِيدٍ: لِمَ

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٢٤ و ٦٢٤١ و ٦٩٠١، ومسلم: ٢١٥٦، والترمذي: ٢٧٠٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٨٨٨، ومسلم: ٢١٥٨، وأبو داود: ٥١٧٢.

ضَرَبْتَ ابْنَ أَخِيكَ؟ قَالَ: مَا ضَرَبْتُهُ، إِنَّمَا ضَرَبْتُ الشَّيْطَانَ. سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاةٍ فَأَرَادَ إِنْسَانٌ يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ فَيَدْرَؤُهُ مَا اسْتَطَاعَ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ، فَإِنَّهُ شَيْطَانٌ»[١].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو نوێژی دەکرد، کوڕەکەی مەڕوان بە پێشیدا تێپەڕی ئەویش دووری خستەوە، بەڵام نەچووە دواوە پاشان لێیدا، منداڵەکە بە گریان هاتە دەرەوە هەتا گەیشت بە مەروان و هەواڵی پێدا، مەڕوان بە ئەبو سەعیدی وت: بۆچی لە برازاکەتدا؟ وتی: لێم نەداوە، بەڵکو لە شەیتانم دا. گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر کەسێک لە ئێوە لە ناو نوێژدا بوو کەسێک ویستی بە پێشیدا تێپەڕی با بە پێی توانای دووری بخاتەوە، ئەگەر دوور نەکەوتەوە ئەوا با شەڕی لەگەڵ بکات، چونکە ئەو کەسە شەیتانە.

## ئەوەی دەربارەی پەرتووکی تۆڵەکردنەوەدا هاتووە لە (سُنَن الْمُجْتَبى) کە لە سونەنەکاندا نەهاتوە لە لێکدانەوەی فەرمایشتی خوا: ﷻ ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا ﴿٩٣﴾ ﴾[٢]

**٤٨٦٣-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: أَمَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبْزَي أَنْ أَسْأَلَ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ هَاتَيْنِ الْآيَتَيْنِ: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ ﴿٩٣﴾ ﴾النساء، فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: لَمْ يَنْسَخْهَا شَيْءٌ، وَعَنْ هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴿٦٨﴾ ﴾الفرقان، قَالَ: نَزَلَتْ فِي أَهْلِ الشِّرْكِ»[٣].

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزی فەرمانی پێکردم پرسیار بکەم لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەربارەی ئەم دوو ئایەتە: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ ﴿٩٣﴾ ﴾ پرسیارم لێکرد وتی: هیچ شتێک نەسخی نەکردوەتەوە، وە لەبارەی ئەم ئایەتەشەوە: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٩ و ٣٢٧٥، ومسلم: ٥٠٥.

(٢) واتە: هەرکەسیش ئیماندارێك بە ئەنقەست بکوژێت ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە بە هەمیشەیی تیایدا دەمێنێتەوە.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٨١، ومسلم: ١٢٢.




يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ ﴿٦٨﴾ ﴾ (واتە: وە کەسانێکن کە لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی تر ناپەرستن و هیچ کەسێ ناکوژن کە خوا کوشتنی قەدەغەکردوە بە حەق و ڕەوا نەبێ)، وتی: لەباری هاوبەشدانەرانەوە دابەزی.

٤٨٦٤- «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: اخْتَلَفَ أَهْلُ الْكُوفَةِ فِي هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿ وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا ﴿٩٣﴾ ﴾النساء، فَرَحَلْتُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ: نَزَلَتْ فِي آخِرِ مَا أُنْزِلَتْ وَمَا نَسَخَهَا شَيْءٌ»[1].

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: خەڵکی کوفە جیاوازیان لەبارەی ئەم ئایەتەوە هەبوو: ﴿ وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا ﴿٩٣﴾ ﴾، ڕۆیشتم بۆ لای ئیبنو عەبباس پرسیارم لێکرد، وتی: لە کۆتاییدا دابەزی، هیچ شتێک نەسخی نەکردەوە.

٤٨٦٥- «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: هَلْ لِمَنْ قَتَلَ مُؤْمِناً مُتَعَمِّداً مِنْ تَوْبَةٍ؟ قَالَ: لَا. وَقَرَأْتُ عَلَيْهِ الْآيَةَ الَّتِي فِي الْفُرْقَانِ: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ أَثَامٗا ﴿٦٨﴾ ﴾الفرقان، قَالَ: هَذِهِ آيَةٌ مَكِّيَّةٌ نَسَخَتْهَا آيَةٌ مَدَنِيَّةٌ: ﴿ وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ ﴿٩٣﴾ ﴾النساء»[2].

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: بە ئیبنو عەبباسم وت: ئایا کەسێک بڕوادارێک بە ئەنقەست بکوژێت تەوبەی بۆ هەیە؟ وتی: نەخێر، ئەو ئایەتەم بە سەریدا خوێندەوە کە لە فورقاندا هاتووە: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ أَثَامٗا ﴿٦٨﴾ ﴾ (واتە: وە کەسانێکن کە لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی تر ناپەرستن و هیچ کەسێ ناکوژن کە خوا کوشتنی قەدەغە کردوە بە حەق و ڕەوا نەبێ)، وتی: ئەم ئایەتە لە مەککە دابەزیوە ئەو ئایەتەی کە لە مەدینە دابەزیوە نەسخی کردۆتەوە: ﴿ وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ ﴿٩٣﴾ ﴾ (واتە: هەرکەسیش ئیماندارێک بە ئەنقەست بکوژێت ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.





**٤٨٦٦-** «عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، سُئِلَ: عَمَّنْ قَتَلَ مُؤْمِناً مُتَعَمِّداً، ثُمَّ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحاً، ثُمَّ اهْتَدَى، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَأَنَّى لَهُ التَّوْبَةُ سَمِعْتُ نَبِيَّكُمْ ﷺ يَقُولُ: يَجِيءُ مُتَعَلِّقاً بِالْقَاتِلِ تَشْخَبُ أَوْدَاجُهُ دَماً يَقُولُ: سَلْ هَذَا فِيمَ قَتَلَنِي، ثُمَّ قَالَ: وَاللَّهِ لَقَدْ أَنْزَلَهَا وَمَا نَسَخَهَا»[1].

**واته:** سالمی کوڕی ئەبو جەعد دەگێڕێتەوە، پرسیار کرا لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ): سەبارەت بە کەسێک بڕوادارێکی بە ئەنقەست کوشتبێ، پاشان تەوبەی کردبێ و کردەوەی چاکی ئەنجام دابێ و ڕێنمایی بە چاکی وەرگرتبێ، ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) وتی: ئەوە کەی تەوبەی بۆ هەیە، گوێم لە پێغەمبەرەکەتان ﷺ بوو دەیفەرموو: لە ڕۆژی دواییدا کوژراو دێت خۆی بە بکوژەوە هەڵواسیوەو خوێنی لێ دەچۆڕێ، دەڵێ: پرسیار لەمە بکە لە بەرچی کوشتمی، پاشان وتی: سوێند بە خوا خوا ﷻ ئەو ئایەتەی دابەزاندو نەسخی نەکردەوە. (مەبەستی ئەم ئایەتەیە: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ ﴿٩٣﴾ ﴾).

**٤٨٦٧-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْكَبَائِرُ: الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ، وَقَوْلُ الزُّورِ»[2].

**واته:** ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: تاوانە گەورەکان: هاوەڵ دانان بۆ خوا، دڵ ئێشانی دایک و باوک، کوشتنی کەسێک، سوێندی درۆ.

**٤٨٦٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْكَبَائِرُ: الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ، وَالْيَمِينُ الْغَمُوسُ»[3].

**واته:** عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: تاوانە گەورەکان (بڕیتین لە): هاوەڵ دانان بۆ خوا، دڵ ئێشانی دایک و باوک، کوشتنی کەسێک، سوێندی درۆ. (لەبەر ئەوە ناونراوە بە (الْغَمُوس) چونکە خاوەنەکەی دەخاتە ناو ئاگرەوەو نوقمی دەکات).

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٢٦٢١.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**٤٨٦٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يَزْنِي الْعَبْدُ حِينَ يَزْنِي، وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا، وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَقْتُلُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ»[(١)].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زیناکەر زینا ناکات لە کاتی زینا کردنەکەدا بڕوادار بێت، مەیخۆر مەی ناخواتەوە لە کاتی مەیخواردنەوەکەیدا بڕواداربێت، دز دزی ناکات لە کاتی دزیکردنەکەیدا بڕواداربێت.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧٨٢ و ٦٨٠٩.




## بە گەورەدانانی دزێتی

**٤٨٧٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ وَلَا يَنْتَهِبُ نُهْبَةً ذَاتَ شَرَفٍ يَرْفَعُ النَّاسُ إِلَيْهَا أَبْصَارَهُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زیناکەر زینا ناکات لە کاتی زینا کردنەکەدا بڕوادار بێت، دز دزی ناکات لە کاتی دزیکردنەکەیدا بڕواداربێت، مەیخۆر مەی ناخواتەوە لە کاتی مەیخواردنەوەکەیدا بڕواداربێت، وە کەسێک تاڵانیەکی بە نرخ تاڵان ناکات کە خەڵک بۆی بڕوانن تێیداو لە کاتی تاڵانکردنەکەیدا بڕواداربێت.**

**٤٨٧١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ وَقَالَ أَحْمَدُ فِي حَدِيثِهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، ثُمَّ التَّوْبَةُ مَعْرُوضَةٌ بَعْدُ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: لە پێغەمبەرەوە ﷺ، ئەحمەد لە فەرموودەکەیدا، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی زیناکەر زینا ناکات لە کاتی زیناکردنەکەدا بڕوادار بێت، دز دزی ناکات لە کاتی دزیکردنەکەیدا بڕواداربێت، مەیخۆر مەی ناخواتەوە لە کاتی مەیخواردنەوەکەیدا بڕواداربێت، پاشان دوای ئەوە تەوبەش دەخرێتە پێش چاو بۆ هەموو کەسێک.**

**٤٨٧٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ وَهُوَ مُؤْمِنٌ وَذَكَرَ رَابِعَةً فَنَسِيتُهَا فَإِذَا فَعَلَ ذَلِكَ خَلَعَ رِبْقَةَ الْإِسْلَامِ مِنْ عُنُقِهِ، فَإِنْ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٧٥ و ٥٥٧٨ و ٦٧٧٢ و ٦٨١٠، ومسلم: ١٠٠ و ٥٧/١٠٥، وأبو داود: ٤٦٨٩، والترمذي: ٢٦٢٥، وابن ماجه: ٣٩٣٦.

(٢) صحيح.

(٣) منكر.



واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: زیناکەر زینا ناکات لە کاتی زیناکردنەکەدا بڕوادار بێت، دز دزی ناکات لە کاتی دزیکردنەکەیدا بڕواداربێت، مەیخۆر مەی ناخواتەوە لە کاتی مەیخواردنەوەکەیدا بڕواداربێت، باسی چوارەم شتی کرد بیرم چوو، ئەگەر ئەوەی کرد ئەوە پەتی ئیسلامەتی لە ملی خۆی لابردوە، ئەگەر تەوبەی کرد خوا ﷻ تەوبەی لێ وەردەگرێ.

**٤٨٧٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَعَنَ اللَّهُ السَّارِقَ يَسْرِقُ الْبَيْضَةَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ، وَيَسْرِقُ الْحَبْلَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەفرەتی خوا لەو دزەی کە هێلکە دەدزێ و، ئینجا دەستی دەبڕدرێت، وە حەبل دەدزێ و دەستی دەبڕدرێت.

## بابەت: تاقیکردنەوەی دز بە لێدان و زیندانی کردن بۆ دانپێدانان

**٤٨٧٤-** «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ، أَنَّهُ رَفَعَ إِلَيْهِ نَفَرٌ مِنَ الْكَلَاعِيِّينَ، أَنَّ حَاكَةً سَرَقُوا مَتَاعاً، فَحَبَسَهُمْ أَيَّاماً، ثُمَّ خَلَّى سَبِيلَهُمْ، فَأَتَوْهُ فَقَالُوا: خَلَّيْتَ سَبِيلَ هَؤُلَاءِ بِلَا امْتِحَانٍ وَلَا ضَرْبٍ، فَقَالَ النُّعْمَانُ: مَا شِئْتُمْ إِنْ شِئْتُمْ أَضْرِبْهُمْ، فَإِنْ أَخْرَجَ اللَّهُ مَتَاعَكُمْ فَذَاكَ، وَإِلَّا أَخَذْتُ مِنْ ظُهُورِكُمْ مِثْلَهُ، قَالُوا: هَذَا حُكْمُكَ؟ قَالَ: هَذَا حُكْمُ اللَّهِ ﷻ وَرَسُولِهِ ﷺ»[٢].

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەگێڕێتەوە: کۆمەڵە کەسێکیان هێنا بۆ لای لە کولاعیەکان کە هۆزێک بوون لە یەمەن، کەل و پەلێکیان دزیبوو، چەند ڕۆژێک بەندی کردن پاشان بەرەڵای کردن، هاتن بۆ خزمەتی وتیان: ئەوانەت بەرەڵاکرد بەبێ تاقیکردنەوەو لێدان، نوعمان وتی: چیتان دەوێ ئەگەر دەتانەوێ لێیان دەدەم، ئەگەر خوا کەلوپەلەکەی ئێوەی دەرهێنا ئەوە چاکترە، ئەگەرنا بە هەمان شێوەیش دەدەم لە پشتی ئێوە، وتیان: ئەمە بڕیاری خۆتە؟ وتی: نەخێر، ئەمە بڕیاری خواو پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧٨٣ و ٦٧٩٩، ومسلم: ١٦٨٧، وإبن ماجه: ٢٥٨٣.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٣٨٢.




**٤٨٧٥-** «عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَبَسَ نَاساً فِي تُهْمَةٍ»(١).

**واتە: بەهزی کوڕی حەکیم دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکانێکی زیندانی کرد بە هۆی تۆمەتێکەوە درابووە پاڵیان.**

**٤٨٧٦-** «عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَبَسَ رَجُلاً فِي تُهْمَةٍ، ثُمَّ خَلَّى سَبِيلَهُ»(٢).

**واتە: بەهزی کوڕی حەکیم دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی زیندانی کرد بە هۆی تۆمەتێکەوە درابووە پاڵی، پاشان ئازادی کرد.**

## فێرکردن و تێگەیاندنی دز

**٤٨٧٧-** «عَنْ أَبِي أُمَيَّةَ الْمَخْزُومِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُتِيَ بِلِصٍّ اعْتَرَفَ اعْتِرَافاً، وَلَمْ يُوجَدْ مَعَهُ مَتَاعٌ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا إِخَالُكَ سَرَقْتَ؟ قَالَ: بَلَى. قَالَ: اذْهَبُوا بِهِ فَاقْطَعُوهُ ثُمَّ جِيئُوا بِهِ فَقَطَعُوهُ، ثُمَّ جَاءُوا بِهِ فَقَالَ لَهُ: قُلْ أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ فَقَالَ: أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ. قَالَ: اللَّهُمَّ تُبْ عَلَيْهِ»(٣).

**واتە: ئەبو ئومەیەی مەخزومی ﷺ دەگێڕێتەوە، دزێکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانی بە تاوانەکەیدا نابوو، بەڵام هیچ کەلوپەلێکی لەلا نەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وا گومان ناکەم دزیت کرد بێت؟ وتی: بەڵێ، دزیم کردوە، فەرمووی: بیبەن و دەستی ببڕنەوە، پاشان بیهێننەوە، دەستیان بڕیەوە پاشان هێنایانەوە بۆ لای پێی فەرموو: بڵێ داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای، وتی: داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای، فەرمووی: خوایە لێی خۆشبە.**

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٦٣٠ و ٣٦٣١، والترمذي: ١٤١٧.

(٢) حسن.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٣٨٠، وإبن ماجه: ٢٥٩٧.




## پیاوێک لە دزێک دەبورێت کە دزی لێکردوە، دوای ئەوەی کە ئیمام دەیهێنێت، وە باسی جیاوازی لە سەر عەطاء لە فەرموودەکەی صەفوانی کوڕی ئومەیە تیایدا

**٤٨٧٨-** «عَنْ قَتَادَةَ عن عَطَاءٍ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً سَرَقَ بُرْدَةً لَهُ، فَرَفَعَهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَأَمَرَ بِقَطْعِهِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ تَجَاوَزْتُ عَنْهُ، فَقَالَ: أَبَا وَهْبٍ أَفَلَا كَانَ قَبْلَ أَنْ تَأْتِيَنَا بِهِ، فَقَطَعَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[1].

**واتە: قەتادە دەگێڕێتەوە، لە عەطاء، لە صەفوانی کوڕی ئومەیە ﷺ پیاوێک عەبایەکی ئەوی دزی، ئەویش بەرزی کردەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، فەرمانی کرد بە برینی دەستی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من لێی خۆش بووم، فەرمووی: ئەی ئەبا وەهب نەدەبوو پێش ئەوەی بیهێنی بۆ لامان لێی خۆش ببی، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بڕیەوە.**

**٤٨٧٩-** «عَنْ قَتَادَةَ عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً سَرَقَ بُرْدَةً فَرَفَعَهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَأَمَرَ بِقَطْعِهِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ تَجَاوَزْتُ عَنْهُ. قَالَ: فَلَوْلَا كَانَ هَذَا قَبْلَ أَنْ تَأْتِيَنِي بِهِ يَا أَبَا وَهْبٍ، فَقَطَعَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[2].

**واتە: قەتادە دەگێڕێتەوە، لە عەطاء، لە صەفوانی کوڕی ئومەیە ﷺ پیاوێک عەبایەکی ئەوی دزی، ئەویش بەرزیکردەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، فەرمانی کرد بە برینی دەستی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من لێی خۆش بووم، فەرمووی: خوزگە ئەم لێخۆشبوونەت پێش ئەوە بووایە کە هێنات بۆ لام ئەی ئەبو وەهەب، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بڕیەوە.**

**٤٨٨٠-** «عَنْ الْأَوْزَاعِيِّ قال حدثني عَطَاءُ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ: أَنَّ رَجُلاً سَرَقَ ثَوْباً، فَأُتِيَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأَمَرَ بِقَطْعِهِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هُوَ لَهُ. قَالَ: فَهَلَّا قَبْلَ الْآنَ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٣٩٤، وإبن ماجه: ٢٥٩٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.




واتە: ئەوزاعی دەڵێ: عەطائی کوڕی ئەبو ڕەباح بۆی باسکردم: پیاوێک جلێکی دزی، هێنرا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمانی کرد بە بڕینی دەستی، پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (با) ئەو کراسە بۆ ئەو (بێت)، فەرمووی: نەدەبوو پێش ئێستا بووایە (ئەم قسەیەت).

## کامە شوێن دەبێتە شوێنی شایستەی هەڵگرتنی ماڵ و سامان و کامەیش شایستە نیە

**٤٨٨١-** «عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ رضي الله عنه: أَنَّهُ طَافَ بِالْبَيْتِ وَصَلَّى، ثُمَّ لَفَّ رِدَاءً لَهُ مِنْ بُرْدٍ، فَوَضَعَهُ تَحْتَ رَأْسِهِ، فَنَامَ فَأَتَاهُ لِصٌّ، فَاسْتَلَّهُ مِنْ تَحْتِ رَأْسِهِ، فَأَخَذَهُ فَأَتَى بِهِ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ هَذَا سَرَقَ رِدَائِي، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: أَسَرَقْتَ رِدَاءَ هَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: اذْهَبَا بِهِ فَاقْطَعَا يَدَهُ. قَالَ صَفْوَانُ: مَا كُنْتُ أُرِيدُ أَنْ تُقْطَعَ يَدُهُ فِي رِدَائِي. فَقَالَ لَهُ: فَلَوْ مَا قَبْلَ هَذَا»[١].

واتە: عیکریمە دەگێڕێتەوە، لە صەفوانی کوڕی ئومەیە رضي الله عنه، ئەو تەوافی ماڵی خوای کردو نوێژی کرد، پاشان عەباکەی لول کردو خستیە ژێر سەری، دواتر لە سەری خەوت، دزێک هات لە ژێر سەری دەریهێناو بردی، ئەویش بردی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەمە عەبایەکەمی دزیوە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا ئەمەت دزیوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: بیبەن دەستی ببڕنەوە، صەفوان وتی: من نەمدەویست لەبەر کراسەکەم دەستی ببڕدرێتەوە. پێی فەرموو: خۆزگە پێش ئەوە نەتهێنایە.

**٤٨٨٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ صَفْوَانُ نَائِماً فِي الْمَسْجِدِ وَرِدَاؤُهُ تَحْتَهُ فَسُرِقَ، فَقَامَ وَقَدْ ذَهَبَ الرَّجُلُ فَأَدْرَكَهُ، فَأَخَذَهُ فَجَاءَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَأَمَرَ بِقَطْعِهِ، قَالَ صَفْوَانُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا بَلَغَ رِدَائِي أَنْ يُقْطَعَ فِيهِ رَجُلٌ، قَالَ: هَلَّا كَانَ هَذَا قَبْلَ أَنْ تَأْتِيَنَا بِهِ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: صەفوان لە مزگەوتدا خەوتبوو عەباکەیشی لە ژێر سەریدا بوو، پاشان دزرا، کاتێ هەڵسا لە خەو پیاوەکە ڕۆیشتبوو، پیاوەکەی دۆزیەوە عەباکەی لێی سەندو بردی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمانی کرد بە بڕینەوەی دەستی، صەفوان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ عەباکەم ئەوە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**ناهێنێ دەستی کەسێکی لەسەر ببڕدرێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی نەدەبوو پێشتر نەتهێنایە بۆ لامان.**

**٤٨٨٣-** «عَنْ حُمَيْدِ بْنِ أُخْتِ صَفْوَانَ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ ﷺ قَالَ: كُنْتُ نَائِماً فِي الْمَسْجِدِ عَلَى خَمِيصَةٍ لِي ثَمَنُهَا ثَلَاثُونَ دِرْهَماً، فَجَاءَ رَجُلٌ فَاخْتَلَسَهَا مِنِّي، فَأُخِذَ الرَّجُلُ، فَأُتِيَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ فَأَمَرَ بِهِ لِيُقْطَعَ، فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: أَتَقْطَعُهُ مِنْ أَجْلِ ثَلَاثِينَ دِرْهَماً؟ أَنَا أَبِيعُهُ وَأُنْسِئُهُ ثَمَنَهَا. قَالَ: فَهَلَّا كَانَ هَذَا قَبْلَ أَنْ تَأْتِيَنِي بِهِ»[١].

**واتە: حومەیدی خوشکەزای صەفوان دەگێڕێتەوە، لە صەفوانی کوڕی ئومەیەوە ﷺ دەڵێ: من لە مزگەوتدا خەوتبووم قوماشێکی خەتدارم خستبووە ژێر سەرم نرخەکەی سی درهەم بوو، پیاوێک هات لێمی دزی و بردی، ئەو پیاوە هێنرا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد دەستی ببڕدرێ، منیش هاتم بۆ لای وتم: ئایا دەستی لە بەر سی درهەم دەبڕی؟ من دەیفرۆشم پێی و دواتر نرخەکەی وەردەگرم، فەرمووی: ئەی نەدەبوو پێش ئەوەی بیهێنی بۆ لام ئەوەت بکردایە.**

**٤٨٨٤-** «عَنْ طَاوُسٍ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ ﷺ، أَنَّهُ سُرِقَتْ خَمِيصَتُهُ مِنْ تَحْتِ رَأْسِهِ، وَهُوَ نَائِمٌ فِي مَسْجِدِ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَخَذَ اللِّصَّ، فَجَاءَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَأَمَرَ بِقَطْعِهِ، فَقَالَ صَفْوَانُ: أَتَقْطَعُهُ؟ قَالَ: فَهَلَّا قَبْلَ أَنْ تَأْتِيَنِي بِهِ تَرَكْتَهُ»[٢].

**واتە: طاوس دەگێڕێتەوە، لە صەفوانی کوڕی ئومەیە ﷺ، ئەو پارچە قوماشێکی خەتداری لێ دزرا کە لە ژێر سەریدا بوو، لە کاتێکدا ئەو خەوتبوو لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ، دز پارچە قوماشەکەی برد، دواتر دزەکەی هێنا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمانی کرد بە بڕینەوەی دەستی، صەفوان وتی: ئایا دەستی دەبڕی؟ فەرمووی: ئایا نەدەبوو پێش ئەوەی بیهێنی بۆ لام وازت لێ بهێنایە.**

**٤٨٨٥-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: تَعَافَوْا الْحُدُودَ قَبْلَ أَنْ تَأْتُونِي بِهِ، فَمَا أَتَانِي مِنْ حَدٍّ فَقَدْ وَجَبَ»[٣].

---

(١) منكر.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٣٧٦.

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لەو تاوانانە خۆش بن کە حەدەکانی تێدا جێبەجێ دەکرێ، پێش ئەوەی بیهێنن بۆ لام، هەر تاوانێک کە حەدی تێدایە بێت بۆ لام ئەوە جێبەجێ کردنی پێویست دەبێت.

٤٨٨٦- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: تَعَافَوْا الْحُدُودَ فِيمَا بَيْنَكُمْ، فَمَا بَلَغَنِي مِنْ حَدٍّ فَقَدْ وَجَبَ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: لە نێوان خۆتاندا لەو تاوانانە خۆش بن کە حەدەکانی تێدا جێبەجێ دەکرێ، هەر تاوانێک کە حەدی تێدایە بگاتە لای من ئەوە جێبەجێ کردنی پێویست دەبێت.

٤٨٨٧- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ امْرَأَةً مَخْزُومِيَّةً كَانَتْ تَسْتَعِيرُ الْمَتَاعَ فَتَجْحَدُهُ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِقَطْعِ يَدِهَا»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئافرەتێکی مەخزومی کەلوپەلی بە ئەمانەت دەبرد دواتر نکووڵی لێ دەکرد، پێغەمبەر فەرمانی کرد بە بڕینەوەی دەستی (دوای ئەوەی لەسەری سەلمێنرا کە دزی کردوەو دانی پێدانا).

٤٨٨٨- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَتِ امْرَأَةٌ مَخْزُومِيَّةٌ تَسْتَعِيرُ مَتَاعاً عَلَى أَلْسِنَةِ جَارَاتِهَا وَتَجْحَدُهُ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِقَطْعِ يَدِهَا»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئافرەتێکی مەخزومی هەبوو کەلوپەلی بە ئەمانەت دەبرد لەسەر زمانی دراوسێیەکانی، دواتر نکووڵی لێ دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە بڕینەوەی دەستی.

٤٨٨٩- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ امْرَأَةً كَانَتْ تَسْتَعِيرُ الْحُلِيَّ لِلنَّاسِ، ثُمَّ تُمْسِكُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لِتَتُبْ هَذِهِ الْمَرْأَةُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَتَرُدَّ مَا تَأْخُذُ عَلَى الْقَوْمِ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قُمْ يَا بِلَالُ فَخُذْ بِيَدِهَا فَاقْطَعْهَا»[٤].

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٣٩٥.

(٣) صحيح.

(٤) ضعيف الإسناد.




واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک بە ئەمانەت خشڵی خەڵکی وەردەگرت، پاشان لای خۆی دەیهێشتەوەو گیری دەداو نەیدەدایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با ئەو ئافرەتە تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، ئەوەیشی لە خەڵکی وەریگرتووە با بیگەڕێنێتەوە، پاشان فەرمووی: هەستە ئەی بیلال دەستی بگرەو بیبڕەوە.

**٤٨٩٠-** «عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ امْرَأَةً كَانَتْ تَسْتَعِيرُ الْحُلِيَّ فِي زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَاسْتَعَارَتْ مِنْ ذَلِكَ حُلِيّاً، فَجَمَعَتْهُ ثُمَّ أَمْسَكَتْهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لِتَتُبْ هَذِهِ الْمَرْأَةُ، وَتُؤَدِّي مَا عِنْدَهَا مِرَاراً، فَلَمْ تَفْعَلْ، فَأَمَرَ بِهَا فَقُطِعَتْ»[١].

واتە: نافع دەگێڕێتەوە، ئافرەتێک لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەمانەت خشڵی خەڵکی وەردەگرت، پاشان لای خۆی کۆی دەکردەوەو گیری دەداو نەیدەدایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ چەند جارێک فەرمووی: با ئەو ئافرەتە تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی ئەوەیشی لە خەڵکی وەریگرتووە با بیگەڕێنێتەوە، بەڵام ئەو ئافرەتە بە گوێی نەکرد، فەرمانی کرد دەستیان بڕیەوە.

**٤٨٩١-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ امْرَأَةً مِنْ بَنِي مَخْزُومٍ سَرَقَتْ، فَأُتِيَ بِهَا النَّبِيُّ ﷺ، فَعَاذَتْ بِأُمِّ سَلَمَةَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَوْ كَانَتْ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ لَقَطَعْتُ يَدَهَا فَقُطِعَتْ يَدُهَا»[٢].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک لە بەنی مەخزوم دزی کرد، هێنرا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش پەنای بردە لای ئوممو سەلەمە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر فاطیمەی کچی موحەممەد دزی بکردایە دەستیم دەبڕیەوە، پاشان دەستی بڕیەوە.

**٤٨٩٢-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ امْرَأَةً مِنْ بَنِي مَخْزُومٍ اسْتَعَارَتْ حُلِيّاً عَلَى لِسَانِ أُنَاسٍ، فَجَحَدَتْهَا، فَأَمَرَ بِهَا النَّبِيُّ ﷺ فَقُطِعَتْ»[٣].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیب دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک لە بەنی مەخزوم خشڵی بە ئەمانەت وەردەگرت لەسەر زمانی خەڵکی دواتر نکووڵی لێدەکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد دەستی بڕایەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٨٩.

(٣) صحيح لغيره.




**٤٨٩٣-** «عَنْ دَاوُدَ بْنِ أَبِي عَاصِمٍ، أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ حَدَّثَهُ نَحْوَهُ»[١].

**واتە: داودی کوڕی ئەبو عاصم دەگێڕێتەوە، سەعیدی کوڕی موسەیب بۆی باس کرد وەکو فەرموودەکەی تر.**

## باسی جیاوازی دەستەواژەی ئەوانەی فەرموودەکەی زوهریان گواستۆتەوە سەبارەت بەو ئافرەتە مەخزومیەی کە دزی کردوە

**٤٨٩٤-** «عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: كَانَتْ مَخْزُومِيَّةٌ تَسْتَعِيرُ مَتَاعاً وَتَجْحَدُهُ، فَرُفِعَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَكُلِّمَ فِيهَا، فَقَالَ: لَوْ كَانَتْ فَاطِمَةَ لَقَطَعْتُ يَدَهَا قِيلَ لِسُفْيَانَ، مَنْ ذَكَرَهُ؟ قَالَ أَيُّوبُ بْنُ مُوسَى، عَنْ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى»[٢].

**واتە: سوفیان دەڵێ: ئافرەتێکی مەخزومی کەل و پەلی خەڵکی بە ئەمانەت دەبردو نکوولی لێ دەکرد، ئەو کێشەیە بەرزکرایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وە قسە لە بارەیەوە کرا، (کە دەستی نەبڕدرێ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر فاطیمەی کچی موحەممەد بووایە دەستیم دەبڕی. بە سوفیان وترا: کێ ئەمەی باس کردوە؟ وتی: ئەیوبی کوڕی موسا لە زوهری لە عوروە لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) بە ویستی خوای بەرز.**

**٤٨٩٥-** «عَنْ أَيُّوبَ بْنِ مُوسَى، عَنْ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ امْرَأَةً سَرَقَتْ فَأُتِيَ بِهَا النَّبِيُّ ﷺ فَقَالُوا: مَنْ يَجْتَرِئُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ أُسَامَةَ، فَكَلَّمُوا أُسَامَةَ فَكَلَّمَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: يَا أُسَامَةُ، إِنَّمَا هَلَكَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ حِينَ كَانُوا إِذَا أَصَابَ الشَّرِيفُ فِيهِمُ الْحَدَّ، تَرَكُوهُ وَلَمْ يُقِيمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا أَصَابَ الْوَضِيعُ أَقَامُوا عَلَيْهِ، لَوْ كَانَتْ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ لَقَطَعْتُهَا»[٣].

**واتە: ئەیوبی کوڕی موسا دەگێڕێتەوە، لە زوهری لە عوروە لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، ئافرەتێک دزی کرد هێنرا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وتیان: کێ بوێری**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤٧٥ و ٣٧٣٢ و ٦٨٨٧، ومسلم: ٨ و ١٦٨٨/١٠، وأبو داود: ٤٣٧٣ و ٤٣٧٤ و ٤٣٩٦ و ٤٣٩٧، والترمذي: ١٤٣٠، وإبن ماجه: ٢٥٤٧.

ئەوە دەکات بچێت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ مەگەر ئوسامە نەبێ، جا قسەیان لەگەڵ ئوسامەدا کرد، ئەویش قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئوسامە، بێگومان نەوەکانی ئیسرائیل بە هۆی ئەوەوە لەناوچوون کاتێ کە کەسێکی بەڕێز کارێکی خراپی بکردایە سنووریان بەسەردا جێبەجێ نەدەکردو وازیان لێ دەهێنا، وە ئەگەر کەسێکی لاوازو بێکەس کارێکی خراپی بکردایە سنووریان بەسەردا جێبەجێ دەکرد، ئەگەر فاطیمەی کچی موحەممەد بووایە دەستیم دەبڕی.

**٤٨٩٦-** «عَنْ أَيُّوبَ بْنِ مُوسَى، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِسَارِقٍ فَقَطَعَهُ، قَالُوا: مَا كُنَّا نُرِيدُ أَنْ يَبْلُغَ مِنْهُ هَذَا. قَالَ: لَوْ كَانَتْ فَاطِمَةَ لَقَطَعْتُهَا»[١].

واتە: ئەیوبی کوڕی موسا دەگێڕێتەوە، لە زوهری، لە عوروە، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: دزێکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر ﷺو دەستی بڕی، وتیان: ئێمە نەمانویست بگاتە ئەو قۆناغە، فەرمووی: (ئەگەر فاطیمە بووایە دەستیم دەبڕی).

**٤٨٩٧-** «عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ امْرَأَةً سَرَقَتْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالُوا: مَا نُكَلِّمُهُ فِيهَا، مَا مِنْ أَحَدٍ يُكَلِّمُهُ إِلَّا حِبُّهُ أُسَامَةُ فَكَلَّمَهُ. فَقَالَ: يَا أُسَامَةُ، إِنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ هَلَكُوا بِمِثْلِ هَذَا، كَانَ إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِنْ سَرَقَ فِيهِمُ الدُّونُ قَطَعُوهُ، وَإِنَّهَا لَوْ كَانَتْ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ لَقَطَعْتُهَا»[٢].

واتە: سوفیانی کوڕی عویەینە دەگێڕێتەوە، لە زوهری، لە عوروە، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ): ئافرەتێک لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ دزی کرد، وتیان: ئێمە قسە لەوەدا ناکەین، هیچ کەسێک قسەی لەگەڵدا ناکات مەگەر خۆشەویستەکەی ئوسامە نەبێ، ئوسامە قسەی لەگەڵدا کرد، فەرمووی: ئەی ئوسامە فەرمووی: بێگومان نەوەکانی ئیسرائیل بە هۆی ئەوەوە لە ناوچوون کاتێ کە کەسێکی بەڕێز و بەناوبانگ کارێکی خراپی بکردایە سنووریان بەسەردا جێبەجێ نەدەکردو وازیان لێ دەهێنا، وە ئەگەر کەسێکی لاوازو بێکەس کارێکی خراپی بکردایە سنووریان بەسەردا جێبەجێ دەکرد، بێگومان ئەگەر فاطیمەی کچی موحەممەد بووایە دەستیم دەبڕی.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.




**٤٨٩٨-** «عَنْ بِشْرِ بْنِ شُعَيْبٍ قال: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: اسْتَعَارَتِ امْرَأَةٌ عَلَى أَلْسِنَةِ أُنَاسٍ يُعْرَفُونَ، وَهِيَ لَا تُعْرَفُ حُلِيّاً فَبَاعَتْهُ، وَأَخَذَتْ ثَمَنَهُ، فَأُتِيَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَسَعَى أَهْلُهَا إِلَى أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، فَكَلَّمَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِيهَا، فَتَلَوَّنَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يُكَلِّمُهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَتَشْفَعُ إِلَيَّ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ؟ فَقَالَ أُسَامَةُ: اسْتَغْفِرْ لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ، ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَشِيَّتَئِذٍ، فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ ﷻ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّمَا هَلَكَ النَّاسُ قَبْلَكُمْ، أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ الشَّرِيفُ فِيهِمْ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ الضَّعِيفُ فِيهِمْ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا، ثُمَّ قَطَعَ تِلْكَ الْمَرْأَةَ»[١].

**واتە:** بیشری کوڕی شوعەیب دەڵێ: باوکم هەواڵی پێدام، لە زوهری، لە عوروە، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئافرەتێک هەبوو شتی بە ئەمانەت وەردەگرت، ئەمەش لەسەر شایەتی و قسەی خەڵکانێکی ناسراو، ئەو ئافرەتە خشڵەکانی بۆ خۆی دەفرۆشت و نرخەکەی دەبرد، هێنرا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، کەسوکارەکەی بەپەلە ڕۆیشتن بۆ لای ئوسامەی کوڕی زەید، ئەویش لە بارەیەوە قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کرد، ڕوخساری پێغەمبەری خوا ﷺ گۆڕا ئەویش قسەی لەگەڵدا دەکرد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئایا لە سنورێک لە سنورەکانی خوادا تکام لێ دەکەی؟ ئوسامە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێخۆشبونم بۆ بکە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لەکاتی خەوتنان، سوپاس و ستایشی خوای کرد بەوەی شیاویەتی، پاشان فەرمووی: بەڕاستی خەڵکانی پێش ئێوە لە ناوچوون، ئەوان کاتێ کە کەسێکی بەڕێزو بەناوبانگ کارێکی خراپی بکردایە وازیان لێ دەهێنا، وە ئەگەر کەسێکی لاوازو بێکەس کارێکی خراپی بکردایە سنووریان بەسەردا جێبەجێ دەکرد، سوێند بەو خوایەی گیانی موحەمەدی بەدەستە، ئەگەر فاطیمەی کچی موحەممەد دزی بکردایە دەستیم دەبڕی، پاشان دەستی ئەو بڕدرا.

**٤٨٩٩-** «عَنِ اللَّيْثِ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ قُرَيْشاً أَهَمَّهُمْ شَأْنُ الْمَخْزُومِيَّةِ الَّتِي سَرَقَتْ، فَقَالُوا: مَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟ قَالُوا: وَمَنْ يَجْتَرِئُ عَلَيْهِ إِلَّا أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ؟ حِبُّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَكَلَّمَهُ أُسَامَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ

---

(١) صحيح.

حُدُودِ اللَّهِ؟ ثُمَّ قَامَ فَخَطَبَ فَقَالَ: إِنَّمَا هَلَكَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ، أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ، وَايْمُ اللَّهِ، لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا»[١].

**واتە: لەیث دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو شیهاب، لە عوروە، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، قورەیش لە خەمی ئەو ئافرەتە مەخزومیەدا بوون کە دزی کرد، وتیان: کێ لە بارەیەوە قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەکات؟ وتیان: کێ جورئەتی ئەوە دەکات جگە لە ئوسامەی کوڕی زەید؟ خۆشەویستی پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئوسامەش لەبارەیەوە قسەی لەگەڵدا کرد پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموو: ئایا لە سنورێک لە سنورەکانی خوادا تکا دەکەی؟ پاشان هەڵسا وتارێکیداو فەرمووی: بەڕاستی خەڵکانی پێش ئێوە لەناوچوون، ئەوان کاتێ کە کەسێکی بەڕێزو بەناوبانگ کارێکی خراپی بکردایە وازیان لێدەهێنا، وە ئەگەر کەسێکی لاوازو بێکەس کارێکی خراپی بکردایە سنووریان بەسەردا جێبەجێ دەکرد، سوێند بە خوا ئەگەر فاطیمەی کچی موحەممەد دزی بکردایە دەستیم دەبڕی).**

**٤٩٠٠-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: سَرَقَتِ امْرَأَةٌ مِنْ قُرَيْشٍ مِنْ بَنِي مَخْزُومٍ، فَأُتِيَ بِهَا النَّبِيُّ ﷺ فَقَالُوا: مَنْ يُكَلِّمُهُ فِيهَا؟ قَالُوا: أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ فَأَتَاهُ فَكَلَّمَهُ، فَزَبَرَهُ وَقَالَ: إِنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ الْوَضِيعُ قَطَعُوهُ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُهَا»[٢].

**واتە: موحەممەدی کوڕی موسلیم دەگێڕێتەوە، لە عوروە، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئافرەتێکی قورەیشی لە بەنی مەخزووم دزی کرد، هێنرا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتیان: کێ هەیە لەبارەیەوە قسە بکات؟ وتیان: ئوسامەی کوڕی زەید، ئەویش هات بۆ لای و قسەی لەبارەیەوە کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستی نەوەکانی ئیسرائیل کاتێ کەسێکی بەڕێز و بەناوبانگ دزی بکردایە وازیان لێدەهێنا، وە ئەگەر کەسێکی لاوازو بێکەس دزی بکردایە دەستیان دەبڕی، سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر فاطیمەی کچی موحەممەد دزی بکردایە دەستیم دەبڕی.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٤٩٠١-** «عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ رَاشِدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ قُرَيْشاً أَهَمَّهُمْ شَأْنُ الْمَخْزُومِيَّةِ الَّتِي سَرَقَتْ، فَقَالُوا: مَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا؟ قَالُوا: مَنْ يَجْتَرِئُ عَلَيْهِ إِلَّا أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ حِبُّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَكَلَّمَهُ أُسَامَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا هَلَكَ الَّذِينَ مَنْ قَبْلِكُمْ، أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ، وَايْمُ اللَّهِ، لَوْ سَرَقَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ مُحَمَّدٍ لَقَطَعْتُ يَدَهَا»[1].

**واتە: ئیسحاقی کوڕی ڕاشد دەگێڕێتەوە، لە زوهری، لە عوروە، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، قورەیش لە خەمی ئەو ئافرەتە مەخزومیەدا بوون کە دزیکرد، وتیان: کێ لە بارەیەوە قسە لەگەڵ پێغەمبەردا دەکات؟ وتیان: کێ جورئەتی ئەوە دەکات جگە لە ئوسامەی کوڕی زەید؟ خۆشەویستی پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئوسامەش لەبارەیەوە قسەی لەگەڵدا کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی خەڵکانی پێش ئێوە لەناوچوون، ئەوان کاتێ کەسێکی بەڕێز و بەناوبانگ دزی بکردایە وازیان لێدەهێنا، وە ئەگەر کەسێکی لاوازو بێکەس دزی بکردایە سنووریان بەسەردا جێبەجێ دەکرد، سوێند بە خوا ئەگەر فاطیمەی کچی موحەممەد دزی بکردایە دەستیم دەبڕی.**

**٤٩٠٢-** «عَنْ يُونُسَ، عَنْ بْنِ شِهَابٍ، أَنَّ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ أَخْبَرَهُ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ امْرَأَةً سَرَقَتْ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ الْفَتْحِ، فَأُتِيَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَكَلَّمَهُ فِيهَا أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، فَلَمَّا كَلَّمَهُ تَلَوَّنَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ؟ فَقَالَ لَهُ أُسَامَةُ: اسْتَغْفِرْ لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَلَمَّا كَانَ الْعَشِيُّ، قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ ﷻ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ، إِنَّمَا هَلَكَ النَّاسُ قَبْلَكُمْ، أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ قَطَعْتُ يَدَهَا»[2].

**واتە: یونس دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو شیهاب، لە عوروەی کوڕی زوبەیر هەواڵی پێداوە، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، ئافرەتێک لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ دزیکرد لە جەنگی ئازاد کردنی مەککە، هێنرا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئوسامە لە بارەیەوە قسەی لەگەڵدا کرد، کاتێ قسەی لەگەڵدا کرد ڕوخساری پێغەمبەر گۆڕا،**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا لە سنورێک لە سنورەکانی خوادا تکام لێدەکەی؟ ئوسامە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێخۆشبونم بۆ بکە، کاتێ شەو هات، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا، سوپاس و ستایشی خوای کرد بەوەی شیاویەتی، پاشان فەرمووی: بەڕاستی خەڵکانێک پێش ئێوە لەناوچوون، ئەوان کاتێ کە کەسێکی بەڕێز و بەناوبانگ دزی بکردایە وازیان لێدەهێنا، وە ئەگەر کەسێکی لاوازو بێکەس دزی بکردایە سنووریان بە سەردا جێبەجێ دەکرد، سوێند بەو خوایەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، ئەگەر فاطیمەی کچی موحەممەد دزی بکردایە دەستیم دەبڕی، پاشان دەستی ئەو بڕدرا.

**٤٩٠٣-** «عَنْ يُونُسَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ: أَنَّ امْرَأَةً سَرَقَتْ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ الْفَتْحِ «مُرْسَلٌ» فَفَزِعَ قَوْمُهَا إِلَى أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ يَسْتَشْفِعُونَهُ، قَالَ عُرْوَةُ: فَلَمَّا كَلَّمَهُ أُسَامَةُ فِيهَا تَلَوَّنَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: أَتُكَلِّمُنِي فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ؟ قَالَ أُسَامَةُ: اسْتَغْفِرْ لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَلَمَّا كَانَ الْعَشِيُّ، قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَطِيباً، فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ. ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّمَا هَلَكَ النَّاسُ قَبْلَكُمْ، أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا ثُمَّ أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِ تِلْكَ الْمَرْأَةِ فَقُطِعَتْ، فَحَسُنَتْ تَوْبَتُهَا بَعْدَ ذَلِكَ، قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: وَكَانَتْ تَأْتِينِي بَعْدَ ذَلِكَ فَأَرْفَعُ حَاجَتَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[1].

واتە: یونس دەگێڕێتەوە، لە زوهریەوە دەڵێ: عورووەی کوڕی زوبەیر هەواڵی پێدام: ئافرەتێک لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ دزیکرد لە جەنگی ئازاد کردنی مەککە (مُرْسَلٌ) کەسوکارەکەی بە هەڵەداوان چوون بۆ لای ئوسامەی کوڕی زەید تکایان بۆ بکات، عوروە دەڵێ: کاتێ ئوسامە لە بارەیەوە قسەی لەگەڵدا کرد، ڕوخساری پێغەمبەری خوا ﷺ گۆڕا و فەرمووی: ئایا لە سنورێک لە سنورەکانی خوادا قسەم لەگەڵ دەکەی؟ ئوسامە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێخۆشبونم بۆ بکە، کاتێ شەو هات، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵساو وتارێکیدا سوپاس و ستایشی خوای کرد بەوەی شیاویەتی، پاشان فەرمووی: بەڕاستی خەڵکانی پێش ئێوە لەناوچوون، ئەوان کاتێ کە کەسێکی بەڕێز و بەناوبانگ دزی بکردایە وازیان لێدەهێنا، وە ئەگەر

---

(١) صحيح.




کەسێکی لاوازو بێکەس دزی بکردایە سنووریان بەسەردا جێبەجێ دەکرد، سوێند بەو خوایەی گیانی موحەمەدی بەدەستە، ئەگەر فاطیمەی کچی موحەممەد دزی بکردایە دەستیم دەبڕی)، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد دەستی بڕایەوە، دوای ئەوە تەوبەیەکی چاکی کرد، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) وتی: دوای ئەوە دەهات بۆ لای پێویستیەکانم بەرزدەکردەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ.

## هاندان لەسەر جێبەجێ کردنی سنورەکانی خوا

**٤٩٠٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: حَدٌّ يُعْمَلُ فِي الْأَرْضِ خَيْرٌ لِأَهْلِ الْأَرْضِ مِنْ أَنْ يُمْطَرُوا ثَلَاثِينَ صَبَاحًا»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سنورێک لە سنورەکانی خوا لەسەر زەویدا جێبەجێ بکرێت چاکترە بۆ خەڵکی سەر زەوی لەوەی سی بەیانیان بارانیان بۆ بباریَ.**

**٤٩٠٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: إِقَامَةُ حَدٍّ بِأَرْضٍ خَيْرٌ لِأَهْلِهَا مِنْ مَطَرِ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: جێبەجێکردنی سنورێک لەسەر زەویەکدا، چاکترە بۆ خەڵکەکەی لە بارانی چل شەو.**

## ئەو ئەندازەی ئەگەر دز دزی کرد دەستی دەبڕدرێت

**٤٩٠٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، يَقُولُ: قَطَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مِجَنٍّ قِيمَتُهُ خَمْسَةُ دَرَاهِمَ»[٣].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە بڕینی دەستی یەکێک لەسەر (دزینی) قەڵغانێک بەهاکەی پێنج درهەم بوو.**

---

(١) حسن بلفظ «أَرْبَعِينَ». أخرجه إبن ماجه: ٢٥٣٨.

(٢) حسن موقوف.

(٣) صحيح بلفظ «ثَلاَثَة».




**٤٩٠٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَطَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مِجَنٍّ ثَمَنُهُ ثَلَاثَةُ دَرَاهِمَ»[١].

**واته: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە بڕینی دەستی یەکێک لەسەر (دزینی) قەڵغانێک نرخەکەی سێ درهەم بوو.**

**٤٩٠٨-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَطَعَ فِي مِجَنٍّ ثَمَنُهُ ثَلَاثَةُ دَرَاهِمَ»[٢].

**واته: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە بڕینی دەستی یەکێک لەسەر (دزینی) قەڵغانێک نرخەکەی سێ درهەم بوو (درهەمی ئەوکات زێڕ بوو).**

**٤٩٠٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: قَالَ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَطَعَ يَدَ سَارِقٍ سَرَقَ تُرْساً مِنْ صُفَّةِ النِّسَاءِ ثَمَنُهُ ثَلَاثَةُ دَرَاهِمَ»[٣].

**واته: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە بڕینی دەستی دزێک قەڵغانێکی دزی لە شوێنی تایبەت بە ئافرەتان نرخەکەی سێ درهەم بوو.**

**٤٩١٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَطَعَ فِي مِجَنٍّ قِيمَتُهُ ثَلَاثَةُ دَرَاهِمَ»[٤].

**واته: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە بڕینی دەستی یەکێک لەسەر (دزینی) قەڵغانێک بەهاکەی پێنج درهەم بوو.**

**٤٩١١-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَطَعَ فِي مِجَنٍّ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: هَذَا خَطَأٌ»[٥].

---

**(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٦٩٥ و ٦٧٩٨، ومسلم: ١٦٨٦، وأبو داود: ٤٣٨٥ و ٤٣٨٦، والترمذي: ١٤٤٦، وابن ماجه: ٢٥٨٤.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) صحيح.**

**(٤) صحيح.**

**(٥) صحيح لغيره.**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە بڕینی دەستی یەکێک لەسەر (دزینی) قەڵغانێ. عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: ئەم سەنەدە هەڵەیە.

**٤٩١٢-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَطَعَ أَبُو بَكْرٍ فِي مِجَنٍّ قِيمَتُهُ خَمْسَةُ دَرَاهِمَ، هَذَا الصَّوَابُ»(١).

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئەبو بەکر فەرمانی کرد بە بڕینی دەستی یەکێک لەسەر (دزینی) قەڵغانێک نرخەکەی پێنج درهەم بوو، ئەم سەنەدە تەواوە.

**٤٩١٣-** «عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَنَساً ﷺ يَقُولُ: سَرَقَ رَجُلٌ مِجَنّاً عَلَى عَهْدِ أَبِي بَكْرٍ، فَقُوِّمَ خَمْسَةَ دَرَاهِمَ، فَقُطِعَ»(٢).

واتە: قەتادە دەڵێ: گوێم لە ئەنەس ﷺ بوو دەیوت: پیاوێک قەڵغانێکی دزی لە سەردەمی ئەبو بەکردا، بەهاکەی پێنج درهەم دەبوو، بۆیە دەستی بڕا.

## باسی جیاوازی لەسەر زوهری لە فەرموودەکەدا

**٤٩١٤-** «عَنْ حَفْصِ بْنِ حَسَّانَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَطَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي رُبْعِ دِينَارٍ»(٣).

واتە: حەفصی کوڕی حەسان دەگێڕێتەوە، لە زوهری، لە عوروە، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی دزێکی بڕی لە چوار یەکی دینارێک. (یەک دینار بەرانبەرە بە مسقاڵێک زێڕ کەواتە: دەکاتە یەک لەسەر چواری مسقاڵێک).

**٤٩١٥-** «عَنْ يُونُسَ، عَنِ بْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا تُقْطَعُ الْيَدُ إِلَّا فِي ثَمَنِ الْمِجَنِّ ثُلُثِ دِينَارٍ، أَوْ نِصْفِ دِينَارٍ، فَصَاعِداً»(٤).

واتە: یونس دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو شیهاب، لە عوروە، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەست نابڕدرێ تەنها لە نرخی قەڵغانێکدا نەبێت کە یەک لەسەر سێی دینارێکە، یان نیو دینار، بەرەو سەرەوە.

---

(١) حسن صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) منكر.





**٤٩١٦-** «عنْ يُونُسَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: قَالَتْ عَمْرَةُ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ فِي رُبْعِ دِينَارٍ»[١].

**واتە: یونس دەگێڕێتەوە، لە زوهری دەڵێ: عەمرە وتی: لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەستی دز دەبڕدرێ لە یەک لەسەر چواری دینارێک بەرەو سەرەوە.**

**٤٩١٧-** «عَنْ يُونُسَ، عَنِ بْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ وَعَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِداً»[٢].

**واتە: یونس دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو شیهاب، لە عوروە و عەمرە، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەستی دز دەبڕدرێ لە یەک لەسەر چواری دینارێک بەرەو سەرەوە.**

**٤٩١٨-** «عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِداً»[٣].

**واتە: مەعمەر دەگێڕێتەوە، لە زوهری، لە عەمرە، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەستی دز دەبڕدرێ لە یەک لەسەر چواری دینارێک بەرەو سەرەوە.**

**٤٩١٩-** «عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِداً»[٤].

**واتە: مەعمەر دەگێڕێتەوە، لە زوهری، لە عەمرە، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەستی دز دەبڕدرێ لە یەک لەسەر چواری دینارێک بەرەو سەرەوە.**

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧٨٩ و ٦٧٩١، ومسلم: ١ و ١٦٨٤/٤، وأبو داود: ٤٣٨٣ و ٤٣٨٤، والترمذي: ١٤٤٥، وإبن ماجه: ٢٥٨٥.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

**٤٩٢٠-** «عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ بْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: تُقْطَعُ الْيَدُ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِداً»(١).

**واتە: مەعمەر دەگێڕێتەوە، لە زوهری، لە عەمرە، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: دەستی دز دەبڕدرێ لە یەک لەسەر چواری دینارێک بەرەو سەرەوە.**

**٤٩٢١-** «عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ قُتَيْبَةُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْطَعُ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِداً»(٢).

**واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە، لە زوهری، لە عەمرە، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی دزی دەبڕی لە یەک لەسەر چواری دینارێک بەرەو سەرەوە.**

**٤٩٢٢-** «عَنْ سَعِيدٍ، عنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِداً»(٣).

**واتە: سەعید دەگێڕێتەوە، لە یەحیای کوڕی سەعید، لە عەمرە، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دەستی دز دەبڕدرێ لە یەک لەسەر چواری دینارێک بەرەو سەرەوە.**

٤٩٢٣- «عَنْ أَبَانٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِداً»(٤).

**واتە: ئەبان دەگێڕێتەوە، لە یەحیای کوڕی سەعید، لە عەمرە، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دەستی دز دەبڕدرێ لە یەک لەسەر چواری دینارێک بەرەو سەرەوە.**

**٤٩٢٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ، أَنَّهَا سَمِعَتْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، تَقُولُ: يُقْطَعُ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِداً»(٥).

---

(١) صحيح موقوف.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

(٥) موقوف و لا ينافي المرفوع.




**واتە: عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە، لە یەحیای کوڕی سەعید، لە عەمرە، ئەو بیستی عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەیوت: دەستی دز دەبڕدرێ لە یەک لەسەر چواری دینارێک بەرەو سەرەوە.**

**٤٩٢٥-** «عَنِ ابْنِ إِدْرِيسَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ:الْقَطْعُ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِداً»[١].

**واتە: ئیبنو ئیدریس دەگێڕێتەوە، لە یەحیای کوڕی سەعید، لە عەمرە، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بڕینی دەست لە یەک لەسەر چواری دینارێک بەرەو سەرەوەیە.**

**٤٩٢٦-** « عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، وَعَبْدِ رَبِّهِ، وَرُزَيْقٍ صَاحِبِ أَيْلَةَ أَنَّهُمْ سَمِعُوا عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ:الْقَطْعُ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِداً»[٢].

**واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە، لە یەحیای کوڕی سەعیدو عەبدو ڕەبەو زورەیقی خاوەنی ئەیلە، ئەوان بیستیان لە عەمرەوە، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بڕینی دەست لە یەک لەسەر چواری دینارێک بەرەو سەرەوەیە (واتە: لە چارەکە مسقاڵێک).**

**٤٩٢٧-** «عَنْ مَالِكٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا طَالَ عَلَيَّ، وَلَا نَسِيتُ الْقَطْعُ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِداً»[٣].

**واتە: مالیک دەگێڕێتەوە، لە یەحیای کوڕی سەعید، لە عەمرە، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: نە زۆری بەسەردا ڕۆیشتووەو نە بیرم چووە، بڕینی دەست لە یەک لەسەر چواری دینارێک بەرەو سەرەوەیە.**

---

(١) صحيح موقوف.

(٢) صحيح موقوف.

(٣) صحيح موقوف.




## باسی جیاوازی ئەبو بەكری كوڕی موحەممەدو عەبدوڵلای كوڕی ئەبو بەكر لە عەمرەوە لەم فەرموودەدا

**٤٩٢٨-** «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا يُقْطَعُ السَّارِقُ إِلَّا فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِداً»[١].

**واتە: ئەبو بەكری كوڕی موحەممەد دەگێڕێتەوە، لە عەمرە، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەو گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەستی دز نابڕدرێ مەگەر لە یەک لەسەر چواری دینارێک بەرەو سەرەوە.**

**٤٩٢٩-** «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ حَزْمٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِثْلَ الْأَوَّلِ»[٢].

**واتە: ئەبو بەكری كوڕی موحەممەدی كوڕی حەزم دەگێڕێتەوە، لە عەمرە، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، لە پێغەمبەری خوا ﷺ هەروەكو ئەوەی یەكەم.**

**٤٩٣٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ عَمْرَةَ قَالَتْ: قَالَتْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: الْقَطْعُ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِداً»[٣].

**واتە: عەبدوڵلای كوڕی موحەممەدی كوڕی ئەبو بەكر دەگێڕێتەوە، لە عەمرە و دەڵێ: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) وتویەتی: بڕینی دەست لە یەک لەسەر چواری دینارێک بەرەو سەرەوەیە.**

**٤٩٣١-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي الرِّجَالِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ فِي ثَمَنِ الْمِجَنِّ، وَثَمَنُ الْمِجَنِّ رُبْعُ دِينَارٍ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح موقوف.

(٤) حسن صحيح الإسناد.




**واتە: عەبدوڕڕەحمانی كوڕی موحەممەدی كوڕی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ئەبو رجال، لە باوكیەوە، لە عەمرە، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەستی دز دەبڕدرێ لە نرخی قەڵغانێكدا، نرخی قەڵغانێكیش یەک لەسەر چواری دینارێكە.**

**٤٩٣٢-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، حَدَّثَهُ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْطَعُ الْيَدَ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِداً»[١].

**واتە: موحەممەدی كوڕی عەبدوڕڕەحمان دەگێڕێتەوە، لە عەمرە، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی دزی دەبڕی لە یەک لەسەر چواری دینارێک بەرەو سەرەوە.**

**٤٩٣٣-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، «ثُمَّ ذَكَرَ كَلِمَةً مَعْنَاهَا» عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تُقْطَعُ الْيَدُ إِلَّا فِي رُبْعِ دِينَارٍ»[٢].

**واتە: موحەممەدی كوڕی عەبدوڕڕەحمان دەگێڕێتەوە، «پاشان باسی وشەیەكی كرد ماناكەی» لە عەمرە، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەستی دزی نابڕدرێ مەگەر بگاتە یەک لەسەر چواری دینارێک.**

**٤٩٣٤-** «عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي عِكْرِمَةُ، أَنَّ امْرَأَةً أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ أَخْبَرَتْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: تُقْطَعُ الْيَدُ فِي الْمِجَنِّ»[٣].

**واتە: یەحیای كوڕی ئەبو كەثیر دەڵێ: عیكریمە بۆی باس كردم، ئافرەتێک هەواڵی پێدا، عائیشە دایكی ئیمانداران (خوا لێی ڕازی بێ) هەواڵی پێدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەستی دز دەبڕدرێ لە نرخی قەڵغانێكدا.**

**٤٩٣٥-** «عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، أَنَّ بُكَيْرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْأَشَجِّ حَدَّثَهُ، أَنَّ سُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ حَدَّثَهُ، أَنَّ عَمْرَةَ ابْنَةَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ حَدَّثَتْهُ، أَنَّهَا، سَمِعَتْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا تَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ فِيمَا دُونَ الْمِجَنِّ قِيلَ لِعَائِشَةَ: مَا ثَمَنُ الْمِجَنِّ؟ قَالَتْ: رُبْعُ دِينَارٍ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح لغيره.

واتە: یەزیدی کوڕی ئەبو حەبیب دەگێڕێتەوە، بوکەیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەشەج بۆی باسکرد، سولەیمانی کوڕی یەسار بۆی باس کرد، عەمرەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان بۆی باسکرد لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) بیستویەتی دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەستی دز نابڕدرێ (لە دزینی شتێک) کەمتر بێت لە نرخی قەڵغانێک، بە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) وترا: نرخی قەڵغانێک چەند؟ وتی: یەک لەسەر چواری دینارێکە.

**٤٩٣٦-** «عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ إِلَّا فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِداً»[١].

واتە: سولەیمانی کوڕی یەسار دەگێڕێتەوە، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) ئەو گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەستی دزی نابڕدرێ مەگەر بگاتە یەک لەسەر چواری دینارێک.

**٤٩٣٧-** «عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْوَلِيدِ، مَوْلَى الْأَخْنَسِيِّينَ يَقُولُ: سَمِعْتُ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ يَقُولُ: كَانَتْ عَائِشَة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا تُحَدِّثُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ يَقُولُ: لَا تُقْطَعُ الْيَدُ إِلَّا فِي الْمِجَنِّ أَوْ ثَمَنِهِ»[٢].

واتە: عوسمانی کوڕی ئەبو ولید مەولای ئەخنەسیەکان دەڵێ: گوێم لە عوروەی کوڕی زوبەیر بوو دەیوت: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) باسی دەکرد، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیفەرموو: دەستی دز نابڕدرێ مەگەر لە قەڵغانێک یان نرخەکەی.

**٤٩٣٨-** «عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْوَلِيدِ يَقُولُ: سَمِعْتُ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ يَقُولُ: كَانَتْ عَائِشَة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا تُحَدِّثُ، عَنْ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: لَا تُقْطَعُ الْيَدُ إِلَّا فِي الْمِجَنِّ أَوْ ثَمَنِهِ وَزَعَمَ أَنَّ عُرْوَةَ قَالَ: الْمِجَنُّ أَرْبَعَةُ دَرَاهِمَ»[٣].

واتە: عوسمانی کوڕی ئەبو ولید دەڵێ: گوێم لە عوروەی کوڕی زوبەیر بوو دەیوت: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) باسی دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**دەستی دز نابڕدرێ مەگەر لە قەڵغانێک، یان نرخەکەی، پێی وابوو عوروە وتی: نرخی قەڵغانێک بریتیە لە چوار درهەم.**

**٤٩٣٩-** «عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، سمعتُ عَمْرَةَ تَقُولُ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا تُحَدِّثُ، أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا تُقْطَعُ الْيَدُ إِلَّا فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَمَا فَوْقَهُ»[١].

**واتە: سولەیمانی کوڕی یەسار دەڵێ: گوێم لە عەمرە بوو دەیوت: گوێم لە عائیشە بوو (خوا لێی ڕازی بێ) باسی دەکرد کە ئەو بیستویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: دەستی دز نابڕدرێ مەگەر بگاتە یەک لەسەر چواری دینارێک (دینارێکیش بریتیە لە مسقاڵێک زێڕ)، بەرەو سەرەوەش.**

**٤٩٤٠-** «عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ قَالَ: لَا تُقْطَعُ الْخَمْسُ إِلَّا فِي الْخَمْسِ قَالَ هَمَّامٌ فَلَقِيتُ عَبْدَ اللَّهِ الدَّانَاجَ، فَحَدَّثَنِي عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ قَالَ: لَا تُقْطَعُ الْخَمْسُ إِلَّا فِي الْخَمْسِ»[٢].

**واتە: سولەیمانی کوڕی یەسار دەڵێ: پێنج پەنجەکە نابڕدرێ مەگەر نرخی دزییەکە بگاتە پێنج درهەم. هەمام وتی: گەیشتم بە عەبدوڵڵای کوڕی داناج، ئەویش بۆی باسکردم لە سولەیمانی کوڕی یەسار دەڵێ: پێنج پەنجەکە نابڕدرێ مەگەر نرخی دزییەکە بگاتە پێنج درهەم.**

**٤٩٤١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: لَمْ تُقْطَعْ يَدُ سَارِقٍ فِي أَدْنَى مِنْ حَجَفَةٍ أَوْ تُرْسٍ، وَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا ذُو ثَمَنٍ»[٣].

**واتە: عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە، لە هیشامی کوڕی عوروە، لە باوکی، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: دەستی دز نابڕدرێ بە کەمتر لە نرخی (حَجَفَةٍ أَوْ تُرْسٍ) کە دوو جۆر قەڵغانن، هەر یەکەیان بە نرخن.**

**٤٩٤٢-** «عَنْ عِيسَى، عَنْ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَطَعَ فِي قِيمَةِ خَمْسَةِ دَرَاهِمَ»[٤].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح مقطوع مخالف للمرفوع.**

**(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧٩٢ و ٦٧٩٤، ومسلم: ١٦٨٥.**

**(٤) ضعيف.**





واتە: عیسا دەگێڕێتەوە، لە شەعبی، لە عەبدوڵلاوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە بڕینی دەست کە دزیەکە بگاتە نرخی پێنج درهەم.

**٤٩٤٣-** «عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ أَيْمَنَ ﷺ قَالَ: لَمْ يَقْطَعِ النَّبِيُّ ﷺ السَّارِقَ إِلَّا فِي ثَمَنِ الْمِجَنِّ، وَثَمَنُ الْمِجَنِّ يَوْمَئِذٍ دِينَارٌ»(١).

**واتە: مەنصور دەگێڕێتەوە، لە موجاهید، لە عەطاء، لە ئەیمەنەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستی دزی نەدەبڕیەوە مەگەر بگەیشتایەتە نرخی قەڵغانێک، نرخی قەڵغانێکیش لەو ڕۆژەدا دینارێک بوو.**

**٤٩٤٤-** «عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ أَيْمَنَ ﷺ قَالَ: لَمْ تَكُنْ تُقْطَعُ الْيَدُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَّا فِي ثَمَنِ الْمِجَنِّ، وَقِيمَتُهُ يَوْمَئِذٍ دِينَارٌ»(٢).

**واتە: مەنصور دەگێڕێتەوە، لە موجاهید، لە ئەیمەنەوە ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەستی دزی نەدەبڕایەوە مەگەر بگەیشتایەتە نرخی قەڵغانێک، نرخی قەڵغانێکیش لەو ڕۆژەدا دینارێک بوو.**

**٤٩٤٥-** «عَنْ مَنْصُورٍ، عَنِ الْحَكَمِ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ أَيْمَنَ ﷺ قَالَ: لَمْ تُقْطَعِ الْيَدُ فِي زَمَنِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَّا فِي ثَمَنِ الْمِجَنِّ، وَقِيمَةُ الْمِجَنِّ يَوْمَئِذٍ دِينَارٌ»(٣).

**واتە: مەنصور دەگێڕێتەوە، لە حەکەم، لە موجاهید، لە ئەیمەنەوە ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەستی دز نەدەبڕایەوە مەگەر بگەیشتایەتە نرخی قەڵغانێک، نرخی قەڵغانێکیش لەو ڕۆژەدا دینارێک بوو.**

**٤٩٤٦-** «عَنْ مَنْصُورٍ، عَنِ الْحَكَمِ، عَنْ مُجَاهِدٍ وَعَطَاءٍ، عَنْ أَيْمَنَ ﷺ قَالَ: لَمْ تُقْطَعِ الْيَدُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَّا فِي ثَمَنِ الْمِجَنِّ وَثَمَنُهُ يَوْمَئِذٍ دِينَارٌ»(٤).

**واتە: مەنصور دەگێڕێتەوە، لە حەکەم، لە موجاهید و عەطاء، لە ئەیمەنەوە ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ دەستی دز نەدەبڕایەوە مەگەر بگەیشتایەتە نرخی قەڵغانێک، نرخەکەیشی لەو ڕۆژەدا دینارێک بوو.**

---

(١) منكر.
(٢) منكر.
(٣) منكر.
(٤) منكر.

**٤٩٤٧-** «عَنْ مَنْصُورٍ، عَنِ الْحَكَمِ، عَنْ عَطَاءٍ وَمُجَاهِدٍ، عَنْ أَيْمَنَ ﷺ قَالَ: يُقْطَعُ السَّارِقُ فِي ثَمَنِ الْمِجَنِّ، وَكَانَ ثَمَنُ الْمِجَنِّ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ دِينَاراً أَوْ عَشْرَةَ دَرَاهِمَ»[١].

**واتە: مەنصور دەگێڕێتەوە، لە حەکەم، لە عەطاء و موجاهید، لە ئەیمەنەوە ﷺ دەڵێ: دەستی دز دەبڕدرا لە نرخی قەڵغانێک، نرخی قەڵغانێکیش لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ دینارێک یان دە درهەم بوو.**

**٤٩٤٨-** «عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ عَطَاءٍ وَمُجَاهِدٍ، عَنْ أَيْمَنَ بْنِ أُمِّ أَيْمَنَ ﷺ يَرْفَعُهُ قَالَ: لَا تُقْطَعُ الْيَدُ إِلَّا فِي ثَمَنِ الْمِجَنِّ، وَثَمَنُهُ يَوْمَئِذٍ دِينَارٌ»[٢].

**واتە: مەنصور دەگێڕێتەوە، لە عەطاء و موجاهید، لە ئەیمەنی کوڕی ئوممو ئەیمەن ﷺ ڕەفعی دەکات، دەڵێ: دەستی دز نەدەبڕایەوە مەگەر بگەیشتایەتە نرخی قەڵغانێک، نرخەکەیشی لەو ڕۆژەدا دینارێک بوو.**

**٤٩٤٩-** «عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ عَطَاءٍ وَمُجَاهِدٍ، عَنْ أَيْمَنَ ﷺ قَالَ: لَا يُقْطَعُ السَّارِقُ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَمَنِ الْمِجَنِّ»[٣].

**واتە: مەنصور دەگێڕێتەوە، لە عەطاء و موجاهید، لە ئەیمەنەوە ﷺ دەڵێ: دەستی دز نەدەبڕایەوە لە کەمتر نرخی قەڵغانێک.**

**٤٩٥٠-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، أَنَّ عَطَاءَ بْنَ أَبِي رَبَاحٍ حَدَّثَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا كَانَ يَقُولُ: ثَمَنُهُ يَوْمَئِذٍ عَشْرَةُ دَرَاهِمَ»[٤].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، عەطائی کوڕی ئەبو ڕەباح بۆی باس کردوە، عەبدوڵڵا کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەیوت: نرخی قەڵغان لەو ڕۆژەدا دە درهەم بوو.**

**٤٩٥١-** «عَنْ أَيُّوبَ بْنِ مُوسَى، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا مِثْلَهُ: كَانَ ثَمَنُ الْمِجَنِّ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يُقَوَّمُ عَشْرَةَ دَرَاهِمَ»[٥].

---

(١) منكر.

(٢) منكر.

(٣) ضعيف.

(٤) شاذ.

(٥) شاذ.




**واتە: ئەیوبی کوڕی موسا دەگێڕێتەوە، لە عەطاء، لە ئیبنو عەبباس (خوا لێی ڕازی بێ) هەر وەکو فەرموودەکەی پێشوو: نرخی قەڵغان لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بە دە درهەم دەخەمڵێنرا.**

**٤٩٥٢-** «عَنْ أَيُّوبَ بْنِ مُوسَى، عَنْ عَطَاءٍ مُرْسَلٌ»[١].

**واتە: ئەیوبی کوڕی موسا دەگێڕێتەوە، لە عەطاء بە (مُرْسَلٌ) هێناویەتی.**

**٤٩٥٣-** «عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي سُلَيْمَانَ، عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: أَدْنَى مَا يُقْطَعُ فِيهِ ثَمَنُ الْمِجَنِّ، قَالَ: وَثَمَنُ الْمِجَنِّ يَوْمَئِذٍ عَشْرَةُ دَرَاهِمَ»[٢].

**واتە: عەبدولمەلیکی کوڕی سولەیمان دەگێڕێتەوە، لە عەطائەوە دەڵێ: کەمترین شتێ دەستی پێ ببڕدرێ ئەوەیە کە نرخەکەی بگاتە قەڵغانێک، وتی: نرخی قەڵغانێکیش لەو ڕۆژگارەدا دە درهەم بوو.**

**٤٩٥٤-** «عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ أَيْمَنَ مولى بْنِ الزُّبَيْرِ وقال خَالِدٌ في حَدِيثِهِ مولى الزُّبَيْرِ، عَنْ تُبَيْعٍ، عَنْ كَعْبٍ قَالَ: مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ صَلَّى، وَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: فَصَلَّى الْعِشَاءَ الْآخِرَةَ، ثُمَّ صَلَّى بَعْدَهَا أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، فَأَتَمَّ، وَقَالَ سَوَّارٌ يُتِمُّ رُكُوعَهُنَّ، وَسُجُودَهُنَّ وَيَعْلَمُ مَا يَقْتَرِئُ وَقَالَ سَوَّارٌ يَقْرَأُ فِيهِنَّ: كُنَّ لَهُ بِمَنْزِلَةِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ»[٣].

**واتە: عەبدولمەلیکی دەگێڕێتەوە، لە عەطاء، لە ئەیمەن مەولای ئیبنو زوبەیر، وە خالد لە فەرموودەکەیدا وتویەتی: مەولای زوبەیرە لە توبەیع، لە کەعبەوە دەڵێ: هەرکەس دەستنوێژی گرت بەچاکترین شێوە، پاشان نوێژی کرد، عەبدوڕڕەحمان وتی: نوێژی عیشای کرد، پاشان دوای ئەوە چوار ڕکات نوێژی کرد، بە چاکی، سەوار وتی: ڕکوع و سوژدە بە چاکی بردو بزانێ چی دەخوێنێ، سەوار وتی: قوڕئانیان تێدا بخوێنێ: پلەی شەوی قەدریان هەیە بۆ ئەو.**

**٤٩٥٥-** «عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ أَيْمَنَ، مَوْلَى ابْنِ عُمَرَ، عَنْ تُبَيْعٍ، عَنْ كَعْبٍ ﷺ قَالَ: مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ شَهِدَ صَلَاةَ الْعَتَمَةِ فِي جَمَاعَةٍ، ثُمَّ صَلَّى إِلَيْهَا أَرْبَعاً مِثْلَهَا يَقْرَأُ فِيهَا، وَيُتِمُّ رُكُوعَهَا وَسُجُودَهَا، كَانَ لَهُ مِنَ الْأَجْرِ مِثْلُ لَيْلَةِ الْقَدْرِ»[٤].

---

(١) شاذ.

(٢) مقطوع مخالف للمرفوع.

(٣) مقطوع موقوف.

(٤) مقطوع موقوف.

واتە: ئیبنو جورەیج دەگێڕێتەوە، لە عەطاء، لە ئەیمەن مەولای عومەر، لە توبەیع، لە کەعبەوە ﷺ دەڵێ: هەرکەس دەستنوێژ بگرێت بە چاکترین شێوە، پاشان ئامادەی نوێژی عیشای بێت بە کۆمەڵ، پاشان چوار ڕکاتی تر بکات وەکو ئەوەو قورئانی تێدا بخوێنێ و بە چاکی ڕکوع و سوژدە ببات، پاداشتی بۆ هەیە وەکو شەوی قەدر.

**٤٩٥٦-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: كَانَ ثَمَنُ الْمِجَنِّ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَشْرَةَ دَرَاهِمَ»[1].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەیەوە ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ نرخی قەڵغان دە درهەم بوو.

## بەروبوومی هەڵواسراو بدزرێ (مەبەست دزینی ئەو شتانەیە کە لە شوێنی پاراستنی خۆیاندا نین)

**٤٩٥٧-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي كَمْ تُقْطَعُ الْيَدُ؟ قَالَ: لَا تُقْطَعُ الْيَدُ فِي ثَمَرٍ مُعَلَّقٍ، فَإِذَا ضَمَّهُ الْجَرِينُ قُطِعَتْ فِي ثَمَنِ الْمِجَنِّ، وَلَا تُقْطَعُ فِي حَرِيسَةِ الْجَبَلِ، فَإِذَا آوَى الْمُرَاحَ قُطِعَتْ فِي ثَمَنِ الْمِجَنِّ»[2].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەیەوە ﷺ دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە چەنددا دەستی دز دەبڕدرێ؟ فەرمووی: دەست نابڕدرێ لە بەروبوومێکی هەڵواسراودا (وەک خورما بە دارخورماکەوە)، ئەگەر خورماکان لە شوێنێکدا کۆکرانەوەو (دزرا، ئەوە) دەستی دزەکە دەبڕدرێ، ئەگەر خورماکە بگاتە نرخی قەڵغانێک، وە دەست نابڕدرێ لە ئاژەڵێکدا کە لە ناو شاخ و کێودا بدزرێ، بەڵام ئەگەر لەناو پەچەدا دزرا ئەوە دەستی دەبڕدرێ ئەگەر بگاتە نرخی قەڵغانێک.

---

(١) شاذ.

(٢) حسن.




## بەروبووم دوای ئەوەی خرایە شوێنی پێویست بە خۆی بدزرێ

**٤٩٥٨-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الثَّمَرِ الْمُعَلَّقِ فَقَالَ: مَا أَصَابَ مِنْ ذِي حَاجَةٍ غَيْرَ مُتَّخِذٍ خُبْنَةً، فَلَا شَيْءَ عَلَيْهِ، وَمَنْ خَرَجَ بِشَيْءٍ مِنْهُ فَعَلَيْهِ غَرَامَةُ مِثْلَيْهِ وَالْعُقُوبَةُ، وَمَنْ سَرَقَ شَيْئاً مِنْهُ بَعْدَ أَنْ يُؤْوِيَهُ الْجَرِينُ، فَبَلَغَ ثَمَنَ الْمِجَنِّ فَعَلَيْهِ الْقَطْعُ، وَمَنْ سَرَقَ دُونَ ذَلِكَ فَعَلَيْهِ غَرَامَةُ مِثْلَيْهِ وَالْعُقُوبَةُ»[1].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەی عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ، پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەروبوومی هەڵواسراو؟ فەرمووی: هەرکەس پێویستی پێی هەبێ و لێی بخوات بەبێ ئەوەی بیخاتە گیرفانەکانی ئەوە هیچی لەسەر نیە، هەرکەسیش شتێکی لێ ببات ئەوە پێویستە وەکو خۆی بیبژێرێ و سزایشی بۆ هەیە، هەرکەسیش شتێکی لێ بدزێ دوای ئەوەی لە شوێنی پێویستدا هەڵدەگیرێ، ڕێژەی ئەو دزراوە بگاتە نرخی قەڵغانێک ئەوە پێویستە دەستی ببڕدرێ، هەرکەسیش کەمتر لەو نرخە بدزێ ئەوە پێویستە هاوشێوەی ببژێرێ و سزایشی بۆ هەیە.**

**٤٩٥٩-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً مِنْ مُزَيْنَةَ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ تَرَى فِي حَرِيسَةِ الْجَبَلِ؟ فَقَالَ: هِيَ وَمِثْلُهَا وَالنَّكَالُ وَلَيْسَ فِي شَيْءٍ مِنَ الْمَاشِيَةِ قَطْعٌ، إِلَّا فِيمَا آوَاهُ الْمُرَاحُ، فَبَلَغَ ثَمَنَ الْمِجَنِّ، فَفِيهِ قَطْعُ الْيَدِ، وَمَا لَمْ يَبْلُغْ ثَمَنَ الْمِجَنِّ، فَفِيهِ غَرَامَةُ مِثْلَيْهِ وَجَلَدَاتُ نَكَالٍ. قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ تَرَى فِي الثَّمَرِ الْمُعَلَّقِ؟ قَالَ: هُوَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ، وَالنَّكَالُ وَلَيْسَ فِي شَيْءٍ مِنَ الثَّمَرِ الْمُعَلَّقِ قَطْعٌ، إِلَّا فِيمَا آوَاهُ الْجَرِينُ، فَمَا أُخِذَ مِنَ الْجَرِينِ فَبَلَغَ ثَمَنَ الْمِجَنِّ فَفِيهِ الْقَطْعُ، وَمَا لَمْ يَبْلُغْ ثَمَنَ الْمِجَنِّ فَفِيهِ غَرَامَةُ مِثْلَيْهِ وَجَلَدَاتُ نَكَالٍ»[2].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەی عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ)، پیاوێک لە موزەینە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەڵێی دەربارەی ئاژەڵێک لە شاخ و**

---

(١) حسن.

(٢) حسن. أخرجه إبن ماجه: ٢٥٩٦.




کێو بدزرێ؟ فەرمووی: وەکو خۆی دەبیژێرێ و دارکاری دەکرێ، دەست برین لە هیچ جۆرە ئاژەڵێکدا نیە، مەگەر لە ناو پەچاکەیدا بیدزێ و نرخەکەیشی بگاتە نرخی قەڵغانێک ئەو کات دەستی دەبڕدرێ، وە ئەگەر نەگاتە نرخی قەڵغانێک ئەوا دەستی نابڕدرێ و تەنها وەکو ئەوەی پێ دەبژێردرێ و چەند دارێکی لێدەدرێ وەک تەمێ کردن، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەڵێی دەربارەی بەروبوومی هەڵواسراو؟ فەرمووی: ئەویش وەکو ئەوەی پێ دەبژێردرێ و دارکاری دەکرێ، دەست برین لە (دزینی) هیچ جۆرە بەروبوومێکی هەڵواسراودا نیە، مەگەر لەوەی لە شوێنی تایبەتی خۆیدا هەڵگیرابێ، جا هەر شتێک لەو بەروبوومانە لە شوێنی پێویستدا هەڵگیران و نرخەکەی گەیشتە نرخی قەڵغانێک ئەوە دەست برینی تێدایە، وە ئەگەر نەگەیشتە نرخی قەڵغانێک ئەوا بەو ئەندازەیەی دزیویەتی دەبیژێرێ و چەند دارێکی لێدەدرێ.

## بابەت: دزینی ئەو شتەی دەست برینی تێدانیە

**٤٩٦٠-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلَا كَثَرٍ»[١].

واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەست برین لە بەرووبوومی هەڵواسراودا نیە کە بەسەر دارەکەوە بێت پێش ئەوەی لە شوێنی تایبەت بە خۆی هەڵبگیرێ، وە لە ئەو شتە سپیەی کە لە نێوەڕاستی دارخورمادایەو دەخورێ.

**٤٩٦١-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلَا كَثَرٍ»[٢].

واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەست برین لە بەرووبوومی هەڵواسراودا نیە کە بەسەر دارەکەوە بێت پێش ئەوەی لە شوێنی تایبەت بە خۆی هەڵبگیرێ، وە لە ئەو شتە سپیەی کە لە نێوەڕاستی دارخورمادایە و دەخورێ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٣٨٨ و ٤٣٨٩، والترمذي: ١٤٤٩، وإبن ماجه: ٢٥٩٣.




**٤٩٦٢-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلَا كَثَرٍ»[١].

**واته: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەست بڕین لە بەرووبوومی هەڵواسراودا نیە کە بەسەر دارەکەوە بێت پێش ئەوەی لە شوێنی تایبەت بە خۆی هەڵبگیرێ، وە لە ئەو شتە سپیەی کە لە نێوەڕاستی دارخورمادایەو دەخورێ.**

**٤٩٦٣-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلَا كَثَرٍ»[٢].

**واته: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەست بڕین لە بەرووبوومی هەڵواسراودا نیە کە بەسەر دارەکەوە بێت پێش ئەوەی لە شوێنی تایبەت بە خۆی هەڵبگیرێ، وە لە ئەو شتە سپیەی کە لە ناوەڕاستی دارخورمادایە و دەخورێ.**

**٤٩٦٤-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلَا كَثَرٍ»[٣].

**واته: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەست بڕین لە بەرووبوومی هەڵواسراودا نیە کە بەسەر دارەکەوە بێت پێش ئەوەی لە شوێنی تایبەت بە خۆی هەڵبگیرێ، وە لە ئەو شتە سپیەی کە لە نێوەڕاستی دارخورمادایەو دەخورێ.**

**٤٩٦٥-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلَا كَثَرٍ»[٤].

**واته: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەست بڕین لە بەرووبوومی هەڵواسراودا نیە کە بەسەر دارەکەوە بێت پێش ئەوەی لە شوێنی تایبەت بە خۆی هەڵبگیرێ، وە لە ئەو شتە سپیەی کە لە نێوەڕاستی دارخورمادایەو دەخورێ.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**٤٩٦٦-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلَا كَثَرٍ»[١].

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەست بڕین لە بەرووبوومی هەڵواسراودا نیە کە بەسەر دارەکەوە بێت پێش ئەوەی لە شوێنی تایبەت بە خۆی هەڵبگیرێ، وە لە ئەو شتە سپیەی کە لە نێوەڕاستی دارخورمادایەو دەخورێ.**

**٤٩٦٧-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلَا كَثَرٍ، وَالْكَثَرُ: الْجُمَّارُ»[٢].

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەست بڕین لە بەرووبوومی هەڵواسراودا نیە کە بەسەر دارەکەوە بێت پێش ئەوەی لە شوێنی تایبەت بە خۆی هەڵبگیرێ، وە لە ئەو شتە سپیەی کە لە نێوەڕاستی دارخورمادایەو دەخورێ.**

**٤٩٦٨-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلَا كَثَرٍ»[٣].

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەست بڕین لە بەرووبوومی هەڵواسراودا نیە کە بەسەر دارەکەوە بێت پێش ئەوەی لە شوێنی تایبەت بە خۆی هەڵبگیرێ، وە لە ئەو شتە سپیەی کە لە نێوەڕاستی دارخورمادایەو دەخورێ.**

**٤٩٦٩-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلَا كَثَرٍ»[٤].

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەست بڕین لە بەرووبوومی هەڵواسراودا نیە کە بەسەر دارەکەوە بێت پێش ئەوەی لە شوێنی تایبەت بە خۆی هەڵبگیرێ، وە لە ئەو شتە سپیەی کە لە نێوەڕاستی دارخورمادایەو دەخورێ.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح.

**٤٩٧٠-** «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلَا كَثَرٍ»[١].

**واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەست بڕین لە بەرووبوومی هەڵواسراودا نیە کە بەسەر دارەکەوە بێت پێش ئەوەی لە شوێنی تایبەت بە خۆی هەڵبگیرێ، وە لە ئەو شتە سپیەی کە لە نێوەڕاستی دارخورمادایەو دەخورێ.**

**٤٩٧١-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَيْسَ عَلَى خَائِنٍ وَلَا مُنْتَهِبٍ، وَلَا مُخْتَلِسٍ قَطْعٌ، لَمْ يَسْمَعْهُ سُفْيَانُ مِنْ أَبِي الزُّبَيْرِ»[٢].

**واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خیانەتکارو (ئەویش ئەو ماڵەیە کە بە ئەمانەت لێی وەردەگرێ و دواتر نایداتەوە) تاڵانچی و (ئەو کەسەیە کە بە ئاشکراو بە زۆر ماڵی خەڵک تاڵان دەکات)، موختلیس (ئەو کەسەیە کە شت دڕفێنێ لەماڵ، یان ئێواران لە دەستی خاوەنەکەی دیڕفێنێ، ئەوەندە ماڵەکە بە پەلە دەبات خاوەنەکەی هەستی پێناکات) دەست بڕینیان بۆ نیە. (هەر یەک لەوانە مانای دزێتی کە دەست بڕینی تێدایە لە خۆ ناگرێ، چونکە دزێتی ئەوەیە شتێک بە نهێنی لە خاوەنەکەی بدزێ، بەڵکو ئەوانە حوکمی تایبەت بە خۆیان هەیە) سوفیان لە ئەبو زوبەیر نەیبیستووە.**

**٤٩٧٢-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيْسَ عَلَى خَائِنٍ، وَلَا مُنْتَهِبٍ، وَلَا مُخْتَلِسٍ قَطْعٌ وَلَمْ يَسْمَعْهُ أَيْضاً ابْنُ جُرَيْجٍ مِنْ أَبِي الزُّبَيْرِ»[٣].

**واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خیانەتکارو تاڵانچی موختەلیس دەست بڕینیان لەسەر نیە. ئیبنو جورەیج ئەم فەرموودەی لە ئیبنو زوبێر نەبیستووە.**

**٤٩٧٣-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: لَيْسَ عَلَى الْمُخْتَلِسِ قَطْعٌ»[٤].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٣٩١ و ٤٣٩٢ و ٤٣٩٣، والترمذي: ١٤٤٨، وإبن ماجه: ٢٥٩١ و ٣٩٣٥.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: موختەلیس دەست بڕینی لەسەر نیە.**

**٤٩٧٤-** «أَخْبَرَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْحَسَنِ، عَنْ حَجَّاجٍ قَالَ : قَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ : قَالَ أَبُو الزُّبَيْرِ : قَالَ جَابِرٌ : لَيْسَ عَلَى الْخَائِنِ قَطْعٌ . قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: وَقَدْ رَوَى هَذَا الْحَدِيثَ عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ عِيسَى بْنُ يُونُسَ، وَالْفَضْلُ بْنُ مُوسَى، وَابْنُ وَهْبٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ رَبِيعَةَ، وَمَخْلَدُ بْنُ يَزِيدَ، وَسَلَمَةُ بْنُ سَعِيدٍ بَصْرِيٌّ ثِقَةٌ، قَالَ: ابْنُ أَبِي صَفْوَانَ، وَكَانَ خَيْرَ أَهْلِ زَمَانِهِ، فَلَمْ يَقُلْ أَحَدٌ مِنْهُمْ : حَدَّثَنِي أَبُو الزُّبَيْرِ. وَلَا أَحْسَبُهُ سَمِعَهُ مِنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، وَاللَّهُ تَعَالَى أَعْلَمُ»[١].

**واتە: ئیبراهیمی کوڕی حەسەن هەواڵی پێدام، لە حەجاجەوە وتی: ئیبنو جورەیج وتی: ئەبو زوبەیر وتی: جابر ﷺ وتی: موختلیس (ئەوەی شت دەڕفێنێ) دەست بڕینی لەسەر نیە. ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: ئەم فەرموودەیە ئیبنو جورەیج و عیسای کوڕی یونس و فەزلی کوڕی موساو ئیبنو وەهەب و موحەممەدی کوڕی ڕەبیعەو موخەلەدی کوڕی یەزیدو سەلەمەی کوڕی سەعیدی بەصری کە ئەو متمانە پێکراوە، ئیبنو ئەبی صەفوان دەڵێ: چاکترینی سەردەمی خۆی بووە، هیچ کەسیان نەیانوتووە ئەبو زوبێر بۆی باسکردم، وە وا هەست ناکەم لە ئەبو زوبێرەوە بیستبێتی، خوا زاناترە.**

**٤٩٧٥-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيْسَ عَلَى مُخْتَلِسٍ، وَلَا مُنْتَهِبٍ، وَلَا خَائِنٍ قَطْعٌ»[٢].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: موختەلیس (ئەوەی شت دەڕفێنێ) و تاڵانچی و خیانەتکار دەست بڕینیان لەسەر نیە (سزای تریان بۆ هەیە).**

**٤٩٧٦-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: لَيْسَ عَلَى خَائِنٍ قَطْعٌ»[٣].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: خیانەتکار دەست بڕینی لەسەر نیە.**

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف والصحيح مرفوع.




## بابەت: بڕینەوەی قاچی دز دوای دەستی

**٤٩٧٧-** «عَنِ الْحَارِثِ بْنِ حَاطِبٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُتِيَ بِلِصٍّ فَقَالَ: اقْتُلُوهُ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّمَا سَرَقَ، فَقَالَ: اقْتُلُوهُ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا سَرَقَ، قَالَ: اقْطَعُوا يَدَهُ. قَالَ: ثُمَّ سَرَقَ فَقُطِعَتْ رِجْلُهُ، ثُمَّ سَرَقَ عَلَى عَهْدِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ، حَتَّى قُطِعَتْ قَوَائِمُهُ كُلُّهَا، ثُمَّ سَرَقَ أَيْضاً الْخَامِسَةَ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَعْلَمَ بِهَذَا حِينَ قَالَ: اقْتُلُوهُ، ثُمَّ دَفَعَهُ إِلَى فِتْيَةٍ مِنْ قُرَيْشٍ لِيَقْتُلُوهُ، مِنْهُمْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الزُّبَيْرِ، وَكَانَ يُحِبُّ الْإِمَارَةَ، فَقَالَ: أَمِّرُونِي عَلَيْكُمْ. فَأَمَّرُوهُ عَلَيْهِمْ، فَكَانَ إِذَا ضَرَبَ ضَرَبُوهُ حَتَّى قَتَلُوهُ»[١].

واتە: حارثی کوڕی حاطیب ﷺ دەگێڕێتەوە، دزێکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیکوژن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە دزیکردوە، فەرمووی: بیکوژن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە دزی کردوە، فەرمووی: دەستی ببڕنەوە، وتی: پاشان دزی کرد قاچیان بڕیەوە، پاشان دزی کرد لە سەردەمی ئەبو بەکردا ﷺ هەتا هەردوو دەست و هەردوو قاچی بڕایەوە، پاشان لە جاری پێنجەمدا دزیکرد ئەبو بەکر وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە حاڵی ئەمەی زانی کاتێ فەرمووی: بیکوژن، پاشان دایە دەستی کۆمەڵە گەنجێک لە قورەیش بۆ ئەوەی بیکوژن، لەوانەش عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر بوو، حەزی لە دەسەڵات بوو، وتی: من بکەن بە ئەمیری خۆتان، ئەوانیش کردیان بە ئەمیری خۆیان، کاتێ لێی بدایە لێیان دەدا، هەتا کوشتیان.

## بابەت: بڕینی هەردوو دەست و هەردوو قاچی دز

**٤٩٧٨-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: جِيءَ بِسَارِقٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: اقْتُلُوهُ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا سَرَقَ، قَالَ: اقْطَعُوهُ فَقُطِعَ. ثُمَّ جِيءَ بِهِ الثَّانِيَةَ، فَقَالَ: اقْتُلُوهُ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا سَرَقَ قَالَ: اقْطَعُوهُ، فَقُطِعَ. فَأُتِيَ بِهِ الثَّالِثَةَ فَقَالَ: اقْتُلُوهُ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّمَا سَرَقَ، فَقَالَ: اقْطَعُوهُ. ثُمَّ أُتِيَ بِهِ الرَّابِعَةَ، فَقَالَ: اقْتُلُوهُ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا سَرَقَ، قَالَ: اقْطَعُوهُ. فَأُتِيَ بِهِ الْخَامِسَةَ قَالَ: اقْتُلُوهُ، قَالَ جَابِرٌ: فَانْطَلَقْنَا بِهِ إِلَى مِرْبَدِ النَّعَمِ، وَحَمَلْنَاهُ فَاسْتَلْقَى عَلَى ظَهْرِهِ، ثُمَّ كَشَّرَ بِيَدَيْهِ وَرِجْلَيْهِ، فَانْصَدَعَتْ الْإِبِلُ، ثُمَّ حَمَلُوا عَلَيْهِ الثَّانِيَةَ،

---

(١) (ضعيف) منكر.




فَفَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ حَمَلُوا عَلَيْهِ الثَّالِثَةَ، فَرَمَيْنَاهُ بِالْحِجَارَةِ فَقَتَلْنَاهُ، ثُمَّ أَلْقَيْنَاهُ فِي بِئْرٍ، ثُمَّ رَمَيْنَا عَلَيْهِ بِالْحِجَارَةِ»[١].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: دزێکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیکوژن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە دزیکردوە، فەرمووی: دەستی ببڕنەوە، دەستیان بڕیەوە، پاشان بۆ جاری دووەم هێنایانەوە (دووبارە دزی کردبوویەوە)، فەرمووی: بیکوژن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە دزیکردوە، فەرمووی: دەستی ببڕنەوە، دەستیان بڕیەوە، پاشان بۆ جاری سێیەم هێنرایەوە، فەرمووی: بیکوژن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە دزیکردوە، فەرمووی: دەستی ببڕنەوە، پاشان بۆ جاری چوارم هێنرایەوە، فەرمووی: بیکوژن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە دزیکردوە، فەرمووی: دەستی ببڕنەوە، پاشان بۆ جاری پێنجەم هێنرایەوە، فەرمووی: بیکوژن، جابر وتی: بردمان بۆ لای پاچای وشتر، خستیانە سەر وشترێک خۆی خستە خوارەوە لەسەر پشت، پاشان دەست و قاچی شکا، وشترەکان پەشۆکان، پاشان بۆ جاری دووەم خستیانە سەر وشترەکە، هەروەکو جاری یەکەمی کرد، پاشان بۆ جاری سێیەم ئەوەیان کرد، بە هەمان شێوەی یەکەمی کردەوە، ئێمەش بەردبارانمان کرد بە بەردو کوشتمان، پاشان فڕێماندایە ناو بیرێکەوەو پاشان بەردەکانمان دا بەسەریدا.**

## بڕینەوەی دەستی دز لە گەشتدا

**٤٩٧٩-** «عَنْ جُنَادَةَ بْنِ أَبِي أُمَيَّةَ، قَالَ: سَمِعْتُ بُسْرَ بْنَ أَبِي أَرْطَاةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا تُقْطَعُ الْأَيْدِي فِي السَّفَرِ»[٢].

**واتە: جونادەی کوڕی ئەبو ئومەییە دەڵێ: گوێم لە بوسری کوڕی ئەرطات ﷺ بوو وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەست نابڕدرێ لە سەفەردا.**

**٤٩٨٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا سَرَقَ الْعَبْدُ فَبِعْهُ وَلَوْ بِنَشٍّ»[٣].

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٤٠٨، والترمذي: ١٤٥٠.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٤١٢، وإبن ماجه: ٢٥٨٩.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کۆیلەیەک دزی کرد بیفرۆشە، ئەگەر بە نیوە قیمەتیش بێت.

## سنوری باڵغبوون و باسی ئەو تەمەنەی کە پیاو و ئافرەت پێی بگەن سزای خۆیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێ

**٤٩٨١-** «عَنْ عَطِيَّةَ ﷺ قَالَ: كُنْتُ فِي سَبْيِ قُرَيْظَةَ، وَكَانَ يُنْظَرُ، فَمَنْ خَرَجَ شِعْرَتُهُ قُتِلَ، وَمَنْ لَمْ تَخْرُجِ اسْتُحْيِيَ وَلَمْ يُقْتَلْ»[١].

**واتە:** عەطیە ﷺ دەڵێ: من یەکێک بووم لە دیلەکانی قوریظە، تەماشا دەکرا هەر کەس تووکی بەری بهاتایە سنوریان بەسەریدا جێبەجێ دەکردو دەکوژرا، هەرکەسیش تووکی بەری نەهاتایە نەدەکوژرا.

## هەڵواسینی دەستی دز بە گەردنی

**٤٩٨٢-** «عَنِ ابْنِ مُحَيْرِيزٍ قَالَ: سَأَلْتُ فَضَالَةَ بْنَ عُبَيْدٍ ﷺ، عَنْ تَعْلِيقِ يَدِ السَّارِقِ فِي عُنُقِهِ، قَالَ: سُنَّةٌ قَطَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَ سَارِقٍ، وَعَلَّقَ يَدَهُ فِي عُنُقِهِ»[٢].

**واتە:** ئیبنو موحەیریز دەڵێ: پرسیارم کرد لە فەضالەی کوڕی عوبەید ﷺ، لەبارەی هەڵواسینی دەستی دز بە گەردنی، وتی: سوننەتە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی دزێکی بڕی و دەستی هەڵواسی بە گەردنیدا.

**٤٩٨٣-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مُحَيْرِيزٍ قَالَ: قُلْتُ لِفَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ ﷺ: أَرَأَيْتَ تَعْلِيقَ الْيَدِ فِي عُنُقِ السَّارِقِ مِنَ السُّنَّةِ؟ هُوَ قَالَ: نَعَمْ، أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِسَارِقٍ فَقَطَعَ يَدَهُ وَعَلَّقَهُ فِي عُنُقِهِ»[٣].

**واتە:** عەبدوڕڕەحمانی کوڕی موحەیریز دەڵێ: بە فەضالەی کوڕی عوبەیدم ﷺ وت: ئایا پێت وایە هەڵواسینی دەستی دز بە گەردنی سونەت بێت؟ وتی: بەڵێ، دزێکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بڕیەوەو هەڵیواسی بە گەردنیدا.

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٤١١، والترمذي: ١٤٤٧، وإبن ماجه: ٢٥٨٧.

(٣) ضعيف.




**٤٩٨٤-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷛، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يُغَرَّمُ صَاحِبُ سَرِقَةٍ إِذَا أُقِيمَ عَلَيْهِ الْحَدُّ»[1].

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷛ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی دزی دەکات ئەگەر سزای شەرعی بەسەردا جێبەجێکرا ماڵە دزراوەکەی پێ نابژێردرێ.**

---

(١) ضعيف.




## باسی چاکترینی کردەوەکان

**٤٩٨٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ: أَيُّ الْأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: الْإِيمَانُ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ کام لە کردەوەکان چاکترینە؟ فەرمووی: بڕواهێنان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی.**

**٤٩٨٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُبْشِيٍّ الْخَثْعَمِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ: أَيُّ الْأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ فَقَالَ: إِيمَانٌ لَا شَكَّ فِيهِ، وَجِهَادٌ لَا غُلُولَ فِيهِ، وَحَجَّةٌ مَبْرُورَةٌ»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حوبشی خوثعەمی ﷺ دەگێڕێتەوە: پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ کام لە کردەوەکان چاکترینە؟ فەرمووی: بڕواهێنانێک هیچ گومانێکی تێدا نەبێت، وە جیهادێک هیچ دزیەکی تێدا نەبێت، هەروەها حەجێکی وەرگیراویش.**

## چێژی ئیمان

**٤٩٨٧-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ بِهِنَّ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ وَطَعْمَهُ: أَنْ يَكُونَ اللَّهُ ﷻ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ فِي اللَّهِ، وَأَنْ يَبْغُضَ فِي اللَّهِ، وَأَنْ تُوقَدَ نَارٌ عَظِيمَةٌ فَيَقَعَ فِيهَا أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ أَنْ يُشْرِكَ بِاللَّهِ شَيْئاً»[٣].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ شت هەن لە هەرکەسدا هەبێ بە هۆیانەوە شیرینی و چێژی ئیمان دەبینێ: خواو پێغەمبەری ﷺ لە هەموو شتێک زیاتر خۆش بوێ، تەنها لە پێناوی خوادا کەسێکی خوش بوێ، لە پێناوی خوایشدا ڕقی لێی بێت، پێی خۆش بێت ئاگرێکی مەزنی بۆ دابگیرسێنرێ و بخرێتە ناوی لەوەی جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ هاوبەشدانان.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦، ومسلم: ٨٣.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٣٢٥ و ١٤٤٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦ و ٢١، ومسلم: ٤٣.

## شیرینی بڕواو ئیمان

**٤٩٨٨-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ: مَنْ أَحَبَّ الْمَرْءَ لَا يُحِبُّهُ إِلَّا لِلَّهِ ﷻ، وَمَنْ كَانَ اللَّهُ ﷻ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَمَنْ كَانَ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الْكُفْرِ بَعْدَ أَنْ أَنْقَذَهُ اللَّهُ مِنْهُ»[1].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سێ شت هەن لە هەرکەسدا هەبێ شیرینی ئیمان دەچێژێ: کەسێک کەسێکی خۆش بوێ تەنها لەبەر خوا خۆشی بوێ، وە کەسێک خواو پێغەمبەری لە هەموو شتێک زیاتر لەلا خۆشەویستر بێت، وە کەسێک پێی خۆش بێت فڕێ بدرێتە ناو ئاگرەوە لەوەی جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ سەر بێبڕوایی دوای ئەوەی خوا ڕزگاریکردوە لێی.**

## شیرینی ئیسلام

**٤٩٨٩-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ بِهِنَّ حَلَاوَةَ الْإِسْلَامِ: مَنْ كَانَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَمَنْ أَحَبَّ الْمَرْءَ لَا يُحِبُّهُ إِلَّا لِلَّهِ، وَمَنْ يَكْرَهُ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الْكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُلْقَى فِي النَّارِ»[2].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سێ شت هەن لە هەرکەسدا هەبێ بە هۆیانەوە شیرینی ئیسلام دەچێژێ: کەسێک خواو پێغەمبەرەکەی لە هەموو شتێ زیاتر خۆش بوێ، وە کەسێک تەنها لەبەر خوا کەسێکی تری خۆش بوێ، وە کەسێک هێندە پێی ناخۆش بێ بگەڕێتەوە بۆ بێبڕوایی، وەک چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە ناو ئاگرەوە.**

## بابەت: وەسفی ئیسلام

**٤٩٩٠-** «عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ إِذْ طَلَعَ عَلَيْنَا رَجُلٌ شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ، شَدِيدُ سَوَادِ الشَّعَرِ، لَا يُرَى عَلَيْهِ أَثَرُ السَّفَرِ، وَلَا يَعْرِفُهُ مِنَّا أَحَدٌ، حَتَّى

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.





جَلَسَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَسْنَدَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى رُكْبَتَيْهِ، وَوَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى فَخِذَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ أَخْبِرْنِي عَنِ الْإِسْلَامِ؟ قَالَ: أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلاً قَالَ: صَدَقْتَ. فَعَجِبْنَا إِلَيْهِ يَسْأَلُهُ وَيُصَدِّقُهُ، ثُمَّ قَالَ: أَخْبِرْنِي عَنِ الْإِيمَانِ؟ قَالَ: أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَالْقَدَرِ كُلِّهِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ قَالَ: صَدَقْتَ. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الْإِحْسَانِ؟ قَالَ: أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ السَّاعَةِ؟ قَالَ: مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ بِهَا مِنَ السَّائِلِ. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنْ أَمَارَاتِهَا؟ قَالَ: أَنْ تَلِدَ الْأَمَةُ رَبَّتَهَا، وَأَنْ تَرَى الْحُفَاةَ الْعُرَاةَ الْعَالَةَ رِعَاءَ الشَّاءِ يَتَطَاوَلُونَ فِي الْبُنْيَانِ. قَالَ عُمَرُ: فَلَبِثْتُ ثَلَاثاً، ثُمَّ قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا عُمَرُ هَلْ تَدْرِي مَنِ السَّائِلُ؟ قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: فَإِنَّهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ أَتَاكُمْ لِيُعَلِّمَكُمْ أَمْرَ دِينِكُمْ»[1].

**واتە: عومەری کوڕی خەطاب ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە دانشتبووین لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕۆژێک بوو، لە ناکاو پیاوێکی جل سپی هات بۆ ناومان، قژی زۆر ڕەش بوو، شوێنەواری گەشت و سەفەری پێوە دیار نەبوو، هیچ کەس لە ئێمە نەیدەناسی، تا هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و دانیشت، ئەژنۆی نا بە ئەژنۆی ئەوەوە، لەپی دەستەکانیشی خستە سەر ڕانی، پاشان وتی: ئەی موحەممەد هەواڵم بدەرێ دەربارەی ئیسلام؟ فەرمووی: شایەتی بدەی بەوەی هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لە خوا، وە موحەممەدیش نێردراوی خوایە، نوێژەکانیشت بە چاکی ئەنجام بدەیت و زەکاتی ماڵەکەیشت دەربکەیت و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانیش بگری، وە حەجی ماڵی خوا بکەیت ئەگەر توانیت، وتی: ڕاستت فەرموو، ئێمەیش پێمان سەیر بوو پرسیاری لێدەکات و بەڕاستی دادەنێت، پاشان وتی: هەواڵم بدەرێ دەربارەی ئیمان؟ فەرمووی: بڕوا بە خوا بهێنی، وە بە فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی، وە بە قەزاو قەدەر بە گشتی خێر و شەڕی، وتی: ڕاستت فەرموو، وتی: هەواڵم بدەرێ دەربارەی ئیحسان؟ فەرمووی: خوا بپەرستی هەروەک ئەوەی دەیبینی، ئەگەر تۆیش ئەو نەبینی بێگومان ئەو تۆ دەبینێ، وتی: هەواڵم بدەرێ دەربارەی ڕۆژی دوایی؟ فەرمووی: پرسیار لێکراو هەر ئەوەندەی پرسیار لێکەری لێدەزانێ، وتی: هەواڵم بدەرێ دەربارەی نیشانەکانی؟ فەرمووی: کەنیزەک**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨، وأبو داود: ٤٦٩٥، والترمذي: ٢٦١٠، وإبن ماجه: ٦٣.

منداڵی دەبێ لە گەورەکەی و منداڵەکەی دەبێتە سەیدو گەورەی دایکی، وە دەبینی خەڵکی پێ خاوس و پەتی و ڕوت و قووت و هەژارو شوان و گاوان خانوەکانیان بەرزدەکەنەوە قات لە سەر قات، عومەر وتی: سێ شەو مامەوەو چاوەڕوانم کرد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: ئەی عومەر ئایا دەزانی پرسیار کەر کێ بوو؟ وتم: خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناترن، فەرمووی: ئەوە جبیرل بوو هات بۆ ناوتان بۆ ئەوەی فێری کاروباری ئاینەکەتان بکات.

## سیفاتی ئیمان و ئیسلام

**٤٩٩١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي ذَرٍّ قَالَا: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَجْلِسُ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ أَصْحَابِهِ، فَيَجِيءُ الْغَرِيبُ فَلَا يَدْرِي أَيُّهُمْ هُوَ حَتَّى يَسْأَلَ، فَطَلَبْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَجْعَلَ لَهُ مَجْلِساً يَعْرِفُهُ الْغَرِيبُ إِذَا أَتَاهُ، فَبَنَيْنَا لَهُ دُكَّاناً مِنْ طِينٍ، كَانَ يَجْلِسُ عَلَيْهِ، وَإِنَّا لَجُلُوسٌ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مَجْلِسِهِ، إِذْ أَقْبَلَ رَجُلٌ أَحْسَنُ النَّاسِ وَجْهاً، وَأَطْيَبُ النَّاسِ رِيحاً، كَأَنَّ ثِيَابَهُ لَمْ يَمَسَّهَا دَنَسٌ، حَتَّى سَلَّمَ فِي طَرَفِ الْبِسَاطِ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا مُحَمَّدُ، فَرَدَّ عَلَيْهِ السَّلَامُ، قَالَ: أَدْنُو يَا مُحَمَّدُ، قَالَ: ادْنُهْ، فَمَا زَالَ يَقُولُ: أَدْنُو مِرَاراً، وَيَقُولُ لَهُ: ادْنُ حَتَّى وَضَعَ يَدَهُ عَلَى رُكْبَتَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أَخْبِرْنِي مَا الْإِسْلَامُ؟ قَالَ: الْإِسْلَامُ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ، وَلَا تُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ، قَالَ: إِذَا فَعَلْتُ ذَلِكَ فَقَدْ أَسْلَمْتُ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: صَدَقْتَ. فَلَمَّا سَمِعْنَا قَوْلَ الرَّجُلِ صَدَقْتَ أَنْكَرْنَاهُ، قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أَخْبِرْنِي مَا الْإِيمَانُ؟ قَالَ: الْإِيمَانُ بِاللَّهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَالْكِتَابِ، وَالنَّبِيِّينَ، وَتُؤْمِنُ بِالْقَدَرِ، قَالَ: فَإِذَا فَعَلْتُ ذَلِكَ فَقَدْ آمَنْتُ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: نَعَمْ، قَالَ: صَدَقْتَ. قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أَخْبِرْنِي مَا الْإِحْسَانُ؟ قَالَ: أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ، قَالَ: صَدَقْتَ. قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أَخْبِرْنِي مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: فَنَكَسَ فَلَمْ يُجِبْهُ شَيْئاً، ثُمَّ أَعَادَ، فَلَمْ يُجِبْهُ شَيْئاً، ثُمَّ أَعَادَ فَلَمْ يُجِبْهُ شَيْئاً، وَرَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ: مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ، وَلَكِنْ لَهَا عَلَامَاتٌ تُعْرَفُ بِهَا، إِذَا رَأَيْتَ الرِّعَاءَ الْبُهُمَ يَتَطَاوَلُونَ فِي الْبُنْيَانِ، وَرَأَيْتَ الْحُفَاةَ الْعُرَاةَ مُلُوكَ الْأَرْضِ، وَرَأَيْتَ الْمَرْأَةَ تَلِدُ رَبَّهَا، خَمْسٌ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا اللَّهُ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ ﴿٣٤﴾﴾لقمان، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾﴾لقمان، ثُمَّ قَالَ: لَا وَالَّذِي بَعَثَ مُحَمَّداً بِالْحَقِّ هُدًى وَبَشِيراً، مَا كُنْتُ بِأَعْلَمَ بِهِ مِنْ رَجُلٍ مِنْكُمْ، وَإِنَّهُ لَجِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ نَزَلَ فِي صُورَةِ دِحْيَةَ الْكَلْبِيِّ»[1].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٦٩٨.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: لە ئەبو زەڕ، وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان هاوەڵەکانیدا دادەنیشت، کەسێکی نەناسراو دەهات نەیدەزانی کامەیانە ئەوە هەتا پرسیاری لێبکات، داوامان کرد شوێنێک بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دابنێین کاتێ کەسێکی نەناسراو دێت بیناسێتەوە، جێگایەکمان بۆی دروست کرد لە قوڕ لەسەری دادەنیشت، ئێمە دادەنیشتین پێغەمبەری خوا ﷺ لە شوێنەکەی خۆی دادەنیشت، لە ناکاو پیاوێک هات جوانترین ڕوخساری هەبوو، خۆشترین بۆنیشی لێدەهات، جلەکانی هیچ پیسیەکی پێوە دیارنەبوو، هەتا لە تەنیشت ڕاخەرەکە جێگیر بوو، وتی: سڵاوی خوات لێ بێت ئەی موحەممەد، وەڵامی دایەوە سڵاو لە تۆش، وتی: نزیک بەرەوە ئەی موحەممەد، فەرمووی: نزیکی بکەنەوە، بەردەوام چەند جارێک وتی: نزیک بەرەوە، ئەویش پێی دەفەرموو: نزیک بەرەوە، هەتا دەستی خستە سەر ئەژنۆی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: ئەی موحەممەد هەواڵم بدەرێ ئیسلام چیە؟ فەرمووی: ئیسلام ئەوەیە خوا بپەرستی و هاوەڵی بۆ دانەنێی، نوێژەکانیشت بە چاکی ئەنجام بدەیت و زەکاتی ماڵەکەیشت دەربکەیت و وە حەجی ماڵی خوا بکەیت و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانیش بگری، فەرمووی: ئەگەر ئەوەم کرد ئەوا مسوڵمان دەبم؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: ڕاستت فەرموو. کاتێ بیستمان پیاوەکە وتی ڕاستت فەرموو سەرمان لێی سوڕما، وتی: هەواڵم بدەرێ بڕواهێنان چیە؟ فەرمووی: بڕوا بە خوا بهێنی، وە بە فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی، وە بڕوا بهێنی بە قەزاو قەدەر، ئەگەر ئەوەم کرد ئەوا بڕوام هێناوە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، وتی: ڕاستت فەرموو، وتی: ئەی موحەممەد هەواڵم بدەرێ ئیحسان چیە؟ فەرمووی: خوا بپەرستی هەر وەک ئەوەی دەیبینی، ئەگەر تۆیش ئەو نەبینی بێگومان ئەو تۆ دەبینێ، وتی: ڕاستت فەرموو، وتی: ئەی موحەممەد هەواڵم بدەرێ کەی ڕۆژی دوایی دێت؟ وتی: سەری خستە خوارو هیچ وەڵامی نەدایەوە، پاشان دووبارەی کردەوە، هیچ وەڵامی نەدایەوە، پاشان دووبارەی کردەوە، هیچ وەڵامی نەدایەوە، ئینجا سەری بەرزکردەوەو فەرمووی: پرسیار لێکراو هەرئەوەندەی پرسیار لێکەری لێدەزانێ، بەڵام چەند نیشانەیەکی هەیە پێی دەناسرێتەوە، ئەگەر بینیت شوانی ئاژەڵ خانووەکانیان بەرزدەکەنەوە قات لە سەر قات، وە خەڵکانی پێ خاوس و پێ پەتی و ڕووت و قووت بوون بە پاشای سەر زەوی، وە بینیت کەنیزەک منداڵی دەبێ لە گەورەکەی و منداڵەکەی دەبێتە سەیدو گەورەی دایکی، پێنج شت هەن





کەس نایزانێ جگە لە خوا: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ ﴿٣٤﴾ ﴾ لقمان، واتە: بەڕاستی لای خوایە زانیاری کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی. هەتا فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿٣٤﴾ ﴾ واتە: بەڕاستی خوا زاناو ئاگادارە. پاشان فەرمووی: نەخێر، سوێند بەو خوایەی موحەممەدی بە حەق ناردوە بۆ ڕێنمایی و مژدەدان، منیش هەر ئەوەندەی یەکێک لە ئێوەی لێ دەزانم، بەڕاستی ئەوە جیبریل (عَلَيْهِ السَّلاَمُ) بوو دابەزی لەسەر شێوەی پیاوێک بەناو دیحیەی کەلبی.

## تەفسیری فەرمایشتی خوا ﷻ:

﴿ قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا ﴿١٤﴾ ﴾[1].

**٤٩٩٢-** «عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﵁ قَالَ: أَعْطَى النَّبِيُّ ﷺ رِجَالاً، وَلَمْ يُعْطِ رَجُلاً مِنْهُمْ شَيْئاً، قَالَ سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَعْطَيْتَ فُلَاناً وَفُلَاناً، وَلَمْ تُعْطِ فُلَاناً شَيْئاً، وَهُوَ مُؤْمِنٌ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَوْ مُسْلِمٌ حَتَّى أَعَادَهَا سَعْدٌ ثَلَاثاً، وَالنَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: أَوْ مُسْلِمٌ، ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنِّي لَأُعْطِي رِجَالاً، وَأَدَعُ مَنْ هُوَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْهُمْ، لَا أُعْطِيهِ شَيْئاً مَخَافَةَ أَنْ يُكَبُّوا فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ»[2].

واتە: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەخشینی بە هەندێ پیاوی بەخشی و بە هەندێکیانی نەبەخشی، سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەفڵان و فڵانەکەست بەخشی، بەڵام هیچت بە فڵانە کەس نەبەخشی، ئەویش بڕوادارە؟ پێغەمبەر ﷺ بەڵکو مسوڵمانە، (چونکە ئیمان پەیوەستە بەدڵەوە، بەڵام ئیسلام پەیوەستە بە ڕواڵەتەوە، بۆیە هیچ کەس ناتوانیت حوکم بدات بەسەر دڵی کەسێکی تردا) تا سێ جار سەعد ئەمەی دووبارە کردەوە، پێغەمبەریش دەیفەرموو: بەڵکو مسوڵمانە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من بە پیاوانێک دەبەخشم، وە واز لەوکەسە دێنم و پێی نابەخشم کە لام خۆشەویستە، هیچی پێنابەخشم، لە ترسی ئەوەی لەسەر ڕوخساریان نەکەونە ناو ئاگرەوە.

---

(١) واتە: عەرەبە دەشتەکیەکان وتیان بڕوامان هێناوە ئەی موحەممەد بڵێ بڕواتان نەهێناوە بەڵکو بڵێن مسوڵمان بووین بەسەر زارەکی.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧، ومسلم: ١٥٠.

**٤٩٩٣-** «عَنْ سَعْدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَسَمَ قَسْماً، فَأَعْطَى نَاساً، وَمَنَعَ آخَرِينَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَعْطَيْتَ فُلَاناً، وَمَنَعْتَ فُلَاناً، وَهُوَ مُؤْمِنٌ؟ قَالَ: لَا تَقُلْ مُؤْمِنٌ، وَقُلْ مُسْلِمٌ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: ﴿قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ﴿١٤﴾﴾الحجرات»[1].

**واتە: سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستکەوتێکی دابەش کرد، بە خەڵکێکی بەخشی و بە خەڵکێ تری نەبەخشی، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بە فڵانەکەست بەخشی و بە فڵانت نەبەخشی، ئەویش بڕوادارە، فەرمووی: بەڵێ بڕوادارە، بەڵێ: مسوڵمانە، (چونکە ئیمان پەیوەستە بە دڵەوە، بەڵام ئیسلام پەیوەستە بە ڕواڵەتەوە، بۆیە هیچ کەس ناتوانێت حوکم بدات بەسەر دڵی کەسێکی تردا) ئیبنو شیهاب دەڵێ: ﴿قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ﴿١٤﴾﴾ (واتە: دەشتەکیەکان وتیان بڕوامان هێنا).**

**٤٩٩٤-** «عَنْ بِشْرِ بْنِ سُحَيْمٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَهُ أَنْ يُنَادِيَ أَيَّامَ التَّشْرِيقِ: أَنَّهُ لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلَّا مُؤْمِنٌ، وَهِيَ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ»[2].

**واتە: بیشری کوڕی سوحەیم ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد لە سێ ڕۆژی جەژنی قوربان بانگەواز بکات: بێگومان کەس ناچێتە بەهەشتەوە مەگەر بڕوادار، ئەو ڕۆژانە ڕۆژی خواردن و خواردنەوەن.**

## سیفەتی کەسی بڕوادار

**٤٩٩٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ النَّاسُ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَالْمُؤْمِنُ مَنْ أَمِنَهُ النَّاسُ عَلَى دِمَائِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ»[3].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مسوڵمان ئەو کەسەیە خەڵکی پارێزراوبن لە زمان و دەستی، بڕواداریش ئەو کەسەیە خەڵکی ئەمین بن لێی لە خوێن و ماڵ و سامانیان.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ١٧٢٠.

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٦٢٧.




## سیفەتی کەسی مسوڵمان

**٤٩٩٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ مَا نَهَى اللَّهُ عَنْهُ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: مسوڵمان ئەو کەسەیە مسوڵمانان پارێزراو بن لە زمان و دەستی، کۆچکەریش ئەو کەسەیە لەو شتە کۆچ بکات کە خوا ﷻ قەدەغەی کردوە.**

**٤٩٩٧-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ صَلَّى صَلَاتَنَا، وَاسْتَقْبَلَ قِبْلَتَنَا، وَأَكَلَ ذَبِيحَتَنَا فَذَلِكُمُ الْمُسْلِمُ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس وەکو ئێمە نوێژی کرد و ڕوو لە قیبلەکەمان کردو سەربڕاوەکانمانی خوارد، ئەوە مسوڵمانە.**

## چاکی و جوانی ئیسلامەتی مرۆڤ

**٤٩٩٨-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا أَسْلَمَ الْعَبْدُ فَحَسُنَ إِسْلَامُهُ، كَتَبَ اللَّهُ لَهُ كُلَّ حَسَنَةٍ كَانَ أَزْلَفَهَا، وَمُحِيَتْ عَنْهُ كُلُّ سَيِّئَةٍ كَانَ أَزْلَفَهَا، ثُمَّ كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ الْقِصَاصُ، الْحَسَنَةُ بِعَشْرَةِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ، وَالسَّيِّئَةُ بِمِثْلِهَا إِلَّا أَنْ يَتَجَاوَزَ اللَّهُ ﷻ عَنْهَا»[٣].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بەندە مسوڵمان بوو، بە شێوەیەکی چاک هەم بە دڵ و هەم بە جەستە، خوا هەموو چاکەیەکی بۆ دەنوسێ کە لە سەردەمی بێبڕواییدا کردوویەتی، وە هەموو گوناهێکی بۆ دەسڕێتەوە لە پێشتر ئەنجامی دابێت، پاشان دوای ئەوە بە هاوشێوە بوونە، چاکەیەک بەرانبەرە بە دە ئەوەندە هەتا حەود سەد ئەوەندە، خراپەیەکیش بە وێنەی خۆی مەگەر خوا چاوپۆشی لێ بکات.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠ و ٦٤٨٤، وأبو داود: ٥٠١١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩١ و ٣٩٣.

(٣) صحيح.

## چ مسوڵمانەتیەک چاکترینە؟

**٤٩٩٩-** «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الإِسْلَامِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ»(١).

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، چ مسوڵمانەتیەک چاکترینە؟ فەرمووی: ئەو کەسەی مسوڵمانان پارێزراو بن لە زمان و دەستی.

## چ مسوڵمانەتیەک خێرترینە

**٥٠٠٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أَيُّ الإِسْلَامِ خَيْرٌ؟ قَالَ: تُطْعِمُ الطَّعَامَ وَتَقْرَأُ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ، وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ»(٢).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ: چ مسوڵمانەتیەک چاکترینە؟ فەرمووی: خۆراک ببەخشی و سڵاو بکەی لەو کەسەی دەیناسی و لەو کەسەش کە نایناسی.

## ئیسلام لەسەر چەند پایە بونیادنراوە؟

**٥٠٠١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَجُلاً قَالَ لَهُ: أَلَا تَغْزُو؟ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالْحَجِّ، وَصِيَامِ رَمَضَانَ»(٣).

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک پێی وت: بۆچی غەزا ناکەی؟ وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئیسلام بونیاد نراوە لەسەر پێنج شت: شایەتیدان بەوەی هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، وە ئەنجامدانی نوێژ و، دانی زەکات و، حەجکردن و، (گرتنی) ڕۆژووی ڕەمەزان.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١، ومسلم: ٤٢، والترمذي: ٢٥٠٤ و ٢٦٢٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢، ومسلم: ٣٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٨، ومسلم: ١٦.




## بەیعەتدان لە سەر پابەند بوون بە ئیسلام

**٥٠٠٢-** «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فِي مَجْلِسٍ فَقَالَ: تُبَايِعُونِي عَلَى أَنْ لَا تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئاً، وَلَا تَسْرِقُوا، وَلَا تَزْنُوا قَرَأَ عَلَيْهِمُ الْآيَةَ فَمَنْ وَفَّى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئاً فَسَتَرَهُ اللَّهُ ﷻ، فَهُوَ إِلَى اللَّهِ إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ»[١].

**واتە: عوبادەی کوڕی صامت ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە کۆڕو مەجلیسێکدا بووین، فەرمووی: بەیعەتم پێ دەدەن لەسەر ئەوەی هاوبەش بۆ خوا دانەنێن و دزی و زینا نەکەن، ئایەتەکەی بە سەریاندا خوێندەوە، هەرکەس لە ئێوە پەیمانی خۆی بە چاکی بەجێهێنا پاداشتی لای خوایە، هەرکەسیش تووشی شتێک لەوانە بوو، پاشان خوا بۆی پۆشی ئەوە کاروباری لای خوایە، ئەگەر ویستی سزای دەدات، وە ئەگەر ویستی لێی خۆش دەبێت.**

## لەسەر چی مسوڵمانان دەجەنگن لەگەڵ خەڵکی

**٥٠٠٣-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ، فَإِذَا شَهِدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ، وَاسْتَقْبَلُوا قِبْلَتَنَا، وَأَكَلُوا ذَبِيحَتَنَا، وَصَلَّوْا صَلَاتَنَا، فَقَدْ حَرُمَتْ عَلَيْنَا دِمَاؤُهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ إِلَّا بِحَقِّهَا، لَهُمْ مَا لِلْمُسْلِمِينَ، وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَيْهِمْ»[٢].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکیدا بجەنگم هەتا شایەتی دەدەن بەوەی هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، وە موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە، جا ئەگەر شایەتیاندا بەوەی هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، وە موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە، ڕوویان کردە قیبلەکەمان و سەربڕاوەکانمانیان خوارد و هەر وەکو ئێمەش نوێژیان کرد، ئەوە خوێن و ماڵیان لەسەر ئێمە قەدەغە بووە، مەگەر بە حەقی ئیسلام، ئەوەی بۆ مسوڵمانان بێت بۆ ئەوانیشە، ئەوەشی لەسەر مسوڵمانان بێت لەسەر ئەوانیشە.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩٩٩، ومسلم: ١٧٠٩.

(٢) صحيح.

## باسی بەش و پلەکانی ئیمان

**٥٠٠٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ شُعْبَةً، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الْإِيمَانِ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئیمان حەفتاو ئەوەندە بەشە، شەرم و حەیاش بەشێکە لە ئیمان.**

**تێبینی: (بِضْع): لە زمانی عەرەبیدا ژمارە سێ (٣) بۆ نۆ (٩)، واتە: (٣،٤،٥،٦،٧،٨،٩) هەمووی دەگرێتەوە.**

**٥٠٠٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ شُعْبَةً، أَفْضَلُهَا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَوْضَعُهَا إِمَاطَةُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الْإِيمَانِ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیمان حەفتا ئەوەندە بەشە، چاکترین و باڵاترینیان (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)یە، کەمترینیشیان لابردنی ئاستەنگێکە لەسەر ڕێگا، شەرم و حەیاش بەشێکە لە ئیمان.**

**٥٠٠٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الْإِيمَانِ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شەرم و حەیا بەشێکە لە ئیمان.**

## جیاوازی بڕواداران لە پلەکانی بڕوادا

**٥٠٠٧-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُرَحْبِيلَ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مُلِئَ عَمَّارٌ إِيمَاناً إِلَى مُشَاشِهِ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩، ومسلم: ٣٥، وأبو داود: ٤٦٧٦، وإبن ماجه: ٥٧.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

**واتە: عەمری کوڕی شورەحبیل دەگێڕێتەوە: لە پیاوێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عەمار ئیمانی پڕ بووە لە نوکی پێیەوە تا سەری.**

**٥٠٠٨-** «عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ قَالَ: قَالَ أَبُو سَعِيدٍ ﷺ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ رَأَى مُنْكَراً فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ»[١].

**واتە: طارقی کوڕی شیهاب دەڵێ: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی: هەر کەس لە ئێوە خراپەیەکی بینی با بەدەستی بیگۆڕێ، ئەگەر نەیتوانی بە دەستی بیگۆڕێ با بە زمانی بیگۆڕێ، ئەگەر بە زمانی نەیتوانی با بە دڵی پێی ناخۆش بێت، دیارە ئەویش لاوازترین ئیمانە.**

**٥٠٠٩-** «عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ قَالَ: قَالَ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ ﷺ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ رَأَى مُنْكَراً فَغَيَّرَهُ بِيَدِهِ فَقَدْ بَرِئَ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يُغَيِّرَهُ بِيَدِهِ، فَغَيَّرَهُ بِلِسَانِهِ فَقَدْ بَرِئَ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يُغَيِّرَهُ بِلِسَانِهِ، فَغَيَّرَهُ بِقَلْبِهِ فَقَدْ بَرِئَ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ»[٢].

**واتە: طارقی کوڕی شیهاب دەڵێ: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی: هەر کەس لە ئێوە خراپەیەکی بینی و بەدەستی گۆڕی ئەوە بەریە لەو خراپەیە، هەرکەس نەیتوانی بە دەستی بیگۆڕێ، پاشان بە زمانی گۆڕی، ئەوە بەریە لەو خراپەیە، هەرکەس نەیتوانی بە زمانی بیگۆڕێ بە دڵی پێی ناخۆش بوو، ئەوا بەریە، ئەویش لاوازترین ئیمانە.**

## زیادبوونی ئیمان

**٥٠١٠-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا مُجَادَلَةُ أَحَدِكُمْ فِي الْحَقِّ، يَكُونُ لَهُ فِي الدُّنْيَا بِأَشَدَّ مُجَادَلَةً مِنَ الْمُؤْمِنِينَ لِرَبِّهِمْ فِي إِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ أُدْخِلُوا النَّارَ. قَالَ: يَقُولُونَ: رَبَّنَا إِخْوَانُنَا كَانُوا يُصَلُّونَ مَعَنَا، وَيَصُومُونَ مَعَنَا وَيَحُجُّونَ مَعَنَا، فَأَدْخَلْتَهُمُ النَّارَ؟ قَالَ: فَيَقُولُ: اذْهَبُوا فَأَخْرِجُوا مَنْ عَرَفْتُمْ مِنْهُمْ، قَالَ: فَيَأْتُونَهُمْ فَيَعْرِفُونَهُمْ بِصُوَرِهِمْ فَمِنْهُمْ مَنْ أَخَذَتْهُ النَّارُ إِلَى أَنْصَافِ سَاقَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ أَخَذَتْهُ إِلَى كَعْبَيْهِ، فَيُخْرِجُونَهُمْ فَيَقُولُونَ: رَبَّنَا قَدْ أَخْرَجْنَا مَنْ أَمَرْتَنَا قَالَ: وَيَقُولُ: أَخْرِجُوا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ وَزْنُ دِينَارٍ مِنَ الْإِيمَانِ، ثُمَّ قَالَ: مَنْ كَانَ فِي

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٩، وأبو داود: ١١٤٠ و ٤٣٤٠، والترمذي: ٢١٧٢، وإبن ماجه: ١٢٧٥ و ٤٠١٣.

(٢) صحيح.





قَلْبِهِ وَزْنُ نِصْفِ دِينَارٍ حَتَّى يَقُولَ: مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ وَزْنُ ذَرَّةٍ، قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَمَنْ لَمْ يُصَدِّقْ فَلْيَقْرَأْ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴿٤٨﴾ ﴾النساء، إِلَى: ﴿ عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ ﴾النساء»[١].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکێک لە ئێوە چەندە مشت و مڕو داکۆکی لە حەق دەکات لە دنیادا، ئەوا لە ڕۆژی دواییدا سەختتر داکۆکی دەکەن لە پەروەردگاریان لە بارەی ئەو برایانەیان کە چوونەتە ئاگر، دەڵێن: پەروەردگارمان براکانمان لەگەڵ ئێمەدا نوێژیان دەکردو ڕۆژویان لەگەڵمان دەگرت و حەجیان لەگەڵماندا ئەنجام دەدا، تۆیش ئەوانت خستۆتە ئاگرەوە؟ دەفەرموێ: بڕۆن کێ دەناسن لێیان دەریان بهێنن، فەرمووی: دەچن بۆ لایان بەشێوەیان دەیانناسنەوە، هەندێکیان ئاگر تا نیوەی قاچی ڕۆیشتووە، هەندێکیان تا پاژنەی پێی، جا دەریاندەهێنن و دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان دەرمان بهێنە لەو شوێنەی فەرمانت پێکردوین، فەرمووی: خوا ﷻ دەفەرموێ: دەربچن ئەوەی بە ئەندازەی کێشی دینارێک ئیمان لە دڵیدایە، پاشان فەرمووی: هەرکەس بە ئەندازەی کێشی نیو دینار، هەتا دەفەرموێ: هەرکەس بە ئەندازەی کێشی دانەوێڵەیەک لە دڵیدایە، ئەبو سەعید دەڵێ: هەرکەس بڕواناکات با ئەم ئایەتە بخوێنێتەوە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴿٤٨﴾ ﴾(واتە: بێگومان خوا خۆش نابێ هاوبەشی بۆ دابنرێت جگە لەوە لە هەموو تاوانەکانی تر خۆش دەبێت بۆ هەرکەس ویستی لەسەر بێت)، هەتا: ﴿ عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ ﴾»

**٥٠١١-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ النَّاسَ يُعْرَضُونَ عَلَيَّ وَعَلَيْهِمْ قُمُصٌ، مِنْهَا مَا يَبْلُغُ الثُّدِيَّ، وَمِنْهَا مَا يَبْلُغُ دُونَ ذَلِكَ، وَعُرِضَ عَلَيَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ وَعَلَيْهِ قَمِيصٌ يَجُرُّهُ، قَالَ: فَمَاذَا أَوَّلْتَ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: الدِّينَ»[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە کاتێکدا من خەوتبووم خەڵکم پێشاندرا، ئەوان کراسیان لە بەردا بوو، تیایاندا بوو کراسەکەی تا سەر سنگی بوو، وە تیایاندا بوو لە خوار ئەوەوە بوو، عومەرم پێ

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٦٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣ و ٣٦٩١، ومسلم: ٢٣٩٠.





**نیشاندرا کراسێکی لەبەردا بوو ئەوەندە شۆڕ بوو ڕایدەکێشا، وتی: چۆن لەیەکی دەدەیتەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بە دین. (واتە: درێژی کراسەکەی عومەر، بەڵگەیە لەسەر باشی دینداریەکەی).**

**٥٠١٢-** «عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، آيَةٌ فِي كِتَابِكُمْ تَقْرَءُونَهَا لَوْ عَلَيْنَا مَعْشَرَ الْيَهُودِ نَزَلَتْ لَاتَّخَذْنَا ذَلِكَ الْيَوْمَ عِيداً. قَالَ: أَيُّ آيَةٍ؟ قَالَ: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۝٣﴾المائدة، فَقَالَ عُمَرُ: إِنِّي لَأَعْلَمُ الْمَكَانَ الَّذِي نَزَلَتْ فِيهِ، وَالْيَوْمَ الَّذِي نَزَلَتْ فِيهِ نَزَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي عَرَفَاتٍ فِي يَوْمِ جُمُعَةٍ»(١).

**واتە: طارقی کوڕی شیهاب دەڵێ: پیاوێک لە جولەکەکان هات بۆ لای عومەر ﷺ وتی: ئەی ئەمیری بڕواداران، ئایەتێک لە کتێبەکەتاندایە دەیخوێننەوە، ئەگەر بۆ ئێمە دابەزیایە ئەو ڕۆژەمان دەکرد بە جەژن، وتی: چی ئایەتێک؟ وتی:﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۝٣﴾ (واتە: ئەمڕۆ ئاینەکەتانم تەواو کرد بۆتان و چاکەو بەهرەی خۆم بە تەواوی ڕشتووە بە سەرتانداو ڕازیبووم کە ئیسلام ئاینتان بێت). عومەر ﷺ وتی: من ئەو جێگایە دەزانم کە تێیدا دابەزی، وە ئەو ڕۆژەیش کە تێیدا دابەزی، دابەزی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لە کێوی عەرەفات لە ڕۆژی هەینی.**

## نیشانەی ئیمان

**٥٠١٣-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَلَدِهِ، وَوَالِدِهِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ»(٢).

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێک لە ئێوە ئیمانی تەواو نابێ هەتا من لە لای خۆشەویستر نەبم لە منداڵەکەی و دایک و باوکی و خەڵکی بە گشتی.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥ و ٤٤٠٧ و ٤٦٠٦ و ٧٢٦٨، ومسلم: ٣٠١٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥، ومسلم: ٤٤.





**٥٠١٤-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ مَالِهِ، وَأَهْلِهِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ»[١].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێک لە ئێوە ئیمانی تەواو نابێ هەتا من لە لای خۆشەویستر نەبم لە ماڵ و سامانەکەی و، کەس و کارەکەی و، خەڵکی بە گشتی.**

**٥٠١٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَلَدِهِ، وَوَالِدِهِ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بە دەستە هیچ یەکێک لە ئێوە ئیمانی تەواو نابێ هەتا خۆشەویستر نەبم لە لای لە منداڵەکەی و، لە دایک و باوکی.**

**٥٠١٦-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَقَالَ حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ فِي حَدِيثِهِ، إِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ»[٣].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حومەیدی کوڕی مەسعەدە لە فەرموودەکەیدا دەڵێ: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێک لە ئێوە ئیمانی تەواو نیە هەتا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش بێت.**

**٥٠١٧-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ مِنَ الْخَيْرِ»[٤].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە، هیچ یەکێک لە ئێوە ئیمانی تەواو نیە هەتا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە لە خێرو چاکە بۆ براکەشی پێی خۆش بێت.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣، ومسلم: ٤٥، والترمذي: ٢٥١٥، وإبن ماجه: ٦٦.

(٤) صحيح.




٥٠١٨- «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: إِنَّهُ لَعَهْدُ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ ﷺ إِلَيَّ: أَنَّهُ لَا يُحِبُّكَ إِلَّا مُؤْمِنٌ، وَلَا يَبْغُضُكَ إِلَّا مُنَافِقٌ»[١].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری نەخوێندەوار ﷺ پەیمانی پێدام: هیچ کەس تۆی خۆش ناوی جگە لە بڕوادار، وە هیچ کەس ڕقی لە تۆ نابێت جگە لە دووڕوو.**

٥٠١٩- «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: حُبُّ الْأَنْصَارِ آيَةُ الْإِيمَانِ، وَبُغْضُ الْأَنْصَارِ آيَةُ النِّفَاقِ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆشەویستی ئەنصارەکان نیشانەی ئیمانە، ڕقلێبوونەوەی ئەنصارەکان نیشانەی دووڕوویيە.**

## نیشانەی دووڕوو

٥٠٢٠- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَرْبَعَةٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقاً، أَوْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ الْأَرْبَعِ، كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ حَتَّى يَدَعَهَا: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ؟»[٣].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چوار شت هەن هەرکەس تیایاندا کۆببێتەوە دووڕوویەکی تەواوە، یان یەکێک لەو چوار نیشانەی تێدا بێت ئەوە نیشانەیەکی دووڕوویی تێدایە هەتا وازی لێدەهێنێ: ئەگەر زۆر قسەی کرد درۆ بکات، ئەگەر پەیمانێکیدا بە کەسێک بیشکێنێت و نەیباتە سەر، ئەگەر گرێبەستێکی کردو سوێندی لەسەر خوارد ناپاکی بکات، ئەگەر ناکۆکی لەگەڵ کەسێکدا هەبوو لە حەق و ڕاستی لابدات.**

**تێبینی: جیاوازیەکی ئەوتۆ نیە لە نێوان (وَعَد)و (عَهد) ئەوە نەبێ (عَهد) بە واتای پەیمانێکی مەحکەم و توند دێت، وە مانای (وَعَد) گشتگیرترە، لە هەر شوێنی باسی (وَعَد) کرا (عَهد)یش لە خۆ دەگرێ، نەک بە پێچەوانە.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧ و ٣٧٨٤، ومسلم: ٧٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤ و ٢٤٥٩ و ٣١٧٨، ومسلم: ٥٨، وأبو داود: ٤٦٨٨، والترمذي: ٢٦٣٢.

**٥٠٢١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: آيَةُ النِّفَاقِ ثَلَاثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نیشانەی دووڕووو سیانە: ئەگەر زۆر قسەی کرد درۆ بکات، ئەگەر پەیمانێکیدا بە کەسێک بیشکێنێت و نەیباتە سەر، ئەگەر ئەسپاردەیەکی لا دانرا ناپاکی لێ بکات.**

**٥٠٢٢-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: عَهِدَ إِلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَنْ لَا يُحِبُّنِي إِلَّا مُؤْمِنٌ، وَلَا يَبْغُضُنِي إِلَّا مُنَافِقٌ»[٢].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی پێدام: هیچ کەس منی خۆش ناوی جگە لە بڕوادار، وە هیچ کەس ڕقی لێم نابێت جگە لە دووڕوو.**

**٥٠٢٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ فَهُوَ مُنَافِقٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، فَمَنْ كَانَتْ فِيهِ وَاحِدَةٌ مِنْهُنَّ لَمْ تَزَلْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ حَتَّى يَتْرُكَهَا»[٣].

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: سێ نیشانە هەن لە هەرکەسدا هەبن ئەوە دووڕووە: ئەگەر زۆر قسەی کرد درۆ بکات، ئەگەر ئەسپاردەیەکی لا دانرا ناپاکی لێ بکات، ئەگەر پەیمانێکیدا بە کەسێک بیشکێنێت و نەیباتە سەر، هەرکەس یەک دانەی تێدا بێت لەو نیشانانە، ئەوە بەردەوام نیشانەیەکی دووڕوویی تێدایە هەتا وازی لێدێنێ.**

## شەونوێژ لە ڕەمەزاندا

**٥٠٢٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَامَ شَهْرَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٤].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس ڕەمەزان شەونوێژ بکات، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، خوا لە هەموو گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێت.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣، ومسلم: ٥٩، والترمذي: ٢٦٣١.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٨.

(٣) صحيح الإسناد موقوف.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٥ و ٣٧ و ٣٨ و ١٩٠١، ومسلم: ٧٥٩ و ٧٦٠.





**٥٠٢٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس ڕەمەزان شەونوێژ بکات، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، خوا لە هەموو گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێت.**

**٥٠٢٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس ڕەمەزان شەونوێژ بکات، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، خوا لە هەموو گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێت.**

## شەونوێژ لە شەوی قەدر

**٥٠٢٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[3].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس ڕەمەزان شەونوێژ بکات، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، ئەوا خوا لە هەموو گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێت، هەرکەسیش شەوی قەدر شەونوێژ بکات، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، ئەوە خوا لە هەموو گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێت.**

## دەرکردنی زەکات

**٥٠٢٨-** «عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ، ثَائِرَ الرَّأْسِ، يُسْمَعُ دَوِيُّ صَوْتِهِ، وَلَا يُفْهَمُ مَا يَقُولُ حَتَّى دَنَا، فَإِذَا هُوَ يَسْأَلُ عَنِ الْإِسْلَامِ. قَالَ لَهُ رَسُولُ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

اللَّهِ ﷺ: خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ، قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُنَّ؟ قَالَ: لَا، إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَصِيَامُ شَهْرِ رَمَضَانَ، قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُ؟ قَالَ: لَا إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ. وَذَكَرَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الزَّكَاةَ، فَقَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: لَا، إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ. فَأَدْبَرَ الرَّجُلُ وَهُوَ يَقُولُ: لَا أَزِيدُ عَلَى هَذَا، وَلَا أَنْقُصُ مِنْهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ»[١].

**واتە: طەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە خەڵکی نەجد هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ قژی بژو ئاڵۆز بوو، بۆڵە بۆڵ و ورتە ورتی دەبیسترا، کەس لێ تێنەدەگەیشت چی دەڵێ هەتا نزیک بوویەوە، پرسیاری لە بارەی ئیسلامەوە کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: پێنج نوێژ لە شەوو ڕۆژێکدا، وتی: جگە لەمە نوێژی ترم لەسەرە؟ فەرمووی: نەخێر، مەگەر نوێژی زیادە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان، وتی: جگە لەم مانگە ڕۆژی ترم لەسەرە؟ فەرمووی: نەخێر، مەگەر ڕۆژی زیادە بگری، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ باسی زەکاتی بۆی کرد، وتی: جگە لەمە هیچی ترم لەسەرە؟ فەرمووی: نەخێر، مەگەر زیادە ببەخشی، پاشان پیاوەکە پشتی هەڵکرد و دەیوت: نە لەوە زیاتر دەکەم و نە لەوە کەمتر دەکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سەرفراز بوو ئەگەر ڕاست بکات.**

## جیهادو تێکۆشان

**٥٠٢٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: انْتَدَبَ اللَّهُ لِمَنْ يَخْرُجُ فِي سَبِيلِهِ لَا يُخْرِجُهُ إِلَّا الْإِيمَانُ بِي، وَالْجِهَادُ فِي سَبِيلِي، أَنَّهُ ضَامِنٌ حَتَّى أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ بِأَيِّهِمَا كَانَ، إِمَّا بِقَتْلٍ، وَإِمَّا وَفَاةٍ، أَوْ أَنْ يَرُدَّهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الَّذِي خَرَجَ مِنْهُ، يَنَالُ مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوا کەفیلی و زامنی ئەو کەسەی کردوە لە پێناویدا دەردەچێ هیچ شتێک دەری نەکات جگە لە بڕوا بوونی نەبێ بە من، وە بۆ جیهاد کردن لە پێناوی مندا، ئەو کەسە زەمانەتی پێدراوە هەتا دەیخەمە بەهەشتەوە بە هەرکام لەو دووانە: بە کوشتن بێت یاخود بە مردن، یاخود دەیگەڕێنێتەوە بۆ ماڵەکەی کە لێی دەرچووە، لەگەڵ پاداشت یان دەستکەوت بە دەستی دێنێ.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٦ و ١٨٩١، ومسلم: ١١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٦ و ٣١٢٣، ومسلم: ١٨٧٦.

**٥٠٣٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَضَمَّنَ اللَّهُ ﷻ لِمَنْ خَرَجَ فِي سَبِيلِهِ، لَا يُخْرِجُهُ إِلَّا الْجِهَادُ فِي سَبِيلِي، وَإِيمَانٌ بِي، وَتَصْدِيقٌ بِرُسُلِي، فَهُوَ ضَامِنٌ أَنْ أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أَوْ أُرْجِعَهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الَّذِي خَرَجَ مِنْهُ، نَائِلًا مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ»(١).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا کەفیلی و زامنی ئەو کەسەی کردوە لە پێناویدا دەردەچێ هیچ شتێک دەری نەکات جگە لە جیهادکردن لە پێناوی مندا، وە بڕوابوونی بە من و بە ڕاستدانانی پێغەمبەرەکانم، ئەو کەسە زەمانەتی پێدراوە هەتا دەیخەمە بەهەشتەوە، یاخود دەیگەڕێنێتەوە بۆ ماڵەکەی کە لێی دەرچووە، لەگەڵ خۆیدا پاداشت یان دەستکەوت بە دەست دێنێ.**

## چەسپاندنی پێنج یەکی غەنیمەت بۆ پێغەمبەر ﷺ

**٥٠٣١-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَدِمَ وَفْدُ عَبْدِ الْقَيْسِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالُوا: إِنَّا هَذَا الْحَيَّ مِنْ رَبِيعَةَ، وَلَسْنَا نَصِلُ إِلَيْكَ إِلَّا فِي الشَّهْرِ الْحَرَامِ، فَمُرْنَا بِشَيْءٍ نَأْخُذُهُ عَنْكَ، وَنَدْعُو إِلَيْهِ مَنْ وَرَاءَنَا، فَقَالَ: آمُرُكُمْ بِأَرْبَعٍ وَأَنْهَاكُمْ عَنْ أَرْبَعٍ: الْإِيمَانُ بِاللَّهِ، ثُمَّ فَسَّرَهَا لَهُمْ شَهَادَةُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامُ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَأَنْ تُؤَدُّوا إِلَيَّ خُمُسَ مَا غَنِمْتُمْ، وَأَنْهَاكُمْ عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالْمُقَيَّرِ، وَالْمُزَفَّتِ»(٢).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: نوێنەرانی عەبدولقەیس هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتیان: ئێمە خەڵکێکی ناسراوین لە ڕەبیعە، ناتوانین بگەین بە تۆ تەنها لە مانگی حەرامدا نەبێ، فەرمانمان پێبکە بە شتێک لێتی وەربگرین، بانگەوازی خەڵکی دوای خۆمانیشی پێ بکەین، فەرمووی: فەرمانتان پێدەکەم بە چوار شت و ڕێگریتان لێدەکەم لە چوار شت: بڕواهێنان بە خوا، پاشان شیکردەوە بۆیان، شایەتیدان بەوەی هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، وە شایەتیدان بەوەی منیش پێغەمبەری خوام، ئەنجامدانی نوێژ و دەرکردنی زەکات، وە پێنجیەکی غەنیمەت و دەستکەوتەکانتان بدەن بە من، وە ڕێگریتان لێدەکەم لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو کولەکەی زەردو (الْحَنْتَمِ) گۆزەو (الْمُقَيَّرِ) قاپی بۆیەکراو بە قیرو (الْمُزَفَّت) قاپی**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣ و ٨٧ و ٥٢٣، ومسلم: ١٧.




بۆیەكراو بە زفت (ئەوانە چەند قاپێک بوو لەناو عەرەبدا بەكاریان دەهێنا، لە دار دروست كرابوون، هەڵیان دەكۆڵی و بەكاریان دەهێنا بۆ جۆرەها خواردنەوە، ئەو قاپانە دەبوونە هۆكارو یارمەتیدەر بۆ ئەوەی ئەو خواردنەوانە زووتر ببێتە سەرخۆشكەر).

## ئامادەبوونی جەنازە

**٥٠٣٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنِ اتَّبَعَ جَنَازَةَ مُسْلِمٍ إِيمَاناً، وَاحْتِسَاباً فَصَلَّى عَلَيْهِ، ثُمَّ انْتَظَرَ حَتَّى يُوضَعَ فِي قَبْرِهِ كَانَ لَهُ قِيرَاطَانِ أَحَدُهُمَا مِثْلُ أُحُدٍ، وَمَنْ صَلَّى عَلَيْهِ ثُمَّ رَجَعَ كَانَ لَهُ قِيرَاطٌ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەركەس شوێنی جەنازەی مسوڵمانێک بكەوێت بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا، پاشان چاوەڕوان بكات هەتا دەخرێتە ناو گۆڕەكەیەوە، دوو قیراتی بۆ هەیە، هەریەكەیان وەكو كێوی ئوحودە، هەركەسیش نوێژی لەسەر بكات، پاشان بگەڕێتەوە ئەوە دوو قیراتی بۆ هەیە.

## بابەت: حەیاو شەرمكردن

**٥٠٣٣-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ عَلَى رَجُلٍ يَعِظُ أَخَاهُ فِي الْحَيَاءِ، فَقَالَ: دَعْهُ، فَإِنَّ الْحَيَاءَ مِنَ الْإِيمَانِ»[٢].

واتە: سالم دەگێڕێتەوە، لە باوكی ﷺ: پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بە لای پیاوێكدا ئامۆژگاری براكەی دەكرد لە بارەی شەرمكردنەوە، فەرمووی: وازی لێبێنە، چونكە شەرمكردن بەشێكە لە ئیمان.

## ئاین ئاســانە

**٥٠٣٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ هَذَا الدِّينَ يُسْرٌ، وَلَنْ يُشَادَّ الدِّينَ أَحَدٌ إِلَّا غَلَبَهُ، فَسَدِّدُوا وَقَارِبُوا، وَأَبْشِرُوا، وَيَسِّرُوا، وَاسْتَعِينُوا بِالْغَدْوَةِ وَالرَّوْحَةِ، وَشَيْءٍ مِنَ الدَّلْجَةِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧ و ١٣٢٣ و ١٣٢٤ و ١٣٢٥، ومسلم: ٩٤٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤، ومسلم: ٣٦، وأبو داود: ٤٧٩٥، والترمذي: ٢٦١٥، وإبن ماجه: ٥٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩ و ٥٦٧٣ و ٦٤٦٣، ومسلم: ٢٨١٦.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ئەم ئاینە ئاسانە، هیچ کەسێک نیە بەرهەڵستی بکات ئیللا زاڵ دەبێ بەسەریدا، (واتە: هیچ کەسێک نیە قووڵ ببێتەوە لە پەرستش و واز لە نەرم و نیانی بهێنێ وەکو ڕاهیبەکان، ئیللا دەستەوستان دەبێ، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ واز لە چاکترین و تەواوترین پەرستش بهێنێ، بەڵکو زۆر ڕۆچوون قەدەغەکراوە)، دەست بەوە بگرن کە ڕاستە بەبێ توندڕەوی، نزیک ببنەوە، مژدە بدەن، ئاسان کاربن، وە بە بەیانیان ئیواران پەرستش ئەنجام بدەن، وە بەشێکی نیوەی شەویش.

## خۆشەویستترین (شێوەی) ئاینداری لای خوا ﷻ

**٥٠٣٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا امْرَأَةٌ، فَقَالَ: مَنْ هَذِهِ؟ قَالَتْ: فُلَانَةُ، لَا تَنَامُ تَذْكُرُ مِنْ صَلَاتِهَا. فَقَالَ: مَهْ، عَلَيْكُمْ مِنَ الْعَمَلِ مَا تُطِيقُونَ، فَوَاللَّهِ لَا يَمَلُّ اللَّهُ ﷻ حَتَّى تَمَلُّوا، وَكَانَ أَحَبَّ الدِّينِ إِلَيْهِ مَا دَامَ عَلَيْهِ صَاحِبُهُ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لای ئافرەتێکی لەلا بوو، فەرمووی: ئەمە کێیە؟ وتی: فڵانە کەس، بەردەوام خەریکی نوێژ کردنە، فەرمووی: بیدەنگ بەو وەسفی مەکە، ئەوەی لە تواناتاندایە ئەوە ئەنجام بدەن، سوێند بە خوا، بەڕاستی خوا بێزار نابێ تا ئێوە بێزار دەبن، خۆشەویستترین پەرستش لای پێغەمبەر ﷺ ئەوە بووە کە خاوەنەکەی لەسەری بەردەوام بێت.

## دوورە پەرێزی بە خاتری پاراستنی ئاینەکەت

**٥٠٣٦-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ خَيْرَ مَالِ مُسْلِمٍ غَنَمٌ يَتَّبِعُ بِهَا شَعَفَ الْجِبَالِ، وَمَوَاقِعَ الْقَطْرِ، يَفِرُّ بِدِينِهِ مِنَ الْفِتَنِ»[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نزیکە چاکترین ماڵ و سامانێک بۆ مسوڵمان مەڕو ماڵاتێک بێت، بە ناو شاخ و شیوەکاندا بیانلەوەڕێنێت، بۆ ئەوەی ئاینەکەی بپارێزێ لە فیتنەو ئاشووب.

---

(١) صحیح. أخرجه البخاري: ٤٣ و ١١٥١ و ٦٤٦٤ و ٦٤٦٧، ومسلم: ٧٨٥ و ٢٨١٨.

(٢) صحیح. أخرجه البخاري: ١٩، وأبو داود: ٤٢٦٧، وإبن ماجه: ٣٩٨٠.




## نموونەی (مرۆڤی) دووڕوو

**٥٠٣٧-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَثَلُ الْمُنَافِقِ كَمَثَلِ الشَّاةِ الْعَائِرَةِ بَيْنَ الْغَنَمَيْنِ، تَعِيرُ فِي هَذِهِ مَرَّةً، وَفِي هَذِهِ مَرَّةً، لَا تَدْرِي أَيَّهَا تَتْبَعُ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نموونەی دووڕوو وەکو نموونەی کاوڕێکە بیەوێ بەران بگرێ لە نێوان دوو ڕانەمەڕدا، جارێ دەچێ بۆ لای ئەم ڕانەمەڕە جارێکی تر بۆ لای ئەو ڕانەمەڕەکە، نازانێ شوێنی کامەیان بکەوێت. (دووڕووش بە ڕواڵەت لەگەڵ مسوڵماناندایە، بە دڵیش لەگەڵ بێبڕواکاندایە).**

## نموونەی قورئان خوێندنی (مرۆڤی) بڕوادارو (مرۆڤی) دووڕوو

**٥٠٣٨-** «عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، مَثَلُ الْأُتْرُجَّةِ طَعْمُهَا طَيِّبٌ، وَرِيحُهَا طَيِّبٌ، وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، كَمَثَلِ التَّمْرَةِ طَعْمُهَا طَيِّبٌ، وَلَا رِيحَ لَهَا، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، كَمَثَلِ الرَّيْحَانَةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ، وَطَعْمُهَا مُرٌّ، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ طَعْمُهَا مُرٌّ، وَلَا رِيحَ لَهَا»[٢].

**واتە: ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نموونەی ئەو بڕوادارەی کە قورئان دەخوێنێ، وەکو پرتەقاڵ وایە تامی خۆشەو بۆنیشی خۆشە، وە نموونەی ئەو بڕوادارەی کە قورئان ناخوێنێ، وەکو خورما وایە تامی خۆشە و بۆنی نیە، وە نموونەی ئەو دووڕووەی کە قورئان دەخوێنێ وەکو ڕەیحانە وایە بۆنی خۆشە و تامی تاڵە، وە نموونەی ئەو دووڕووەی کە قورئان ناخوێنێ، وەکو گوژاڵک وایە تامی تاڵە و بۆنی نیە.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧٨٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٢٠، ومسلم: ٧٩٧.




## نیشانەی مرۆڤی بڕوادار

**٥٠٣٩-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ»[1].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێک لە ئێوە بڕوای تەواو نابێ هەتا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەیشی پێی خۆش بێت.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣، ومسلم: ٤٥، والترمذي: ٢٥١٥، وإبن ماجه: ٦٦.




## سوننەتە سروشتیەکان (الْفِطْرَة) زگماک[1]

**٥٠٤٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قال: عَشْرَةٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ، وَقَصُّ الْأَظْفَارِ، وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ، وَإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ، وَالسِّوَاكُ، وَالِاسْتِنْشَاقُ، وَنَتْفُ الْإِبْطِ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَانْتِقَاصُ الْمَاءِ، قَالَ مُصْعَبٌ: وَنَسِيتُ الْعَاشِرَةَ إِلَّا أَنْ تَكُونَ الْمَضْمَضَةَ»[2].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دە شت هەن لە فیترەتی مرۆڤن: بەرسمێڵ کردن، بڕینی نینۆکەکان، شۆردنی ئەو شوێنانەی کە عەرەق و پیسی تێدا کۆدەبێتەوە، بەردانەوەی ڕیش و بەکارهێنانی سیواک، ئاو وەردانە لووت، هەڵکەندنی تووکی بنباڵ، تاشینی بەر، شۆردنی ئەندامی نێرینە، موصعەب وتی: دەیەمم بیرچوو، وادەزانم ئاو وەردانە لە دەمە.**

**٥٠٤١-** «عَنِ الْمُعْتَمِرِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ طَلْقاً يَذْكُرُ: عَشْرَةً مِنَ الْفِطْرَةِ: السِّوَاكَ، وَقَصَّ الشَّارِبِ، وَتَقْلِيمَ الْأَظْفَارِ، وَغَسْلَ الْبَرَاجِمِ، وَحَلْقَ الْعَانَةِ، وَالِاسْتِنْشَاقَ، وَأَنَا شَكَكْتُ فِي الْمَضْمَضَةِ»[3].

**واتە: موعتەمر دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە دەڵێ: بیستم طەلق باسی دەکرد: دە شت هەن لە فیترەتی مرۆڤن: سیواک کردن، بەرسمێڵ کردن، بڕینی نینۆکەکان، شۆردنی ئەو شوێنانەی کە پیسی تێدا کۆدەبێتەوە، تاشینی بەر، ئاو وەردانە لووت، من گومانم هەبوو لە ئاو وەردانە دەم.**

**٥٠٤٢-** «عَنْ طَلْقِ بْنِ حَبِيبٍ قَالَ: عَشْرَةٌ مِنَ السُّنَّةِ: السِّوَاكُ، وَقَصُّ الشَّارِبِ، وَالْمَضْمَضَةُ، وَالِاسْتِنْشَاقُ، وَتَوْفِيرُ اللِّحْيَةِ، وَقَصُّ الْأَظْفَارِ، وَنَتْفُ الْإِبْطِ، وَالْخِتَانُ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ وَغَسْلُ الدُّبُرِ»[4].

**واتە: طەلقی کوڕی حەبیب دەڵێ: دە شت هەن لە سوننەتی پێغەمبەرانن: سیواک کردن، بەرسمێڵ کردن، ئاو وەردانە دەم، ئاو وەردانە لووت، هێشتنەوەی ڕیش بە شێوەیەکی چاک، بڕینی نینۆکەکان، هەڵکەندنی تووکی بنباڵ، خەتەنەکردن، تاشینی بەر، شۆردنی پاشەوە.**

---

(١) واتە: ئەو سروشتە پاکەیە کە خوا خودی پێکهاتەی مرۆڤی لەسەر دروست کردوە، وە سوننەتی پێغەمبەرانیشە.

(٢) حسن. أخرجه مسلم: ٢٦١، وأبو داود: ٥٣، والترمذي: ٢٧٥٧، وإبن ماجه: ٢٩٣.

(٣) صحيح الإسناد مقطوع.

(٤) صحيح الإسناد مقطوع.



**٥٠٤٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: خَمْسٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: الْخِتَانُ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَنَتْفُ الضَّبْعِ، وَتَقْلِيمُ الظُّفْرِ، وَتَقْصِيرُ الشَّارِبِ وَقَفَهُ مَالِكٌ»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج شت هەن لە فیترەتی مرۆڤن: خەتەنەکردن، تاشینی بەر، هەڵکەندنی تووکی بنباڵ، بڕینی نینۆکەکان، کورتکردنەوەی سمێڵ.**

**٥٠٤٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: خَمْسٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: تَقْلِيمُ الْأَظْفَارِ، وَقَصُّ الشَّارِبِ، وَنَتْفُ الْإِبْطِ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَالْخِتَانُ»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێنج شت هەن لە فیترەتی مرۆڤن: بڕینی نینۆکەکان، بەر سمێڵ کردن، هەڵکەندنی تووکی بنباڵ، تاشینی بەر، خەتەنەکردن.**

## تەختکردنی سمێڵ هەتا سەر پێست

**٥٠٤٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَحْفُوا الشَّوَارِبَ، وَأَعْفُوا اللِّحَى»[3].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سمێڵتان تەخت بکەن هەتا سەر پێست، ڕیشیشتان بەربدەنەوە.**

**٥٠٤٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَعْفُوا اللِّحَى، وَأَحْفُوا الشَّوَارِبَ»[4].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕیشتان بەربدەنەوە، سمێڵیشتان تەخت بکەن هەتا سەر پێست.**

**٥٠٤٧-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ لَمْ يَأْخُذْ شَارِبَهُ فَلَيْسَ مِنَّا»[5].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٧٦١.

واتە: زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەرکەس بەرسمێڵی نەکات لە ئێمە نیە.

## مۆڵەتدان بە سەر تاشین

٥٠٤٨- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى صَبِيّاً حَلَقَ بَعْضَ رَأْسِهِ وَتَرَكَ بَعْضاً، فَنَهَى عَنْ ذَلِكَ، وَقَالَ: احْلِقُوهُ كُلَّهُ أَوِ اتْرُكُوهُ كُلَّهُ»(١).

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ منداڵێکی بینی بەشێک لەسەری تاشی بوو وازی لە بەشەکەی تری هێنابوو، ئەو کارەی قەدەغەکرد، وە فەرمووی: یان هەمووی بتاشە، یان هەمووی بهێڵەرەوە.

## قەدەغەکردن لەوەی ئافرەت سەری بتاشێ

٥٠٤٩- «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ تَحْلِقَ الْمَرْأَةُ رَأْسَهَا»(٢).

واتە: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە ئافرەت سەری خۆی بتاشێ.

## قەدەغەکردنی (الْقَزَع): (بریتیە لەوەی سەری هەندێک بتاشێ و لە چەند شوێنێکی جیاواز قژی بهێڵێتەوە).

٥٠٥٠- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: نَهَانِي اللَّهُ ﷻ عَنِ الْقَزَعِ»(٣).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ تاشینی بەشێکی قژو هێشتنەوەی بەشێکی قەدەغە کرد.

٥٠٥١- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْقَزَعِ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢١٢٠، وأبو داود: ٤١٩٥.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٩١٤.

(٣) منكر. أخرجه البخاري: ٥٩٢٠ و ٥٩٢١، ومسلم: ٢١٢٠، وأبو داود: ٣١٩٣ و ٤١٩٤، وإبن ماجه: ٣٦٣٧ و ٣٦٣٨.

(٤) صحيح.




واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تاشینی بەشێکی قژو هێشتنەوەی بەشێکی قەدەغەکرد.

## بەرسمێڵ کردن

**٥٠٥٢-** «عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَلِي شَعْرٌ، فَقَالَ ذُبَابٌ، فَظَنَنْتُ أَنَّهُ يَعْنِينِي، فَأَخَذْتُ مِنْ شَعْرِي، ثُمَّ أَتَيْتُهُ، فَقَالَ لِي: لَمْ أَعْنِكَ وَهَذَا أَحْسَنُ»[(١)].

**واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ قژم هاتبوو، فەرمووی: ئەوە شومە، گومانم برد مەبەستی منە، بۆیە قژم کورت کردەوەو، پاشان هاتم بۆ لای، پێمی فەرموو: مەبەستم تۆ نەبوو (بەڵام) ئەمە چاکترە.**

**٥٠٥٣-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ شَعْرُ النَّبِيِّ ﷺ شَعْراً رَجْلاً، لَيْسَ بِالْجَعْدِ، وَلَا بِالسَّبْطِ بَيْنَ أُذُنَيْهِ وَعَاتِقِهِ»[(٢)].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قژی لوول و ئاڵۆز نەبوو، خاویش نەبوو، لە نێوان هەردوو گوێ و شانیدا بووە.**

**٥٠٥٤-** «عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْحِمْيَرِيِّ قَالَ: لَقِيتُ رَجُلاً صَحِبَ النَّبِيَّ ﷺ كَمَا صَحِبَهُ أَبُو هُرَيْرَةَ أَرْبَعَ سِنِينَ، قَالَ: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَمْتَشِطَ أَحَدُنَا كُلَّ يَوْمٍ»[(٣)].

**واتە: حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی حومەیری دەڵێ: گەیشتم بە پیاوێک هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بوو وەکو چۆن ئەبو هورەیرە ﷺ چوار ساڵ هاوەڵی بوو، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردووین کەسێکمان هەموو ڕۆژێک قژی شانە بکات، (واتە: زیادەڕەوی تێدا بکات).**

## شانەکردنی قژ ڕۆژ نارۆژێک

**٥٠٥٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ التَّرَجُّلِ إِلَّا غِبّاً»[(٤)].

---

(١) صحيح الإسناد. أخرجه أبو داود: ٤١٩٠، وإبن ماجه: ٣٦٣٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٠٥ و ٥٩٠٦، ومسلم: ٢٣٣٨، وإبن ماجه: ٣٦٣٤.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١٥٩، والترمذي: ١٧٥٦.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موغەفەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لەسەر شانەکردن (بە بەردەوامی) مەگەر ڕۆژێک سەرشانە بکات و ڕۆژێک شانەی نەکات.

**٥٠٥٦-** «عَنِ الْحَسَنِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ التَّرَجُّلِ إِلَّا غِبّاً»[١].

واتە: حەسەن دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لە سەر شانەکردن، (بە بەردەوامی) مەگەر ڕۆژێک سەر شانە بکات و ڕۆژێک شانەی نەکات.

**٥٠٥٧-** «عَنْ يُونُسَ، عَنِ الْحَسَنِ وَمُحَمَّدٍ قَالَا: التَّرَجُّلُ غِبٌّ»[٢].

واتە: یونس دەگێڕێتەوە، لە حەسەن و موحەممەدەوە وتیان: سەر شانەکردن ڕۆژ ناڕۆژێکە.

**٥٠٥٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ، قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ عَامِلاً بِمِصْرَ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَإِذَا هُوَ شَعِثُ الرَّأْسِ مُشْعَانٌّ. قَالَ: مَا لِي أَرَاكَ مُشْعَانّاً وَأَنْتَ أَمِيرٌ؟ قَالَ: كَانَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ يَنْهَانَا عَنِ الْإِرْفَاهِ. قُلْنَا: وَمَا الْإِرْفَاهُ؟ قَالَ: التَّرَجُّلُ كُلَّ يَوْمٍ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق، دەڵێ: پیاوێک هەبوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەمیر بوو لە میسر، پیاوێک لە هاوەڵانی هات بۆ لای، قژی ئاڵۆز بوو، وتی: ئەوە چیە ئەبینم قژت ئاڵۆزە، لە کاتێکدا تۆ ئەمیری؟ وتی: پێغەمبەر خوا ﷺ ڕێگری لێدەکردین لە (الْإِرْفَاه) وتمان: (الْإِرْفَاه) چیە؟ وتی: قژ شانەکردن هەموو ڕۆژێک.

## شانەکردنی قژ لە لای ڕاستەوە

**٥٠٥٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُحِبُّ التَّيَامُنَ، يَأْخُذُ بِيَمِينِهِ، وَيُعْطِي بِيَمِينِهِ، وَيُحِبُّ التَّيَمُّنَ فِي جَمِيعِ أُمُورِهِ»[٤].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لای ڕاستی پێخۆش بوو، بە دەستی ڕاستی وەریدەگرت و بە دەستی ڕاستیشی دەیبەخشی، وە لای ڕاستی پێخۆش بوو لە هەموو کاروبارەکانیدا.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١٦٠.

(٤) صحيح.




## دانانی قژ (قژ درێژ کردن)

**٥٠٦٠-** «عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَحَدَاً أَحْسَنَ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَجُمَّتُهُ تَضْرِبُ مَنْكِبَيْهِ»[١].

**واتە:** بەڕاء ﷺ دەڵێ: هیچ کەسێکم نەبینیوە هێندەی پێغەمبەری خوا ﷺ جوان بێت لە ناو پۆشاکی سوردا، قژی تا سەرشانی دەهات.

**٥٠٦١-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ شَعْرُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ»[٢].

**واتە:** ئەنەس ﷺ دەڵێ: قژی پێغەمبەری خوا ﷺ تا نیوەی گوێچکەی بوو.

**٥٠٦٢-** «عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: مَا رَأَيْتُ رَجُلاً أَحْسَنَ فِي حُلَّةٍ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: وَرَأَيْتُ لَهُ لِمَّةً تَضْرِبُ قَرِيباً مِنْ مَنْكِبَيْهِ»[٣].

**واتە:** بەراء ﷺ دەڵێ: کەسێکم نەبینیوە لە نێو پۆشاکی سوردا هێندەی پێغەمبەری خوا ﷺ جوان بووبێت، وە قژیم بینی دەهاتە نەرمایی گوێچکەی و نزیک لە شانی.

## قژ هۆنینەوە، پەلکە

**٥٠٦٣-** «عَنْ هُبَيْرَةَ بْنِ يَرِيمَ قال: قَالَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ: عَلى قِرَاءَةِ من تَأْمُرُونِّي أَقْرَأُ، لَقَدْ قَرَأْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِضْعاً وَسَبْعِينَ سُورَةً، وَإِنَّ زَيْداً لَصَاحِبُ ذُؤَابَتَيْنِ يَلْعَبُ مَعَ الصِّبْيَانِ»[٤].

**واتە:** هوبەیرەی کوڕی یەریەم دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: لەسەر خوێندنەوەی کێ فەرمانم پێ دەکەن قورئان بیخوێنم، (کاتێک ئەو قسەی کرد کە فەرمان کرا قورئان لەسەر موصحەفەکەی عوسمان بخوێنرێ، جا لە نێوانیاندا جیاوازی هەبوو، وە واز لە موصحەفەکەی ئەو بهێنن)، بێگومان حەفتاو ئەوەندە سوورەتم بەسەر پێغەمبەری خوادا ﷺ خوێند، زەید قژی لە پشتیەوە هۆنیبوویەوە لەگەڵ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح لغيره. أخرجه البخاري: ٥٠٠٠، ومسلم: ٢٤٦٢/١١٤.




منداڵەکاندا یاری دەکرد. (مەبەستی ئەوەیە ئەو لە پێشترە لە خوێندنەوە قورئان لە زەید کە موصحەفی عوسمانی نووسی، بۆیە ناگەڕێتەوە بۆ لای ئەوەی زەید نوسیویەتی).

٥٠٦٤- «عَنْ أَبِي وَائِلٍ ﷺ قَالَ: خَطَبَنَا ابْنُ مَسْعُودٍ فَقَالَ: كَيْفَ تَأْمُرُونِّي أَقْرَأُ عَلَى قِرَاءَةِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ بَعْدَ مَا قَرَأْتُ مِنْ فِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِضْعاً وَسَبْعِينَ سُورَةً، وَإِنَّ زَيْداً مَعَ الْغِلْمَانِ لَهُ ذُؤَابَتَانِ»[١].

واتە: ئەبو وائیل ﷺ دەڵێ: ئیبنو مەسعود وتاری بۆداین، وتی: چۆن فەرمانم پێدەکەن قورئان لەسەر قیرائەتی زەیدی کوڕی ثابت بخوێنم، دوای ئەوەی حەفتاو ئەوەندە سوورەتم لە زاری پێغەمبەری خواوە ﷺ وەرگرتووە، زەیدیش لەناو منداڵەکاندا یاری دەکرد دوو پەلکەی هەبوو.

٥٠٦٥- «عَنْ زِيَادِ بْنِ الْحُصَيْنِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بِالْمَدِينَةِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ادْنُ مِنِّي فَدَنَا مِنْهُ، فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى ذُؤَابَتِهِ ثُمَّ أَجْرَى يَدَهُ، وَسَمَّتَ عَلَيْهِ وَدَعَا لَهُ»[٢].

واتە: زیادی کوڕی حوصەین دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: کاتێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: لێم نزیک ببەرەوە، ئەویش لێی نزیک بویەوە دەستی خستە سەر پرچە هۆنراوەکەی و دوعای خێری بۆ کرد.

## درێژکردنی قژ هەتا سەرشان

٥٠٦٦- «عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَلِي جُمَّةٌ، قَالَ ذُبَابٌ: وَظَنَنْتُ أَنَّهُ يَعْنِينِي، فَانْطَلَقْتُ فَأَخَذْتُ مِنْ شَعْرِي، فَقَالَ: إِنِّي لَمْ أَعْنِكَ وَهَذَا أَحْسَنُ»[٣].

واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ قژم هەتا سەر شانم هاتبوو، فەرمووی: شومە، گومانم برد مەبەستی منە، بۆیە قژم کورت کردەوەو پاشان هاتم بۆ لای، پێمی فەرموو: مەبەستم تۆ نەبوو، ئەمەیان چاکترە). (کەواتە: کورت کردنەوەی بەلاوە چاکتر بوو).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح.




## گرێدانی ڕیش یاخود بە پەلکە کردنی ڕیش

٥٠٦٧- «عَنْ رُوَيْفِعِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: يَا رُوَيْفِعُ، لَعَلَّ الْحَيَاةَ سَتَطُولُ بِكَ بَعْدِي، فَأَخْبِرِ النَّاسَ أَنَّهُ مَنْ عَقَدَ لِحْيَتَهُ، أَوْ تَقَلَّدَ وَتَراً، أَوْ اسْتَنْجَى بِرَجِيعِ دَابَّةٍ أَوْ عَظْمٍ، فَإِنَّ مُحَمَّداً بَرِيءٌ مِنْهُ»[١].

واتە: ڕوەیفعی کوڕی ثابت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی ڕوەیفیع پێدەچێ تەمەنت درێژ بێت، (بێگومان تەمەنی درێژبوو لە پەنجاو سێی کۆچی، کۆچی دوایی کرد، کۆتا کەس بوو لە ناو صەحابەکاندا مرد) هەواڵ بدە بە خەڵکی هەرکەس ڕیشی گرێبدات بە هۆی خۆ بە گەورە زانین، یان نوشتەیەک بە خۆیدا هەڵبواسێ بە مەبستی ئەوەی بیپارێزێ لە بەڵاو ناخۆشی، یان خۆی پاک بکاتەوە بە پاشەڕۆ، یان ئێسکی ئاژەڵ، بێگومان موحەممەد ﷺ بەریە لێی.

## قەدەغەکردنی هەڵکەندنی مووی پیری

٥٠٦٨- «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ نَتْفِ الشَّيْبِ»[٢].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەی ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە هەڵکەندنی مووی سپی.

## ڕێگەدان بە بۆیەکردنی قژ

٥٠٦٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْيَهُودُ، وَالنَّصَارَى لَا تَصْبُغُ فَخَالِفُوهُمْ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جولەکەو گاور قژ بۆیە ناکەن، ئێوە پێچەوانەیان بکەن. (واتە: قژتان بۆیە بکەن).

٥٠٧٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِمِثْلِهِ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٦.

(٢) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٢٠٢، والترمذي: ٢٨٢١، وإبن ماجه: ٣٧٢١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤٦٢ و ٥٨٩٩، ومسلم: ٢١٠٣، وأبو داود: ٤٢٠٣، والترمذي: ١٧٥٢، وإبن ماجه: ٣٦٢١.

(٤) صحيح.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بە هەر وەکو فەرموودەکەی تر.

**٥٠٧١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لَا تَصْبُغُ فَخَالِفُوا عَلَيْهِمْ فَاصْبُغُوا»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی جولەکەو گاورەکان قژ بۆیە ناکەن، ئێوە پێچەوانەیان بکەن، قژتان بۆیە بکەن.

**٥٠٧٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ الْيَهُودَ، وَالنَّصَارَى لَا تَصْبُغُ فَخَالِفُوهُمْ»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی جولەکەو گاورەکان قژ بۆیە ناکەن، ئێوە پێچەوانەیان بکەن.

**٥٠٧٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: غَيِّرُوا الشَّيْبَ، وَلَا تَشَبَّهُوا بِالْيَهُودِ»(٣).

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕەنگی قژتان بگۆڕن، خۆتان مەشوبهێنن بە جولەکە.

**٥٠٧٤-** «عَنِ الزُّبَيْرِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: غَيِّرُوا الشَّيْبَ، وَلَا تَشَبَّهُوا بِالْيَهُودِ»(٤).

واتە: زوبەیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕەنگی قژتان بگۆڕن، خۆتان مەشوبهێنن بە جولەکە.

## قەدەغە کردن لە بۆیەکردنی قژ بە ڕەنگی ڕەش

**٥٠٧٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، رَفَعَهُ أَنَّهُ قَالَ: قَوْمٌ يَخْضِبُونَ بِهَذَا السَّوَادِ آخِرَ الزَّمَانِ كَحَوَاصِلِ الْحَمَامِ، لَا يَرِيحُونَ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ»(٥).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٢١٢.




**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) ڕەفعی کردوە دەفەرمووێ: خەڵکانێک لە کۆتا زەماندا قژیان ڕەش دەکەن، وەکو سنگی کۆتر، بۆنی بەهەشت ناکەن.**

**٥٠٧٦-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: أُتِيَ بِأَبِي قُحَافَةَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ وَرَأْسُهُ وَلِحْيَتُهُ كَالثَّغَامَةِ بَيَاضاً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: غَيِّرُوا هَذَا بِشَيْءٍ، وَاجْتَنِبُوا السَّوَادَ»(١).

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککە ئەبو قوحافەیان هێنا قژو ڕیشی سپی بوو بوو، وەکو (الثَّغَامَة) (ڕووەکێکە بەروبوومی سپی دەگرێ) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕەنگی ئەم قژە بگۆڕن بە شتێکی تر، خۆتان بە دوور بگرن لە ڕەش.**

## بۆیەکردن بە خەنەو ئوزمە

**٥٠٧٧-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَفْضَلُ مَا غَيَّرْتُمْ بِهِ الشَّمَطَ الْحِنَّاءُ وَالْكَتَمُ»(٢).

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چاکترین شتێک کە پیری پێ بگۆڕن خەنەو ئوزمەیە.**

**٥٠٧٨-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ أَحْسَنَ مَا غَيَّرْتُمْ بِهِ الشَّيْبَ الْحِنَّاءُ وَالْكَتَمُ»(٣).

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی چاکترین شتێک کە پیری پێ بگۆڕن خەنەو ئوزمەیە.**

**٥٠٧٩-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ مِنْ أَحْسَنِ مَا غَيَّرْتُمْ بِهِ الشَّيْبَ الْحِنَّاءَ وَالْكَتَمَ»(٤).

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی چاکترین شتێک کە پیری پێ بگۆڕن خەنەو ئوزمەیە.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٨ و ٢١٠٢/٧٩، وأبو داود: ٤٢٠٤، وإبن ماجه: ٣٦٢٤.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٢٠٥، والترمذي: ١٧٥٣، وإبن ماجه: ٣٦٢٢.

(٤) صحيح.



**٥٠٨٠-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ أَحْسَنَ مَا غَيَّرْتُمْ بِهِ الشَّيْبَ الْحِنَّاءُ وَالْكَتَمُ»[١].

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی چاکترین شتێک کە پیری پێ بگۆڕن خەنەو ئوزمەیە.**

**٥٠٨١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ أَحْسَنَ مَا غَيَّرْتُمْ بِهِ الشَّيْبَ الْحِنَّاءُ وَالْكَتَمُ»[٢].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی بورەیدە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی چاکترین شتێک کە پیری پێ بگۆڕن خەنەو ئوزمەیە.**

**٥٠٨٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ أَحْسَنَ مَا غَيَّرْتُمْ بِهِ الشَّيْبَ الْحِنَّاءُ وَالْكَتَمُ»[٣].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی بورەیدە ﷺ دەگێڕێتەوە، هەواڵی پێگەیشتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی چاکترین شتێک کە پیری پێ بگۆڕن خەنەو ئوزمەیە.**

**٥٠٨٣-** «عَنْ أَبِي رِمْثَةَ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ أَنَا وَأَبِي النَّبِيَّ ﷺ وَكَانَ قَدْ لَطَخَ لِحْيَتَهُ بِالْحِنَّاءِ»[٤].

**واتە: ئەبو ڕیمثە ﷺ دەڵێ: من و باوکم هاتین بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ڕیشی گرتبوو لە خەنە.**

**٥٠٨٤-** «عَنْ أَبِي رِمْثَةَ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَرَأَيْتُهُ قَدْ لَطَخَ لِحْيَتَهُ بِالصُّفْرَةِ»[٥].

**واتە: ئەبو ڕیمثە ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بینیم ڕیشی زەرد کردبوو.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح.




## ڕەنگ کردن بە زەرد

**٥٠٨٥-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ يُصَفِّرُ لِحْيَتَهُ بِالْخَلُوقِ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنَّكَ تُصَفِّرُ لِحْيَتَكَ بِالْخَلُوقِ، قَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَفِّرُ بِهَا لِحْيَتَهُ، وَلَمْ يَكُنْ شَيْءٌ مِنَ الصِّبْغِ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْهَا، وَلَقَدْ كَانَ يَصْبُغُ بِهَا ثِيَابَهُ كُلَّهَا حَتَّى عِمَامَتَهُ»[١].

**واتە: زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێ: عومەرم بینی ڕیشی زەرد دەکرد بە (خَلُوق) (بۆنێکی ناسراوی خۆشە لە زەعفەران پێک دەهێنرێ ڕەنگی سورو زەرد ئەڕوانێ) وتم: ئەی ئەبو عەبدوڕڕەحمان تۆ ڕیشت زەرد دەکەیت بە خەلوق، وتی: من پێغەمبەری خوام ﷺ بینی پێی زەرد دەکرد، هیچ ڕەنگێک وەکو ئەوە لە لای من خۆشەویست نیە، جا ئیبنو عومەر هەموو جلەکانی پێ ڕەنگ دەکرد تەنانەت مێزەرەکەی سەریشی.**

**٥٠٨٦-** «عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه، أَنَّهُ سَأَلَهُ: هَلْ خَضَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: لَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ، إِنَّمَا كَانَ شَيْءٌ فِي صُدْغَيْهِ»[٢].

**واتە: قەتادە دەگێڕێتەوە، ئەو پرسیاری لە ئەنەس رضي الله عنه کرد: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ قژی بۆیە دەکرد؟ وتی: نەگەیشتە ئەو تەمەن، بەڵکو چەند تەڵێکی سپی لە لای نەرمایی هەردوو گوێی هەبوو.**

**٥٠٨٧-** «عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَكُنْ يَخْضِبُ، إِنَّمَا كَانَ الشَّمَطُ عِنْدَ الْعَنْفَقَةِ يَسِيراً وَفِي الصُّدْغَيْنِ يَسِيراً، وَفِي الرَّأْسِ يَسِيراً»[٣].

**واتە: ئەنەس رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قژی بۆیە نەدەکرد، بەڵکو بەهۆی پیری چەند تاڵە مویەکی سپی دەرکەوتبوو لە خواری لێوی وە لە لای نەرمایی هەردوو گوێی، وە چەند تاڵێکیش لە ناو سەریدا.**

**٥٠٨٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَكْرَهُ عَشْرَ خِصَالٍ: الصُّفْرَةَ يَعْنِي الْخَلُوقَ وَتَغْيِيرَ الشَّيْبِ، وَجَرَّ الْإِزَارِ، وَالتَّخَتُّمَ بِالذَّهَبِ، وَالضَّرْبَ بِالْكِعَابِ، وَالتَّبَرُّجَ بِالزِّينَةِ لِغَيْرِ مَحَلِّهَا، وَالرُّقَى إِلَّا بِالْمُعَوِّذَاتِ، وَتَعْلِيقَ التَّمَائِمِ، وَعَزْلَ الْمَاءِ بِغَيْرِ مَحَلِّهِ، وَإِفْسَادَ الصَّبِيِّ غَيْرَ مُحَرِّمِهِ»[٤].

---

(١) صحيح الإسناد. أخرجه أبو داود: ٤٠٦٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٥٥٠، ومسلم: ٢٣٤١/١٠٤.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) منكر. أخرجه أبو داود: ٤٢٢٢.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دە خەصڵەتی پێ باش نەبوو: زەرد کردن، واتە (خَلُوق) (بۆنێکی ناسراوی خۆشە لە زەعفەران پێک دەهێنرێ ڕەنگی سورو زەرد ئەڕوانێ) گۆڕینی نیشانەی پیرێتی، درێژکردنی دەرقاچە لە جل و بەرگدا، لە دەستکردنی زێڕ، یاریکردن بە زاری تاوڵە، خۆڕازاندنەوەیەک لە جێگای خۆیدا نەبێ، نوشتەکردن بە جگە لە (الْمُعَوِّذَات)، هەڵواسینی نوشتە یان مورو، دانانی تۆوی پیاو لە غەیری شوێنی خۆی، شیرنەدان بە منداڵێکی کۆرپەلە کە دایکی دووگیان بێت.

## بۆیە کردن بۆ ئافرەتان

**٥٠٨٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ امْرَأَةً، مَدَّتْ يَدَهَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بِكِتَابٍ فَقَبَضَ يَدَهُ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَدَدْتُ يَدِي إِلَيْكَ بِكِتَابٍ فَلَمْ تَأْخُذْهُ، فَقَالَ: إِنِّي لَمْ أَدْرِ أَيَدُ امْرَأَةٍ هِيَ أَوْ رَجُلٍ قَالَتْ: بَلْ يَدُ امْرَأَةٍ، قَالَ: لَوْ كُنْتِ امْرَأَةً لَغَيَّرْتِ أَظْفَارَكِ بِالْحِنَّاءِ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک دەستی درێژکرد بۆ پێغەمبەر ﷺ بە نوسراوێک (پێغەمبەریش ﷺ) دەستی خۆی نوقاند، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستم درێژ کرد بۆت بە نوسراوێک وەرت نەگرت، فەرمووی: من نەمزانی ئایا ئەوە دەستی ئافرەتە یان دەستی پیاوە، وتی: بەڵکو دەستی ئافرەتە، فەرمووی: ئەگەر تۆ ئافرەت بووایەی ئەوە نینۆکەکانت بە خەنە ڕەنگ دەکرد.

## حەز نەکردن بە بۆنی خەنە

**٥٠٩٠-** «عَنْ كَرِيمَةَ قَالَتْ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ سَأَلَتْهَا امْرَأَةٌ عَنِ الْخِضَابِ بِالْحِنَّاءِ، قَالَتْ: لَا بَأْسَ بِهِ، وَلَكِنْ أَكْرَهُ هَذَا، لِأَنَّ حِبِّي ﷺ كَانَ يَكْرَهُ رِيحَهُ، تَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ»[٢].

واتە: کەریمە دەڵێ: گوێم لە ئافرتێک بوو پرسیاری کرد لە عائیشە لەبارەی قژ بۆیەکردن بە خەنە، وتی: هیچ گرفتێکی تێدا نیە، بەڵام من حەزی لێناکەم، چونکە خۆشەویستەکەم ﷺ حەزی لە بۆنی نەدەکرد، مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بوو.

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٤١٦٦.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤١٦٤.




## هەڵکەندنی تووک

**٥٠٩١-** «عَنْ أَبِي رَيْحَانَةَ يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ عَشْرٍ عَنْ: الْوَشْرِ، وَالْوَشْمِ، وَالنَّتْفِ، وَعَنْ مُكَامَعَةِ الرَّجُلِ الرَّجُلَ بِغَيْرِ شِعَارٍ، وَعَنْ مُكَامَعَةِ الْمَرْأَةِ الْمَرْأَةَ بِغَيْرِ شِعَارٍ، وَأَنْ يَجْعَلَ الرَّجُلُ أَسْفَلَ ثِيَابِهِ حَرِيراً مِثْلَ الْأَعَاجِمِ، أَوْ يَجْعَلَ عَلَى مَنْكِبَيْهِ حَرِيراً، أَمْثَالَ الْأَعَاجِمِ، وَعَنِ النُّهْبَى، وَعَنْ رُكُوبِ النُّمُورِ، وَلُبُوسِ الْخَوَاتِيمِ إِلَّا لِذِي سُلْطَانٍ»[١].

**واتە: ئەبو ڕەیحانە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دە شتی قەدەغەکردوە: دەستکاری کردنی ددان و جوانکردنەوەی لە لایەن ئافرەتی بەساڵاچوو بۆ ئەوەی خۆی بشوبهێنی بە گەنج، خاڵ کوتان، هەڵکەندنی تووکی سپی لە ڕوخسار، ڕاکشانی دوو پیاو پێکەوە لەسەر جێگەیەک بەبێ ئەوەی پەردەیەک لە نێوانیاندا بێت، وە ڕاکشانی دوو ئافرەت پێکەوە لەسەر جێگەیەک بەبێ ئەوەی پەردەیەک لە نێوانیاندا بێت (واتە: یەک دۆشەک و یەک بەتانی) کەسێک بەشێکی زۆر لە دەوروبەری جلەکەی بکات بە حەریر، (بە ئەندازەی چوار پەنجە زیاتر) وەک عەجەمەکان، یان حەریر بخاتە سەر شانی، وە تاڵانی و بردنی ماڵی غەنیمەت پێش دابەش کردنی، وە بەکارهێنانی پێستی پڵنگ بۆ سەر ئاژەڵ و پۆشینی، وە لە دەست کردنی موستیلە مەگەر بۆ خاوەن دەسەڵات.**

## پێوەخستنی پەڕۆ بە قژەوە (بۆ ئەوەی قژی زۆر دەربکەوێت)

**٥٠٩٢-** «عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الزُّورِ»[٢].

**واتە: موعاویە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە (الزُّور) وە (الزُّور) بریتیە لەوەی ئافرەت لە دواوە قژی دەکات بە تۆپەڵە (وەکو کۆپانەی وشتر دەردەکەوێ).**

**٥٠٩٣-** «عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ عَلَى الْمِنْبَرِ وَمَعَهُ فِي يَدِهِ كُبَّةٌ مِنْ كُبَبِ النِّسَاءِ مِنْ شَعْرٍ، فَقَالَ: مَا بَالُ الْمُسْلِمَاتِ يَصْنَعْنَ مِثْلَ هَذَا، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ زَادَتْ فِي رَأْسِهَا شَعْراً لَيْسَ مِنْهُ، فَإِنَّهُ زُورٌ تَزِيدُ فِيهِ»[٣].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٠٤٩، وإبن ماجه: ٣٦٥٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: سەعیدی مەقبوری ﷺ دەڵێ: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانم بینی لەسەر مینبەر تۆپەڵە قژێک بەدەستیەوە بوو، لە تۆپەڵە قژی ئافرەتان، وتی: ئەوە چیە مسوڵمانان ئەمانە بەکاردێنن، من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر ئافرەتێک پارچە قژێک زیاد بکات بۆ سەری و هی خۆی نەبێ، ئەوە (الزُّور)ە. (کە بریتیە لەوەی ئافرەت لە دواوە قژی دەکات بە تۆپەڵە، بە قژی تر زیادی دەکات (وەکو کۆپانەی وشتر دەردەکەوێ).

## (الْوَاصِلَة): (ئەو کەسەیە قژێکی دروستکراو دەبەستێ بە قژێکی ترەوە، یەکسانە بیبەستێ بە قژی خۆیەوە یان قژی کەسێکی تر)

**٥٠٩٤-** «عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَعَنَ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ»[١].

واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لە ئەوکەسەی قژێکی دروستکراو دەبەستێ بە قژێکی ترەوە، وە ئەو کەسەش بۆی دەبەسترێ (یان بۆ دەچێنرێ).

## (الْمُسْتَوْصِلَة): (ئەو کەسەیە قژی دروستکراوی بۆ دەبەسترێ)

**٥٠٩٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْوَاصِلَةَ، وَالْمُسْتَوْصِلَةَ، وَالْوَاشِمَةَ، وَالْمُوتَشِمَةَ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لە ئەوکەسەی قژێکی دروستکراو دەبەستێ بە قژێکی ترەوە، وە ئەو کەسەش بۆی دەبەسترێ (یان بۆ دەچێنرێ)، ئەو کەسەیشی خاڵ دەکوتێ و ئەوەشی خاڵی بۆ کوتراوە.

**٥٠٩٦-** «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَعَنَ الْوَاصِلَةَ، وَالْمُسْتَوْصِلَةَ، وَالْوَاشِمَةَ، وَالْمُسْتَوْشِمَةَ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.

واتە: نافع دەگێڕێتەوە، هەواڵی پێگەیشتووە کە بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لە ئەو کەسەی قژێکی دروستکراو دەبەستێ بە قژێکی ترەوە، وە ئەوکەسەش بۆی دەبەسترێ (یان بۆ دەچێنرێ)، ئەو کەسەیشی خاڵ دەکوتێ و ئەوەشی خاڵی بۆ کوتراوە.

**٥٠٩٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَعَنَ اللَّهُ الْوَاصِلَةَ، وَالْمُسْتَوْصِلَةَ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەفرینی خوا لە ئەو کەسەی قژێکی دروستکراو دەبەستێ بە قژێکی ترەوە، وە ئەوکەسەش بۆی دەبەسترێ. (یان بۆ دەچێنرێ).

**٥٠٩٨-** «عَنْ مَسْرُوقٍ أَنَّ امْرَأَةً أَتَتْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﷺ فَقَالَتْ: إِنِّي امْرَأَةٌ زَعْرَاءُ أَيَصْلُحُ أَنْ أَصِلَ فِي شَعْرِي؟ فَقَالَ: لَا، قَالَتْ: أَشَيْءٌ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَوْ تَجِدُهُ فِي كِتَابِ اللَّهِ؟ قَالَ: لَا بَلْ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَأَجِدُهُ فِي كِتَابِ اللَّهِ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ»[٢].

واتە: مەسروق دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک هات بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ وتی: من ئافرەتێکم قژم کەمە ئایا دروستە بۆم قژی دروستکراو بدەم بە دەمیەوە؟ وتی: نەخێر، وتی: ئایا شتێکت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستووە لەو بارەیەوە، یان لە کتێبی خوادا بینیوتە؟ وتی: نەخێر، بەڵکو لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستم وە لە کتێبی خوایشدا دەیبینم، ئینجا فەرموودەکەی باسکرد.

## (الْمُتَنَمِّصَات): (ئەو ئافرەتانەن کە موولا برۆیان هەڵدەکەنن)

**٥٠٩٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْوَاشِمَاتِ، وَالْمُوتَشِمَاتِ، وَالْمُتَنَمِّصَاتِ، وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لە و ئافرەتانەی خاڵ دەکوتن و ئەوانەیشی خاڵیان بۆ دەکوترێ، وە ئەو ئافرەتانەیش کە مووی برۆیان

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٠٥ و ٥٩٣٤، ومسلم: ٢١٢٣.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٨٨٦ و ٤٨٨٧ و ٥٩٣١ و ٥٩٣٩ و ٥٩٤٣ و ٥٩٤٨، ومسلم: ٢١٢٥، وأبو داود: ٤١٦٩، والترمذي: ٢٧٨٢، وإبن ماجه: ١٩٨٩.

هەڵدەکەنن، وە ئەوانەی ددانیان بەرزو شاش دەکەن بۆ جوانی و دروستکراوی خوا دەگۆڕن.

**٥١٠٠-** «عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ ﷺ: الْمُتَفَلِّجَاتِ. وَسَاقَ الْحَدِيثَ»[١].

**واتە: ئیبراهیم دەڵێ: عەبدوڵڵا ﷺ وتی: (الْمُتَفَلِّجَاتِ) ئینجا فەرموودەکەی باسکرد.**

**٥١٠١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، تَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْوَاشِمَةِ وَالْمُسْتَوْشِمَةِ، وَالْوَاصِلَةِ وَالْمُسْتَوْصِلَةِ، وَالنَّامِصَةِ وَالْمُتَنَمِّصَةِ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لە و ئافرەتەی خاڵ دەکوتێ و لەوەشی خاڵی بۆ دەکوترێ، وە لەو ئافرەتەی قژێکی دروستکراو دەبەستێ بە قژێکی ترەوە، وە ئەو کەسەش بۆی دەبەسترێ، وە ئەو ئافرەتەی کە موو هەڵدەکەنێ و ئەوەیشی بۆی هەڵدەکەنرێ.**

## ئەوانەی خاڵ دەکوتن، وە باسی جیاوازی لەسەر عەبدوڵڵای کوڕی موڕەو شەعبی لەم فەرموودەدا

**٥١٠٢-** «عَنِ الْأَعْمَشِ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنِ مُرَّةَ يُحَدِّثُ، عَنِ الْحَارِثِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: آكِلُ الرِّبَا، وَمُوكِلُهُ، وَكَاتِبُهُ إِذَا عَلِمُوا ذَلِكَ، وَالْوَاشِمَةُ، وَالْمَوْشُومَةُ لِلْحُسْنِ، وَلَاوِي الصَّدَقَةِ، وَالْمُرْتَدُّ أَعْرَابِيًّا بَعْدَ الْهِجْرَةِ مَلْعُونُونَ عَلَى لِسَانِ مُحَمَّدٍ ﷺ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٣].

**واتە: ئەعەمەش دەڵێ: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی موڕە بوو باسی دەکرد، لە حارث، لە عەبدوڵڵاوە ﷺ دەڵێ: ئەوەی ڕیبا دەخوا، ئەوەیشی دەیدات، ئەوەیشی دەینوسێ ئەگەر زانیان، وە لە و ئافرەتەی خاڵ دەکوتێ و لەوەیشی خاڵی بۆ دەکوترێ بۆ جوانی، ئەوەیشی زەکاتی ماڵەکەی دەرناکات، ئەوەیشی دەبێتەوە دەشتەکی لە دوای هیجرەت، نەفرینیان لێکراوە لەسەر زاری موحەممەد ﷺ لە ڕۆژی دواییدا.**

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) ضعيف الإسناد.

(٣) صحيح.





**٥١٠٣-** «عَنِ حُصَيْنٍ وَمُغِيرَةٍ وابن عَوْنٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ الْحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَعَنَ آكِلَ الرِّبَا، وَمُوكِلَهُ، وَكَاتِبَهُ، وَمَانِعَ الصَّدَقَةِ، وَكَانَ يَنْهَى عَنِ النَّوْحِ»[١].

**واتە: حوصەین و موغیرەو ئیبنو عەون دەگێڕێتەوە، لە شەعبی، لە حارث، لە عەلی ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لە ئەوەی ڕیبا دەخوات، ئەوەیشی دەیدات، ئەوەیشی دەینوسێ، ئەوەیشی زەکات نادات، هەروەها ڕێگری دەکرد لە شیوەن کردن.**

**٥١٠٤-** «عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ الْحَارِثِ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ آكِلَ الرِّبَا، وَمُوكِلَهُ، وَشَاهِدَهُ، وَكَاتِبَهُ، وَالْوَاشِمَةَ وَالْمُوتَشِمَةَ قَالَ: إِلَّا مِنْ دَاءٍ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، وَالْحَالُّ وَالْمُحَلَّلُ لَهُ، وَمَانِعُ الصَّدَقَةِ، وَكَانَ يَنْهَى عَنِ النَّوْحِ، وَلَمْ يَقُلْ لَعَنَ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەون دەگێڕێتەوە، لە شەعبی، لە حارث دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لە ئەوەی ڕیبا دەخوات، ئەوەیشی دەیدات، ئەوەشی دەبێتە شاهید لە مامەڵەکە، ئەوەشی دەینوسێ، ئەوەیشی خاڵ دەکوتێ و ئەوەیشی خاڵی بۆ دەکوترێ، وتی: مەگەر بۆ نەخۆشیەک؟ وتی: بەڵێ، وە ئەوەی کە ژنی مێرداری تەڵاقدراو حەڵاڵ دەکات، ئەوەیشی بۆی حەڵاڵ کراوە (لە کوردەوایدا پێی دەوترێ: مارە بە جاش، ئەویش بریتیە لەوەی پیاوێک ژنەکەی تەڵاق دەدات کەسێکی تریش بۆ چەند ڕۆژێک، یان بۆ چەند ساتێک لە خۆی مارەی دەکات بەو مەرجەی دواتر بیداتەوە بە مێردی یەکەمی) ئەوەیشی زەکاتی ماڵەکەی دەرناکات، هەروەها ڕێگری دەکرد لە شیوەن کردن، نەیوت نەفرینی کردوە.**

**٥١٠٥-** «عَنْ عَطَاءِ بن السَّائِبِ عن الشَّعْبِيِّ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ آكِلَ الرِّبَا، وَمُوكِلَهُ، وَشَاهِدَهُ، وَكَاتِبَهُ، وَالْوَاشِمَةَ، وَالْمُوتَشِمَةَ، وَنَهَى عَنِ النَّوْحِ، وَلَمْ يَقُلْ لَعَنَ صَاحِبَ»[٣].

**واتە: عەطائی کوڕی سائیب دەگێڕێتەوە، شەعبی دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لەو کەسەی ڕیبا دەخوات، ئەوەیشی دەیدات، ئەوەیشی شایەتی بۆ دەدات و ئەوەیشی دەینوسێت، ئەوەیشی خاڵ دەکوتێ و ئەوەیشی خاڵی بۆ دەکوترێ، هەروەها ڕێگری دەکرد لە شیوەن کردن، نەیوت نەفرینی لێکردوە.**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٠٧٦ و ٢٠٧٧، والترمذي: ١١١٩، وإبن ماجه: ١٩٣٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.




٥١٠٦- «عَنْ عُمَارَةَ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أُتِيَ عُمَرُ بِامْرَأَةٍ تَشِمُ، فَقَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ هَلْ سَمِعَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَبُو هُرَيْرَةَ: فَقُمْتُ فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، أَنَا سَمِعْتُهُ قَالَ: فَمَا سَمِعْتَهُ؟ قُلْتُ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: لَا تَشِمْنَ، وَلَا تَسْتَوْشِمْنَ»[١].

**واتە: عومارە دەگێڕێتەوە، لە ئەبو زورعە، لە ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئافرەتێکیان هێنا بۆ لای عومەر خاڵی دەکوتا، عومەر ﷺ وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا کەسێک لە ئێوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هیچی لەوبارەوە بیستووە، ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: هەڵسام وتم: ئەی ئەمیری بڕواداران من بیستومە فەرموویەتی: وتی: تۆ چیت بیستووە؟ وتم: گوێم لێ بوو دەیفەرموو: با نە خاڵ بکوتن و نە خاڵیشیان بۆ بکوترێ.**

## (الْمُتَفَلِّجَاتِ): (ئەو ئافرەتانەی ددانیان بەرزو شاش دەکەن بۆ جوانی)

٥١٠٧- «عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَلْعَنُ الْمُتَنَمِّصَاتِ، وَالْمُتَفَلِّجَاتِ، وَالْمُوتَشِمَاتِ اللَّاتِي يُغَيِّرْنَ خَلْقَ اللَّهِ ﷻ»[٢].

**واتە: ئیبنو مەسعود ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، نەفرینی دەکرد لە ئەوانەی مووی برۆیان هەڵدەکەنن، وە ئەوانەی ددانیان بەرزو شاش دەکەن (بۆ جوان کردن)، ئەوانەشی خاڵ دەکوتن، ئەوانەی دروستکراوی خوا ﷻ دەگۆڕن.**

٥١٠٨- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَلْعَنُ الْمُتَنَمِّصَاتِ، وَالْمُتَفَلِّجَاتِ، وَالْمُوتَشِمَاتِ اللَّاتِي يُغَيِّرْنَ خَلْقَ اللَّهِ ﷻ»[٣].

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، نەفرینی دەکرد لە ئەوانەی مووی برۆیان هەڵدەکەنن، وە ئەوانەی ددانیان بەرزو شاش دەکەن بۆ جوانی، ئەوانەیشی خاڵ دەکوتن، ئەوانەی دروستکراوی خوا ﷻ دەگۆڕن.**

٥١٠٩- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَعَنَ اللَّهُ الْمُتَنَمِّصَاتِ، وَالْمُوتَشِمَاتِ، وَالْمُتَفَلِّجَاتِ اللَّاتِي يُغَيِّرْنَ خَلْقَ اللَّهِ ﷻ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٤٦.

(٢) حسن صحيح.

(٣) حسن صحيح.

(٤) حسن صحيح.




واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: نەفرینی خوا لە ئەوانەی مووی برۆیان هەڵدەکەنن، وە ئەوانەی ددانیان بەرزو شاش دەکەن بۆ جوانی، ئەوانەیشی خاڵ دەکوتن، ئەوانەی دروستکراوی خوا ﷻ ﷻ دەگۆڕن.

## قەدەغەکردنی باریک کردنی ددان[1]

**٥١١٠-** «عَنْ أَبِي الْحُصَيْنِ الْحِمْيَرِيِّ، أَنَّهُ كَانَ هُوَ وَصَاحِبٌ لَهُ يَلْزَمَانِ أَبَا رَيْحَانَةَ ﷺ يَتَعَلَّمَانِ مِنْهُ خَيْراً قَالَ: فَحَضَرَ صَاحِبِي يَوْماً، فَأَخْبَرَنِي صَاحِبِي أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا رَيْحَانَةَ يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَرَّمَ الْوَشْرَ، وَالْوَشْمَ، وَالنَّتْفَ»[٢].

واتە: ئەبو حوصەینی حیمیەری، خۆی و هاوەڵێکی خۆیان پەیوەست کردبوو بە ئەبو ڕەیحانەوە ﷺ لێیەوە فێری خێرو چاکە دەبوون، وتی: ڕۆژێک هاوەڵەکەم ئامادە بوو، هاوەڵەکەم هەواڵی پێدام کە ئەو بیستویەتی ئەبو ڕەیحانە دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستکاری کردنی ددان و جوانکردنەوەی لە لایەن ئافرەتی بەساڵاچوو بۆ ئەوەی خۆی بشوبهێنی بە گەنج قەدەغە کردوە، هەروەها خاڵ کوتان و هەڵکەندنی مووش.

**٥١١١-** «عَنْ أَبِي رَيْحَانَةَ ﷺ قَالَ: بَلَغَنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْوَشْرِ، وَالْوَشْمِ»[٣].

واتە: ئەبو ڕەیحانە ﷺ دەڵێ: هەواڵمان پێگەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستکاری کردنی ددان و جوانکردنەوەی لە لایەن ئافرەتی بەساڵاچوو بۆ ئەوەی خۆی بشوبهێنی بە گەنج قەدەغەکردوە، هەروەها خاڵ کوتانیش.

**٥١١٢-** «عَنْ أَبِي رَيْحَانَةَ ﷺ قَالَ: بَلَغَنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْوَشْرِ، وَالْوَشْمِ»[٤].

واتە: ئەبو ڕەیحانە ﷺ دەڵێ: هەواڵمان پێگەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستکاری کردنی ددان و جوانکردنەوەی لە لایەن ئافرەتی بەساڵاچوو بۆ ئەوەی خۆی بشوبهێنی بە گەنج قەدەغەکردوە، هەروەها خاڵ کوتانیش.

---

(١) ئەمەش ئافرەتانی بەساڵاچوو دەیکەن بۆ ئەوەی خۆیان بچوێنن بە ئافرەتە گەنجەکان.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.





## چاو ڕەشتن

**٥١١٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ مِنْ خَيْرِ أَكْحَالِكُمُ الْإِثْمِدَ إِنَّهُ يَجْلُو الْبَصَرَ، وَيُنْبِتُ الشَّعَرَ»(١).

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی چاکترین جۆری ئەوەی چاوی پێ دەڕژن بەردی (الْإِثْمِدَ)ـە، (ئەویش بەردێکی بە ناوبانگە بۆ چاوڕەشتن) ئەو چاوڕەشتنە ڕووناکی چاو زیاد دەکات و تووکیش سەوز دەکات.

## چەورکردنی قژ

**٥١١٤-** «عَنْ سِمَاكٍ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ ﷺ، سُئِلَ عَنْ شَيْبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَانَ إِذَا ادَّهَنَ رَأْسَهُ لَمْ يُرَ مِنْهُ، وَإِذَا لَمْ يُدَّهَنْ رُئِيَ مِنْهُ»(٢).

واتە: سیماک دەڵێ: گوێم لە جابری کوڕی سەمورە ﷺ بوو، پرسیاری لێکرا لە بارەی مووی سپی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: کاتێ قژی چەور بکردایە پێیەوە دیار نەبوو، وە ئەگەر چەوری نەکردایە پێیەوە دیار بوو.

## ڕەنگ کردن بە زەعفەران

**٥١١٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، كَانَ يَصْبُغُ ثِيَابَهُ بِالزَّعْفَرَانِ، فَقِيلَ لَهُ، فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصْبُغُ»(٣).

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) جلەکانی ڕەنگ دەکرد بە زەعفەران، پێی وترا: وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگی دەکرد.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٨٧٨ و ٤٠١٦، والترمذي: ٩٩٤، وإبن ماجه: ١٤٧٢ و ٣٤٩٧ و ٣٥٦٦.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٨ و ٢٣٤٤/١٠٩، والترمذي: ٣٦٤٤.

(٣) صحيح الإسناد.




## بەکارهێنانی عەنبەر

**٥١١٦-** «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَطَيَّبُ قَالَتْ: نَعَمْ، بِذِكَارَةِ الطِّيبِ الْمِسْكِ، وَالْعَنْبَرِ»[١].

**واتە:** موحەممەدی کوڕی عەلی دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ): ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆنی خۆشی بەکاردەهێنا؟ وتی: بەڵێ، ئەوەی بۆ پیاو شیاوە میسک و عەنبەرە.

## جیاکردنەوەی نێوان گوڵاوی پیاوان و گوڵاوی ئافرەتان

**٥١١٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: طِيبُ الرِّجَالِ مَا ظَهَرَ رِيحُهُ، وَخَفِيَ لَوْنُهُ، وَطِيبُ النِّسَاءِ مَا ظَهَرَ لَوْنُهُ، وَخَفِيَ رِيحُهُ»[٢].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆنی پیاوان ئەوەیە بۆنی دیار بێت و ڕەنگی دیار نەبێ، بۆنی ئافرەتانیش ئەوەیە ڕەنگی دیار بێت و بۆنی دیار نەبێت.

**٥١١٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: طِيبُ الرِّجَالِ مَا ظَهَرَ رِيحُهُ، وَخَفِيَ لَوْنُهُ، وَطِيبُ النِّسَاءِ مَا ظَهَرَ لَوْنُهُ، وَخَفِيَ رِيحُهُ»[٣].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بۆنی پیاوان ئەوەیە بۆنی دیار بێت و ڕەنگی دیار نەبێ، بۆنی ئافرەتانیش ئەوەیە ڕەنگی دیار بێت و بۆنی دیار نەبێت.

## خۆشترین بۆنەکان

**٥١١٩-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ امْرَأَةً مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ اتَّخَذَتْ خَاتِماً مِنْ ذَهَبٍ وَحَشَتْهُ مِسْكاً قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: هُوَ أَطْيَبُ الطِّيبِ»[٤].

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢١٧٤ و ٤٠١٩، والترمذي: ٢٧٨٧.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەتێک لە نەوەکانی ئیسرائیل موستیلەیەکی زێری هەبوو بۆنی میسکی تێکردبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە خۆشترین بۆنە.

## بەکارهێنانی زەعفەران و (خَلُوق) (بۆنێکی ناسراوی خۆشە لە زەعفەران پێک دەهێنرێ ڕەنگی سورو زەرد ئەڕوانێ)

**٥١٢٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بِهِ رَدْعٌ مِنْ خَلُوقٍ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: اذْهَبْ فَانْهَكْهُ ثُمَّ أَتَاهُ فَقَالَ: اذْهَبْ فَانْهَكْهُ، ثُمَّ أَتَاهُ فَقَالَ: اذْهَبْ فَانْهَكْهُ، ثُمَّ لَا تَعُدْ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ خۆی گرتبوو لە بۆنی خەلوق، شوێنەکەی بە جلەکانیەوە دیار بوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: بڕۆ بە چاکی بیشۆرە، پاشان هاتەوە بۆ لای، فەرمووی: بڕۆ بە چاکی بیشۆرە، پاشان هاتەوە بۆ لای فەرمووی: بڕۆ بە چاکی بیشۆرە، ئیتر دوبارەی مەکەرەوە. (فەرموودەکە دەبێتە بەڵگە لەسەر سەختی خراپی بەکارهێنانی ئەو بۆنەی ڕەنگی هەیە بۆ پیاوان).

**٥١٢١-** «عَنْ يَعْلَى بْنِ مُرَّةَ ﷺ، أَنَّهُ مَرَّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ مُتَخَلِّقٌ، فَقَالَ لَهُ: هَلْ لَكَ امْرَأَةٌ؟ قُلْتُ: لَا، قَالَ: فَاغْسِلْهُ، ثُمَّ اغْسِلْهُ، ثُمَّ لَا تَعُدْ»[2].

واتە: یەعلای کوڕی مورە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە ئەو تێپەڕی بەلای پێغەمبەردا ﷺ خەلوقی لە خۆی دابوو، پێی فەرموو: ئایا خێزانت هەیە؟ وتم: نەخێر، فەرمووی: بڕۆ بیشۆرە، پاشان بیشۆرە، ئیتر دووبارەی مەکەرەوە.

**٥١٢٢-** «عَنْ يَعْلَى بْنِ مُرَّةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَبْصَرَ رَجُلاً مُتَخَلِّقاً قَالَ: اذْهَبْ فَاغْسِلْهُ، ثُمَّ اغْسِلْهُ، وَلَا تَعُدْ»[3].

واتە: یەعلای کوڕی مورە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای پیاوێکی کرد خەلوقی بەکارهێنابوو، فەرمووی: بڕۆ بیشۆرە، دواتر بیشۆرە، ئیتر دووبارەیشی مەکەرەوە.

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٨١٦.

(٣) ضعيف.




**٥١٢٣-** «عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَمْرٍو، عَنْ رَجُلٍ، عَنْ يَعْلَى، نَحْوَهُ خَالَفَهُ سُفْيَانُ رَوَاهُ عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حَفْصٍ، عَنْ يَعْلَى»[١].

**واتە: شوعبە دەگێڕێتەوە، لە عەطاء، لە ئیبنو عەمر، لە پیاوێکەوە لە یەعلا بە وێنەی ئەو فەرموودەی پێشووە، سوفیان پێچەوانەی کردوە لە عەطائی کوڕی سائب لە عەبدوڵڵای کوڕی حەفص لە یەعلاوە.**

**٥١٢٤-** «عَنْ يَعْلَى بْنِ مُرَّةَ الثَّقَفِيِّ ﷺ قَالَ: أَبْصَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَبِي رَدْعٌ مِنْ خَلُوقٍ قَالَ: يَا يَعْلَى، لَكَ امْرَأَةٌ؟ قُلْتُ: لَا، قَالَ: اغْسِلْهُ، ثُمَّ لَا تَعُدْ، ثُمَّ اغْسِلْهُ، ثُمَّ لَا تَعُدْ، ثُمَّ اغْسِلْهُ، ثُمَّ لَا تَعُدْ قَالَ: فَغَسَلْتُهُ ثُمَّ لَمْ أَعُدْ، ثُمَّ غَسَلْتُهُ، ثُمَّ لَمْ أَعُدْ، ثُمَّ غَسَلْتُهُ ثُمَّ لَمْ أَعُدْ»[٢].

**واتە: یەعلای کوڕی موڕەی ثەقەفی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بینیمی بۆنی خەلوقم لە خۆم دابوو شوێنەوارەکەی بە جلەکانمەوە دیار بوو، فەرمووی: ئەی یەعلا ژنت هەیە؟ وتم: نەخێر، فەرمووی: بیشۆرە، جارێکی تر مەگەڕێرەوە سەری، پاشان بیشۆرەو جارێکی تر مەگەڕێرەوە سەری، پاشان بیشۆرەو جارێکی تر مەگەڕێرەوە سەری، وتی: شۆردم و بەکارم نەهێنایەوە، پاشان شۆردم و بەکارم نەهێنا، پاشان شۆردم و بەکارم نەهێنایەوە.**

**٥١٢٥-** «عَنْ يَعْلَى ﷺ قَالَ: مَرَرْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَأَنَا مُتَخَلِّقٌ فَقَالَ: أَيْ يَعْلَى، هَلْ لَكَ امْرَأَةٌ؟ قُلْتُ: لَا، قَالَ: اذْهَبْ فَاغْسِلْهُ، ثُمَّ اغْسِلْهُ، ثُمَّ اغْسِلْهُ، ثُمَّ لَا تَعُدْ قَالَ: فَذَهَبْتُ فَغَسَلْتُهُ، ثُمَّ غَسَلْتُهُ، ثُمَّ غَسَلْتُهُ، ثُمَّ لَمْ أَعُدْ»[٣].

**واتە: یەعلا ﷺ دەڵێ: تێپەڕیم بە لای پێغەمبەری خوادا ﷺ خەلوقم بەکارهێنابوو، فەرمووی: ئەی یەعلا ژنت هەیە؟ وتم: نەخێر، فەرمووی: بڕۆ بیشۆرە، پاشان بیشۆرە، پاشان بیشۆرە، جارێکی تر مەگەڕێرەوە سەری، وتی: شۆردم، پاشان شۆردم، پاشان شۆردم و بەکارم نەهێنایەوە.**

---

**(١) ضعيف.**

**(٢) ضعيف.**

**(٣) ضعيف.**




## ئەوەی بە ناپەسەند دادەندرێ بۆ ئافرەتان لە بەکارهێنانی بۆنی خۆش

**٥١٢٦-** «عَنِ الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ اسْتَعْطَرَتْ فَمَرَّتْ عَلَى قَوْمٍ لِيَجِدُوا مِنْ رِيحِهَا فَهِيَ زَانِيَةٌ»[١].

**واتە: ئەشعەری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر ئافرەتێک خۆی بۆن خۆش بکات، پاشان تێپەڕ بێت بە لای خەڵکانێکدا، تاوەکو ئەو بۆنەی لێ بکەن کە داویەتی لە خۆی، ئەوە زینای کردوە.**

## خۆشۆردنی ئافرەت لە بۆنی خۆش

**٥١٢٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا خَرَجَتِ الْمَرْأَةُ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَلْتَغْتَسِلْ مِنَ الطِّيبِ، كَمَا تَغْتَسِلُ مِنَ الْجَنَابَةِ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئافرەت دەرچوو بۆ مزگەوت، با خۆی بشۆرێ لە بۆنی خۆش، وەک چۆن خۆی دەشۆرێت بۆ جەنابەت.**

## قەدەغە کردنی ئافرەت لە ئامادەبوونی نوێژی بە کۆمەڵ ئەگەر بۆنی خۆشی لە خۆی دابوو

**٥١٢٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ أَصَابَتْ بَخُوراً، فَلَا تَشْهَدْ مَعَنَا الْعِشَاءَ الْآخِرَةَ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر ئافرەتێک بۆنی خۆش لە خۆی بدات، با لەگەڵماندا ئامادەی نوێژی خەوتنان نەبێت.**

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٤١٧٣، والترمذي: ٢٧٨٦.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١٧٤، وإبن ماجه: ٤٠٠٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٤٤، وأبو داود: ٤١٧٥.

**٥١٢٩-** «عَنْ زَيْنَبَ، امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا شَهِدَتْ إِحْدَاكُنَّ صَلَاةَ الْعِشَاءِ، فَلَا تَمَسَّ طِيْبَاً»[١].

**واتە: زەینەب خێزانی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە ئامادەی نوێژی عیشا بوو با بۆنی خۆش لە خۆی نەدات.**

**٥١٣٠-** «عَنْ زَيْنَبَ، امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا شَهِدَتْ إِحْدَاكُنَّ الْعِشَاءَ، فَلَا تَمَسَّ طِيباً»[٢].

**واتە: زەینەب خێزانی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە ئامادەی نوێژی عیشا بوو با بۆنی خۆش لە خۆی نەدات.**

**٥١٣١-** «عَنْ زَيْنَبَ الثَّقَفِيَّةِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَيَّتُكُنَّ خَرَجَتْ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَلَا تَقْرَبَنَّ طِيباً»[٣].

**واتە: زەینەبی ثەقەفیە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێک لە ئێوە دەرچوو بۆ مزگەوت، با نزیکی بۆنی خۆش نەبێتەوە.**

**٥١٣٢-** «عَنْ زَيْنَبَ الثَّقَفِيَّةِ، امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَهَا أَنْ لَا تَمَسَّ الطِّيبَ، إِذَا خَرَجَتْ إِلَى الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ»[٤].

**واتە: زەینەبی ثەقەفیە خێزانی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرد بۆنی خۆش لە خۆی نەدات ئەگەر دەرچوو بۆ نوێژی عیشا.**

**٥١٣٣-** «عَنْ زَيْنَبَ الثَّقَفِيَّةِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا خَرَجَتِ الْمَرْأَةُ إِلَى الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ، فَلَا تَمَسَّ طِيباً»[٥].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤١ و ٤٤٣/١٤٢.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٤٣/١٤٢.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح.

واتە: زەینەبی ثەقەفیە دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئافرەت دەرچوو بۆ نوێژی عیشا با بۆنی خۆش بەکاری نەهێنێت.

**٥١٣٤-** «عَنْ زَيْنَبَ الثَّقَفِيَّةِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا شَهِدَتْ إِحْدَاكُنَّ الصَّلَاةَ، فَلَا تَمَسَّ طِيباً»[١].

واتە: زەینەبی ثەقەفیە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە ئامادەی نوێژ بوو با بۆنی خۆش لە خۆی نەدات.

## بەکار هێنانی مێخوڕ

**٥١٣٥-** «عَنْ نَافِعٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا إِذَا اسْتَجْمَرَ اسْتَجْمَرَ بِالْأَلُوَّةِ غَيْرَ مُطَرَّاةٍ، وَبِكَافُورٍ يَطْرَحُهُ مَعَ الْأَلُوَّةِ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا كَانَ يَسْتَجْمِرُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[٢].

واتە: نافع دەڵێ: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) هەندێ جار مێخوڕێکی پەتی دادەگیرسان، هەندێ جاریش تێکەڵی دەکرد لەگەڵ کافوردا، پاشان وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەم شێوەیە مێخوڕی دادەگیرساند.

## کەراهەتی هەیە ئافرەتان خشڵ و زێڕو زیو بە ئاشکرا بە خۆیاندا بکەن و دەری بخەن

**٥١٣٦-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ يُخْبِرُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَمْنَعُ أَهْلَهُ الْحِلْيَةَ وَالْحَرِيرَ وَيَقُولُ: إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ حِلْيَةَ الْجَنَّةِ، وَحَرِيرَهَا فَلَا تَلْبَسُوهَا فِي الدُّنْيَا»[٣].

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ هەواڵیداوە، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە خانەوادەکەی خشڵ و حەریر بپۆشن، وە دەیفەرموو: ئەگەر ئێوە خشڵ و حەریری بەهەشتتان دەوێ، ئەوە لە دنیادا لە بەری مەکەن.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٥٤.

(٣) صحيح.




**٥١٣٧-** «عَنْ رِبْعِيٍّ، عَنْ امْرَأَتِهِ، عَنْ أُخْتِ حُذَيْفَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ، قَالَتْ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ، أَمَا لَكُنَّ فِي الْفِضَّةِ مَا تَحَلَّيْنَ، أَمَا إِنَّهُ لَيْسَ مِنَ امْرَأَةٍ تَحَلَّتْ ذَهَباً تُظْهِرُهُ إِلَّا عُذِّبَتْ بِهِ»(1).

**واتە: ڕەبعی دەگێڕێتەوە، لە خێزانەکەیەوە، لە خوشکی حوزەیفەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین و فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ئافرەتان، بۆ ئێوە هەیە هەرچۆنێک زیو بپۆشن، بەڵام هەر ئافرەتێک لە ئێوە زێڕ بپۆشێ و دەریبخات ئیللا بە هۆیەوە سزا دەدرێت.**

**٥١٣٨-** «عَنْ رِبْعِيٍّ، عَنْ امْرَأَتِهِ، عَنْ أُخْتِ حُذَيْفَةَ قَالَتْ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ، أَمَا لَكُنَّ فِي الْفِضَّةِ مَا تَحَلَّيْنَ، أَمَا إِنَّهُ لَيْسَ مِنْكُنَّ امْرَأَةٌ تُحَلَّى ذَهَباً تُظْهِرُهُ إِلَّا عُذِّبَتْ بِهِ»(2).

**واتە: ڕەبعی دەگێڕێتەوە، لە خێزانەکەیەوە، لە خوشکی حوزەیفەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین و فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ئافرەتان، بۆ ئێوە هەیە هەرچۆنێک زیو بپۆشن، بەڵام هەر ئافرەتێک لە ئێوە زێڕ بپۆشێ و دەریبخات ئیللا بە هۆیەوە سزا دەدرێت.**

**٥١٣٩-** «عَنْ أَسْمَاءِ بِنْتِ يَزِيدَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ تَحَلَّتْ، يَعْنِي بِقِلَادَةٍ مِنْ ذَهَبٍ جُعِلَ فِي عُنُقِهَا مِثْلُهَا مِنَ النَّارِ، وَأَيُّمَا امْرَأَةٍ جَعَلَتْ فِي أُذُنِهَا خُرْصاً مِنْ ذَهَبٍ، جَعَلَ اللَّهُ ﷻ فِي أُذُنِهَا مِثْلَهُ خُرْصاً مِنَ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»(3).

**واتە: ئەسمائی کچی یەزید (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر ئافرەتێک خۆی بڕازێنێتەوە بە ملوانکەی زێڕ، بە وێنەی ئەوە ئاگر دەخرێتە ملی، وە هەر ئافرەتێک گوارەی زێڕ لە گوێ بکات (و دەریبخات بۆ خەڵک) خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییدا گوارەیەکی ئاگرین دەکاتە گوێی.**

**٥١٤٠-** «عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ الرَّحَبِيِّ، أَنَّ ثَوْبَانَ ﷺ، مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَدَّثَهُ قَالَ: جَاءَتْ بِنْتُ هُبَيْرَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَفِي يَدِهَا فَتَخٌ، فَقَالَ: كَذَا فِي كِتَابِ أَبِي، أَيْ خَوَاتِيمُ ضِخَامٌ، فَجَعَلَ

---

**(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٢٣٧.**

**(٢) ضعيف.**

**(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٢٨٣.**




رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَضْرِبُ يَدَهَا، فَدَخَلَتْ عَلَى فَاطِمَةَ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، تَشْكُو إِلَيْهَا الَّذِي صَنَعَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَانْتَزَعَتْ فَاطِمَةُ سِلْسِلَةً فِي عُنُقِهَا مِنْ ذَهَبٍ، وَقَالَتْ: هَذِهِ أَهْدَاهَا إِلَيَّ أَبُو حَسَنٍ، فَدَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالسِّلْسِلَةُ فِي يَدِهَا فَقَالَ: يَا فَاطِمَةُ، أَيَغُرُّكِ أَنْ يَقُولَ النَّاسُ ابْنَةُ رَسُولِ اللَّهِ وَفِي يَدِهَا سِلْسِلَةٌ مِنْ نَارٍ، ثُمَّ خَرَجَ وَلَمْ يَقْعُدْ، فَأَرْسَلَتْ فَاطِمَةُ بِالسِّلْسِلَةِ إِلَى السُّوقِ فَبَاعَتْهَا، وَاشْتَرَتْ بِثَمَنِهَا غُلَاماً و»قَالَ مَرَّةً: عَبْداً «وَذَكَرَ كَلِمَةً مَعْنَاهَا» فَأَعْتَقَتْهُ، فَحُدِّثَ بِذَلِكَ، فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنْجَى فَاطِمَةَ مِنَ النَّارِ»[١].

**واتە: ئەبو ئەسمائی ڕەحەبی دەگێڕێتەوە: ثەوبان ﷺ مەولای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باسکردو وتی: کچەکەی هوبەیرە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بازنێکی گەورەی زێڕی لە دەستیدا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ دای لە دەستی، ئەویش ڕۆیشت بۆ لای فاطیمە سکاڵای ئەوەی کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ دای لە دەستی، فاطیمەیش زنجیرێکی زێڕ لە ملیدا بوو دایکەند، وتی: ئەمە باوکی حەسەن بە هەدیە پێی داوم، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە زنجیرەکە لە ناو دەستیدا بوو، فەرمووی: ئەی فاطیمە ئایا پێت خۆشە خەڵکی بڵێن فاطیمەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ زنجیرێکی ئاگرین لە دەستیدایە، پاشان چووە دەرەوەو دانەنیشت، فاطیمە زنجیرەکەی نارد بۆ بازاڕو فرۆشتی و بە نرخەکەی کۆیلەیەکی منداڵی کڕی، جارێکی تر وتی: کۆیلەیەکی کڕی «وە باسی وشەیەکی ماناکەی ئەوە بوو»، پاشان ئازادی کرد، ئەوە باس کرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی فاطیمەی لە ئاگر ڕزگارکرد.**

**٥١٤١-** «عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ قَالَ: جَاءَتْ بِنْتُ هُبَيْرَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَفِي يَدِهَا فَتَخٌ مِنْ ذَهَبٍ، أَيْ خَوَاتِيمُ ضِخَامٌ فَجَعَلَ رسول اللَّهِ ﷺ يَضْرِبُ يَدَهَا فَدَخَلَتْ على فَاطِمَةَ بِنْتِ رسول اللَّهِ ﷺ تَشْكُو إِلَيْهَا الذي صَنَعَ بها رسول اللَّهِ ﷺ فَانْتَزَعَتْ فَاطِمَةُ سِلْسِلَةً في عُنُقِهَا من ذَهَبٍ وَقَالَتْ هذه أَهْدَاهَا إلي أبو حَسَنٍ فَدَخَلَ رسول اللَّهِ ﷺ وَالسِّلْسِلَةُ في يَدِهَا فقال يا فَاطِمَةُ أَيَغُرُّكِ أَنْ يَقُولَ الناس ابْنَةُ رسول اللَّهِ وفي يَدِهَا سِلْسِلَةٌ من نَارٍ ثُمَّ خَرَجَ ولم يَقْعُدْ فَأَرْسَلَتْ فَاطِمَةُ بِالسِّلْسِلَةِ إلى السُّوقِ فَبَاعَتْهَا وَاشْتَرَتْ بِثَمَنِهَا غُلَاماً وقال مَرَّةً عَبْداً «وَذَكَرَ كَلِمَةً مَعْنَاهَا» فَأَعْتَقَتْهُ فَحُدِّثَ بِذَلِكَ فقال الْحَمْدُ لِلَّهِ الذي أَنْجَى فَاطِمَةَ من النَّارِ»[٢].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح.**




واتە: ثەوبان ﷺ دەڵێ: کچەکەی هوبەیرە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ چەند بازنێکی گەورەی زێڕ لە دەستیدا بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ دەیدا لە دەستی، دواتر ڕۆیشت بۆ لای فاطیمەی کچی پێغەمبەر ﷺ سکاڵای ئەوەی کرد کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵی کردی، فاطیمەش زنجیرێکی زێڕ لە ملیدا بوو دایکەند، وتی: ئەمە باوکی حەسەن بە دیاری پێی داوم، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە زنجیرەکە لە دەستیدا بوو، فەرمووی: ئەی فاطیمە ئایا پێت خۆشە خەڵکی بڵێن فاطیمەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ زنجیرێکی ئاگرینی لە دەستیدایە، پاشان پێغەمبەر ﷺ چووە دەرەوەو دانەنیشت، دواتر فاطیمە زنجیرەکەی نارد بۆ بازاڕو فرۆشتی و بە نرخەکەی منداڵێکی کۆیلەی پێ کڕی، جارێکی تر وتی: کۆیلەیەکی پێ کڕی «وە باسی وشەیەکی ماناکەی ئەوە بوو»، پاشان ئازادی کرد، ئەوە باس کرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی فاطیمەی لە ئاگر ڕزگارکرد.

**٥١٤٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كُنْتُ قَاعِداً عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَأَتَتْهُ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، سِوَارَيْنِ مِنْ ذَهَبٍ، قَالَ: سِوَارَانِ مِنْ نَارٍ، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، طَوْقٌ مِنْ ذَهَبٍ قَالَ: طَوْقٌ مِنْ نَارٍ، قَالَتْ: قُرْطَيْنِ مِنْ ذَهَبٍ، قَالَ: قُرْطَيْنِ مِنْ نَارٍ، قَالَ: وَكَانَ عَلَيْهِمَا سِوَارَانِ مِنْ ذَهَبٍ، فَرَمَتْ بِهِمَا، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا لَمْ تَتَزَيَّنْ لِزَوْجِهَا صَلِفَتْ عِنْدَهُ، قَالَ: مَا يَمْنَعُ إِحْدَاكُنَّ أَنْ تَصْنَعَ قُرْطَيْنِ مِنْ فِضَّةٍ، ثُمَّ تُصَفِّرَهُ بِزَعْفَرَانٍ أَوْ بِعَبِيرٍ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: من لە لای پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووم ئافرەتێک هات بۆ لای وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا حەڵاڵە لە دەستکردنی دوو دەستبەند لە زێڕ، فەرمووی: دوو دەستبەندە لە ئاگر، وتی: ئەی کەمەر بەندێک، فەرمووی: کەمەر بەندێکە لە ئاگر، وتی: ئەی دوو گوارەی زێڕ، فەرمووی: دوو گوارەیە لە ئاگر، وتی: دوو دەستبەندی زێڕی هەبوو هەردووکیانی فڕێدا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ئافرەت خۆی بۆ مێردەکەی جوان نەکات هیچ خێرێکی نابێ لە لای؟ فەرمووی: هیچ شتێک ڕێگری لە ئێوە ناکات کە دوو گوارەی زیو بکەنە گوێتان بە زەعفەران زەردی بکەن، یان بە عەبیر.

---

(١) ضعیف.




**٥١٤٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى عَلَيْهَا مَسَكَتَيْ ذَهَبٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَلَا أُخْبِرُكِ بِمَا هُوَ أَحْسَنُ مِنْ هَذَا، لَوْ نَزَعْتِ هَذَا، وَجَعَلْتِ مَسَكَتَيْنِ مِنْ وَرِقٍ، ثُمَّ صَفَّرْتِهِمَا بِزَعْفَرَانٍ كَانَتَا حَسَنَتَيْنِ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو بازنگی زێڕی لە دەستیدا بینی، فەرمووی: ئایا هەواڵت بدەمێ چی لەمە چاكترە، ئەگەر ئەمە لە خۆت بكەیتەوەو لە جێگای دوو بازنی زیو دابنێیت، پاشان بە زەعفەران زەردیان بكەیت، ئەوە بۆ تۆ چاكترە.**

## قەدەغەکردنی زێڕ لەسەر پیاوان

**٥١٤٤-** «عَنْ عَلِيِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ أَخَذَ حَرِيراً، فَجَعَلَهُ فِي يَمِينِهِ، وَأَخَذَ ذَهَباً فَجَعَلَهُ فِي شِمَالِهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ هَذَيْنِ حَرَامٌ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي»[٢].

**واتە: عەلی كوڕی ئەبو طاڵیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ حەریرێكی گرت بە دەستەوەو لە لای ڕاستی داینا، زێڕێكیشی گرت بە دەستەوەو لە لای چەپی داینا، پاشان فەرمووی: بەڕاستی ئەم دووانە خوا ﷻ قەدەغەی كردوە لەسەر نێرینەی ئوممەتەكەم.**

**٥١٤٥-** «عَنْ عَلِيِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَخَذَ حَرِيراً، فَجَعَلَهُ فِي يَمِينِهِ، وَأَخَذَ ذَهَباً فَجَعَلَهُ فِي شِمَالِهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ هَذَيْنِ حَرَامٌ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي»[٣].

**واتە: عەلی كوڕی ئەبو طاڵیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ حەریرێكی گرت بە دەستەوەو لە لای ڕاستی داینا، زێڕێكیشی گرت بە دەستەوەو لە لای چەپی داینا، پاشان فەرمووی: بەڕاستی ئەم دووانە خوا ﷻ قەدەغەی كردوە لەسەر نێرینەی ئوممەتەكەم.**

**٥١٤٦-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ أَخَذَ حَرِيراً فَجَعَلَهُ فِي يَمِينِهِ، وَأَخَذَ ذَهَباً فَجَعَلَهُ فِي شِمَالِهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ هَذَيْنِ حَرَامٌ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٠٥٧، وإبن ماجه: ٣٥٩٥.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ حەریرێکی گرت بە دەستەوەو لە لای ڕاستی دایناو، زێڕێکیشی گرت بە دەستەوەو لە لای چەپی داینا، پاشان فەرمووی: بەڕاستی ئەم دووانە خوا ﷻ قەدەغەی کردوە لەسەر نێرینەی ئوممەتەکەم.**

**٥١٤٧-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ يَقُولُ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَهَباً بِيَمِينِهِ، وَحَرِيراً بِشِمَالِهِ، فَقَالَ: هَذَا حَرَامٌ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي»(١).

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زێڕێکی لە لای ڕاستی دانا، حەریرێکیشی لە لای چەپی دانا، پاشان فەرمووی: ئەمە قەدەغەیە لەسەر نێرینەی ئوممەتەکەم.**

**٥١٤٨-** «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أُحِلَّ الذَّهَبُ وَالْحَرِيرُ لِإِنَاثِ أُمَّتِي، وَحُرِّمَ عَلَى ذُكُورِهَا»(٢).

**واتە: ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زێڕو حەریر حەڵاڵ کراوە بۆ مێینەی ئوممەتەکەم، وە حەرامیش کراوە لەسەر نێرینەکانی.**

**٥١٤٩-** «عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ وَالذَّهَبِ إِلَّا مُقَطَّعاً»(٣).

**واتە: موعاویە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە پۆشینی حەریر و زێڕ مەگەر کەمێک نەبێ لەت لەت کرابێت. (واتە: ڕێژەیەکی زۆر کەم بۆ قەراغ عەباو جوبەو هاوشێوەی ئەوانە).**

**٥١٥٠-** «عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ لُبْسِ الذَّهَبِ إِلَّا مُقَطَّعاً، وَعَنْ رُكُوبِ الْمَيَاثِرِ»(٤).

**واتە: موعاویە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە پۆشینی حەریر و زێڕ مەگەر کەمێک نەبێ لەت لەت کرابێت، وە لە دانیشتن لەسەر (الْمَيَاثِر) (ڕاخەرێکە لەسەر کورتان ئەسپ یان پشتی وشتر دادەنرا، ئافرەتان دروستیان دەکرد**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

بۆ مێردەکانیان، ڕەنگی سور بوو لە حەریر دروست دەکرا، ئەوە پیشەی لووت بەرزەکان بوو).

**٥١٥١-** «عَنْ أَبِي شَيْخٍ، أَنَّهُ سَمِعَ مُعَاوِيَةَ ﷺ، وَعِنْدَهُ جَمْعٌ مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ ﷺ قَالَ: أَتَعْلَمُونَ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ لُبْسِ الذَّهَبِ إِلَّا مُقَطَّعاً؟ قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ»[١].

**واتە: ئەبو شەیخ دەگێڕێتەوە، ئەو گوێبیستی موعاویە ﷺ بوو، کۆمەڵێک لە هاوەڵانی موحەممەد ﷺ لە دەوری بوون، وتی: ئایا دەزانن پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە پۆشینی حەریرو زێڕ مەگەر کەمێک نەبێ لەت کرابێت؟ وتیان: بەڵێ.**

**٥١٥٢-** «عَنْ أَبِي شَيْخٍ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ مُعَاوِيَةَ ﷺ فِي بَعْضِ حَجَّاتِهِ إِذْ جَمَعَ رَهْطاً مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ ﷺ، فَقَالَ لَهُمْ: أَلَسْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ لُبْسِ الذَّهَبِ إِلَّا مُقَطَّعاً؟ قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ»[٢].

**واتە: ئەبو شەیخ دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە لەگەڵ موعاویە ﷺ بووین لە کاتی حەج کردنیدا، کۆمەڵێک لە هاوەڵانی موحەممەدی ﷺ کۆکردەوەو پێی وتن ئایا ئێوە نەتانزانیوە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە پۆشینی زێڕ، مەگەر کەمێک نەبێت لەت لەت کرابێت؟ وتیان: بەڵێ.**

**٥١٥٣-** «عَنْ أَبِي حِمَّانَ، أَنَّ مُعَاوِيَةَ ﷺ، عَامَ حَجَّ، جَمَعَ نَفَراً مَنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْكَعْبَةِ، فَقَالَ لَهُمْ: أَنْشُدُكُمُ اللَّهَ أَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ لُبْسِ الذَّهَبِ؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: وَأَنَا أَشْهَدُ»[٣].

**واتە: ئەبو حیمان دەگێڕێتەوە: موعاویە ﷺ لە ساڵی حەجدا کۆمەڵێک لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوای ﷺ کۆکردوە، پێیانی وت: سوێندتان دەدەم بە خوا ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێکردوون لە پۆشینی زێڕ؟ وتیان: بەڵێ، وتی: منیش شایەتی دەدەم.**

**٥١٥٤-** «عَنْ أَبِي شَيْخٍ، عَنْ أَخِيهِ حِمَّانَ، أَنَّ مُعَاوِيَةَ ﷺ، عَامَ حَجَّ جَمَعَ نَفَراً مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْكَعْبَةِ، فَقَالَ لَهُمْ: أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ، هَلْ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ لُبُوسِ الذَّهَبِ؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: وَأَنَا أَشْهَدُ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٧٩٤ و ٤٢٣٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**واتە: ئەبو شەیخ، لە براکەیەوە حیمان دەگێڕێتەوە: موعاویە ﷺ لە ساڵی حەجدا کۆمەڵێک لە هاوەڵانی پێغەمبەری ﷺ کۆکردوە لە کەعبە، پێیانی وت: سوێندتان دەدەم بە خوا ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە پۆشینی زێڕ؟ وتیان: بەڵێ، وتی: منیش شایەتی دەدەم.**

**٥١٥٥-** «عَنْ أَبِي شَيْخٍ قَالَ: حَدَّثَنِي حِمَّانُ، قَالَ: حَجَّ مُعَاوِيَةُ ﷺ، فَدَعَا نَفَراً مِنَ الْأَنْصَارِ فِي الْكَعْبَةِ فَقَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ، أَلَمْ تَسْمَعُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَنْهَى عَنِ الذَّهَبِ؟ قَالُوا: نَعَمْ قَالَ: وَأَنَا أَشْهَدُ»[١].

**واتە: ئەبو شەیخ دەڵێ: حیمان بۆی باسکردم، وتی: موعاویە ﷺ حەجی کرد، لە کەعبە کۆمەڵێک لە ئەنصارەکانی بانگ کرد، وتی: سوێندتان دەدەم بە خوا ئایا نەتانبیستووە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری بکات لە پۆشینی زێڕ؟ وتیان: بەڵێ، وتی: منیش شایەتی دەدەم.**

**٥١٥٦-** «عَنْ حِمَّانٍ قَالَ: حَجَّ مُعَاوِيَةُ ﷺ، فَدَعَا نَفَراً مِنَ الْأَنْصَارِ فِي الْكَعْبَةِ فَقَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ، أَلَمْ تَسْمَعُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الذَّهَبِ؟ قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: وَأَنَا أَشْهَدُ»[٢].

**واتە: حیمان دەڵێ: موعاویە ﷺ حەجی کرد، لە کەعبە کۆمەڵێک لە ئەنصارەکانی بانگ کرد، وتی: سوێندتان دەدەم بە خوا ئایا نەتانیستووە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە پۆشینی زێڕ؟ وتیان: بەڵێ، وتی: منیش شایەتی دەدەم.**

**٥١٥٧-** «عَنْ أَبِي حِمَّانَ قَالَ: حَجَّ مُعَاوِيَةُ ﷺ، فَدَعَا نَفَراً مِنَ الْأَنْصَارِ فِي الْكَعْبَةِ، فَقَالَ: أَلَمْ تَسْمَعُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الذَّهَبِ؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: وَأَنَا أَشْهَدُ»[٣].

**واتە: ئەبو حیمان دەڵێ: موعاویە ﷺ حەجی کرد، لە کەعبە کۆمەڵێک لە ئەنصارەکانی بانگکرد، وتی: سوێندتان دەدەم بە خوا ئایا نەتانیستووە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە پۆشینی زێڕ؟ وتیان: بەڵێ، وتی: منیش شایەتی دەدەم.**

**٥١٥٨-** «عَنْ حِمَّانٍ قَالَ: حَجَّ مُعَاوِيَةُ ﷺ، فَدَعَا نَفَراً مِنَ الْأَنْصَارِ فِي الْكَعْبَةِ فَقَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ، أَلَمْ تَسْمَعُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَنْهَى عَنِ الذَّهَبِ؟ قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: وَأَنَا أَشْهَدُ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

واتە: حیبان دەڵێ: موعاویە ﷺ حەجی کرد، لە کەعبە کۆمەڵێک لە ئەنصارەکانی بانگ کرد، وتی: سوێندتان دەدەم بە خوا ئایا نەتانیستووە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری دەکات لە پۆشینی زێڕ؟ وتیان: بەڵێ، وتی: منیش شایەتی دەدەم.

**٥١٥٩-** «عَنْ أَبِي شَيْخٍ الْهُنَائِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ ﷺ، وَحَوْلَهُ نَاسٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ، وَالْأَنْصَارِ فَقَالَ لَهُمْ: أَتَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ؟ فَقَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ، قَالَ: وَنَهَى عَنْ لُبْسِ الذَّهَبِ، إِلَّا مُقَطَّعاً؟ قَالُوا: نَعَمْ»[١].

واتە: ئەبو شەیخی هونائی دەڵێ: گوێم لە موعاویە ﷺ بوو کاتێ کۆمەڵە خەڵکێک لە موهاجیرو ئەنصارەکان لە دەوری بوون پێیانی فەرموو: ئایا دەزانن پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە پۆشینی حەریر؟ وتیان: بەڵی، وتی: هەروەها قەدەغەی کرد لە پۆشینی زێڕ، مەگەر لەت لەت کرابێ؟ وتیان: بەڵێ.

**٥١٦٠-** «عَنْ أَبِي شَيْخٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ لُبْسِ الذَّهَبِ إِلَّا مُقَطَّعاً»[٢].

واتە: ئەبو شەیخ دەڵێ: گوێم لە عومەر بوو وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە پۆشینی زێڕ، مەگەر لەت لەت کرابێ.

## ئەوەی لووتی بڕاوە ئایا لە شوێنیدا لووتێک لە زێڕ دابنێ (ئاساییە)؟

**٥١٦١-** «عَنْ عَرْفَجَةَ بْنِ أَسْعَدَ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ: أَنَّهُ أُصِيبَ أَنْفُهُ يَوْمَ الْكُلَابِ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَاتَّخَذَ أَنْفاً مِنْ وَرِقٍ فَأَنْتَنَ عَلَيْهِ فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَتَّخِذَ أَنْفاً مِنْ ذَهَبٍ»[٣].

واتە: عەرفەجەی کوڕی ئەسعەد دەگێڕێتەوە، لە باپیرەیەوە ﷺ، ئەو لە سەردەمی نەفامیدا لە ڕۆژی کیلاب (ناوی جەنگێکی بەناوبانگە لە جەنگەکانی عەرەب) بەشێک لووتی بڕابوویەوە، لووتێکی لە زیو دروستکرد، بۆگەنی کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد لووتێک دروست بکات لە زێڕ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٢٣٢ و ٤٢٣٣ و ٤٢٣٤، والترمذي: ١٧٧٠.




**٥١٦٢-** «عَنْ عَرْفَجَةَ بْنِ أَسْعَدَ بْنِ كُرَيْبٍ ﵁ قَالَ: أَنَّهُ رَأَى جَدَّهُ أُصِيبَ أَنْفُهُ يَوْمَ الْكُلَابِ فِي الْجَاهِلِيَّةِ قَالَ: فَاتَّخَذَ أَنْفاً مِنْ فِضَّةٍ، فَأَنْتَنَ عَلَيْهِ، فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَتَّخِذَهُ مِنْ ذَهَبٍ»[١].

**واتە: عەرفەجەی کوڕی ئەسعەدی کوڕی کورەیب ﵁ دەڵێ: باپیرەی بینی لە سەردەمی نەفامیدا لە ڕۆژی کیلاب (ناوی جەنگێکی بەناوبانگە لە جەنگەکانی عەرەب) بەشێکی لووتی بڕابوویەوە، لووتێکی لە زیو دروستکرد، بۆگەنی کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد لووتێک دروست بکات لە زێڕ.**

## مۆڵەتدان لە بەکارهێنانی موستیلەی زێڕ بۆ پیاو

**٥١٦٣-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ قَالَ: قَالَ عُمَرُ لِصُهَيْبٍ: مَا لِي أَرَى عَلَيْكَ خَاتَمَ الذَّهَبِ؟ قَالَ: قَدْ رَآهُ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْكَ فَلَمْ يَعِبْهُ، قَالَ: مَنْ هُوَ؟ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[٢].

**واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب دەڵێ: عومەر بە صوهەیبی وت: ئەوە چیە دەبینم موستیلەی زێڕ لە دەستتدایە؟ وتی: ئەو کەسەی لە تۆ چاکترە بینیویەتی و ڕەخنەی لێ نەگرت، وتی: ئەو کەسە کێ بوو؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بوو.**

## موستیلەی زێڕ

**٥١٦٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: اتَّخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَاتَمَ الذَّهَبِ، فَلَبِسَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَاتَّخَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَ الذَّهَبِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنِّي كُنْتُ أَلْبَسُ هَذَا الْخَاتَمَ، وَإِنِّي لَنْ أَلْبَسَهُ أَبَداً، فَنَبَذَهُ، فَنَبَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَهُمْ»[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ موستیلەیەکی لە زێڕ پێ بوو لە دەستی کرد، خەڵکەکەیش موستیلەی زێڕیان لە دەست کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەم موستیلەیەم لە دەست کرد، بەڵام ئیتر هەرگیز لە دەستی ناکەم، لە دەستی دایکەند، خەڵکەکەیش لە دەستیان دایانکەند.**

---

(١) حسن.

(٢) ضعيف الإسناد.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٦٧، ومسلم: ٢٠٩١ بزيادة.




**٥١٦٥-** «عَنْ هُبَيْرَةَ بْنِ يَرِيمَ قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ ﷺ: نَهَانِي النَّبِيُّ ﷺ عَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ، وَعَنِ الْقَسِّيِّ، وَعَنِ الْمَيَاثِرِ الْحُمْرِ، وَعَنِ الْجِعَةِ»[1].

**واتە: هوبەیرەی کوڕی یەریم دەڵێ: عەلی ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی لێکردم لە لە دەستکردنی موستیلەی زێڕ، وە لە (الْقَسِّيِّ) (کە جلێکە زۆرینەی حەریرە) هەروەها لە (الْمَيَاثِرِ الْحُمْرِ) (ڕاخەرێکی سورە لەسەر زینی ئەسپ یان پشتی وشتر دادەنرا، ئافرەتان دروستیان دەکرد بۆ مێردەکانیان، ڕەنگی سوور بوو لە حەریر دروست دەکرا، ئەوە پیشەی لووت بەرزەکان بوو) وە لە (الْجِعَةِ) (کە شەرابێکی سەرخۆشکەرە لە جۆ دروست دەکرێت).**

**٥١٦٦-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ، وَعَنِ الْقَسِّيِّ، وَعَنِ الْمَيَاثِرِ الْحُمْرِ»[2].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردم لە لەدەست کردنی موستیلەی زێڕ، وە لە (الْقَسِّيِّ) (کە جلێکە زۆرینەی حەریرە) هەروەها لە (الْمَيَاثِرِ الْحُمْرِ) (ڕاخەرێکی سورە لەسەر کوتانی ئەسپ یان پشتی وشتر دادەنرا، ئافرەتان دروستیان دەکرد بۆ مێردەکانیان، ڕەنگی سوور بوو لە حەریر دروست دەکرا، ئەوە پیشەی لووتبەرزەکان بوو).**

**٥١٦٧-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ حَلْقَةِ الذَّهَبِ، وَعَنِ الْمِيثَرَةِ الْحَمْرَاءِ، وَعَنِ الثِّيَابِ الْقَسِّيَّةِ، وَعَنِ الْجِعَةِ، شَرَابٌ يُصْنَعُ مِنَ الشَّعِيرِ، وَالْحِنْطَةِ، وَذَكَرَ مِنْ شِدَّتِهِ»[3].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە لەدەستکردنی ئەڵقەی زێڕ، وە لە (الْمِيثَرَةِ الْحَمْرَاءِ) (ڕاخەرێکی بچوکی سوورە لەسەر زینی ئەسپ، یان پشتی وشتر دادەنرا، ئافرەتان دروستیان دەکرد بۆ مێردەکانیان، ڕەنگی سوور بوو لە حەریر دروست دەکرا، ئەوە پیشەی لووت بەرزەکان بوو) وە لە جلی (الْقَسِّيِّ) (کە زۆرینەی حەریرە) ،هەروەها لە (الْجِعَةِ) (کە شەرابێکی سەرخۆشکەرە لە جۆ دروست دەکرێت)، لە گەنمیش دروست دەکرێت، وە باسی توندی ئەو کارەیشی کردوە.**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٦٩٧.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**٥١٦٨-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ حَلْقَةِ الذَّهَبِ، وَالْقَسِّيِّ، وَالْمِيثَرَةِ، وَالْجِعَةِ»[1].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردووم لە لەدەستکردنی ئەڵقەی زێڕ، وە لە (الْقَسِّيِّ) (کە جلێکە زۆرینەی حەریرە) وە لە (الْمِيثَرَةِ) (ڕاخەرێکی سوورە لەسەر زینی ئەسپ یان پشتی وشتر دادەنرا، ئافرەتان دروستیان دەکرد بۆ مێردەکانیان، ڕەنگی سور بوو لە حەریر دروست دەکرا، ئەوە پیشەی لووتبەرزەکان بوو) ،هەروەها لە (الْجِعَة).**

**٥١٦٩-** «عَنْ صَعْصَعَةَ بْنِ صُوحَانَ ﷺ قَالَ: قُلْتُ لِعَلِيٍّ: انْهَنَا عَمَّا نَهَاكَ عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: نَهَانِي عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ، وَحَلْقَةِ الذَّهَبِ، وَلُبْسِ الْحَرِيرِ، وَالْقَسِّيِّ، وَالْمِيثَرَةِ الْحَمْرَاءِ»[2].

**واتە: صەعصەعەی کوڕی صوحان ﷺ دەڵێ: بە عەلیم وت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردووین وەکو چۆن قەدەغەی لە تۆ کردوە، وتی: قەدەغەی لێکردم لە دروستکردنی شەراب لە ناو کولەکە (الْحَنْتَمِ) گۆزە، وە لە لە دەستکردنی ئەڵقەی زێڕو پۆشینی حەریرو (الْقَسِّيِّ) (کە جلێکە زۆرینەی حەریرە) وە لە (الْمِيثَرَةِ الْحَمْرَاءِ) (ڕاخەرێکی سورە لەسەر زینی ئەسپ، یان پشتی وشتر دادەنرا، ئافرەتان دروستیان دەکرد بۆ مێردەکانیان، ڕەنگی سوور بوو لە حەریر دروست دەکرا، ئەوە پیشەی لووتبەرزەکان بوو).**

**٥١٧٠-** «عَنْ مَالِكِ بْنِ عُمَيْرٍ قَالَ: جَاءَ صَعْصَعَةُ بْنُ صُوحَانَ إِلَى عَلِيٍّ فَقَالَ: انْهَنَا عَمَّا نَهَاكَ عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالنَّقِيرِ، وَالْجِعَةِ، وَنَهَانَا عَنْ حَلْقَةِ الذَّهَبِ، وَلُبْسِ الْحَرِيرِ، وَلُبْسِ الْقَسِّيِّ، وَالْمِيثَرَةِ الْحَمْرَاءِ»[3].

**واتە: مالیکی کوڕی عومەیر دەڵێ: صەعصەعەی کوڕی صوحان هات بۆ لای عەلی وتی: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردوین وەکو چۆن قەدەغەی لە تۆ کردوە، وتی: قەدەغەی لێکردووین لە دروست کردنی شلەمەنی لەناو کولەکە و گۆزە و قەدی دارخورمای هەڵکۆڵدراو (ئەوانە چەند قاپێک بوو لە ناو عەرەبدا بەکاریان**

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح.

(٣) صحیح.




دەهێنا، لە دار دروست کرابوون، هەڵیان دەکۆڵی و بەکاریان دەهێنا بۆ جۆرەها خواردنەوە، ئەو قاپانە دەبوونە هۆکارو یارمەتیدەر بۆ ئەوەی ئەو خواردنەوانە زووتر ببێتە سەرخۆشکەر)، وە لە (الْجِعَة) (کە شەرابێکی سەرخۆشکەرە لە جۆ دروست دەکرێت)، وە قەدەغەی لێکردین لە پۆشینی (الْقَسِّيِّ) (کە جلێکە زۆرینەی حەریرە) وە لە (الْمِيثَرَةِ الْحَمْرَاءِ) (ڕاخەرێکی سوورە لەسەر زینی ئەسپ یان پشتی وشتر دادەنرا، ئافرەتان دروستیان دەکرد بۆ مێردەکانیان، ڕەنگی سوور بوو لە حەریر دروست دەکرا، ئەوە پیشەی لووتبەرزەکان بوو).

**٥١٧١-** «عَنْ مَالِكِ بْنِ عُمَيْرٍ قَالَ: قَالَ صَعْصَعَةُ بْنُ صُوحَانَ لِعَلِيٍّ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، انْهَنَا عَمَّا نَهَاكَ عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالْجِعَةِ، وَعَنْ حِلَقِ الذَّهَبِ، وَلُبْسِ الْحَرِيرِ، وَعَنِ الْمِيثَرَةِ الْحَمْرَاءِ»[١].

واتە: مالیکی کوڕی عومەیر دەڵێ: صەعصەعەی کوڕی صوحان بە عەلی ئەمیری بڕواداران وت: قەدەغەمان لێ بکە لەو شتانەی پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێ کردووی، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردووین لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو کولەکەو گۆزە و قەدی دارخورمای هەڵکۆڵدراو (الْجِعَة) (کە شەرابێکی سەرخۆشکەرە لە جۆ دروست دەکرێت)، وە لە لەدەست کردنی ئەڵقەی زێڕو پۆشینی حەریر، هەروەها لە (الْمِيثَرَةِ الْحَمْرَاءِ) (ڕاخەرێکی سوورە لەسەر کورتانی ئەسپ یان پشتی وشتر دادەنرا، ئافرەتان دروستیان دەکرد بۆ مێردەکانیان، ڕەنگی سوور بوو لە حەریر دروست دەکرا، ئەوە پیشەی لووتبەرزەکان بوو).

**٥١٧٢-** «عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قَالَ: نَهَانِي حِبِّي ﷺ عَنْ ثَلَاثٍ لَا أَقُولُ نَهَى النَّاسَ «نَهَانِي: عَنْ تَخَتُّمِ الذَّهَبِ، وَعَنْ لُبْسِ الْقَسِّيِّ، وَعَنِ الْمُعَصْفَرِ الْمُفَدَّمَةِ، وَلَا أَقْرَأُ سَاجِداً، وَلَا رَاكِعاً»[٢].

واتە: عەلی رضي الله عنه دەڵێ: خۆشەویستەکەم ﷺ قەدەغەی لێکردووم لە سێ شت، ناڵێم قەدەغەی لە خەڵکی کرد، بەڵکو قەدەغەی لە من کرد، لە لەدەست کردنی زێڕ و پۆشینی (الْقَسِّيِّ) (کە جلێکە زۆرینەی حەریرە) و (الْمُعَصْفَرِ الْمُفَدَّمَة) (کە جلوبەرگێکە بە سووری تۆخ ڕەنگ کراو)، هەروەها لە سوژدەو ڕکوعدا قورئان نەخوێنم.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.





**٥١٧٣-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَلَا أَقُولُ نَهَاكُمْ، عَنْ تَخَتُّمِ الذَّهَبِ، وَعَنْ لُبْسِ الْقَسِّيِّ، وَعَنْ لُبْسِ الْمُفْدَمِ، وَالْمُعَصْفَرِ، وَعَنِ الْقِرَاءَةِ رَاكِعاً»[١].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردووم، نالێم قەدەغەی لە ئێوە کرد، لە لەدەستکردنی زێڕ و پۆشینی (الْقَسِّيِّ) (کە جلێکە زۆرینەی حەریرە) و پۆشینی (الْمُفَدَّمَة) (کە لە جلوبەرگێکە بە سووری زۆر تۆخ ڕەنگ کراو) و لە (الْمُعَصْفَر) (ڕووەکێکی هاوینەیە لە زەعفەران دەچێ، دەخرێتە ناو خواردنەوە، لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ جلوبەرگی پێ ڕەنگ دەکرا) هەروەها لە ڕکوعدا قورئان بخوێنم.**

**٥١٧٤-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ يَقُولُ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْقِرَاءَةِ وَأَنَا رَاكِعٌ، وَعَنْ لُبْسِ الذَّهَبِ، وَالْمُعَصْفَرِ»[٢].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردم لە ڕکوعدا قورئان بخوێنم، وە لە پۆشینی زێڕو (الْمُعَصْفَر) (ڕووەکێکی هاوینەیە لە زەعفەران دەچێ، دەخرێتە ناو خواردنەوە، لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ جلوبەرگی پێ ڕەنگ دەکرا).**

**٥١٧٥-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ يَقُولُ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَلَا أَقُولُ نَهَاكُمْ، عَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ، وَعَنِ الْقَسِّيِّ، وَالْمُعَصْفَرِ، وَأَنْ لَا أَقْرَأَ وَأَنَا رَاكِعٌ»[٣].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردم، نالێم قەدەغەی لە ئێوە کرد، لە لەدەستکردنی زێڕو پۆشینی قەسی و موعەصفەر، هەروەها لە ڕکوعدا قورئان بخوێنم.**

**٥١٧٦-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ تَخَتُّمِ الذَّهَبِ، وَعَنِ الْمُعَصْفَرِ، وَعَنْ لُبْسِ الْقَسِّيِّ، وَعَنِ الْقِرَاءَةِ فِي الرُّكُوعِ»[٤].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردم، لە لەدەستکردنی زێڕو پۆشینی موعەصفەرو قەسی، هەروەها لە خوێندنی قورئان لە ڕکوعدا.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) حسن صحيح.

(٤) صحيح.

**٥١٧٧-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ لُبْسِ الْقَسِّيِّ، وَالْمُعَصْفَرِ، وَعَنِ التَّخَتُّمِ بِالذَّهَبِ»[١].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردم، لە پۆشینی قەسی و موعەصفەر، هەروەها لە لە دەستکردنی زێڕ.**

**٥١٧٨-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَرْبَعٍ: عَنِ التَّخَتُّمِ بِالذَّهَبِ، وَعَنْ لُبْسِ الْقَسِّيِّ، وَعَنْ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ وَأَنَا رَاكِعٌ، وَعَنْ لُبْسِ الْمُعَصْفَرِ»[٢].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردم، لە چوار شت: لە لەدەستکردنی زێڕو لە پۆشینی قەسی، وە لە ڕکوعدا قورئان بخوێنم، هەروەها لە پۆشینی موعەصفەر.**

**٥١٧٩-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ لُبْسِ الْمُعَصْفَرِ، وَعَنِ الْقَسِّيِّ، وَعَنِ التَّخَتُّمِ بِالذَّهَبِ، وَأَنْ أَقْرَأَ وَأَنَا رَاكِعٌ»[٣].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردم لە پۆشینی موعەصفەرو قەسی، وە لە لەدەستکردنی زێڕ، هەر وەها قورئان بخوێنم و لە ڕکوعدا بم.**

## جیاوازی لەبارەی یەحیای کوڕی ئەبو کەثیر لە فەرموودەکەدا

**٥١٨٠-** «عَنْ حَرْب بن شَدَّادٍ عَن يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ سَعِيدٍ الْفَدَكِيُّ، أَنَّ نَافِعاً، أَخْبَرَهُ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ حُنَيْنٍ، أَنَّ عَلِيّاً ﷺ حَدَّثَهُ، قَالَ:نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ ثِيَابِ الْمُعَصْفَرِ، وَعَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ، وَعَنْ لُبْسِ الْقَسِّيِّ، وَأَنْ أَقْرَأَ وَأَنَا رَاكِعٌ»[٤].

**واتە: حەڕبی کوڕی شەداد دەگێڕێتەوە، لە یەحیاوە دەڵێ: عەمڕی کوڕی سەعیدی فەدەکی بۆی باسکردم نافع هەواڵی پێداوە دەڵێ: کوڕی حونەین بۆی باسکردم، عەلی ﷺ بۆی باس کرد وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردم لە پۆشینی**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




پۆشاكى موعەصفەر، وە لە لەدەستكردنى زێڕ و لە پۆشینى قەسى، هەر وەها لە ڕكوعدا قورئان بخوێنم.

٥١٨١- «عَنْ نافع عن إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُنَيْنٍ، عَنْ بَعْضِ مَوَالِي الْعَبَّاسِ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُعَصْفَرِ، وَالثِّيَابِ الْقَسِّيَّةِ، وَعَنْ أَنْ يَقْرَأَ وَهُوَ رَاكِعٌ»[1].

واتە: نافع دەگێڕێتەوە، لە ئیبراهیمی كوڕی عەبدوڵلای كوڕی حونەین، لە هەندێ لە خزمەتكارەكانی عەبباس، لە عەلیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە لە پۆشینی موعەصفەرو لە پۆشینی جلی قەسی، هەروەها لەوەی لە ڕكوعدا قورئان بخوێنێ.

٥١٨٢-«عَنْ أبي عَمْرٍو الْأَوْزَاعِيِّ عن يَحْيَى، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ:نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَسَاقَ الْحَدِيثَ»[2].

واتە: ئەبو عەمری ئەوزاعی دەگێڕێتەوە، لە یەحیا، لە عەلیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێكردم، فەرموودەكەی هێنا.

## فەرموودەی عەبیدە

٥١٨٣- «عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: نَهَانِي النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الْقَسِّيِّ، وَالْحَرِيرِ، وَخَاتَمِ الذَّهَبِ، وَأَنْ أَقْرَأَ رَاكِعاً»[3].

واتە: عەبیدە دەگێڕێتەوە، لە عەلیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕێگری لێكردم لە پۆشینی جلی قەسی و حەریر و لە دەستكردنی زێڕ، هەروەها لە ڕكوعدا قورئان بخوێنم.

٥١٨٤-«عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: نَهَى عَنْ مَيَاثِرِ الْأُرْجُوَانِ، وَلُبْسِ الْقَسِّيِّ، وَخَاتَمِ الذَّهَبِ»[4].

واتە: عەبیدە دەگێڕێتەوە، لە عەلیەوە ﷺ دەڵێ: قەدەغەی كرد لە (مَيَاثِر الْأُرْجُوَان) (ڕاخەرێكە لەسەر كورتانی ئەسپ یان پشتی وشتر دادەنرا، ئافرەتان دروستیان دەكرد

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح موقوف.




بۆ مێردەکانیان، ڕەنگی سوورە لە حەریر دروست دەکرا، ئەوە پیشەی لووتبەرزەکان بوو) وە لە پۆشینی جلی قەسی و لەدەستکردنی زێڕ.

**٥١٨٥-** «عَنْ عَبِيدَةَ قَالَ: نَهَى عَنْ مَيَاثِرِ الْأُرْجُوَانِ، وَخَوَاتِيمِ الذَّهَبِ»[١].

واتە: عەبیدە دەڵێ: قەدەغەی کرد لە (الْمَيَاثِرِ الْأُرْجُوَانِ) (ڕاخەرێکە لەسەر کورتانی ئەسپ یان پشتی وشتر دادەنرا، ئافرەتان دروستیان دەکرد بۆ مێردەکانیان، ڕەنگی سوورە لە حەریر دروست دەکرا، ئەوە پیشەی لووتبەرزەکان بوو)و لە لە دەستکردنی زێڕ.

## فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەو جیاوازی لەسەر قەتادە

**٥١٨٦-** «عن الْحَجَّاجِ هو بن الْحَجَّاجِ عن قَتَادَةَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُبَيْدٍ، عَنْ بُشَيْرِ بْنِ نَهِيكٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ تَخَتُّمِ الذَّهَبِ»[٢].

واتە: حەجاج کە کوڕی حەجاجە دەگێڕێتەوە، لە قەتادە، لە مالیکی کوڕی عوبەید، لە بوشەیری کوڕی نەهیک، لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردم زێڕ لە دەستم بکەم.

**٥١٨٧-** «عَنْ حَفْصٍ اللَّيْثِيِّ قَالَ: أَشْهَدُ عَلَى عِمْرَانَ ﵁ أَنَّهُ حَدَّثَنَا قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ، وَعَنِ التَّخَتُّمِ بِالذَّهَبِ، وَعَنِ الشُّرْبِ فِي الْحَنَاتِمِ»[٣].

واتە: حەفصی لەیثی دەڵێ: شایەتی دەدەم عیمران ﵁ بۆی باس کردین دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە پۆشینی حەریر و لەدەستکردنی زێڕو خواردنەوە لە ناو (الْحَنَاتِمِ) گۆزەکان (قاپێک بووە لەناو عەرەبدا بەکار هاتووە، لە دار دروست کرابوو، هەڵیان دەکۆڵی و بەکاریان دەهێنا بۆ جۆرەها خواردنەوە، ئەو قاپە دەبووە هۆکارو یارمەتیدەر بۆ ئەوەی ئەو خواردنەوانە زووتر ببنە سەرخۆشکەر).

---

(١) صحيح مقطوع.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٦٤، ومسلم: ٢٠٨٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٣٨.




**٥١٨٨-** «عَنْ بَكْرِ بْنِ سَوَادَةَ، أَنَّ أَبَا النَّجِيبِ حَدَّثَهُ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ حَدَّثَهُ، أَنَّ رَجُلاً قَدِمَ مِنْ نَجْرَانَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَعَلَيْهِ خَاتَمٌ مِنْ ذَهَبٍ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ: إِنَّكَ جِئْتَنِي وَفِي يَدِكَ جَمْرَةٌ مِنْ نَارٍ»[١].

**واتە: ئەبو بەکری کوڕی سەوودە دەگێڕێتەوە، ئەبو نەجیب بۆی باس کردوە، ئەبو سەعیدی خودری ﷺ بۆی باسکرد، پیاوێک لە نەجرانەوە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ موستیلەیەکی زێڕی لەدەستدا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ پشتی تێکردو فەرمووی: تۆ هاتووی بۆ لام و پشکۆیەکی ئاگر لەدەستت دایە.**

**٥١٨٩-** «عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ رَجُلٍ، حَدَّثَهُ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً كَانَ جَالِساً عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ وَعَلَيْهِ خَاتَمٌ مِنْ ذَهَبٍ، وَفِي يَدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِخْصَرَةٌ أَوْ جَرِيدَةٌ، فَضَرَبَ بِهَا النَّبِيُّ ﷺ إِصْبَعَهُ، فَقَالَ الرَّجُلُ: مَا لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: أَلَا تَطْرَحُ هَذَا الَّذِي فِي إِصْبَعِكَ، فَأَخَذَهُ الرَّجُلُ فَرَمَى بِهِ، فَرَآهُ النَّبِيُّ ﷺ بَعْدَ ذَلِكَ فَقَالَ: مَا فَعَلَ الْخَاتَمُ؟ قَالَ: رَمَيْتُ بِهِ، قَالَ: مَا بِهَذَا أَمَرْتُكَ، إِنَّمَا أَمَرْتُكَ أَنْ تَبِيعَهُ، فَتَسْتَعِينَ بِثَمَنِهِ»[٢].

**واتە: مەنصور دەگێڕێتەوە، لە سالم، لە پیاوێکەوە بۆی باسکرد، لە بەڕائی کوڕی عازب ﷺ، پیاوێک دانیشتبوو لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ موستیلەیەکی زێڕ لەدەستیدا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ گۆچانێک یان لقێکی دارخورمای پێ بوو دای لەسەر پەنجەکانی پیاوەکە، پیاوەکە وتی: چیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەوەی لە دەستتدایە فڕێی نادەی، پیاوەکەیش لە دەستی کردەوەو فڕێیدا، پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوە پیاوەکەی بینیەوە فەرمووی: موستیلەکە چی لێ هات، وتی: فڕێمدا، فەرمووی: فەرمانم نەکرد فڕێی بدەی، بەڵکو فەرمانم پێکردی بیفرۆشی و سوود لە نرخەکەی وەربگری.**

**٥١٩٠-** «عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَبْصَرَ فِي يَدِهِ خَاتَماً مِنْ ذَهَبٍ، فَجَعَلَ يَقْرَعُهُ بِقَضِيبٍ مَعَهُ، فَلَمَّا غَفَلَ النَّبِيُّ ﷺ أَلْقَاهُ، قَالَ: مَا أُرَانَا إِلَّا قَدْ أَوْجَعْنَاكَ وَأَغْرَمْنَاكَ»[٣].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) ضعيف الإسناد.**

**(٣) صحيح.**




**واتە: زوهری دەگێڕێتەوە، لە عەطائی کوڕی یەزید، لە ئەبو ثەعلەبەی خوشەنی ﷺ، پێغەمبەر ﷺ تەماشای کرد موستیلەیەکی زێڕ لە دەستیدا بوو، پێغەمبەری خواش بە دارێک دەیدا لە موستیلەکەی، کاتێ پێغەمبەر ﷺ بێ ئاگا بوو فڕێیدا، فەرمووی: وا دەبینین ئازارمان دای یان زیانمان پێ گەیاندی.**

**٥١٩١-** «عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو إِدْرِيسَ الْخَوْلَانِيُّ، أَنَّ رَجُلاً مِمَّنْ أَدْرَكَ النَّبِيَّ ﷺ لَبِسَ خَاتِماً مِنْ ذَهَبٍ نَحْوَهُ»[١].

**واتە: ئیبنو شیهاب دەڵێ: ئەبو ئیدریسی خەولانی هەواڵی پێدام، پیاوێک لەوانەی کە گەیشتبوو بە پێغەمبەر ﷺ موستیلەیەکی لە زێڕ لە دەستتدا بوو، هەروەکو فەرموودەکەی پێشوی باس کرد.**

**٥١٩٢-** «عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أبي إِدْرِيسَ الْخَوْلَانِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى عَلَى رَجُلٍ خَاتَماً مِنْ ذَهَبٍ نَحْوَهُ»[٢].

**واتە: زوهری دەگێڕێتەوە، لە ئەبو ئیدریسی خەولانی ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بینی موستیلەیەکی زێڕ لە دەستیدا بوو، هەروەکو فەرمودەکەی پێشووی باس کرد.**

**٥١٩٣-** «عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أبي إِدْرِيسَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى فِي يَدِ رَجُلٍ خَاتَمَ ذَهَبٍ، فَضَرَبَ إِصْبَعَهُ بِقَضِيبٍ كَانَ مَعَهُ حَتَّى رَمَى بِهِ»[٣].

**واتە: زوهری دەگێڕێتەوە، لە ئەبو ئیدریس ﷺ، کەوا پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی موستیلەیەکی زێڕ لە دەستیدا بوو، بە دارێک کە لەلای بوو دای لە پەنجەکەی، هەتا موستیلەکەی فڕێدا.**

**٥١٩٤-** «عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، مُرْسَلٌ»[٤].

**واتە: ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرموودەکە (مُرْسَلٌ)ە.**

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح لغيره.**

**(٣) صحيح لغيره.**

**(٤) صحيح لغيره.**

## ئەندازەی کێشی موستیلەی زیو

**٥١٩٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَعَلَيْهِ خَاتَمٌ مِنْ حَدِيدٍ فَقَالَ: مَا لِي أَرَى عَلَيْكَ حِلْيَةَ أَهْلِ النَّارِ فَطَرَحَهُ، ثُمَّ جَاءَهُ وَعَلَيْهِ خَاتَمٌ مِنْ شَبَهٍ فَقَالَ: مَا لِي أَجِدُ مِنْكَ رِيحَ الْأَصْنَامِ فَطَرَحَهُ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مِنْ أَيِّ شَيْءٍ أَتَّخِذُهُ؟ قَالَ: مِنْ وَرِقٍ، وَلَا تُتِمَّهُ مِثْقَالاً»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ موستیلەیەکی ئاسن لە دەستیدا بوو، فەرمووی: چیە دەبینم خشڵێکی ئاگر لە دەستتدایە، ئەویش فڕێیدا، پاشان هاتەوە بۆ لای موستیلەیەکی مسی لە دەستیدا بوو (کە شێوەکەی لە زێڕ دەچێت و بت و صەنەمی لێ دروست دەکرێت)، فەرمووی: ئەوە چیە دەبینم بۆنی بتەکانت لێ دێت، ئەویش فڕێیدا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، موستیلەکەم لە چی جۆرێک بێت؟ فەرمووی: لە زیو کێشەکەی نەگاتە مسقاڵێک.**

## سیفەتی موستیلەی پێغەمبەر ﷺ

**٥١٩٦-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اتَّخَذَ خَاتَماً مِنْ وَرِقٍ فَصُّهُ حَبَشِيٌّ، وَنُقِشَ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ موستیلەیەکی زیوی دروست کرد، ئەو کەسەی دروستی کردبوو حەبەشی بوو، نەخشێنرا بوو بە (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّه).**

**٥١٩٧-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ خَاتَمُ فِضَّةٍ يَتَخَتَّمُ بِهِ فِي يَمِينِهِ، فَصُّهُ حَبَشِيٌّ، يَجْعَلُ فَصَّهُ مِمَّا يَلِي كَفَّهُ»[٣].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٢٢٣، والترمذي: ١٧٨٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ موستیلەیەکی زیوی هەبوو دەیکردە دەستی ڕاستی، ئەو کەسەی دروستی کردبوو حەبەشی بوو، یان نەخشەکەیشی لە خۆی بوو.

**٥١٩٨-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ خَاتَمُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ فِضَّةٍ، وَكَانَ فَصُّهُ مِنْهُ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: موستیلەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە زیو بوو، ئەو کەسەی دروستی کرد حەبەشی بوو، یان نەخشەکەی لە خۆی بوو، گۆی موستیلەکەی ڕووی لە ناو لەپی بوو.

**٥١٩٩-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ خَاتَمُهُ مِنْ وَرِقٍ فَصُّهُ مِنْهُ»[٢].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، موستیلەکەی پێغەمبەر ﷺ لە زیو بوو، نەخشەکەی لە خۆی بوو.

**٥٢٠٠-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ خَاتَمُ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ فِضَّةٍ، فَصُّهُ مِنْهُ»[٣].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، موستیلەکەی پێغەمبەر ﷺ لە زیو بوو، نەخشەکەیشی لە خۆی بوو.

**٥٢٠١-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: أَرَادَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَكْتُبَ إِلَى الرُّومِ فَقَالُوا: إِنَّهُمْ لَا يَقْرَءُونَ كِتَاباً إِلَّا مَخْتُوماً، فَاتَّخَذَ خَاتَماً مِنْ فِضَّةٍ، كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِهِ فِي يَدِهِ، وَنُقِشَ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ»[٤].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی نوسراوێک بنوسێ بۆ ڕوومەکان وتیان: ئەوان نوسراوێک ناخوێننەوە مۆری لێ نەدرا بێت، ئەویش مۆرێکی دروست کرد لە زیو، هەروەکو ئەوەی ئێستا تەماشای سپیایەتی موستیلەکە بکەم لە دەستیدا، هەڵکۆڵا بوو بە (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**٥٢٠٢-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: أَخَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ حَتَّى مَضَى شَطْرُ اللَّيْلِ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى بِنَا كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِ خَاتَمِهِ فِي يَدِهِ مِنْ فِضَّةٍ»[١].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشای دواخست هەتا نیوەی شەو تێپەڕی، پاشان هاتەدەر (لە ماڵ)و نوێژی پێکردین، هەروەکو ئەوەی ئێستا تەماشای سپیایەتی موستیلە زیوەکە بکەم لە دەستیدا.**

## شوێنی لە دەستکردنی موستیلە لە پەنجەو باسی فەرموودەی عەلی و عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر

**٥٢٠٣-** «عَنْ عَلِيٍّ، عَنْ شَرِيكٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَلْبَسُ خَاتَمَهُ فِي يَمِينِهِ»[٢].

**واتە: عەلی دەگێڕێتەوە، شەریک دەڵێ: ئەبو سەلەمە ﷺ هەواڵی پێدام، پێغەمبەر ﷺ موستیلەکەی دەکردە دەستی ڕاستی.**

**٥٢٠٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَخَتَّمُ بِيَمِينِهِ»[٣].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر دەڵێ، پێغەمبەر ﷺ موستیلەی دەکردە دەستی ڕاستی.**

## لەدەستکردنی موستیلەی ئاسن ڕووپۆش کرابێ بە زیو

**٥٢٠٥-** «عَنْ إِيَاسِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ الْمُعَيْقِيبِ، عَنْ جَدِّهِ مُعَيْقِيبٍ ﷺ قَالَ: كَانَ خَاتَمُ النَّبِيِّ ﷺ حَدِيداً مَلْوِيّاً عَلَيْهِ فِضَّةٌ قَالَ: وَرُبَّمَا كَانَ فِي يَدِي فَكَانَ مُعَيْقِيبٌ عَلَى خَاتَمِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[٤].

**واتە: ئیاسی کوڕی حارثی کوڕی موعەیقیب دەگێڕێتەوە، لە باپیرەی موعەیقیب ﷺ دەڵێ: موستیلەکەی پێغەمبەر ﷺ ئاسن بوو ڕووپۆش کرابوو بە زیو، وتی:**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٤٠.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٢٣٦.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٧٤٤، وإبن ماجه: ٣٦٤٧.

(٤) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٢٢٤.




کەمجارێک لە دەستمدا بوو، جا موعەیقیب کرابووە سەرپەرشتیاری موستیلەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

## لە دەستکردنی موستیلەی مس

**٥٢٠٦-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: أَقْبَلَ رَجُلٌ مِنَ الْبَحْرَيْنِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَسَلَّمَ، فَلَمْ يُرَدَّ عَلَيْهِ، وَكَانَ فِي يَدِهِ خَاتَمٌ مِنْ ذَهَبٍ، وَجُبَّةُ حَرِيرٍ، فَأَلْقَاهُمَا ثُمَّ سَلَّمَ، فَرَدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ، ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَيْتُكَ آنِفاً فَأَعْرَضْتَ عَنِّي، فَقَالَ: إِنَّهُ كَانَ فِي يَدِكَ جَمْرَةٌ مِنْ نَارٍ، قَالَ: لَقَدْ جِئْتُ إِذاً بِجَمْرٍ كَثِيرٍ، قَالَ: إِنَّ مَا جِئْتَ بِهِ لَيْسَ بِأَجْزَأَ عَنَّا مِنْ حِجَارَةِ الْحَرَّةِ، وَلَكِنَّهُ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا قَالَ: فَمَاذَا أَتَخَتَّمُ؟ قَالَ: حَلْقَةً مِنْ حَدِيدٍ أَوْ وَرِقٍ أَوْ صُفْرٍ»[١].

**واتە:** ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە بەحرەینەوە هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ سڵاوی لێکرد، ئەویش وەڵامی نەدایەوە، موستیلەیەکی زێڕ لەدەستیدابوو جوبەیەکی حەریریشی لەبەردا بوو، هەردووکیانی داکەند، پاشان سڵاوی لێکرد، وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە، پاشان کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کەمێک پێش ئێستا هاتم بۆ لات پشتت تێکردم، فەرمووی: چونکە پشکۆیەکی ئاگر لە دەستتدا بوو، وتی: کەواتە بە پشکۆیەکی زۆرەوە هاتووم، فەرمووی: ئەوە پشکۆیەکە بۆ ئەو پیاوەی خۆی پێ دەڕازێنێتەوە، بەڵام ئەوەی بەکاریدەهێنی بۆ پڕکردنەوەی پێویستی دنیایی خۆی بۆ ئەو نابێتە پشکۆیەکی ئاگر، وتی: چی موستیلەیەک لە دەست بکەم، فەرمووی: موستیلەیەکی ئاسن، یان زیو، یان مس.

**٥٢٠٧-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَدِ اتَّخَذَ حَلْقَةً مِنْ فِضَّةٍ، فَقَالَ: مَنْ أَرَادَ أَنْ يَصُوغَ عَلَيْهِ فَلْيَفْعَلْ، وَلَا تَنْقُشُوا عَلَى نَقْشِهِ»[٢].

**واتە:** ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە ئەڵقەیەکی لە زیو دروست کردبوو، فەرمووی: هەرکەس دەیەوێت وەکو ئەم موستیلەیە بۆ خۆی دروست بکات با بیکات، (بەڵام) هیچ نەخشێک لەسەر نەخشەکەی ئەو هەڵمەکۆڵن (چونکە نەخشەکە نوسرابوو (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ).

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح الإسناد.




**٥٢٠٨-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: اتَّخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَاتَماً، وَنَقَشَ عَلَيْهِ نَقْشاً، قَالَ: إِنَّا قَدِ اتَّخَذْنَا خَاتَماً، وَنَقَشْنَا فِيهِ نَقْشاً، فَلَا يَنْقُشْ أَحَدٌ عَلَى نَقْشِهِ، ثُمَّ قَالَ أَنَسٌ: فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِهِ فِي يَدِهِ»[١].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەڵقەیەکی لە زیو دروست کردبوو، نەخشێکیشی لەسەری هەڵکۆڵیبوو، فەرمووی: ئێمە موستیلەمان دروست دەکردو نەخشمان لەسەری هەڵکۆڵی، با هیچ کەسێک نەخشەکەی وەکو ئەو نەبێت، پاشان ئەنەس وتی: هەروەکو ئەوە وایە ئێستا سپیایی سەر نەخشەکە لە پێش چاوم بێت لە دەستیدا.**

## فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ نەخشی (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ) لەسەر موستیلەکانتان هەڵمەکۆڵن

**٥٢٠٩-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَسْتَضِيئُوا بِنَارِ الْمُشْرِكِينَ، وَلَا تَنْقُشُوا عَلَى خَوَاتِيمِكُمْ عَرَبِيّاً»[٢].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە کاروبارەکانتاندا ڕاوێژ بە هاوبەشدانەران مەکەن، وە نەخشی موستیلەکانتان هەڵمەکۆڵن وەکو نەخشی موستیلەی پێغەمبەر ﷺ.**

## قەدەغە کردن لە لەدەست کردنی موستیلە لە پەنجەی هەڕەشە، یان شایەتمان

**٥٢١٠-** «عَنْ أَبِي بُرْدَةَ قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ ﷺ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا عَلِيُّ، سَلِ اللَّهَ الْهُدَى وَالسَّدَادَ وَنَهَانِي أَنْ أَجْعَلَ الْخَاتَمَ فِي هَذِهِ، وَهَذِهِ وَأَشَارَ يَعْنِي بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى»[٣].

**واتە: ئەبو بوردە دەڵێ: عەلی ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: ئەی عەلی، داوای ڕێنمایی و پێکانی ڕاستی بکە، وە قەدەغەی لێکردم موستیلە بکەمە**

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.




**ئەم پەنجە و ئەو پەنجەمە، ئاماژەی کرد واتە: بە پەنجەی شایەتمان و نێوەڕاست (زەڕنەقوتە).**

**٥٢١١-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْخَاتَمِ فِي هَذِهِ وَهَذِهِ، يَعْنِي السَّبَّابَةَ وَالْوُسْطَى»[١].

**واتە: عەلی ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێ کردم موستیلە بکەمە ئەم پەنجە و ئەو پەنجەمە، واتە: پەنجەی شایەتمان و نێوەڕاست.**

**٥٢١٢-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قُلْ: اللَّهُمَّ اهْدِنِي وَسَدِّدْنِي، وَنَهَانِي أَنْ أَضَعَ الْخَاتَمِ فِي هَذِهِ وَهَذِهِ، وَأَشَارَ بِشْرٌ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى قَالَ: وَقَالَ عَاصِمٌ، أَحَدُهُمَا»[٢].

**واتە: عەلی ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: بڵێ: خوایە گیان ڕێنمایم بکەو یارمەتیم بدە حەق و ڕاستی بپێکم، وە قەدەغەی لێکردم موستیلە بکەمە ئەم پەنجەو ئەو پەنجەمە، بیشر ئاماژەی کرد بە پەنجەی شایەتمان و نێوەڕاست، وە وتی: عاصم وتی: یەکێکیان.**

## دانانی موستیلە لە کاتی چوونە سەرئاو

**٥٢١٣-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا دَخَلَ الْخَلَاءَ نَزَعَ خَاتَمَهُ»[٣].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بچوایەتە سەرئاو موستیلەکەی دادەنا.**

**٥٢١٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: اتَّخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَاتَماً مِنْ ذَهَبٍ، وَجَعَلَ فَصَّهُ مِنْ قِبَلِ كَفِّهِ، فَاتَّخَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَ الذَّهَبِ، فَأَلْقَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَاتَمَهُ وَقَالَ: لَا أَلْبَسُهُ أَبَداً وَأَلْقَى النَّاسُ خَوَاتِيمَهُمْ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٩، والترمذي: ١٧٤٦، وإبن ماجه: ٣٠٣.

(٤) صحيح.




**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ موستیلەیەکی دروست کرد لە زێڕ، نەخشەکەی لە ناو لەپیدا بوو، ئینجا خەڵکیش موستیلەی زێڕیان دروست کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ موستیلەکەی خۆی داکەند، وە فەرمووی: هەرگیز لە دەستی ناکەم، خەڵکەکەیش موستیلەکانی خۆیانیان داکەند.**

**٥٢١٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اتَّخَذَ خَاتَماً مِنْ ذَهَبٍ، وَجَعَلَ فَصَّهُ مِمَّا يَلِي كَفَّهُ، فَاتَّخَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَ، فَطَرَحَهُ النَّبِيُّ ﷺ وَقَالَ: لَا أَلْبَسُهُ أَبَداً»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ موستیلەیەکی دروستکرد لە زێڕ، نەخشەکەی لەناو لەپی دانا، ئینجا خەڵکیش موستیلەی زێڕیان دروست کرد، پێغەمبەر ﷺ لە دەستی دایکەند، وە فەرمووی: هەرگیز لە دەستی ناکەم.**

**٥٢١٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ تَخَتَّمَ خَاتَماً مِنْ ذَهَبٍ، ثُمَّ طَرَحَهُ، وَلَبِسَ خَاتَماً مِنْ وَرِقٍ، وَنَقَشَ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ، وَقَالَ: لَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ أَنْ يَنْقُشَ عَلَى نَقْشِ خَاتَمِي هَذَا، ثُمَّ جَعَلَ فَصَّهُ فِي بَطْنِ كَفِّهِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ موستیلەیەکی دروست کرد لە زێڕ، پاشان داینا، ئینجا موستیلەیەکی زیوی لە دەست کرد، وە هەڵیکۆڵی بە (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّه) وە فەرمووی: دروست نیە بۆ هیچ کەسێک موستیلەکەی هەڵبکۆڵێ وەکو ئەمەی من، پاشان نەخشەکەی خستە ناو لەپی دەستی.**

**٥٢١٧-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَبِسَ خَاتَماً مِنْ ذَهَبٍ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، فَلَمَّا رَآهُ أَصْحَابُهُ فَشَتْ خَوَاتِيمُ الذَّهَبِ، فَرَمَى بِهِ، فَلَا نَدْرِي مَا فَعَلَ، ثُمَّ أَمَرَ بِخَاتَمٍ مِنْ فِضَّةٍ، فَأَمَرَ أَنْ يُنْقَشَ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ، وَكَانَ فِي يَدِ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى مَاتَ وَفِي يَدِ أَبِي بَكْرٍ حَتَّى مَاتَ، وَفِي يَدِ عُمَرَ حَتَّى مَاتَ، وَفِي يَدِ عُثْمَانَ سِتَّ سِنِينَ مِنْ عَمَلِهِ، فَلَمَّا كَثُرَتْ عَلَيْهِ الْكُتُبُ دَفَعَهُ إِلَى رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَكَانَ يَخْتِمُ بِهِ، فَخَرَجَ الْأَنْصَارِيُّ إِلَى قَلِيبٍ لِعُثْمَانَ، فَسَقَطَ، فَالْتُمِسَ فَلَمْ يُوجَدْ، فَأَمَرَ بِخَاتَمٍ مِثْلِهِ، وَنَقَشَ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ»[٣].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) ضعيف الإسناد.**

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ ڕۆژ موستیلەیەکی زێڕی لە دەست کرد، کاتێ کە هاوەڵەکانی بینیان موستیلەی زێڕ لە ناویاندا بڵاوبویەوە، ئەویش موستیلەکەی داکەند، نازانین بۆچی ئەوەی کرد، پاشان فەرمانی کرد بە موستیلەی زیو، فەرمانی کرد هەڵبکۆڵرێ و (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ)ی تێدا بنوسرێ، لە دەستیدا بوو هەتا کۆچی دوایی کرد، ئینجا لەدەستی ئەبو بەکردا بوو هەتا کۆچی دوایی کرد، ئینجا لە دەستی عومەردا بوو هەتا کۆچی دوایی کرد، پاشان بۆ ماوەی شەش ساڵ لە دەستی عوسماندا مایەوە، کاتێ کە نوسراوەکانی زۆربوون دایە دەستی پیاوێکی ئەنصاری ئەو مۆری پێ دەکرد، ئەنصارەکان دەرچوون بۆ لای بیرێکی عوسمان، لە دەستی ئەنصاریەکە بەربوویە خوارەوەو ئەندازەیەکی زۆر گەڕان بە دوایدا، بەڵام نەیاندۆزیەوە، فەرمانی کرد موستیلەیەک دروست بکرێت هەروەکو ئەوە کە (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ) تێدا هەڵبکۆڵرێ.

**٥٢١٨-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اتَّخَذَ خَاتَماً مِنْ ذَهَبٍ، وَكَانَ فَصُّهُ فِي بَاطِنِ كَفِّهِ، فَاتَّخَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَ مِنْ ذَهَبٍ فَطَرَحَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَطَرَحَ النَّاسُ خَوَاتِيمَهُمْ، وَاتَّخَذَ خَاتَماً مِنْ فِضَّةٍ، فَكَانَ يَخْتِمُ بِهِ، وَلَا يَلْبَسُهُ»[1].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ موستیلەیەکی دروست کرد لە زێڕ، نەخشەکەی لە ناو لەپی دەستیدا بوو، خەڵکەکەش موستیلەی زێڕیان بەکارهێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ فڕێیدا، خەڵکەکەش موستیلەکانیان فڕێدا، ئینجا موستیلەکی لە زیو دروست کرد، مۆری پێدەکرد، بەڵام لە دەستی نەدەکرد.

## زەنگۆڵەی ملی ئاژەڵ

**٥٢١٩-** «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي شَيْخٍ قَالَ: كُنْتُ جَالِساً مَعَ سَالِمٍ فَمَرَّ بِنَا رَكْبٌ لِأُمِّ الْبَنِينَ مَعَهُمْ أَجْرَاسٌ، فَحَدَّثَ نَافِعاً، سَالِمٌ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَا تَصْحَبُ الْمَلَائِكَةُ رَكْباً مَعَهُمْ جُلْجُلٌ، كَمْ تَرَى مَعَ هَؤُلَاءِ مِنَ الْجُلْجُلِ»[2].

---

(١) صحيح دون قوله: «وَلَا يَلْبَسُهُ» فإنه شاذ.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو بەکری کوڕی ئەبو شێخ دەڵێ: من لەگەڵ سالم دانیشتبووم، کاروانیەکی (أُمِّ الْبَنِينَ) تێپەڕی بە لاماندا دەنگی زەنگۆڵەی ملی ئاژەڵەکانیان دەهات، سالم بۆ نافعی باس کرد لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: فریشتەکان هاوەڵی کاروانیەک ناکەن زەنگۆڵەیان لەگەڵدا بێت، جا چەند زەنگۆڵە دەبینی لەگەڵ ئەوانەدا.

**٥٢٢٠-** «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُوسَى قَالَ: كُنْتُ مَعَ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، فَحَدَّثَ سَالِمٌ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا تَصْحَبُ الْمَلَائِكَةُ رُفْقَةً فِيهَا جُلْجُلٌ»[١].

واتە: ئەبو بەکری کوڕی موسا دەڵێ: من لەگەڵ سالم کوڕی عەبدوڵڵا دانیشتبووم، سالم لە باوکیەوە ﷺ گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: فریشتەکان هاوەڵی کاروانیەک ناکەن زەنگۆڵەیان لەگەڵدا بێت.

**٥٢٢١-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، رَفَعَهُ قَالَ: لَا تَصْحَبُ الْمَلَائِكَةُ رُفْقَةً فِيهَا جُلْجُلٌ»[٢].

واتە: سالم دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ ڕەفعی کردوە (واتە: داویەتیە پاڵ پێغەمبەری خوا ﷺ): دەڵێ: فریشتەکان هاوەڵی کاروانیەک ناکەن زەنگۆڵەیان لەگەڵدا بێت.

**٥٢٢٢-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا تَدْخُلُ الْمَلَائِكَةُ بَيْتاً فِيهِ جُلْجُلٌ، وَلَا جَرَسٌ، وَلَا تَصْحَبُ الْمَلَائِكَةُ رُفْقَةً فِيهَا جَرَسٌ»[٣].

واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: فریشتەکان ناچنە ماڵێکەوە زەنگۆڵە و زەنگی تێدا بێت، وە هاوەڵی کاروانیەک ناکەن زەنگی تێدا بێت.

**٥٢٢٣-** «عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كُنْتُ جَالِساً عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَرَآنِي رَثَّ الثِّيَابِ فَقَالَ: أَلَكَ مَالٌ، قُلْتُ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ مِنْ كُلِّ الْمَالِ، قَالَ: فَإِذَا آتَاكَ اللَّهُ مَالاً فَلْيُرَ أَثَرُهُ عَلَيْكَ»[٤].

واتە: ئەبو ئەحوەص دەگێڕێتەوە، باوکی ﷺ دەڵێ: من لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووم بینیمی جلەکانم کۆن بوو بوون، فەرمووی: ئایا ماڵ و سامانت

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) حسن.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٠٦٣، والترمذي: ٢٠٠٦.




هەیە؟ وتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو جۆرە ماڵ و سامانێکم هەیە (کە لەو سەردەمەدا هەبوو، وەکو وشترو مەڕو ماڵات و ئەسپ و کۆیلە) فەرمووی: ئەگەر خوا ماڵ و سامانێکی پێ بەخشیت با شوێنەواری نیعمەتەکانی پێتەوە دەربکەوێ، (واتە: جلێکی جوان بپۆشە هەتا خەڵکی بزانن خوا نازو نیعمەتی خۆی ڕشتوە بەسەرتدا).

**٥٢٢٤-** «عَنْ أَبِي الأَحْوَصِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فِي ثَوْبٍ دُونٍ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: أَلَكَ مَالٌ؟ قَالَ: نَعَمْ، مِنْ كُلِّ الْمَالِ، قَالَ: مِنْ أَيِّ الْمَالِ؟ قَالَ: قَدْ آتَانِي اللَّهُ مِنَ الإِبِلِ، وَالْغَنَمِ، وَالْخَيْلِ، وَالرَّقِيقِ، قَالَ: فَإِذَا آتَاكَ اللَّهُ مَالاً، فَلْيُرَ عَلَيْكَ أَثَرُ نِعْمَةِ اللَّهِ وَكَرَامَتِهِ»[1].

واتە: ئەبو ئەحوەص دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، ئەو هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ جلێکی کۆن و بێنرخی لەبەرکردبوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا ماڵ و سامانت هەیە؟ وتی: بەڵێ لە هەموو جۆرە ماڵ و سامانێکم هەیە، فەرمووی: لە چی ماڵێکت هەیە؟ وتی: خوا ﷻ ماڵ و سامانی پێ بەخشیوم لە وشترو مەڕو ماڵات و ئەسپ و کۆیلە، فەرمووی: ئەگەر خوا ماڵ و سامانێکی پێ بەخشیت با شوێنەواری نیعمەت و ڕێزگرتنی خوا پێتەوە دەربکەوێ. (واتە: جلێکی جوان بپۆشە هەتا خەڵکی بزانن خوا نازو نیعمەتی خۆی ڕشتوە بەسەرتدا).

## باسی (الْفِطْرَة): زگماک[2]

**٥٢٢٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: خَمْسٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ، وَنَتْفُ الإِبْطِ، وَتَقْلِيمُ الأَظْفَارِ، وَالِاسْتِحْدَادُ، وَالْخِتَانُ»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: پێنج شت هەن لە فیترەت و زگماکی مرۆڤن : کورت کردنەوەی سمێڵ، هەڵکەندنی تووکی بنباڵ، برینی نینۆکەکان، تاشینی بەر، خەتەنەکردن.

---

(١) صحيح.

(٢) ئەو خووە پاکەیە کە خوا خودی پێکهاتەی مرۆڤی لەسەر دروست کردوەو تیایدا چاندویەتی، وە سوننەتی پێغەمبەرانیشە.

(٣) صحيح.




## تەختکردنی سمێڵ هەتا سەر پێست و بەردانەوەی ڕیش

**٥٢٢٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَحْفُوا الشَّوَارِبَ، وَأَعْفُوا اللِّحَى»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سمێڵتان تەخت بکەن هەتا سەر پێست، ڕیشیشتان بەربدەنەوە.

## تاشینی سەری منداڵان

**٥٢٢٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أَمْهَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ آلَ جَعْفَرٍ ثَلَاثَةً أَنْ يَأْتِيَهُمْ ثُمَّ أَتَاهُمْ، فَقَالَ: لَا تَبْكُوا عَلَى أَخِي بَعْدَ الْيَوْمِ ثُمَّ قَالَ: ادْعُوا إِلَيَّ بَنِي أَخِي، فَجِيءَ بِنَا كَأَنَّا أَفْرُخٌ فَقَالَ: ادْعُوا إِلَيَّ الْحَلَّاقَ فَأَمَرَ بِحَلْقِ رُءُوسِنَا»[٢].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی جەعفەر دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (لە کاتی مردنی جەعفەر) مۆڵەتیدا سێ ڕۆژ خانەوادەی جەعفەر بگرین و خەم و پەژارەی بۆ بخۆن، پاشان هات بۆ لایان، فەرمووی: لە دوای ئەمڕۆ بۆ براکەم مەگرین، پاشان فەرمووی: برازاکانم بۆ بانگ بکەن (عەبدوڵلاو عەون و موحەممەد) دەڵێن: ئێمەیان هێنا، هەروەکو بێچوو باڵندە وابووین، فەرمووی: سەرتاشم بۆ بانگ بکەن، دواتر فەرمانی کرد بە تاشینی سەرمان.

## باسی قەدەغە کردن لە تاشینی بەشێک لەسەری منداڵ و وازهێنان لە بەشێکی تری

**٥٢٢٨-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الْقَزَعِ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تاشینی بەشێکی قژو هێشتنەوەی بەشێکی قەدەغە کرد.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٩٢ و ٥٨٩٣، ومسلم: ٢٥٩، وأبو داود: ٤١٩٩، والترمذي: ٢٧٦٣ و ٢٧٦٤.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١٩٢.

(٣) صحيح.





**تێبینی: (الْقَزَعِ): بریتیە لەوەی سەری هەمووی بتاشێ و لە چەند شوێنێکی جیاواز قژی بهێڵێتەوە.**

**٥٢٢٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَنْهَى عَنِ الْقَزَعِ»[١].

**واتە: ئیبن و عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو تاشینی بەشێکی قژو هێشتنەوەی بەشێکی قەدەغە دەکرد.**

**٥٢٣٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْقَزَعِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تاشینی بەشێکی قژو هێشتنەوەی بەشێکی قەدەغە کرد.**

**٥٢٣١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الْقَزَعِ»[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ تاشینی بەشێکی قژو هێشتنەوەی بەشێکی قەدەغە کرد.**

## بەردانەوەی قژ هەتا سەرشان

**٥٢٣٢-** «عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجِلاً مَرْبُوعاً عَرِيضَ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ، كَثَّ اللِّحْيَةِ، تَعْلُوهُ حُمْرَةٌ جُمَّتُهُ إِلَى شَحْمَتَيْ أُذُنَيْهِ، لَقَدْ رَأَيْتُهُ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ مَا رَأَيْتُ أَحْسَنَ مِنْهُ»[٤].

**واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی مامناوەندو ناو شان پان بوو، نە کورت و نە درێژ بوو، ڕیشی پڕ بووە، سورو سپی بووە، قژی زۆر بووە هەتا نەرمایی گوێیەکانی دەهات، بینیم پۆشاکێکی سووری لەبەردابوو، هەرگیز شتی واجوانم نەبینیوە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**٥٢٣٣-** «عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: مَا رَأَيْتُ مِنْ ذِي لِمَّةٍ أَحْسَنَ فِي حُلَّةٍ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلَهُ شَعْرٌ يَضْرِبُ مَنْكِبَيْهِ»[١].

**واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: کەسێکم نەبینیوە لەناو جلی سوردا ئەوەندەی پێغەمبەری خوا ﷺ جوان بوو بێت، وە قژێکی هەبوو دەهاتە نزیک هەردوو شانی.**

**٥٢٣٤-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ شَعْرُ النَّبِيِّ ﷺ إِلَى نِصْفِ أُذُنَيْهِ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: قژی پێغەمبەر ﷺ هەتا نیوەی گوێچکەی دەهات.**

**٥٢٣٥-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَضْرِبُ شَعْرُهُ إِلَى مَنْكِبَيْهِ»[٣].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ قژی دەیدا لە سەر هەردوو شانی.**

## ڕێکخستنی قژ

**٥٢٣٦-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أَتَانَا النَّبِيُّ ﷺ فَرَأَى رَجُلاً ثَائِرَ الرَّأْسِ فَقَالَ: أَمَا يَجِدُ هَذَا مَا يُسَكِّنُ بِهِ شَعْرَهُ»[٤].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لامان پیاوێکی بینی قژی بژو ئاڵۆز بوو، فەرمووی: ئایا ئەمە شتێکی لا نەبووە قژی پێ ڕێک بخات.**

**٥٢٣٧-** «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: كَانَتْ لَهُ جُمَّةٌ ضَخْمَةٌ، فَسَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ فَأَمَرَهُ أَنْ يُحْسِنَ إِلَيْهَا، وَأَنْ يَتَرَجَّلَ كُلَّ يَوْمٍ»[٥].

**واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: ئەو قژێکی درێژی هەبوو هەتا سەر هەردوو شانی دەهات، پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمانی پێکرد خزمەتی بکات و هەموو ڕۆژێک شانەی بکات.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٥٥١ و ٥٨٤٨ و ٥٩٠١، ومسلم: ٩١ و ٢٣٣٧/٩٣، وأبو داود: ٤٠٧٢ و ٤١٨٣ و ٤١٨٤، والترمذي: ١٧٢٤ و ٣٦٣٥، وإبن ماجه: ٣٥٩٩.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٣٣٨/٩٦، وأبو داود: ٤١٨٥ و ٤١٨٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٠٣ و ٥٩٠٤، ومسلم: ٢٣٣٨/٩٥.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٠٦٢.

(٥) ضعيف.




## لەتکردنی قژ لە ناوەڕاستەوە لە کاتی شانە کردن

**٥٢٣٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَسْدُلُ شَعْرَهُ، وَكَانَ الْمُشْرِكُونَ يَفْرُقُونَ شُعُورَهُمْ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُحِبُّ مُوَافَقَةَ أَهْلِ الْكِتَابِ فِيمَا لَمْ يُؤْمَرْ فِيهِ بِشَيْءٍ، ثُمَّ فَرَقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَعْدَ ذَلِكَ»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قژی دەهێنایە خوارەوە بۆ نێوچەوانی (وەکو خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان) هاوبەشدانەرانیش دەیانکرد بە دوو لەتەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی دەکرد هاوشێوەی خاوەن کتێبەکان بکات لەوانەی فەرمانی پێ نەکراوە بە هیچ شتێ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوە قژی کرد بە دوو لەتەوە.**

## قژ شانە کردن

**٥٢٣٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، أَنَّ رَجُلاً، مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ يُقَالُ لَهُ: عُبَيْدٌ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَنْهَى عَنْ كَثِيرٍ مِنَ الْإِرْفَاهِ»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە، پیاوێک هەبوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێی دەوترا: عوبەید وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە قژ زۆر شانەکردنی.**

**تێبینی: (الْإِرْفَاهِ): واتە: قژ زۆر شانەکردن و چەورکردن و ڕازاندنەوەی.**

## شانەکردنی قژ لە لای ڕاستەوە

**٥٢٤٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، وَذَكَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُحِبُّ التَّيَامُنَ مَا اسْتَطَاعَ فِي طُهُورِهِ، وَتَنَعُّلِهِ، وَتَرَجُّلِهِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٥٥٨ و ٣٩٤٤ و ٥٩١٧، ومسلم: ٢٣٣٦، وأبو داود: ٤١٨٨، وإبن ماجه: ٣٦٣٢.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لای ڕاستی پێخۆش بوو لەوەی لە توانایدا بوایە، لە خۆپاککردنەوەو پێڵاو لە پێکردن و قژ شانەکردنیدا.**

## فەرمان کردن بە بۆیە کردن

**٥٢٤١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يُخْبِرُ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ الْيَهُودَ، وَالنَّصَارَى لَا يَصْبُغُونَ فَخَالِفُوهُمْ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ هەواڵیداوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان جولەکەو گاورەکان قژ بۆیە ناکەن، ئێوە پێچەوانەیان بکەن.**

**٥٢٤٢-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِأَبِي قُحَافَةَ وَرَأْسُهُ وَلِحْيَتُهُ كَأَنَّهُ ثَغَامَةٌ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: غَيِّرُوا أَوْ اخْضِبُوا»[٢].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: ئەبو قوحافەیان هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ قژو ڕیشی سپی بوو بوو، هەر وەکو (الثَّغَامَة) (ڕووەکێکە بەروبوومی سپی دەگرێ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: قژی بگۆڕن، یان بۆیەی بکەن.**

## زەرد کردنی ڕیش

**٥٢٤٣-** «عَنْ عُبَيْدٍ قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ يُصَفِّرُ لِحْيَتَهُ، فَقُلْتُ لَهُ: فِي ذَلِكَ فَقَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُصَفِّرُ لِحْيَتَهُ»[٣].

**واتە: عوبەیدە دەڵێ: ئیبنو عومەرم (خوا لێی ڕازی بێ) بینی ڕیشی زەرد دەکرد، لەوبارەوە قسەم لەگەڵی کرد وتی: پێغەمبەرم ﷺ بینی ڕیشی زەرد دەکرد.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




## زەردکردنی ڕیش بە (الْوَرْسِ) و زەعفەران (الْوَرْسِ) (جۆرە گیایەکە گوڵەکەی وشک دەکرێتەوەو ورد دەکرێ، پاشان تێکەڵ دەکرێ و بەکاردەهێنرێ، ڕەنگی زەردە هەروەکو ئاڵەت وایە)

**٥٢٤٤-** «عَنِ نافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَلْبَسُ النِّعَالَ السِّبْتِيَّةَ، وَيُصَفِّرُ لِحْيَتَهُ بِالْوَرْسِ، وَالزَّعْفَرَانِ وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَفْعَلُ ذَلِكَ»[١].

**واتە: نافع دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو عومەرەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەعلی (السِّبْتِيَّةَ) لەپێ دەکرد، ڕیشیشی زەرد دەکرد بە وەرس و زەعفەران، ئیبنو عومەریش هەر بەوشێوەی دەکرد.**

## بەستنەوەی قژی زیادە جگە لە قژی خۆی

**٥٢٤٥-** «عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ ﷛، وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ بِالْمَدِينَةِ، وَأَخْرَجَ مِنْ كُمِّهِ قُصَّةً مِنْ شَعْرٍ فَقَالَ: يَا أَهْلَ الْمَدِينَةِ، أَيْنَ عُلَمَاؤُكُمْ، سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَنْهَى عَنْ مِثْلِ هَذِهِ، وَقَالَ: إِنَّمَا هَلَكَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ حِينَ اتَّخَذَ نِسَاؤُهُمْ مِثْلَ هَذَا»[٢].

**واتە: حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: گوێم لە موعاویە ﷛ بوو لەسەر مینبەر لە مەدینە لە گیرفانی تۆپەڵە قژێکی دەرهێنا، وتی: ئەی خەڵکی مەدینە، کوا زاناکانتان، گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو قەدەغەی دەکرد لە بەکارهێنانی هاوشێوەی ئەمە، وتی: بەڕاستی نەوەکانی ئیسرائیل کاتێ لەناوچوون ژنەکانیان هاوشێوەی ئەمەیان بەکاردەهێنا.**

**٥٢٤٦-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، قَالَ: قَدِمَ مُعَاوِيَةُ ﷛ الْمَدِينَةَ فَخَطَبَنَا وَأَخَذَ كُبَّةً مِنْ شَعْرٍ، قَالَ: مَا كُنْتُ أَرَى أَحَداً يَفْعَلُهُ إِلَّا الْيَهُودَ، وَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَلَغَهُ فَسَمَّاهُ الزُّورَ»[٣].

**واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب دەڵێ: موعاویە ﷛ هاتە مەدینە وتارێکی بۆ داین تۆپەڵە قژێکی گرت بەدەستەوە، وتی: کەسم نەبینیوە بەکاری بهێنێ جگە لە**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤٦٨ و ٥٩٣٢، ومسلم: ٢١٢٧، وأبو داود: ٤١٦٧، والترمذي: ٢٧٨١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤٨٨ و ٥٩٣٨، ومسلم: ١٢٣ و ٢١٢٧/١٢٤.




جولەکە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕاگەینرا، ناوی نا بە (الزُّور) (بریتیە لەوەی ئافرەت لە دواوە قژی دەکات بە تۆپەڵەو بە پەڕوو قژی تر گەورەی دەکات).

## لکاندنی پەڕۆ بە قژەوە (بۆ ئەوەی قژی زۆر دەربکەوێت)

**٥٢٤٧-** «عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَاكُمْ عَنِ الزُّورِ قَالَ: وَجَاءَ بِخِرْقَةٍ سَوْدَاءَ فَأَلْقَاهَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ، فَقَالَ: هُوَ هَذَا تَجْعَلُهُ الْمَرْأَةُ فِي رَأْسِهَا ثُمَّ تَخْتَمِرُ عَلَيْهِ»[١].

واتە: ئیبنو لموسەیەب دەگێڕێتەوە، موعاویە ﷺ وتی: ئەی خەڵکینە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی لێکردوون لە هەر شتێ ئافرەتان قژی پێ زۆر بکەن. وتی: پارچە پەڕۆیەکی ڕەشی هێناو فڕێیدایە بەردەستیان، وتی: ئەمە ئەوەیە ئافرەت دەیکاتە سەری پاشان سەرپۆش دەدا بەسەریدا (لە دواوە وەکو کۆپانەی وشتر دەردەکەوێت).

**٥٢٤٨-** «عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الزُّورِ، وَالزُّورُ الْمَرْأَةُ تَلُفُّ عَلَى رَأْسِهَا»[٢].

واتە: موعاویە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە (الزُّور) وە (الزُّور) بریتیە لەوەی ئافرەت لە دواوە قژی دەکات بە تۆپەڵە (وەکو کۆپانەی وشتر دەردەکەوێ).

## نەفرینی خوا لە (الْوَاصِلَة) (ئەو کەسەیە قژێکی دروستکراو دەبەستێ بە قژێکی ترەوە، یەکسانە بیبەستێ بە قژی خۆیەوە یان قژی کەسێکی تر یان قژی کەسێکی تر دەچێنێ).

**٥٢٤٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَعَنَ الْوَاصِلَةَ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لەو کەسەی قژێکی دروستکراو دەبەستێ بە قژێکی ترەوە.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




## نەفرینی خوا لەو کەسەی قژی دروستکراو دەبەستێ، وە ئەو کەسەش قژی دروستکراوی بۆ دەبەسترێ

٥٢٥٠- «عَنْ أَسْمَاءَ، أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ بِنْتاً لِي عَرُوسٌ، وَإِنَّهَا اشْتَكَتْ، فَتَمَرَّقَ شَعْرُهَا فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ إِنْ وَصَلْتُ لَهَا فِيهِ؟ فَقَالَ: لَعَنَ اللَّهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ»[١].

واتە: ئەسماء (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کچێکم هەیە دەگوازرێتەوە ئەو بێتاقەتە لەبەر ئەوەی قژی لەت لەت بووە، ئایا گوناهبار نابم قژی تری پێوە ببەستم؟ فەرمووی: خوا نەفرینی کردوە لەوەی قژی دروستکراو دەبەستێ بە قژێکی ترەوە، وە ئەو کەسەشی بۆی دەبەسترێ یان بۆی دەچێنرێ.

## نەفرینی کردن لەو کەسەی خاڵ دەکوتێ و ئەو کەسەش کە خاڵی بۆ کوتراوە

٥٢٥١- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْوَاصِلَةَ وَالْمُوتَصِلَةَ، وَالْوَاشِمَةَ وَالْمُوتَشِمَةَ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کرد لەو کەسەی قژێکی دروستکراو دەبەستێ بە قژێکی ترەوە، ئەوەیشی بۆی دەبەسترێ، (یەکسانە بیبەستێ بە قژی خۆیەوە، یان قژی کەسێکی تر)، وە ئەوەی خاڵ و تاتۆ دەکوتێ و ئەوەشی خاڵی بۆ کوتراوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٣٥ و ٥٩٣٦ و ٥٩٤١، ومسلم: ١١٥ و ٢١٢٢/١١٦، وإبن ماجه: ١٩٨٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٣٧ و ٥٩٤٠ و ٥٩٤٢ و ٥٩٤٧، ومسلم: ٢١٢٤، وأبو داود: ٤١٦٨، والترمذي: ١٧٥٩ و ٢٧٨٣، وإبن ماجه: ١٩٨٧.




## نەفرینی خوا لەو ئافرەتانەی کە مووی برۆیان هەڵدەکەنن و ئەوانەش ددانیان بەرزو شاش دەکەن بۆ جوانی

**٥٢٥٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَعَنَ اللَّهُ الْمُتَنَمِّصَاتِ، وَالْمُتَفَلِّجَاتِ، أَلَا أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[١].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: خوا نەفرینی کردوە لەو ئافرەتانەی کە مووی برۆیان هەڵدەکەنن، ئەوانەیشی ددانیان بەرزو شاش دەکەن بۆ جوانی، ئاگاداربن، منیش نەفرین لەوانە دەکەم پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی لێکردوون.**

**٥٢٥٣-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْوَاشِمَاتِ، وَالْمُتَفَلِّجَاتِ، وَالْمُتَنَمِّصَاتِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللَّهِ ﷻ»[٢].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لەوانەی خاڵ دەکوتن، ئەوانەیشی ددانیان بەرزو شاش دەکەن بۆ جوانی، ئەوانەیشی مووی برۆیان هەڵدەکەنن ئەوانەی دروست کراوی خوا دەگۆڕن.**

**٥٢٥٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَعَنَ اللَّهُ الْمُتَنَمِّصَاتِ، وَالْمُتَفَلِّجَاتِ، وَالْمُتَوَشِّمَاتِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللَّهِ، فَأَتَتْهُ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ: أَنْتَ الَّذِي تَقُولُ كَذَا وَكَذَا؟ قَالَ: وَمَا لِي لَا أَقُولُ مَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[٣].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا نەفرینی کردوە لەوانەی مووی برۆیان هەڵدەکەنن، ئەوانەیشی ددانیان بەرزو شاش دەکەن بۆ جوانی، ئەوانەیشی خاڵ دەکوتن، ئەوانەی دروست کراوی خوا دەگۆڕن، ئافرەتێک هات بۆ لای وتی: تۆ ئاواو ئاوا دەڵێی؟ وتی: ئەی بۆ نەیڵێم کە پێغەمبەری خوا ﷺ وتبێتی.**

**٥٢٥٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَعَنَ اللَّهُ الْمُتَوَشِّمَاتِ، وَالْمُتَنَمِّصَاتِ، وَالْمُتَفَلِّجَاتِ أَلَا أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح.




واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: خوا نەفرینی کردوە لەو کەسانەی خاڵ دەکوتن، ئەوانەیشی مووی برۆیان هەڵدەکەنن، ئەوانەیشی ددانیان بەرزو شاش دەکەن بۆ جوانی، منیش نەفرین لەوانە دەکەم پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی لێکردوون.

## بەکارهێنانی زەعفەران

**٥٢٥٦-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَتَزَعْفَرَ الرَّجُلُ»[١].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە پیاو زەعفەران بۆ جەستەی بەکاربهێنێ.

**٥٢٥٧-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُزَعْفِرَ الرَّجُلُ جِلْدَهُ»[٢].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە پیاو زەعفەران بدات لە پێستی.

## بۆنی خۆش

**٥٢٥٨-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أُتِيَ بِطِيبٍ لَمْ يَرُدَّهُ»[٣].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بۆنی خۆشی بۆ بهێنرایە ڕەتی نەدەکردەوە.

**٥٢٥٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ عُرِضَ عَلَيْهِ طِيبٌ فَلَا يَرُدَّهُ، فَإِنَّهُ خَفِيفُ الْمَحْمَلِ طَيِّبُ الرَّائِحَةِ»[٤].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بۆنی خۆشی بۆ پێشنیار کرا، با ڕەتی نەکاتەوە، چونکە هەڵگرتنی سووکەو بۆنی خۆشە.

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف الإسناد.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٨٢ و ٥٩٢٩، والترمذي: ٢٧٨٩.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٥٣، وأبو داود: ٤١٧٢.




**٥٢٦٠-** «عَنْ زَيْنَبَ، امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا شَهِدَتْ إِحْدَاكُنَّ الْعِشَاءَ فَلَا تَمَسَّ طِيباً»[١].

**واتە: زەینەب خێزانی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (ئەی ئافرەتان) ئەگەر یەکێک لە ئێوە (ئافرەتان) ئامادەی نوێژی عیشا بوو با بۆنی خۆش لە خۆی نەدات.**

**٥٢٦١-** «عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، أَخْبَرَتْنِي زَيْنَبُ الثَّقَفِيَّةُ، امْرَأَةُ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَهَا: إِذَا خَرَجْتِ إِلَى الْعِشَاءِ، فَلَا تَمَسِّ طِيباً»[٢].

**واتە: بوسری کوڕی سەعید دەگێڕێتەوە، زەینەبی ثەقەفیە خێزانی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) هەواڵی پێم داوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەگەر دەرچووی بۆ نوێژی عیشا بۆنی خۆش لە خۆت مەدە.**

**٥٢٦٢-** «عَنْ زَيْنَبَ الثَّقَفِيَّةِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: أَيَّتُكُنَّ خَرَجَتْ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَلَا تَقْرَبَنَّ طِيباً»[٣].

**واتە: زەینەبی ثەقەفیە دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر یەکێک لە ئێوە ڕۆیشت بۆ مزگەوت، ئەوە با نزیکی بۆنی خۆش نەبێتەوە.**

**٥٢٦٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ أَصَابَتْ بَخُوراً، فَلَا تَشْهَدْ مَعَنَا الْعِشَاءَ الْآخِرَةَ»[٤].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر ئافرەتێک بۆنی خۆشی لە خۆیدا با لەگەڵماندا ئامادەی نوێژی عیشا نەبێت.**

## باسی خۆشترین بۆن

**٥٢٦٤-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: ذَكَرَ النَّبِيُّ ﷺ امْرَأَةً حَشَتْ خَاتَمَهَا بِالْمِسْكِ، فَقَالَ: وَهُوَ أَطْيَبُ الطِّيبِ»[٥].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح.




واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ باسی ئافرەتێکی کرد سەر موستیلەکەی پڕ کردبوو لە بۆنی میسک، فەرمووی: ئەوە خۆشترین بۆنە.

## حەرام کردنی پۆشینی زێڕ

**٥٢٦٥-** «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ أَحَلَّ لِإِنَاثِ أُمَّتِي الْحَرِيرَ وَالذَّهَبَ، وَحَرَّمَهُ عَلَى ذُكُورِهَا»(١).

**واتە: ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ حەڵاڵی کردوە بۆ مێینەی ئوممەتەکەم حەریرو زێڕ، وە قەدەغەی کردوە لەسەر نێرینەکانی.**

## قەدەغە کردن لە لەدەست کردنی موستیلەی زێڕ

**٥٢٦٦-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نُهِيتُ عَنِ الثَّوْبِ الْأَحْمَرِ، وَخَاتَمِ الذَّهَبِ، وَأَنْ أَقْرَأَ وَأَنَا رَاكِعٌ»(٢).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: سێ شتم لێ قەدەغە کراوە: جلی سور، موستیلەی زێڕ، وە لە ڕکوعدا قورئان بخوێنم.**

**٥٢٦٧-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: نَهَانِي النَّبِيُّ ﷺ عَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ، وَأَنْ أَقْرَأَ الْقُرْآنَ وَأَنَا رَاكِعٌ، وَعَنِ الْقَسِّيِّ، وَعَنِ الْمُعَصْفَرِ»(٣).

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی لێکردم لە لەدەستکردنی موستیلەی زێڕ، وە لەوەی لە ڕکوعدا قورئان بخوێنم، وە لەپۆشینی جلی (الْقَسِّيِّ) (کە جلێکە زۆرینەی حەریرە)، وە لە (الْمُعَصْفَر) (واتە: جلی ڕەنگاو ڕەنگ، موعەصفەر: ڕووەکێکی هاوینەیە لە زەعفەران دەچێ، دەخرێتە ناو خواردنەوە، لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ جلوبەرگی پێ ڕەنگ دەکرا).**

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٧٢٠.

(٢) صحيح الإسناد. أخرجه مسلم: ٤٨١.

(٣) حسن الإسناد.





**٥٢٦٨-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ يَقُولُ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ، وَعَنْ لُبُوسِ الْقَسِّيِّ، وَالْمُعَصْفَرِ، وَقِرَاءَةِ الْقُرْآنِ وَأَنَا رَاكِعٌ»[١].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردم لە لەدەستکردنی موستیلەی زێڕ، وە لە پۆشینی (الْقَسِّيِّ) (کە جلێکە زۆرینەی حەریرە)، وە (الْمُعَصْفَر) (واتە: جلی ڕەنگاو ڕەنگ، موعەصفەر: ڕووەکێکی هاوینەیە لە زەعفەران دەچێ، دەخرێتە ناو خواردنەوە، لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ جلوبەرگی پێ ڕەنگ دەکرا) وە لە ڕکوعدا قورئان بخوێنم.**

**٥٢٦٩-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْقِرَاءَةِ فِي الرُّكُوعِ»[٢].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردم لە ڕکوعدا قورئان بخوێنم.**

**٥٢٧٠-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ ثِيَابِ الْمُعَصْفَرِ، وَعَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ، وَلُبْسِ الْقَسِّيِّ، وَأَنْ أَقْرَأَ وَأَنَا رَاكِعٌ»[٣].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردم لە پۆشینی جلی موعەصفەر، وە لە لەدەستکردنی موستیلەی زێڕو، پۆشینی قەسی و، هەروەها لە ڕکوعدا قورئان بخوێنم.**

**٥٢٧١-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَرْبَعٍ: عَنْ لُبْسِ ثَوْبٍ مُعَصْفَرٍ، وَعَنِ التَّخَتُّمِ بِخَاتَمِ الذَّهَبِ، وَعَنْ لُبْسِ الْقَسِّيَّةِ، وَأَنْ أَقْرَأَ الْقُرْآنَ وَأَنَا رَاكِعٌ»[٤].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردم لە چوارشت: لە پۆشینی جلی موعەصفەرو لە دەستکردنی موستیلەی زێڕو، پۆشینی قەسیە، هەروەها لە ڕکوعدا قورئان بخوێنم.**

**٥٢٧٢-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ ثِيَابِ الْمُعَصْفَرِ، وَعَنِ الْحَرِيرِ، وَأَنْ يَقْرَأَ وَهُوَ رَاكِعٌ، وَعَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ»[٥].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) صحيح.**

**(٤) صحيح.**

**(٥) صحيح.**

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە پۆشینی جلی موعەصفەرو حەریر، وە لە ڕکوعدا قوڕئان بخوێنێ، هەروەها لە لەدەستکردنی موستیلەی زێڕ.**

**٥٢٧٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ نَهَى عَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لە لەدەستکردنی موستیلەی زێڕ.**

**٥٢٧٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ تَخَتُّمِ الذَّهَبِ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە لەدەستکردنی موستیلەی زێڕ.**

## سیفاتی موستیلەکەی پێغەمبەر ﷺ و شێوەی نەخشاندن و هەڵکۆڵینی

**٥٢٧٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: اتَّخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَاتَمَ الذَّهَبِ، فَلَبِسَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَاتَّخَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَ الذَّهَبِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنِّي كُنْتُ أَلْبَسُ هَذَا الْخَاتَمَ، وَإِنِّي لَنْ أَلْبَسَهُ أَبَداً فَنَبَذَهُ فَنَبَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَهُمْ»[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ موستیلەیەکی لە زێڕ دروست کردو، پاشان لە دەستی کرد، خەڵکەکەیش موستیلەی زێڕیان لە دەست کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەم موستیلەیەم لە دەستکرد، بەڵام ئیتر هەرگیز لە دەستی ناکەم، لە دەستی دایکەند، خەڵکەکەیش لە دەستیان دایانکەند.**

**٥٢٧٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ نَقْشُ خَاتَمِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ»[٤].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: نەخشی موستیلەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّه) بوو.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٦٤، ومسلم: ٢٠٨٩.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**٥٢٧٧-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اتَّخَذَ خَاتَماً مِنْ وَرِقٍ، وَفَصُّهُ حَبَشِيٌّ، وَنَقْشُهُ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ»[١].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ موستیلەیەکی دروستکرد لە زیو، ئەو کەسەی دروستی کردبوو حەبەشی بوو، نەخشێنرا بوو بە: (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّه).**

**٥٢٧٨-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: أَرَادَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَكْتُبَ إِلَى الرُّومِ فَقَالُوا: إِنَّهُمْ لَا يَقْرَءُونَ كِتَاباً إِلَّا مَخْتُوماً فَاتَّخَذَ خَاتَماً مِنْ فِضَّةٍ، كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِهِ فِي يَدِهِ، وَنُقِشَ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی نوسراوێک بنوسێ بۆ ڕومەکان وتیان: ئەوان نوسراوێک ناخوێننەوە مۆری لێ نەدرابێت، ئەویش مۆرێکی دروست کرد لە زیو، وەکو ئەوەی ئێستا تەماشای سپیایەتی موستیلەکە بکەم لە دەستیدا، هەڵکۆڵرابوو بوو بە: (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّه).**

**٥٢٧٩-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اتَّخَذَ خَاتَماً مِنْ وَرِقٍ وَفَصُّهُ حَبَشِيٌّ»[٣].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ موستیلەیەکی دروستکرد لە زیو، مەعدەنەکەی حەبەشی بوو.**

**٥٢٨٠-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ خَاتَمُ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ فِضَّةٍ، وَفَصُّهُ مِنْهُ»[٤].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: موستیلەکەی پێغەمبەر ﷺ لە زیو بوو، نەخشەکەیشی لە خۆی بوو.**

**٥٢٨١-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قَدِ اصْطَنَعْنَا خَاتَماً، وَنَقَشْنَا عَلَيْهِ نَقْشاً فَلَا يَنْقُشْ عَلَيْهِ أَحَدٌ»[٥].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: موستیلەیەکمان دروستکرد، وە نەخشێکمان لە سەری نەخشاند با هیچ کەسێکی تر ئەو نەخشە**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥، ومسلم: ٢٠٩٢/٥٦.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٦١ و ٢٠٩٤/٦٢، وأبو داود: ٤٢١٦، والترمذي: ١٧٣٩، وإبن ماجه: ٣٦٤١ و ٣٦٤٦.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٧٠، وأبو داود: ٤٢١٧، والترمذي: ١٧٤٠.

(٥) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٧٤ و ٥٨٧٧، ومسلم: ٢٠٩٢، وإبن ماجه: ٣٦٤٠.




لەسەر موستیلەکەی خۆی دا دروست نەکات. (چونکە پێغەمبەر ﷺ نوسراوی بکردایە بەو نەخشە مۆری دەکردو دەینارد بە نوێنەرەکانی دا).

## شوێنی موستیلە لە پەنجەدا

**٥٢٨٢-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اصْطَنَعَ خَاتَماً فَقَالَ: إِنَّا قَدِ اتَّخَذْنَا خَاتَماً، وَنَقَشْنَا عَلَيْهِ نَقْشاً، فَلَا يَنْقُشْ عَلَيْهِ أَحَدٌ، وَإِنِّي لَأَرَى بَرِيقَهُ فِي خِنْصَرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[١].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ موستیلەیەکی دا بە دروستکردن، فەرمووی: ئێمە موستیلەیەکمان دروستکردووەو نەخشێکمان لەسەری هەڵکۆڵیوە، با هیچ کەسێکی تر لەسەر ئەو شێوەیە نەخشی نەکات، وە من بریسکەی ئەو موستیلەیەم لە پەنجە بچکۆلەکەی (توتەی) پێغەمبەری خوادا ﷺ دەبینی.**

**٥٢٨٣-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ موستیلەی دەکردە دەستی ڕاستی.**

**٥٢٨٤-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِ خَاتَمِ النَّبِيِّ ﷺ فِي إِصْبَعِهِ الْيُسْرَى»[٣].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: هەروەکو ئەوەی ئێستا تەماشای سپیایەتی موستیلەکەی دەستی پێغەمبەر ﷺ بکەم کە لە پەنجەی چەپیدا بوو.**

**٥٢٨٥-** «عَنْ ثَابِتٍ، أَنَّهُمْ سَأَلُوا أَنَساً ﷺ، عَنْ خَاتَمِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ خَاتَمِهِ مِنْ فِضَّةٍ، وَرَفَعَ إِصْبَعَهُ الْيُسْرَى الْخِنْصَرَ»[٤].

**واتە: ثابت دەگێڕێتەوە: ئەوان پرسیاریان کرد لە ئەنەس ﷺ لە بارەی موستیلەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: هەروەکو ئەوەی ئێستا تەماشای بریقەی موستیلەکەی بکەم کە لە زیو بوو، ئەنەس پەنجە بچکۆلەکەی (توتەی) دەستی چەپی بەرزکردەوە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح.




**٥٢٨٦-** «عَنْ أَبِي بُرْدَةَ قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيّاً ﷺ يَقُولُ: نَهَانِي نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْخَاتَمِ فِي السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى»[1].

**واتە: ئەبو بوردە دەڵێ: گوێم لە عەلی ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێکردووم لەوەی موستیلە بکەمە پەنجەی شایەتمان و پەنجەی نێوەڕاست.**

**٥٢٨٧-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ أَلْبَسَ فِي إِصْبَعِي هَذِهِ، وَفِي الْوُسْطَى وَالَّتِي تَلِيهَا»[2].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێکردووم موستیلە بکەمە ئەم پەنجەمە، وە لە پەنجەی نێوەڕاست و ئەوەشی لە دوای ئەو دێت. (کە پەنجەی شایەتمانە).**

## شوێنی هەڵکۆڵینی یان گۆی موستیلە لە پەنجەدا

**٥٢٨٨-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَخَتَّمُ بِخَاتَمٍ مِنْ ذَهَبٍ، ثُمَّ طَرَحَهُ، وَلَبِسَ خَاتَماً مِنْ وَرِقٍ، وَنُقِشَ عَلَيْهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ، ثُمَّ قَالَ: لَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ أَنْ يَنْقُشَ عَلَى نَقْشِ خَاتَمِي هَذَا، وَجَعَلَ فَصَّهُ فِي بَطْنِ كَفِّهِ»[3].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ موستیلەیەکی دروستکرد لە زێڕ، پاشان داینا، ئینجا موستیلەیەکی زیوی لە دەستکرد، وە هەڵیکۆڵی بە: (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّه) پاشان فەرمووی: دروست نیە بۆ هیچ کەسێک موستیلەکەی هەڵبکۆڵێ وەکو ئەمەی من، پاشان نەخشەکەی خستە ناو لەپی دەستی.**

## فڕێدانی موستیلەو وازهێنان لە لەدەستکردنی

**٥٢٨٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اتَّخَذَ خَاتَماً فَلَبِسَهُ قَالَ: شَغَلَنِي هَذَا عَنْكُمْ مُنْذُ الْيَوْمَ، إِلَيْهِ نَظْرَةٌ، وَإِلَيْكُمْ نَظْرَةٌ ثُمَّ أَلْقَاهُ»[4].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧٢٥، وأبو داود: ٤٢٢٥، والترمذي: ١٧٨٦، وإبن ماجه: ٣٦٤٨.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ موستیلەیەکی دروست کردو پاشان لە دەستی کرد، فەرمووی: ئەمە بە درێژایی ئەمڕۆ منی سەرقاڵ کرد لە ئێوە، جارێک تەماشای ئەمەم دەکردو، جارێکیش تەماشای ئێوە، پاشان دایکەند.**

**٥٢٩٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اصْطَنَعَ خَاتَماً مِنْ ذَهَبٍ وَكَانَ يَلْبَسُهُ فَجَعَلَ فَصَّهُ فِي بَاطِنِ كَفِّهِ فَصَنَعَ النَّاسُ، ثُمَّ إِنَّهُ جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَنَزَعَهُ وَقَالَ: إِنِّي كُنْتُ أَلْبَسُ هَذَا الْخَاتَمَ وَأَجْعَلُ فَصَّهُ مِنْ دَاخِلٍ فَرَمَى بِهِ ثُمَّ قَالَ: وَاللَّهِ لَا أَلْبَسُهُ أَبَداً، فَنَبَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَهُمْ»[1].

**واتە: : ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ موستیلەیەکی دا بە دروستکردن لە زێڕ، جا موستیلەکەی لە دەستدەکرد نەخشی موستیلەکەی دەخستە ناو لەپی، خەڵکەکەیش موستیلەیان لە دەستکرد، پاشان لەسەر مینبەر دانیشت و لە دەستی داکەندو فەرمووی: من ئەم موستیلەیەم لە دەست دەکرد نەخشەکەیشیم دەخستە ناو لەپمەوە، دواتر فڕێیدا، پاشان فەرمووی: ئیتر هەرگیز لە دەستی ناکەم، خەڵکەکەیش موستیلەکانیان داکەند.**

**٥٢٩١-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى فِي يَدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ خَاتَماً مِنْ وَرِقٍ يَوْماً وَاحِداً، فَصَنَعُوهُ، فَلَبِسُوهُ، فَطَرَحَ النَّبِيُّ ﷺ وَطَرَحَ النَّاسُ»[2].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو موستیلەیەکی زیوی لە دەست پێغەمبەری خوادا ﷺ بینی تەنها یەک ڕۆژ، خەڵکەکەیش وەکو ئەو موستیلەیان لە دەستکرد، ئینجا پێغەمبەر ﷺ لە دەستی داکەندو خەڵکەکەیش لە دەستیان دایانکەند.**

**٥٢٩٢-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اتَّخَذَ خَاتَماً مِنْ ذَهَبٍ، وَكَانَ جَعَلَ فَصَّهُ فِي بَاطِنِ كَفِّهِ، فَاتَّخَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَ مِنْ ذَهَبٍ، فَطَرَحَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَطَرَحَ النَّاسُ خَوَاتِيمَهُمْ، وَاتَّخَذَ خَاتَماً مِنْ فِضَّةٍ فَكَانَ يَخْتِمُ بِهِ وَلَا يَلْبَسُهُ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٦٦ و ٥٨٧٣ و ٥٨٧٦ و ٦٦٥١، ومسلم: ٥٣ و ٢٠٩١/٥٥، وأبو داود: ٤٢١٨ و ٤٢١٩ و ٤٢٢٠، والترمذي: ١٧٤١، وإبن ماجه: ٣٦٣٩ و ٤٦٤٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٦٨، ومسلم: ٢٠٩٣، وأبو داود: ٤٢٢١.

(٣) صحيح دون قوله: «لاَ يَلْبَسُهُ» فإنه شاذ.




واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ موستیلەیەکی دروستکرد لە زێڕ، نەخشەکەی لە ناو لەپی دەستیدا بوو، خەڵکەکەش موستیلەی زێڕیان بەکارهێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ فڕێیدا، خەڵکەکەیش موستیلەکانیان داکەند، ئینجا موستیلەکی لە زیو دروستکرد، مۆری پێدەکرد، بەڵام لە دەستی نەدەکرد.

**٥٢٩٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: اتَّخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَاتَماً مِنْ ذَهَبٍ، وَجَعَلَ فَصَّهُ مِمَّا يَلِي بَطْنَ كَفِّهِ، فَاتَّخَذَ النَّاسُ الْخَوَاتِيمَ، فَأَلْقَاهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: لَا أَلْبَسُهُ أَبَداً ثُمَّ اتَّخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَاتَماً مِنْ وَرِقٍ، فَأَدْخَلَهُ فِي يَدِهِ، ثُمَّ كَانَ فِي يَدِ أَبِي بَكْرٍ، ثُمَّ كَانَ فِي يَدِ عُمَرَ، ثُمَّ كَانَ فِي يَدِ عُثْمَانَ حَتَّى هَلَكَ فِي بِئْرِ أَرِيسٍ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ موستیلەیەکی دروستکرد لە زێڕ، نەخشەکەی خستە ناو لەپی، خەڵکەکەش موستیلەیان بەکارهێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ فڕێیداو فەرمووی: هەرگیز ئیتر لە دەستی ناکەم، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ موستیلەیەکی لە زیو دروستکرد کردیە دەستی، پاشان لە دوای ئەو لە دەستی ئەبو بەکردا بوو، پاشان لە دەستی عومەر بوو، پاشان لە دەستی عوسماندا بوو هەتا لە بیری ئەریس گوم (ون) بوو.

## باسی ئەوەی دروستە لە پۆشینی جل و بەرگ و ئەوەیشی دروست نیە

**٥٢٩٤-** «عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَرَآنِي سَيِّئَ الْهَيْئَةِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: هَلْ لَكَ مِنْ شَيْءٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، مِنْ كُلِّ الْمَالِ قَدْ آتَانِي اللَّهُ، فَقَالَ: إِذَا كَانَ لَكَ مَالٌ فَلْيُرَ عَلَيْكَ»[٢].

واتە: ئەبو ئەحوەص دەگێڕێتەوە، باوکی ﷺ وتوویەتی: چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بینیمی جلەکانم کۆن بوو بوون، فەرمووی: ئایا ماڵ و سامانت هەیە؟ وتم: خوا لە هەموو جۆرە ماڵ و سامانێکی پێداوم (کە لەو سەردەمەدا هەبوو، وەکو وشترو مەڕو ماڵات و ئەسپ و کۆیلە) فەرمووی: ئەگەر خوا ماڵ و سامانێکی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

پێ بەخشیت با شوێنەواری نیعمەتەکانی پێتەوە دەربکەوێ، (واتە: جلێکی جوان بپۆشە هەتا خەڵکی بزانن خوا نازو نیعمەتی خۆی ڕشتوە بەسەرتدا).

## باسی قەدەغەکردنی پۆشینی جلوبەرگی (السِّيَرَاء) (پۆشاکێکی خەتدار بوو تێکەڵ بوو بە حەریر)

**٥٢٩٥-** «عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى حُلَّةَ سِيَرَاءَ تُبَاعُ عِنْدَ بَابِ الْمَسْجِدِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوِ اشْتَرَيْتَ هَذَا لِيَوْمِ الْجُمُعَةِ وَلِلْوَفْدِ إِذَا قَدِمُوا عَلَيْكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا يَلْبَسُ هَذِهِ مَنْ لَا خَلَاقَ لَهُ فِي الْآخِرَةِ، قَالَ: فَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَعْدُ مِنْهَا بِحُلَلٍ فَكَسَانِي مِنْهَا حُلَّةً فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَسَوْتَنِيهَا، وَقَدْ قُلْتَ فِيهَا مَا قُلْتَ؟ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَمْ أَكْسُكَهَا لِتَلْبَسَهَا، إِنَّمَا كَسَوْتُكَهَا لِتَكْسُوَهَا أَوْ لِتَبِيعَهَا فَكَسَاهَا عُمَرُ أَخاً لَهُ مِنْ أُمِّهِ مُشْرِكاً»(١).

واتە: عومەری کوڕی خەطاب ﷺ جلێکی خەتدرای جوانی بینی تێکەڵ بوو بە حەریر، لە بەردەم مزگەوتدا دەفرۆشرا، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، خۆزگە ئەمەت دەکڕی و لە ڕۆژی هەینی لەبەرت دەکرد، هەروەها بۆ کاتێک نوێنەرێک دێت بۆ لات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی کەسێک ئەو جلە دەپۆشێت هیچ بەشێکی نەبێت لە ڕۆژی دواییدا، وتی: پاشان دوای ئەوە چەند جلێکی وەکو ئەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هات، دانەیەکیانی دا بە من، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیدەی بە من بیپۆشم لە کاتێکدا ئەوەی وتت دەربارەی کە وتت؟ فەرمووی: پێم نەداوی بۆ ئەوەی بیپۆشی، بەڵکو بۆ ئەوە پێم داوی بیبەخشی بە کەسێکی تر، یان بۆ خۆت بیفرۆشی، عومەر بەخشیە برایەکی دایکی (واتە: زڕ برای) کە هاوبەشدانەر بوو.

## باسی مۆڵەتدان بە ئافرەتان لە پۆشینی جلوبەرگی (السِّيَرَاء) (پۆشاکێکی خەتدار بوو تێکەڵ بوو بە حەریر)

**٥٢٩٦-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ عَلَى زَيْنَبَ بِنْتِ النَّبِيِّ ﷺ قَمِيصَ حَرِيرٍ سِيَرَاءَ»(٢).

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: کراسێکی حەریری خەتدارم لەبەر زەینەبی کچی پێغەمبەر ﷺ بینی.

---

(١) صحيح.

(٢) شاذ. أخرجه البخاري: ٥٨٤٢، وأبو داود: ٤٠٥٨، وإبن ماجه: ٣٥٩٨.




**٥٢٩٧-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى عَلَى أُمِّ كُلْثُومٍ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بُرْدَ سِيَرَاءَ، وَالسِّيَرَاءُ الْمُضَلَّعُ بِالْقَزِّ»[1].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو کراسێکی حەریری خەتداری لەبەر ئوم کەلثومی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ بینی.**

**٥٢٩٨-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ يَقُولُ: أُهْدِيَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ حُلَّةُ سِيَرَاءَ، فَبَعَثَ بِهَا إِلَيَّ، فَلَبِسْتُهَا، فَعَرَفْتُ الْغَضَبَ فِي وَجْهِهِ، فَقَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ أُعْطِكَهَا لِتَلْبَسَهَا فَأَمَرَنِي فَأَطَرْتُهَا بَيْنَ نِسَائِي»[2].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاکێکی حەریری پێشکەش کرا، ناردی بۆ من، دواتر منیش پۆشیم، توڕەییم لە ڕوخساریدا بەدی کرد، فەرمووی: پێم نەبەخشیویت بۆ ئەوەی لەبەری بکەیت، فەرمانی پێکردم دابەشم کرد لە نێوان خێزانەکانمدا.**

## باسی قەدەغەکردنی پۆشینی ئاوریشم

**٥٢٩٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ عُمَرَ خَرَجَ فَرَأَى حُلَّةَ إِسْتَبْرَقٍ تُبَاعُ فِي السُّوقِ، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اشْتَرِهَا فَالْبَسْهَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَحِينَ يَقْدَمُ عَلَيْكَ الْوَفْدُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا يَلْبَسُ هَذَا مَنْ لَا خَلَاقَ لَهُ، ثُمَّ أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِثَلَاثِ حُلَلٍ مِنْهَا فَكَسَا عُمَرَ حُلَّةً، وَكَسَا عَلِيّاً حُلَّةً، وَكَسَا أُسَامَةَ حُلَّةً، فَأَتَاهُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قُلْتَ: فِيهَا مَا قُلْتَ، ثُمَّ بَعَثْتَ إِلَيَّ؟ فَقَالَ: بِعْهَا وَاقْضِ بِهَا حَاجَتَكَ أَوْ شَقِّقْهَا خُمُراً بَيْنَ نِسَائِكَ»[3].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: عومەر هاتە دەرەوە جلێکی ئاوریشمی بینی لە بازاڕدا دەفرۆشرا، هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بیکڕەو لە ڕۆژی هەینی لەبەری بکە، هەروەها کاتێ نوێنەران دێن بۆ لات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی کەسێک ئەمە لەبەر دەکات هیچ بەشێکی نەبێت لە دواڕۆژدا، پاشان سێ جلی ئاوریشمیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بە دیاری هێنا، دانەیەکیانی بەخشی بە عومەر، دانەیەکیش بە عەلی و دانەیەکیش**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦١٤ و ٥٣٦٦ و ٥٨٤٠، ومسلم: ١٧ و ٢٠٧١/١٩، وإبن ماجه: ٣٥٩٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٤٨ و ٢١٠٤ و ٣٠٥٤ و ٦٠٨١، ومسلم: ٨ و ٢٠٦٨/٩، وأبو داود: ١٠٧٧ و ٤٠٤١.




بە ئوسامە (خوا لێیان ڕازی بێ)، عومەر هات بۆ لای وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی وتت دەربارەی ئەمە وتت، پاشان بۆ منت نارد؟ فەرمووی: بیفرۆشەو کەم و کوڕی خۆتی پێ پڕبکەرەوە، یان بەش بەشی بکە لە نێوان خێزانەکانتدا. (یان لە نێوان ئافرەتانی خزمیدا).

## سیفاتی پۆشاکی ئاوریشم

**٥٣٠٠-** «عَنْ يَحْيَى وَهُوَ ابْنُ أَبِي إِسْحَقَ قَالَ: قَالَ سَالِمٌ: مَا الْإِسْتَبْرَقُ؟ قُلْتُ: مَا غَلُظَ مِنَ الدِّيبَاجِ وَخَشُنَ مِنْهُ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ يَقُولُ: رَأَى عُمَرُ مَعَ رَجُلٍ حُلَّةَ سُنْدُسٍ، فَأَتَى بِهَا النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: اشْتَرِ هَذِهِ»[١].

**واتە: یەحیای کوڕی ئیسحاق دەڵێ: سالم وتی: (الإِسْتَبْرَقُ) چیە؟ وتم: ئاوریشمی ئەستورو زبرە، وتی: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بوو دەیوت: عومەر ئاوریشمی ئەستوری لای پیاوێک بینی، هێنای بۆ خزمەت پێغەمبەر وتی: ئەمە بکڕە.**

## باسی قەدەغەکردنی لەبەرکردنی (الدِّيبَاج) (حەریرێکی ئەستورە).

**٥٣٠١-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُكَيْمٍ، قَالَ: اسْتَسْقَى حُذَيْفَةُ فَأَتَاهُ دُهْقَانٌ بِمَاءٍ فِي إِنَاءٍ مِنْ فِضَّةٍ، فَحَذَفَهُ، ثُمَّ اعْتَذَرَ إِلَيْهِمْ مِمَّا صَنَعَ بِهِ، وَقَالَ: إِنِّي نُهِيتُهُ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا تَشْرَبُوا فِي إِنَاءِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَلَا تَلْبَسُوا الدِّيبَاجَ، وَلَا الْحَرِيرَ، فَإِنَّهَا لَهُمْ فِي الدُّنْيَا، وَلَنَا فِي الْآخِرَةِ»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عوکەیم دەڵێ: حوزەیفە داوای ئاوی کرد، گەورەی قەومەکە لە ناو قاپێکی زیودا ئاوی بۆ هێنا، ئەویش بەرەو ڕوویان فڕێیدا، پاشان پاساوی بۆیان هێنایەوە لەو کارەی کردی، وتی: من قەدەغەم لێکراوە لەناو ئەو جۆرە قاپانەدا بخۆمەوە، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: مەخۆنەوە لە قاپ و قاچاخی زێڕو زیو، نە دیباج بپۆشن و نە حەریریش، چونکە لە دونیادا بۆ بێبڕوایانە، لە دواڕۆژیشدا بۆ ئێوەیە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٢٦ و ٥٦٣٢ و ٥٦٣٣ و ٥٨٣١ و ٥٨٣٧، ومسلم: ٤ و ٢٠٦٧/٥، وأبو داود: ٣٧٢٣، والترمذي: ١٨٧٨، وإبن ماجه: ٢٤١٤ و ٣٥٩٠.




## پۆشینی دیباجێک کە بە زێڕ چنرابێت

**٥٣٠٢-** «عَنْ وَاقِدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ حِينَ قَدِمَ الْمَدِينَةَ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَقَالَ: مِمَّنْ أَنْتَ؟ قُلْتُ: أَنَا وَاقِدُ بْنُ عَمْرِو بْنِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ قَالَ: إِنَّ سَعْداً كَانَ أَعْظَمَ النَّاسِ وَأَطْوَلَهُ، ثُمَّ بَكَى فَأَكْثَرَ الْبُكَاءَ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَ إِلَى أُكَيْدِرٍ صَاحِبِ دُومَةَ بَعْثاً، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ بِجُبَّةِ دِيبَاجٍ مَنْسُوجَةٍ فِيهَا الذَّهَبُ، فَلَبِسَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَامَ عَلَى الْمِنْبَرِ، وَقَعَدَ فَلَمْ يَتَكَلَّمْ، وَنَزَلَ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَلْمِسُونَهَا بِأَيْدِيهِمْ، فَقَالَ: أَتَعْجَبُونَ مِنْ هَذِهِ لَمَنَادِيلُ سَعْدٍ فِي الْجَنَّةِ أَحْسَنُ مِمَّا تَرَوْنَ»[١].

واتە: واقیدی کوڕی عەمری کوڕی سەعدی کوڕی موعاز دەڵێ: هاتم بۆ لای ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ کاتێ هاتە مەدینە، سڵاوم لێکرد، وتی: تۆ کێی؟ وتم: من واقیدی کوڕی عەمری کوڕی سەعدی کوڕی موعازم، وتی: بەڕاستی گەورەترین و بەڕێزترینی ناو خەڵک بوو، پاشان زۆر گریا، پاشان وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ لای ئوکەیدەر دەسەڵاتداری دەومە، ئەویش جوبەیەکی دیباجی بۆی نارد بە زێڕ چنرابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەری کرد، پاشان هەڵسایە سەر مینبەرو دانیشت هیچ قسەی نەکرد، ئینجا دابەزی، خەڵکەکەش دەستیان لە جوبەکە دەدا، فەرمووی: ئایا سەرتان لەمە سوڕماوە، جوبەکەی سەعد لە بەهەشتدا زۆر لەمە چاکترە کە دەیبینن.

## باسی هەڵوەشاندنەوەی حوکمی پۆشینی دیباجێک بە زێڕ چنرابێت

**٥٣٠٣-** «عن جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: لَبِسَ النَّبِيُّ ﷺ قَبَاءً مِنْ دِيبَاجٍ أُهْدِيَ لَهُ، ثُمَّ أَوْشَكَ أَنْ نَزَعَهُ، فَأَرْسَلَ بِهِ إِلَى عُمَرَ فَقِيلَ لَهُ: قَدْ أَوْشَكَ مَا نَزَعْتَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: نَهَانِي عَنْهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ، فَجَاءَ عُمَرُ يَبْكِي فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَرِهْتَ أَمْراً وَأَعْطَيْتَنِيهِ؟ قَالَ: إِنِّي لَمْ أُعْطِكَهُ لِتَلْبَسَهُ، إِنَّمَا أَعْطَيْتُكَهُ لِتَبِيعَهُ فَبَاعَهُ عُمَرُ بِأَلْفَيْ دِرْهَمٍ»[٢].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ جلێکی دیباجی پۆشی بە دیاری بۆی هاتبوو، پاشان کەمێکی پێچوو دایکەند، ناردی بۆ عومەر، پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ،

---

(١) حسن صحيح. أخرجه الترمذي: ١٧٢٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٧٠.

کەمێک لەبەرت کرد ئینجا داتکەند، فەرمووی: جبریل قەدەغەی لێکردم بیپۆشم، عومەر هاتە خزمەتی دەگریا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، شتێکت پێناخۆشە بۆ خۆت بە منی دەبەخشیت؟ فەرمووی: من پێم نەبەخشیوی بیپۆشی، بەڵکو پێم بەخشیت بۆ ئەوەی بیفرۆشی، عومەر فرۆشتی بە دوو هەزار دینار.

## هەڕەشە کردن لە پۆشنی حەریر، هەر کەس لە دنیادا بیپۆشێ لە ڕۆژی دوایی نایپۆشێ

**٥٣٠٤-** «عَنْ ثَابِتٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ، وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَخْطُبُ وَيَقُولُ: قَالَ مُحَمَّدٌ ﷺ: مَنْ لَبِسَ الْحَرِيرَ فِي الدُّنْيَا، فَلَنْ يَلْبَسَهُ فِي الْآخِرَةِ»(١).

**واتە: ثابت دەڵێ: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر بوو لەسەر مینبەر وتاری دەداو دەیوت: موحەممەد ﷺ فەرمووی: هەرکەس لە دنیادا حەریر بپۆشێ هەرگیز لە ڕۆژی دواییدا نایپۆشێ.**

**٥٣٠٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: لَا تُلْبِسُوا نِسَاءَكُمُ الْحَرِيرَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ لَبِسَهُ فِي الدُّنْيَا لَمْ يَلْبَسْهُ فِي الْآخِرَةِ»(٢).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: با ژنەکانتان حەریر نەپۆشن، چونکە من گوێم لە عومەری کوڕی خەطاب بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس لە دنیادا بپۆشێ هەرگیز لە ڕۆژی دواییدا نایپۆشێ.**

**٥٣٠٦-** «عَنْ عِمْرَانَ بن حِطَّانَ أَنَّهُ سَأَلَ عَبْدَ اللَّهِ بن عَبَّاسٍ عن لُبْسِ الْحَرِيرِ، فَقَالَ: سَلْ عَائِشَةَ، فَسَأَلْتُ عَائِشَةَ قَالَتْ: سَلْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ، فَسَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ فَقَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو حَفْصٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ لَبِسَ الْحَرِيرَ فِي الدُّنْيَا، فَلَا خَلَاقَ لَهُ فِي الْآخِرَةِ»(٣).

**واتە: عیمرانی کوڕی حیطان دەگێڕێتەوە: ئەو پرسیاری کرد لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس لە بارەی پۆشینی حەریر، وتی: پرسیار لە عائیشە بکە، پرسیارم کرد لە**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٣٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٣٤ و ٥٨٣٥، ومسلم: ١٠ و ٢٠٦٩/١١، والترمذي: ٢٨١٧.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٨٦، ومسلم: ٢٠٦٨.




**عائیشە، وتی: پرسیار لە عەبدوڵلای کوڕی عومەر بکە، پرسیارم کرد لە عەبدوڵلای کوڕی عومەر وتی: ئەبو حەفص بۆی باسکردم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس لە دنیادا حەریر لەبەر بکات هیچ بەشێکی بۆ نیە لە ڕۆژی دواییدا.**

**٥٣٠٧-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا يَلْبَسُ الْحَرِيرَ مَنْ لَا خَلَاقَ لَهُ»[1].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: بێگومان کەسێک حەریر لەبەر دەکات هیچ بەشێکی نەبێت لە ڕۆژی دواییدا.**

**٥٣٠٨-** «عَنْ عَلِيٍّ الْبَارِقِيِّ قَالَ: أَتَتْنِي امْرَأَةٌ تَسْتَفْتِينِي فَقُلْتُ لَهَا: هَذَا ابْنُ عُمَرَ فَاتَّبَعَتْهُ تَسْأَلُهُ، وَاتَّبَعْتُهَا أَسْمَعُ مَا يَقُولُ: قَالَتْ: أَفْتِنِي فِي الْحَرِيرِ؟ قَالَ: نَهَى عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ »[2].

**واتە: عەلی باریقی دەڵێ: ئافرەتێک هات بۆ لام پرسیاری لێکردم، وتم ئەوە ئیبنو عومەرە ئەویش چوو بۆ لای و پرسیاری لێکرد، منیش شوێنی کەوتم بزانم چی دەڵێ، ئافرەتەکە وتی: لە بارەی پۆشینی حەریر فەتوام بۆ بدە؟ ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە پۆشینی.**

## باسی قەدەغەکردنی پۆشینی جلوبەرگی (الْقَسِّيَّة) (پۆشاکێکە زۆرینەی حەریرە)

**٥٣٠٩-** «عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِسَبْعٍ وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ نَهَانَا: عَنْ خَوَاتِيمِ الذَّهَبِ، وَعَنْ آنِيَةِ الْفِضَّةِ، وَعَنِ الْمَيَاثِرِ، وَالْقَسِّيَّةِ، وَالْإِسْتَبْرَقِ، وَالدِّيبَاجِ، وَالْحَرِيرِ»[3].

**واتە: بەڕائی کوڕی عازب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین بە حەوت شت، وە ڕێگری لێکردین لە حەوت شت: (ڕێگری لێ کردین) لە لەدەستکردنی زێڕ، وە لە خواردنەوە لە ناو قاپ و قاچاخی زیو، وە لە (الْمَيَاثِرِ) (ڕاخەرێکە لەسەر**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٣٩، ومسلم: ٢٠٦٦.




کورتانی ئەسپ یان پشتی وشتر دادەنرا، ئافرەتان دروستیان دەکرد بۆ مێردەکانیان، ڕەنگی سوور بوو لە حەریر دروست دەکرا، ئەوە پیشەی لووتبەرزەکان بوو)، وە لە (الْقَسِّيَّة) (کە جلێکە زۆرینەی حەریرە)، وە لە ئاوریشمی تەنک و ئاوریشمی ئەستورو حەریر.

## مۆڵەتدان بە پۆشینی حەریر

**٥٣١٠-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَرْخَصَ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَالزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ فِي قُمُصِ حَرِيرٍ مِنْ حِكَّةٍ كَانَتْ بِهِمَا»[١].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتیدا بە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و زوبەیری کوڕی عەوام لە پۆشینی کراسی حەریر بە هۆی ئەوەی جەستەیان دەخورا (تووشی خورشت بوو بوون).**

**٥٣١١-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَخَّصَ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَالزُّبَيْرِ فِي قُمُصِ حَرِيرٍ كَانَتْ بِهِمَا، يَعْنِي لِحِكَّةٍ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتیدا بە عەبدوڕڕەحمان و زوبەیر لە پۆشینی کراسی حەریر بەهۆی ئەوەی جەستەیان دەخورا.**

**٥٣١٢-** «عَنْ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، قَالَ: كُنَّا مَعَ عُتْبَةَ بْنِ فَرْقَدٍ فَجَاءَ كِتَابُ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا يَلْبَسُ الْحَرِيرَ إِلَّا مَنْ لَيْسَ لَهُ مِنْهُ شَيْءٌ فِي الْآخِرَةِ إِلَّا هَكَذَا وَقَالَ أَبُو عُثْمَانَ: بِأُصْبُعَيْهِ اللَّتَيْنِ تَلِيَانِ الْإِبْهَامَ، فَرَأَيْتُهُمَا أَزْرَارَ الطَّيَالِسَةِ حَتَّى رَأَيْتُ الطَّيَالِسَةَ»[٣].

**واتە: سولەیمانی تەیمی دەگێڕێتەوە، لە ئەبو عوسمانی نەهدیەوە دەڵێ: ئێمە لەگەڵ عوتبەی کوڕی فەرقەد بووین، نوسراوی عومەر ﷺ هات، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با هیچ کەس حەریر لەبەر نەکات مەگەر کەسێک لە دوارۆژدا هیچ بەشێکی بۆ نەبێ، تەنها بەم شێوە نەبێت، ئەبو عوسمان وتی: بە هەردوو پەنجەی کە**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩١٩ و ٢٩٢٢، ومسلم: ٢٤ و ٢٠٧٦/٢٦، وأبو داود: ٤٠٥٦، والترمذي: ١٧٢٢، وإبن ماجه: ٣٥٩٢.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٢٩ و ٥٨٣٠، ومسلم: ١٢ و ٢٠٦٩/١٤، وأبو داود: ٤٠٤٢، وإبن ماجه: ٢٨٢٠ و ٣٥٩٣.




لە تەنیشت پەنجە گەورەکەیەتی ئاماژەی پێکرد، هەردوو پەنجەیم بینی لە قەراغ جلێکی سەوز دابنابوو کەناو داران و دەسەڵاتداران دەیپۆشن.

**٥٣١٣-** «عَنْ سُوَيْدِ بن غَفَلَةَ عن عُمَرَ ، أَنَّهُ لَمْ يُرَخِّصْ فِي الدِّيبَاجِ إِلَّا مَوْضِعَ أَرْبَعِ أَصَابِعَ»[١].

واتە: سوەیدی کوڕی غەفەلە دەگێڕێتەوە، لە عومەرەوە ، ئەو مۆڵەتی نەدا بە بەکارهێنانی دیباج تەنها بە ئەندازەی چوار پەنجە نەبێت.

## پۆشینی جلوبەرگی (الْحُلَلِ):
## (ئەو پۆشاکەیە سەرتاپا دایدەپۆشێ)

**٥٣١٤-** «عَنِ الْبَرَاءِ  قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ مُتَرَجِّلاً لَمْ أَرَ قَبْلَهُ، وَلَا بَعْدَهُ أَحَداً هُوَ أَجْمَلُ مِنْهُ»[٢].

واتە: بەڕاء  دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی تاخمە جلێکی سوری پۆشی بوو، قژیشی شانە کردبوو، هەرگیز نە لە پێش ئەو نە لە دوای ئەو لەو جوانترم نەبینیوو.

## پۆشینی جلوبەرگی (الْحِبَرَةِ):
## (پۆشاکێکە لە لۆکە یان کەتان دروست دەکرێ خەتی سەوزی تێدایە)

**٥٣١٥-** «عَنْ أَنَسٍ  قَالَ: كَانَ أَحَبُّ الثِّيَابِ إِلَى نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ الْحِبَرَةَ»[٣].

واتە: ئەنەس  دەڵێ: خۆشەویسترین پۆشاک لای پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاکی حیبرە بووە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٦٩/١٥، والترمذي: ١٧٢١.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨١٢ و ٥٨١٣، ومسلم: ٢٠٧٩، وأبو داود: ٤٠٦٠، والترمذي: ١٧٨٧.





## باسی قەدەغەکردنی پۆشینی (الْمُعَصْفَرِ)[١]

**٥٣١٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ رَآهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَعَلَيْهِ ثَوْبَانِ مُعَصْفَرَانِ فَقَالَ: هَذِهِ ثِيَابُ الْكُفَّارِ فَلَا تَلْبَسْهَا»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بینی دوو پارچە جلی موعەصفەری لەبەردا بوو، فەرمووی: ئەمە جلی کافرانە لەبەری مەکە.**

**٥٣١٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ وَعَلَيْهِ ثَوْبَانِ مُعَصْفَرَانِ، فَغَضِبَ النَّبِيُّ ﷺ وَقَالَ: اذْهَبْ فَاطْرَحْهُمَا عَنْكَ، قَالَ: أَيْنَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: فِي النَّارِ»[٣].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دوو پارچە جلی موعەصفەری لەبەردا بوو. پێغەمبەر ﷺ توڕەبوو، فەرمووی: بڕۆ لەبەرتی دابکەنەو فڕێی بدە، وتی: فڕێی بدەمە کوێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ناو ئاگرەوە.**

**٥٣١٨-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ يَقُولُ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ، وَعَنْ لُبُوسِ الْقَسِّيِّ، وَالْمُعَصْفَرِ، وَقِرَاءَةِ الْقُرْآنِ وَأَنَا رَاكِعٌ»[٤].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردم لە لەدەستکردنی موستیلەی زێڕ، وە لە پۆشینی (الْقَسِّيِّ) (کە جلێکە زۆرینەی حەریرە)، وە لە پۆشینی جلی موعەصفەر، هەروەها لە ڕکوعدا قورئان بخوێنم.**

---

(١) پۆشاکێکی ڕەنگکراوە، جا موعەصفەر ڕووەکێکی هاوینەیە لە زەعفەران دەچێ، دەخرێتە ناو خواردنەوە، لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ جلوبەرگی پێ ڕەنگ دەکرا.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧ و ٢٠٧٧/٢٨.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٨٠ و ٢٠٧٨.




## پۆشینی پۆشاکی سەوز

**٥٣١٩-** «عَنْ أَبِي رِمْثَةَ ﷺ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَعَلَيْهِ ثَوْبَانِ أَخْضَرَانِ»[١].

**واتە: ئەبو ڕەمثە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەدەرەوە بۆ نێومان دوو پارچە پۆشاکێکی سەوزی لەبەردا بوو.**

## پۆشینی (بُرْدَة) (عەبایەکی خەت خەتە دەورو بەری چنراوە).

**٥٣٢٠-** «عَنْ خَبَّابِ بْنِ الْأَرَتِّ ﷺ قَالَ: شَكَوْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مُتَوَسِّدٌ بُرْدَةً لَهُ فِي ظِلِّ الْكَعْبَةِ، فَقُلْنَا: أَلَا تَسْتَنْصِرُ لَنَا؟ أَلَا تَدْعُو اللَّهَ لَنَا؟»[٢].

**واتە: خەبابی کوڕی ئەرەت ﷺ دەڵێ: سکاڵامان برد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ (چونکە بێبڕوایان ئەشکەنجەیان دەدان) ئەو لە سێبەری کەعبەدا پاڵی دابوویەوە عەباکەی کردبووە ژێر سەری، وتمان: ئایا داوای سەرکەوتنمان بۆ ناکەی؟ ئایا لای خوا نزامان بۆ ناکەی؟ (لە هاوبەشدانەران).**

**٥٣٢١-** «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ بِبُرْدَةٍ قَالَ سَهْلٌ: هَلْ تَدْرُونَ مَا الْبُرْدَةُ؟ قَالُوا: نَعَمْ، هَذِهِ الشَّمْلَةُ مَنْسُوجٌ فِي حَاشِيَتِهَا، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي نَسَجْتُ هَذِهِ بِيَدِي أَكْسُوكَهَا فَأَخَذَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُحْتَاجاً إِلَيْهَا، فَخَرَجَ إِلَيْنَا، وَإِنَّهَا لَإِزَارُهُ»[٣].

**واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: ئافرەتێک هات (بُرْدَة)یەکی پێ بوو، سەهل وتی: ئەزانن (بُرْدَة) چیە؟ وتیان: بەڵێ، ئەو عەبایەیە کە دوروبەری چنراوە، ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من ئەمەم بەدەستی خۆم چنیوە بیبەخشم پێت بۆ ئەوەی لەبەری بکەیت، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵیگرت و پێویستی پێی بوو، پاشان هاتە دەرەوە بۆ ناومان هەتا نێو قەدی دەهات.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٦١٢ و ٣٨٥٦ و ٦٩٤٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٧٧ و ٢٠٩٣ و ٥٨١٠ و ٦٠٣٦، وإبن ماجه: ٣٥٥٥.




## فەرمانکردن بە پۆشینی پۆشاکی سپی

**٥٣٢٢-** «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْبَسُوا مِنْ ثِيَابِكُمُ الْبَيَاضَ، فَإِنَّهَا أَطْهَرُ وَأَطْيَبُ، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ»[١].

**واتە: سەمورە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پۆشاکە سپیەکانتان بپۆشن، چونکە ئەوە پاکترو چاکترە، مردووەکانتانیشی پێ کفن بکەن.**

**٥٣٢٣-** «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: عَلَيْكُمْ بِالْبَيَاضِ مِنَ الثِّيَابِ فَلْيَلْبَسْهَا أَحْيَاؤُكُمْ، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ، فَإِنَّهَا مِنْ خَيْرِ ثِيَابِكُمْ»[٢].

**واتە: سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێویستە جلی سپی بەکاربهێنن، با زیندووەکانتان بیپۆشن، مردووەکانتانیشی پێ کفن بکەن، چونکە جلی سپی چاکترینی نێو جلەکانتانە.**

## پۆشینی جلوبەرگی (الأَقْبِيَة) (جۆرە پۆشاکێکە لە ئاوریشم)

**٥٣٢٤-** «عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ ﷺ قَالَ: قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَقْبِيَةً، وَلَمْ يُعْطِ مَخْرَمَةَ شَيْئاً، فَقَالَ مَخْرَمَةُ: يَا بُنَيَّ، انْطَلِقْ بِنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ، قَالَ: ادْخُلْ، فَادْعُهُ لِي، قَالَ: فَدَعَوْتُهُ، فَخَرَجَ إِلَيْهِ، وَعَلَيْهِ قَبَاءٌ مِنْهَا، فَقَالَ: خَبَأْتُ هَذَا لَكَ فَنَظَرَ إِلَيْهِ، فَلَبِسَهُ مَخْرَمَةُ»[٣].

**واتە: میسوەری کوڕی مەخرەمە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ جلوبەرگی ئەقبیەی دابەش کرد، هیچی نەبەخشی بە مەخرەمە، مەخرەمە وتی: ئەی کوڕە بچوکەکەم با بچین بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، منیش لەگەڵی ڕۆیشتم، وتی: بچۆ ژوورەوە، بانگی بکە بۆم، وتی: بانگم کرد، هاتەدەرەوە بۆ لای و پۆشاکێکی پێ بوو فەرمووی: ئەمەم بۆ تۆ هەڵگرتووە، ئەویش تەماشای کرد، ئینجا مەخرەمە لەبەریکرد.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٩٩ و ٢٦٥٧ و ٥٨٠٠ و ٥٨٦٢، ومسلم: ١٢٩ و ١٠٥٨/١٣٠، وأبو داود: ٤٠٢٨، والترمذي: ٢٨١٨.




## پۆشینی بیجامەو شەرواڵ لە ئیحرامدا

**٥٣٢٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ بِعَرَفَاتٍ فَقَالَ: مَنْ لَمْ يَجِدْ إِزَاراً فَلْيَلْبَسِ السَّرَاوِيلَ، وَمَنْ لَمْ يَجِدْ نَعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ»[١].

**واتە:** ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بوو لە عەرفات دەیفەرموو: هەرکەس ئیزاری نەبوو با بیجامەو شەرواڵ لە پێ بکات، هەرکەسیش نەعلی نەبوو با خوف لە پێ بکات. (إِزَار): (ئەو پارچە قوماشێکە خواری ناوکەوە پێدا دەپۆشرێ تا قاپە ڕەقە)

## هەڕەشە لە شۆڕبوونی دەرقاچە

**٥٣٢٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: بَيْنَا رَجُلٌ يَجُرُّ إِزَارَهُ مِنَ الْخُيَلَاءِ خُسِفَ بِهِ، فَهُوَ يَتَجَلْجَلُ فِي الْأَرْضِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»[٢].

**واتە:** عەبدوڵلای كوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە کاتێکدا پیاوێک لەبەر فیزو خۆبەزلزانین جلوبەرگی شۆڕکردووەو ڕایدەکێشا بە دوای خۆیدا، بە ناخی زەویدا ڕۆچێنرا، جا بەردەوام بە ناخی زەویدا ڕۆدەچێت هەتا ڕۆژی دوایی.

٥٣٢٧- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ أَوْ قَالَ: إِنَّ الَّذِي يَجُرُّ ثَوْبَهُ مِنَ الْخُيَلَاءِ لَمْ يَنْظُرِ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٣].

**واتە:** عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی جلوبەرگی بە دوای خۆی بخشێنێ لەبەر لووتبەرزی، خوا تەماشای ناکات لە ڕۆژی دواییدا.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧٩٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧٨٣ و ٥٧٩١، ومسلم: ٤٢ و ٢٠٨٥/٤٦، وأبو داود: ٤٠٩٤، والترمذي: ١٧٣٠ و ١٧٣١، وإبن ماجه: ٣٥٦٩ و ٣٥٧٦.




**٥٣٢٨-** «عَنِ ابْنِ عُمَر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ مِنْ مَخِيلَةٍ، فَإِنَّ اللَّهَ ﷻ لَمْ يَنْظُرْ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس جلوبەرگی بە دوای خۆی بخشێنێ لەبەر لووتبەرزی، ئەوە بێگومان خوا تەماشای ناکات لە ڕۆژی دواییدا.**

## جێگای دەرقاچەی جلوبەرگی بڕوادار (مەبەست پیاوانە نەک ئافرەتان)

**٥٣٢٩-** «عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَوْضِعُ الْإِزَارِ إِلَى أَنْصَافِ السَّاقَيْنِ وَالْعَضَلَةِ، فَإِنْ أَبَيْتَ فَأَسْفَلَ، فَإِنْ أَبَيْتَ فَمِنْ وَرَاءِ السَّاقِ، وَلَا حَقَّ لِلْكَعْبَيْنِ فِي الْإِزَارِ»[٢].

**واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شوێنی دەرقاچە هەتا نیوەی هەردوو قاچ و ماسولکەکەیە، ئەگەر نەتویست با لەخوارتر بێت، ئەگەر نەتویست با لەخوار قاچەوە بێت، با دەرقاچە قولەپێ نەپۆشێ.**

## ئەو جلوبەرگەی لەخوار قولەپێوەیە

**٥٣٣٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا تَحْتَ الْكَعْبَيْنِ مِنَ الْإِزَارِ فَفِي النَّارِ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو جل و بەرگەی لە خوار قولەپێوەیە لە ئاگردایە.**

**٥٣٣١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ مِنَ الْإِزَارِ فَفِي النَّارِ»[٤].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو جل و بەرگەی لە خوار قولەپێوەیە لە ئاگردایە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٧٨٣، وإبن ماجه: ٣٥٧٢.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧٨٧.





## درێژکردنی دەرقاچە

**٥٣٣٢-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ لَا يَنْظُرُ إِلَى مُسْبِلِ الْإِزَارِ»(١).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ تەماشای ئەو کەسە ناکات دەرقاچەکەی درێژو دەخشێ بەژێر پێیدا.**

**٥٣٣٣-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ ﷻ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: الْمَنَّانُ بِمَا أَعْطَى، وَالْمُسْبِلُ إِزَارَهُ، وَالْمُنَفِّقُ سَلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ»(٢).

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ کۆمەڵ هەن خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییدا نە قسەیان لەگەڵ دەکات و، نە پاکیان دەکاتەوەو سزایەکی بە ئێشیان بۆ هەیە: ئەو کەسەی کە منەت دەکات بەسەر خەڵکیدا بەوەی بەخشیویەتی، ئەوکەسەی کە دەرقاچەکەی درێژەو دەخشێ بەژێر پێیدا، ئەوکەسەی ماڵەکەی دەفرۆشێت و (ساغ دەکاتەوە) بە سوێندی درۆ.**

**٥٣٣٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْإِسْبَالُ فِي الْإِزَارِ، وَالْقَمِيصِ، وَالْعِمَامَةِ مَنْ جَرَّ مِنْهَا شَيْئاً خُيَلَاءَ لَا يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»(٣).

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: درێژ کردنەوە لە دەرقاچە و کراس و مێزەردا، هەرکەس شتێک لەوانە درێژ بکات لەبەر لووتبەرزی، خوا تەماشای ناکات لە ڕۆژی دواییدا.**

**٥٣٣٥-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ مِنَ الْخُيَلَاءِ لَا يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَحَدَ شِقَّيْ إِزَارِي يَسْتَرْخِي إِلَّا أَنْ أَتَعَاهَدَ ذَلِكَ مِنْهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّكَ لَسْتَ مِمَّنْ يَصْنَعُ ذَلِكَ خُيَلَاءَ»(٤).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٦٦٥ و ٥٧٨٤ و ٦٠٦٢، وأبو داود: ٤٠٨٥.




**واتە: سالم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس جلوبەرگی شۆڕ بکات لەبەر لووتبەرزی، خوا لە ڕۆژی دواییدا تەماشای ناکات، ئەبو بەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من لایەکی جلوبەرگەکەم شۆڕ دەبێتەوە، مەگەر هەمیشە ئاگام لێ بێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ لەوکەسانە نیت بە لووتبەرزی ئەو کارە بکەی.**

## دەرقاچەی ئافرەتان

**٥٣٣٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ مِنَ الْخُيَلَاءِ لَمْ يَنْظُرِ اللَّهُ إِلَيْهِ قَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَكَيْفَ تَصْنَعُ النِّسَاءُ بِذُيُولِهِنَّ؟ قَالَ: تُرْخِينَهُ شِبْراً قَالَتْ: إِذاً تَنْكَشِفَ أَقْدَامُهُنَّ؟ قَالَ: تُرْخِينَهُ ذِرَاعاً، لَا تَزِدْنَ عَلَيْهِ»[1].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس جلوبەرگی شۆڕ بکات لەبەر لووتبەرزی، خوا تەماشای ناکات، ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئافرەتان چی لە دەرقاچەکانیان بکەن؟ فەرمووی: بستێک شۆڕی بکەنەوە، وتی: ئەگەر قاچیان دەرکەوت؟ فەرمووی: باڵێک درێژی بکەنەوە، با لەوە زیاتری نەکەن.**

**٥٣٣٧-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا ذَكَرَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ ذُيُولَ النِّسَاءِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يُرْخِينَ شِبْراً، قَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: إِذاً يَنْكَشِفَ عَنْهَا، قَالَ: تُرْخِي ذِرَاعاً، لَا تَزِيدُ عَلَيْهِ»[2].

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو باسی دەرقاچەی ئافرەتانی کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بستێک شۆڕی بکەنەوە، ئوممو سەلەمە وتی: ئەگەر قاچیان دەرکەوت؟ فەرمووی: باڵێک درێژی بکەنەوە، با لەوە زیاتری نەکەن.**

**٥٣٣٨-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمَّا ذُكِرَ فِي الْإِزَارِ مَا ذُكِرَ، قَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: فَكَيْفَ بِالنِّسَاءِ؟ قَالَ: يُرْخِينَ شِبْراً. قَالَتْ: إِذاً تَبْدُو أَقْدَامُهُنَّ، قَالَ: فَذِرَاعاً، لَا يَزِدْنَ عَلَيْهِ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١١٩، وإبن ماجه: ٣٥٨١.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١١٧ و ٤١١٨، وإبن ماجه: ٣٥٨٠.

(٣) صحيح.




واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە بارەی دەرقاچەوە قسەی کرد، ئوممو سەلەمە وتی: ئەی بۆ ئافرەتان چۆنە؟ فەرمووی: بستێک شۆڕی بکەنەوە، وتی: ئەگەر قاچیان دەرکەوت؟ فەرمووی: باڵێک، با لەوە زیاتری نەکەن.

**٥٣٣٩-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَمْ تَجُرُّ الْمَرْأَةُ مِنْ ذَيْلِهَا؟ قَالَ: شِبْراً، قَالَتْ: إِذاً يَنْكَشِفَ عَنْهَا، قَالَ: ذِرَاعٌ، لَا تَزِيدُ عَلَيْهَا»[١].

واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئافرەت تا چەند دەرقاچەی درێژ بکات؟ فەرمووی: بستێک، وتی: ئەگەر قاچیان دەرکەوت؟ فەرمووی: باڵێک، با لەوە زیاتری نەکات.

## قەدەغەکردنی لەبەرکردنی جل و بەرگێک داخراو بێت نەتوانێ دەستی لێیەوە دەربکات

**٥٣٤٠-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رضي الله عنه قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ اشْتِمَالِ الصَّمَّاءِ، وَأَنْ يَحْتَبِيَ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ لَيْسَ عَلَى فَرْجِهِ مِنْهُ شَيْءٌ»[٢].

واتە: ئەبو سەعید رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لە پۆشینی جل و بەرگێک داخراو بێت نەتوانێ دەستی لێیەوە دەربکات، هەروەها دابنیشێ لەسەر سمتی و هەردوو قاچی بچەقێنێ، بەیەک پۆشاکەوە هیچ لەو پۆشاکە بەسەر شەرمگاو عەورەتیەوە نەبێت.

**٥٣٤١-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ اشْتِمَالِ الصَّمَّاءِ، وَأَنْ يَحْتَبِيَ الرَّجُلُ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ لَيْسَ عَلَى فَرْجِهِ مِنْهُ شَيْءٌ»[٣].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لە پۆشینی جلوبەرگێک داخراو بێت نەتوانێ دەستی لێیەوە دەربکات، هەروەها دابنیشێ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

لەسەر سمتی و هەردوو قاچی بچەقێنێ، بە یەک پۆشاکەوە هیچ لەو پۆشاکە بەسەر شەرمگاو عەورەتیەوە نەبێت.

## قەدەغەکردن لە دانیشتن لەسەر سمتی و هەردوو قاچی بچەقێنێ، بەیەک پۆشاکەوە هیچ لەو پۆشاکە بەسەر شەرمگاو عەورەتیەوە نەبێت

**٥٣٤٢-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ اشْتِمَالِ الصَّمَّاءِ، وَأَنْ يَحْتَبِيَ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ»[١].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لە پۆشینی جلوبەرگێک داخراو بێت نەتوانێ دەستی لێیەوە دەربکات، هەروەها دابنیشێ لەسەر سمتی و هەردوو قاچی بچەقێنێ، بە یەک پۆشاکەوە (هیچ لەو پۆشاکە بەسەر شەرمگاو عەورەتیەوە نەبێت).

## پۆشینی مێزەری ڕەشی قەترانی

**٥٣٤٣-** «عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ عِمَامَةً حَرْقَانِيَّةً»[٢].

واتە: جەعفەری کوڕی عەمڕی کوڕی حورەیث دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی مێزەرێکی ڕەشی قەترانی لە سەردا بوو.

## پۆشینی مێزەری ڕەش

**٥٣٤٤-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ بِغَيْرِ إِحْرَامٍ»[٣].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە نێو مەککە لە ڕۆژی ڕزگارکردنیدا، مێزەرێکی ڕەش لە سەریدا بوو بەبێ ئیحرام.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٠ و ٢٠٩٩/٧٤، وأبو داود: ٤٠٨١ و ٤١٣٧ و ٤٨٦٥، والترمذي: ٢٧٦٦ و ٢٧٦٧.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**٥٣٤٥-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ الْفَتْحِ، وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ»[١].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چووە نێو مەککە لە ڕۆژی ڕزگارکردنیدا، وە مێزەرێکی ڕەش لە سەریدا بوو.**

## شۆڕکردنەوەی لایەکی مێزەر بە نێوان هەردوو شاندا

**٥٣٤٦-** «عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَأَنِّي أَنْظُرُ السَّاعَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ قَدْ أَرْخَى طَرَفَهَا بَيْنَ كَتِفَيْهِ»[٢].

**واتە: جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی ئومەیە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: هەر وەکو ئەوە وایە ئێستا تەماشای ئەو کاتە بکەم کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر بوو، مێزەرێکی ڕەشی لەسەردا بوو، تەنیشتی مێزەرەکەی شۆڕ کردبووەوە لە نێوان هەردوو شانیدا.**

## (دەربارەی) وێنەکان

**٥٣٤٧-** «عَنْ أَبِي طَلْحَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَا تَدْخُلُ الْمَلَائِكَةُ بَيْتاً فِيهِ كَلْبٌ، وَلَا صُورَةٌ»[٣].

**واتە: ئەبو طەڵحە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: فریشتە ناچێتە هیچ ماڵێکەوە سەگی تێدا بێت هەروەها وێنەیش.**

**٥٣٤٨-** «عَنْ أَبِي طَلْحَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا تَدْخُلُ الْمَلَائِكَةُ بَيْتاً فِيهِ كَلْبٌ، وَلَا صُورَةُ تَمَاثِيلَ»[٤].

**واتە: ئەبو طەڵحە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: فریشتە ناچێتە هیچ ماڵێکەوە سەگی تێدا بێت هەروەها پەیکەریش.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٥٢ و ١٣٥٩/٤٥٣، وأبو داود: ٤٠٧٧، وإبن ماجه: ١١٠٤ و ٢٨٢١ و ٣٥٨٤ و ٣٥٧٨.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**٥٣٤٩-** «عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى أَبِي طَلْحَةَ الْأَنْصَارِيِّ يَعُودُهُ، فَوَجَدَ عِنْدَهُ سَهْلَ بْنَ حُنَيْفٍ، فَأَمَرَ أَبُو طَلْحَةَ إِنْسَاناً يَنْزَعُ نَمَطاً تَحْتَهُ، فَقَالَ لَهُ سَهْلٌ: لِمَ تَنْزِعُ؟ قَالَ: لِأَنَّ فِيهِ تَصَاوِيرُ، وَقَدْ قَالَ فِيهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَا قَدْ عَلِمْتَ، قَالَ: أَلَمْ يَقُلْ، إِلَّا مَا كَانَ رَقْماً فِي ثَوْبٍ؟ قَالَ: بَلَى، وَلَكِنَّهُ أَطْيَبُ لِنَفْسِي»[1].

**واتە: عوبێدوڵلای کوڕی عەبدوڵلا دەگێڕێتەوە: ئەو چوو بۆ لای ئەبو طەڵحەی ئەنصاری سەردانی کرد، بینی سەهلی کوڕی حونەیف لایەتی، ئەبو طەڵحە فەرمانی کرد بە یەکێک ئەو ڕاخەرەی ژێری کە لە سووف دروستکراوە لایببات، سەهل پێی وت: بۆچی لایدەبەیت؟ وتی: چونکە وێنەی تێدایە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەیەوە فەرموویەتی وەک خۆت دەیزانی، وتی: ئایا نەیفەرمووە جگە لەو نەخشە نەبێت لەناو جل و بەرگدایە؟ وتی: بەڵێ، بەڵام ئەوە بۆ نەفسی من باشترە.**

**٥٣٥٠-** «عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ، عَنْ أَبِي طَلْحَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا تَدْخُلُ الْمَلَائِكَةُ بَيْتاً فِيهِ صُورَةٌ قَالَ بُسْرٌ: ثُمَّ اشْتَكَى زَيْدٌ، فَعُدْنَاهُ، فَإِذَا عَلَى بَابِهِ سِتْرٌ فِيهِ صُورَةٌ، قُلْتُ لِعُبَيْدِ اللَّهِ الْخَوْلَانِيِّ: أَلَمْ يُخْبِرْنَا زَيْدٌ عَنِ الصُّورَةِ يَوْمَ الْأَوَّلِ؟ قَالَ: قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: أَلَمْ تَسْمَعْهُ يَقُولُ: إِلَّا رَقْماً فِي ثَوْبٍ»[2].

**واتە: بوسری کوڕی سەعید دەگێڕێتەوە، لە زەیدی کوڕی خالد، لە ئەبو طەڵحەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فریشتە ناچێتە هیچ ماڵێکەوە وێنەی تێدا بێت، بوسر دەڵێ: پاشان زەید نەخۆش کەوت، سەردانیمان کرد، لەسەر دەرگاکەی پەردەیەک هەبوو وێنەی تێدا بوو، بە عوبەیدوڵلای خەولانیم وت: ئایا زەید یەکەم ڕۆژ هەواڵی پێ نەداین دەربارەی وێنە؟ وتی: عوبەیدوڵلا وتی: ئایا نەتبیست دەیوت: جگە لەو نەخشە نەبێت لە ناو جل و بەرگدایە.**

**٥٣٥١-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: صَنَعْتُ طَعَاماً، فَدَعَوْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَجَاءَ، فَدَخَلَ فَرَأَى سِتْراً فِيهِ تَصَاوِيرُ فَخَرَجَ وَقَالَ: إِنَّ الْمَلَائِكَةَ لَا تَدْخُلُ بَيْتاً فِيهِ تَصَاوِيرُ»[3].

---

**(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٧٥٠.**

**(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٢٦ و ٥٩٥٨، ومسلم: ٨٥ و ٢١٠٦/٨٦، وأبو داود: ٤١٥٣ و ٤١٥٤ و ٤١٥٥.**

**(٣) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٣٣٥٩.**




واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: خواردنێکم دروستکرد، پێغەمبەرم ﷺ بانگهێشت کردو هات، کە هاتە ژوورەوە پەردەیەکی بینی وێنەی تێدا بوو، دواتر چووە دەرەوەو فەرمووی: فریشتە ناچێتە هیچ ماڵێکەوە وێنەی تێدا بێت.

**٥٣٥٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَرْجَةً، ثُمَّ دَخَلَ وَقَدْ عَلَّقْتُ قِرَاماً فِيهِ الْخَيْلُ أُولاَتُ الأَجْنِحَةِ، قَالَتْ: فَلَمَّا رَآهُ قَالَ: انْزِعِيهِ»[1].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچو بە دەرچوونێک پاشان گەڕایەوە، قوماشێکی ڕەنگاو ڕەنگم هەڵواسیبوو وێنەی ئەسپی باڵداری تێدا بوو، عائیشە وتی: کاتێ پێغەمبەر ﷺ بینی: فەرمووی: لایبە.

**٥٣٥٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَانَ لَنَا سِتْرٌ فِيهِ تِمْثَالُ طَيْرٍ مُسْتَقْبِلَ الْبَيْتِ إِذَا دَخَلَ الدَّاخِلُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا عَائِشَةُ، حَوِّلِيهِ، فَإِنِّي كُلَّمَا دَخَلْتُ فَرَأَيْتُهُ ذَكَرْتُ الدُّنْيَا قَالَتْ: وَكَانَ لَنَا قَطِيفَةٌ لَهَا عَلَمٌ فَكُنَّا نَلْبَسُهَا فَلَمْ نَقْطَعْهُ»[2].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پەردەیەکمان هەبوو وێنەی باڵندەی تێدا بوو، ڕووی لە نێو ماڵ بوو کاتێک کەسێک بهاتایەتە ژوورەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی عائیشە جێگاکەی بگۆڕە، من هەرکاتێک دێمە ژوورەوەو دەیبینم بیر لە دنیا دەکەمەوە، وتی: پارچە قەیفەیەکمان هەبوو نیشانەی تێدا بوو ئێمە دەمانپۆشی و نەمان دەبڕی.

**٥٣٥٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ فِي بَيْتِي ثَوْبٌ فِيهِ تَصَاوِيرُ، فَجَعَلْتُهُ إِلَى سَهْوَةٍ فِي الْبَيْتِ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي إِلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: يَا عَائِشَةُ، أَخِّرِيهِ عَنِّي فَنَزَعْتُهُ فَجَعَلْتُهُ وَسَائِدَ»[3].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لە ماڵەکەمدا پارچە قوماشێک هەبوو وێنەی تێدا بوو، منیش کردمە پەردە بۆ تاقی ژوورەکەمان، کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی تێدا دەکرد، پاشان فەرمووی: ئەی عائیشە دووری بخەرەوە لێم، منیش لام بردو کردم بە سەرین.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٥٥، ومسلم: ٢١٠٧/٩٠.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٨ و ٢١٠٧، والترمذي: ٢٤٦٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٥٤، ومسلم: ٢١٠٧.




**٥٣٥٥-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا نَصَبَتْ سِتْراً فِيهِ تَصَاوِيرُ، فَدَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَنَزَعَهُ، فَقَطَعَتْهُ وِسَادَتَيْنِ قَالَ رَجُلٌ فِي الْمَجْلِسِ حِينَئِذٍ يُقَالُ لَهُ: رَبِيعَةُ بْنُ عَطَاءٍ: أَنَا سَمِعْتُ أَبَا مُحَمَّدٍ يَعْنِي الْقَاسِمَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَرْتَفِقُ عَلَيْهِمَا»[١].

**واتە:** عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: ئەو پەردەیەکی دانا وێنەی تێدا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە لایبرد، دواتر کردی بە دوو سەرین. پیاوێک ئەو کاتە لە مەجلیسەکەدا پێی دەوترا: ڕەبیعەی کوڕی عەطاء وتی: من گوێم لە ئەبو موحەممەدی قاسم بوو گێڕایەوە، لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پاڵیدەدا پێیانەوە.

## باسی ئەو کەسەی سەخترین سزای بۆ هەیە

**٥٣٥٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ سَفَرٍ، وَقَدْ سَتَّرْتُ بِقِرَامٍ عَلَى سَهْوَةٍ لِي، فِيهِ تَصَاوِيرُ، فَنَزَعَهُ وَقَالَ: أَشَدُّ النَّاسِ عَذَاباً يَوْمَ الْقِيَامَةِ الَّذِينَ يُضَاهُونَ بِخَلْقِ اللَّهِ»[٢].

**واتە:** عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتێک هاتەوە، منیش پەردەیەکم بە قوماشێکی ڕەنگاو ڕەنگ دروستکردبوو وێنەی تێدابوو کردم بە پەردە بۆ ژوورەکەم، دواتر پێغەمبەر ﷺ لای بردو فەرمووی: سەخترین سزا بۆ کەسانێکە لە ڕۆژی دواییدا کە لاسایی خوا دەکەنەوە لە دروستکردندا.

**٥٣٥٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَقَدْ سَتَّرْتُ بِقِرَامٍ فِيهِ تَمَاثِيلُ، فَلَمَّا رَآهُ تَلَوَّنَ وَجْهُهُ، ثُمَّ هَتَكَهُ بِيَدِهِ وَقَالَ: إِنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَذَاباً يَوْمَ الْقِيَامَةِ الَّذِينَ يُشَبِّهُونَ بِخَلْقِ اللَّهِ»[٣].

**واتە:** عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لام پەردەیەکم بە قوماشێکی ڕەنگاو ڕەنگ دروست کردبوو پەیکەری تێدا بوو، کاتێ بینی ڕەنگی گۆڕا، پاشان بەدەستی دڕاندی، فەرمووی: بە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٠٩، ومسلم: ٢١٠٧/٩١.





ڕاستی سەختترین سزا بۆ کەسانێکە لە ڕۆژی دواییدا کە لاسایی خوا دەکەنەوە لە دروستکردندا.

## باسی داواکردن لەو کەسانەی وێنە دەکێشن لە ڕۆژی دواییدا ڕۆح بکەن بەبەریدا

**٥٣٥٨-** «عَنِ النَّضْرِ بْنِ أَنَسٍ قَالَ: كُنْتُ جَالِساً عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَتَاهُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ، فَقَالَ: إِنِّي أُصَوِّرُ هَذِهِ التَّصَاوِيرَ، فَمَا تَقُولُ فِيهَا؟ فَقَالَ: ادْنُهْ ادْنُهْ، سَمِعْتُ مُحَمَّداً ﷺ يَقُولُ: مَنْ صَوَّرَ صُورَةً فِي الدُّنْيَا كُلِّفَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنْ يَنْفُخَ فِيهَا الرُّوحَ، وَلَيْسَ بِنَافِخِهِ»[١].

**واتە: نەضری کوڕی ئەنەس دەڵێ: من لای ئیبنو عەبباس دانیشتبووم، پیاوێک لە خەڵکی عێراق هات بۆ لای، وتی: من ئەم وێنانە دەکێشم، تۆ چی دەڵێی دەربارەیان؟ وتی: نزیکی بکەرەوە نزیکی بکەرەوە، گوێم لە موحەممەد ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس وێنەیەک بکێشێت لە دنیادا لە ڕۆژی قیامەتدا داوای لێدەکرێ ڕۆح بکات بە بەریدا، ناشتوانێ ڕۆح بکات بە بەریدا.**

**٥٣٥٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ صَوَّرَ صُورَةً عُذِّبَ حَتَّى يَنْفُخَ فِيهَا الرُّوحَ، وَلَيْسَ بِنَافِخٍ فِيهَا»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس وێنەیەک بکێشێ سزا دەدرێت هەتا ڕۆح دەکات بە بەریدا، ناشتوانێت ڕۆح بکات بە بەریدا.**

**٥٣٦٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ صَوَّرَ صُورَةً كُلِّفَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنْ يَنْفُخَ فِيهَا الرُّوحَ، وَلَيْسَ بِنَافِخٍ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس وێنەیەک بکێشێ لە ڕۆژی دواییدا داوای لێدەکرێ ڕۆح بکات بە بەریدا، ناشتوانێت ڕۆح بکات بە بەریدا.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٦٣ و ٧٠٤٢، ومسلم: ٢١١٠/١٠٠، وأبو داود: ٥٠٢٤، والترمذي: ١٧٥١ و ٢٢٨٣.

(٣) صحيح. أخرجه علقه البخاري إثر ٧٠٤٢.




**٥٣٦١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِنَّ أَصْحَابَ هَذِهِ الصُّوَرِ الَّذِينَ يَصْنَعُونَهَا يُعَذَّبُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُقَالُ لَهُمْ: أَحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خاوەنی ئەم وێنانەی کە دروستیان کردوە، لە ڕۆژی دواییدا سزا دەدرێن، پێیان دەوترێ: ئەوەی دروستان کرد زیندووی بکەنەوە.**

**٥٣٦٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ أَصْحَابَ هَذِهِ الصُّوَرِ يُعَذَّبُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَيُقَالُ لَهُمْ: أَحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خاوەنی ئەم وێنانە سزا دەدرێن لە ڕۆژی دواییدا، پێیان دەوترێ: ئەوەی دروستان کرد زیندووی بکەنەوە.**

**٥٣٦٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: إِنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَذَاباً يَوْمَ الْقِيَامَةِ الَّذِينَ يُضَاهُونَ اللَّهَ فِي خَلْقِهِ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: بەڕاستی سەختترین سزا بۆ کەسانێکە لە ڕۆژی دواییدا کە لاسایی خوا دەکەنەوە لە دروستکردندا.**

## باسی ئەو کەسەی سەخترین سزای بۆ هەیە لە ڕۆژی دواییدا

**٥٣٦٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ مِنْ أَشَدِّ النَّاسِ عَذَاباً يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْمُصَوِّرُونَ»[٤].

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سەختترین سزا بۆ کەسانێکە لە ڕۆژی دواییدا وێنە دەکێشن.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٥١ و ٧٥٥٨، ومسلم: ٢١٠٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٠٥ و ٣٢٢٤ و ٥١٨١ و ٥٩٦١ و ٧٥٥٧، ومسلم: ٢١٠٧/٩٦، وإبن ماجه: ٢١٥١.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٥٠، ومسلم: ٢١٠٩.




**٥٣٦٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: اسْتَأْذَنَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: ادْخُلْ فَقَالَ: كَيْفَ أَدْخُلُ وَفِي بَيْتِكَ سِتْرٌ فِيهِ تَصَاوِيرُ، فَإِمَّا أَنْ تُقْطَعَ رُءُوسُهَا، أَوْ تُجْعَلَ بِسَاطاً يُوطَأُ فَإِنَّا مَعْشَرَ الْمَلَائِكَةِ لَا نَدْخُلُ بَيْتاً فِيهِ تَصَاوِيرُ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: جبریل داوای مۆڵەتی هاتنە ماڵەوەی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، فەرمووی: وەرە ژوورەوە، وتی: چۆن بێمە ژوورەوە لە ماڵەکەتدا پەردەیەک هەیە وێنەی تێدایە، یان با سەری لێ بکرێتەوە، یان بکرێ بە ڕاخەرێک ڕابخرێ، چونکە ئێمەی کۆمەڵەی فریشتە ناچینە هیچ ماڵێکەوە وێنەی تێدا بێت.**

## لێفــەکان

**٥٣٦٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يُصَلِّي فِي لُحُفِنَا»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نەدەکرد بە لێفەکانمانەوە.**

## چۆنیەتی نەعلی پێغەمبەری خوا ﷺ

**٥٣٦٧-** «عن أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ نَعْلَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَانَ لَهَا قِبَالَانِ»[٣].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: نەعلەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو خەتی هەبوو، (زانایان باسی هەردوو خەتەکەیان کردوە یەکێکیان لە نێوان پەنجە گەورەکەی و ئەوەی تەنیشتی بوو، ئەویتریان لە نێوان پەنجەی نێوەڕاست و پەنجەی تەنیشت پەنجە گەورە بووە).**

**٥٣٦٨-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ أَوْسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ لِنَعْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قِبَالَانِ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١٥٨، والترمذي: ٢٨٠٦.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٦٧ و ٦٤٥، والترمذي: ٦٠٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٥٧، وأبو داود: ٤١٣٤، والترمذي: ١٧٧٢ و ١٧٧٣، وإبن ماجه: ٣٦١٥.

(٤) صحيح لغيره.




واتە: عەمری کوڕی ئەوس ﷺ دەڵێ: نەعلەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو خەتی هەبوو، (زانایان باسی هەردوو خەتەکەیان کردوە یەکێکیان لە نێوان پەنجە گەورەکەی و ئەوەی تەنیشتی بوو، ئەوی تریان لە نێوان پەنجەی ناوەڕاست و پەنجەی تەنیشت پەنجە گەورە بووە).

## باسی قەدەغەکردن لە ڕێکردن بە یەک نەعلەوە

**٥٣٦٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا انْقَطَعَ شِسْعُ نَعْلِ أَحَدِكُمْ، فَلَا يَمْشِ فِي نَعْلٍ وَاحِدَةٍ حَتَّى يُصْلِحَهَا»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خەتی نەعلی یەکێکتان بڕا با بەیەک تاک نەعلەکەی ڕێ نەکات هەتا چاکی دەکاتەوە.

**٥٣٧٠-** «عَنْ أَبِي رَزِينٍ قَالَ: رَأَيْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَضْرِبُ بِيَدِهِ عَلَى جَبْهَتِهِ يَقُولُ: يَا أَهْلَ الْعِرَاقِ تَزْعُمُونَ أَنِّي أَكْذِبُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَشْهَدُ لَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِذَا انْقَطَعَ شِسْعُ نَعْلِ أَحَدِكُمْ، فَلَا يَمْشِ فِي الْأُخْرَى حَتَّى يُصْلِحَهَا»[2].

واتە: ئەبو ڕەزین دەڵێ: ئەبو هورەیرەم ﷺ بینی بە دەستی دەیدا لەناو چاوانی، دەیوت: ئەی خەڵکی عێراق وا گومان دەبەن من درۆ بەدەم پێغەمبەری خواوە ﷺ دەکەم، شایەتی دەدەم گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ئەگەر قەیتانی نەعلی یەکێکتان بڕا با بە یەک تاک نەعلەکەی ڕێ نەکات هەتا چاکی دەکاتەوە.

## ئەوەی هاتووە لە بارەی ئەو ڕاخەرانەی کە لە کەوڵ دروست دەکرێن

**٥٣٧١-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اضْطَجَعَ عَلَى نَطْعٍ، فَعَرِقَ، فَقَامَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ إِلَى عَرَقِهِ فَنَشَّفَتْهُ، فَجَعَلَتْهُ فِي قَارُورَةٍ، فَرَآهَا النَّبِيُّ ﷺ قَالَ: مَا هَذَا الَّذِي تَصْنَعِينَ يَا أُمَّ سُلَيْمٍ؟ قَالَتْ: أَجْعَلُ عَرَقَكَ فِي طِيبِي، فَضَحِكَ النَّبِيُّ ﷺ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٩٨.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٩٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٢٨١، ومسلم: ٨٣ و ٢٣٣١/٨٤.




واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لەسەر کەوڵێک پاڵ کەوت ئارەقی کرد، دایکی سولەیم هەڵسا ئارەقەکەی گوشی، خستیە ناو قاپێکەوە، پێغەمبەر ﷺ بینی فەرمووی: ئەمە چیە دروستی دەکەی ئەی دایکی سولەیم؟ وتی: ئارەقەکەی تۆ دەکەمە ناو بۆنە خۆشەکەمەوە، پێغەمبەر ﷺ پێکەنی.

## ڕاگرتنی خزمەتکارێک، وڵاخێکێک بۆ سوار بوون

**٥٣٧٢-** «عَنْ سَمُرَةَ بْنِ سَهْمٍ رَجُلٍ مِنْ قَوْمِهِ قَالَ: نَزَلْتُ عَلَى أَبِي هَاشِمِ بْنِ عُتْبَةَ ﷺ وَهُوَ طَعِينٌ، فَأَتَاهُ مُعَاوِيَةُ يَعُودُهُ فَبَكَى أَبُو هَاشِمٍ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: مَا يُبْكِيكَ، أَوَجَعٌ يُشْئِزُكَ، أَمْ عَلَى الدُّنْيَا فَقَدْ ذَهَبَ صَفْوُهَا؟ قَالَ: كُلٌّ لَا، وَلَكِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَهِدَ إِلَيَّ عَهْداً، وَدِدْتُ أَنِّي كُنْتُ تَبِعْتُهُ، قَالَ: إِنَّهُ لَعَلَّكَ تُدْرِكُ أَمْوَالاً تُقْسَمُ بَيْنَ أَقْوَامٍ، وَإِنَّمَا يَكْفِيكَ مِنْ ذَلِكَ خَادِمٌ، وَمَرْكَبٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَأَدْرَكْتُ فَجَمَعْتُ»[١].

واتە: سەمورەی کوڕی سەهم دەگێڕێتەوە، پیاوێک لە قەومەکەی وتی: ڕۆیشتم بۆ لای ئەبو هاشمی کوڕی عوتبە ﷺ ئەو بریندار بوو، موعاویە هات بۆ لای سەردانی کرد، ئەبو هاشم گریا، موعاویە وتی: چی دەتگرێنێ؟ ئایا ئازارێک بێتاقەتی کردووی، یان بۆ دنیا دەگری کە خۆشیەکەی ڕۆیی؟ وتی: بۆ هیچ کام لەوانە ناگریم ئەوە نەبێ پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانێکی لێوەرگرتم حەزم دەکرد جێبەجێم بکردایە، وتی: بێگومان پێدەچێ بگەیت بەماڵ و سامانێک دابەش بکرێت لە نێوان خەڵکێکدا، تەنها لەو ماڵ و سامانە خزمەتکارێک و وڵاخێک بەسە لە پێناوی خوادا بەکاربیهێنی، منیش پێی گەیشتم و کۆمکردەوە.

## ڕازاندنەوەی شمشێر

**٥٣٧٣-** «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلٍ ﷺ قَالَ: كَانَتْ قَبِيعَةُ سَيْفِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ فِضَّةٍ»[٢].

واتە: ئەبو ئومامەی کوڕی سەهل ﷺ دەڵێ: سمێڵی شمشێرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە زیو بووە. (واتە: سەری دەسکی شمشێرەکە کە لەسەر شێوەی سمێڵە).

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٣٢٧، وإبن ماجه: ٤١٠٣.

(٢) صحيح.

**٥٣٧٤-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ نَعْلُ سَيْفِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ فِضَّةٍ، وَقَبِيعَةُ سَيْفِهِ فِضَّةٌ، وَمَا بَيْنَ ذَلِكَ حِلَقُ فِضَّةٍ»[١].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئەو پارچە ئاسنەی لەسەر كیفی شمشێرەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە زیو بوو، هەروەها سمێڵی شمشێرەكەیشی لە زیو بووە، لە نێوان ئەوەدا ئەڵقەیەكی زیو بوو.**

**٥٣٧٥-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي الْحَسَنِ ﷺ قَالَ: كَانَتْ قَبِيعَةُ سَيْفِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ فِضَّةٍ»[٢].

**واتە: سەعیدی كوڕی ئەبو حەسەن دەڵێ: سمێڵی (یان سەری دەسكی) شمشێرەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە زیو بووە.**

## قەدەغە كردن لە دانیشتن لەسەر ئەو ڕاخەرەی كە دەخرێتە سەر كورتان لە ئەرجوانەیە (كە گوڵێكی سوری تۆخە).

**٥٣٧٦-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قُلِ اللَّهُمَّ سَدِّدْنِي وَاهْدِنِي، وَنَهَانِي عَنِ الْجُلُوسِ عَلَى الْمَيَاثِرِ، وَالْمَيَاثِرُ قَسِّيٌّ كَانَتْ تَصْنَعُهُ النِّسَاءُ لِبُعُولَتِهِنَّ عَلَى الرَّحْلِ كَالْقَطَائِفِ مِنَ الْأُرْجُوَانِ»[٣].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: بڵێ خوایە یارمەتیم بدەی حەق و ڕاستی بپێكم، وە ڕێنمایم بكەیت، هەروەها ڕێگری لێكردم لە دانیشتن لەسەر (الْمَيَاثِر)، وە (الْمَيَاثِر) ڕاخەرێک بوو ئافرەتان دروستیان دەكرد بۆ مێردەكانیان بۆ سەر كورتانی وڵاخ وەكو قەدیفە وابوو لە ئەرجوان (كە گوڵێكی سوری تۆخە).**

## دانیشتن لەسەر كورسی

**٥٣٧٧-** «عَنْ أَبِي رِفَاعَةَ ﷺ قَالَ: انْتَهَيْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يَخْطُبُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، رَجُلٌ غَرِيبٌ جَاءَ يَسْأَلُ عَنْ دِينِهِ، لَا يَدْرِي مَا دِينُهُ، فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَتَرَكَ خُطْبَتَهُ حَتَّى

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٥٨٣ و ٢٥٨٥، والترمذي: ١٦٩١.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٥٨٤.

(٣) صحيح.





انْتَهَى إِلَيَّ، فَأُتِيَ بِكُرْسِيٍّ خِلْتُ قَوَائِمَهُ حَدِيداً، فَقَعَدَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَجَعَلَ يُعَلِّمُنِي مِمَّا عَلَّمَهُ اللَّهُ ثُمَّ أَتَى خُطْبَتَهُ فَأَتَمَّهَا»[١].

واتە: ئەبو ریفاعە ﷺ دەڵێ: گەیشتم بە پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پیاوێکی نەناسراو هاتووە پرسیار لە بارەی ئاینەکەیەوە دەکات، نازانێ ئاینەکەی چیە (مەبەستی خۆی بووە)، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی تێم کردو وازی لە وتارەکەی هێنا هەتا گەیشتە لام، کورسیەکیان بۆ هێنا پێم وابوو قاچەکانی ئاسن بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری دانیشت، ئەوەی خوا فێری کردبوو فێری کردم، پاشان ڕۆیشت وتارەکەی تەواو کرد.

## دانانی دەواری سور

**٥٣٧٨-** «عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِالْبَطْحَاءِ وَهُوَ فِي قُبَّةٍ حَمْرَاءَ، وَعِنْدَهُ أُنَاسٌ يَسِيرُ، فَجَاءَهُ بِلَالٌ فَأَذَّنَ، فَجَعَلَ يُتْبِعُ فَاهُ هَاهُنَا وَهَاهُنَا»[٢].

واتە: ئەبو جوحەیفە ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە جێگایەکی نەرمی فراوان بووین (لم و زیخی تێدایە بۆ پشوودان گونجاو بوو) ئەویش لە ناو دەوارێکدا بوو لە پێستە (دروست کرابوو)، ڕووپۆش کرابوو بە سور، خەڵکێکی کەم لە دەوروبەری بوو، بیلالیش هات بانگیدا، (لە کاتی بانگدا) دەمی بەملاو بەو لادا دەبرد.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٧٦.

(٢) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٧١١.




## فەزڵ و چاکەی حاکمی دادپەروەر لە حوکم و بڕیاریدا

**٥٣٧٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ الْمُقْسِطِينَ عِنْدَ اللَّهِ تَعَالَى عَلَى مَنَابِرَ مِنْ نُورٍ، عَلَى يَمِينِ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَعْدِلُونَ فِي حُكْمِهِمْ وَأَهْلِيهِمْ وَمَا وَلُوا»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی دادپەروەران لای خوا لەسەر مینبەری نوورینن، لە لای ڕاستی خوای بە ڕەحمن ئەوانەی دادپەروەرن لە حوکم و بڕیاریاندا، وە لە خانەوادەیاندا، ئەوەشی لە ژێر دەستیاندایە.**

## ئیمام و پێشەوای دادپەروەر

**٥٣٨٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ ﷻ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ: إِمَامٌ عَادِلٌ، وَشَابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ اللَّهِ ﷻ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ فِي خَلَاءٍ فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، وَرَجُلٌ كَانَ قَلْبُهُ مُعَلَّقاً فِي الْمَسْجِدِ، وَرَجُلَانِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ ﷻ، وَرَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ إِلَى نَفْسِهَا فَقَالَ: إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ ﷻ، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ، فَأَخْفَاهَا حَتَّى لَا تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا صَنَعَتْ يَمِينُهُ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەوت کۆمەڵە هەن خوا ﷻ لە سێبەری خۆیدا دیانپارێزێ، ڕۆژێک هیچ سێبەرێک نیە جگە لە سێبەری خۆی نەبێ: پێشەوایەکی دادپەروەر، گەنجێک پێگەیشتبێ لە پەرستشی خوادا، پیاوێک لە چۆڵیدا یادی خوا بکات و فرمێسک لە چاوانی بێنە خوارە، پیاوێک دڵی پەیوەست بێت بە مزگەوتەوە، دوو کەسیش لە پێناوی خوادا یەکتریان خۆش بوێ، پیاوێک ئافرەتێکی خاوەن پلەو پایەو جوان بانگی بکات بۆ ڕابواردن، بڵێ: من لە خوا دەترسم، پیاوێک خێرو بەخشینێک بکات، بیشارێتەوە دەستی چەپی بە دەستی ڕاستی نەزانێ.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨٢٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٦٠ و ١٤٢٣ و ٦٤٧٩ و ٦٨٠٦، ومسلم: ١٠٣١/٩١.




## پێکانی حەق و ڕاستی لە حوکم و بڕیاردا

**٥٣٨١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ فَأَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا اجْتَهَدَ فَأَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ»(١).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دادوەر لە بڕیارو دادوەریدا کۆششی کرد بۆ ئەوەی ڕاستی بپێکی، پاشان ڕاستی پێکا، ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە، وە ئەگەر کۆششی کردو هەڵەی کرد، ئەوە یەک پاداشتی بۆ هەیە.**

## بابەت: نەبەخشینی پۆست و پلە بەو کەسەی داوای دەکات و سوورە لەسەری

**٥٣٨٢-** «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: أَتَانِي نَاسٌ مِنَ الْأَشْعَرِيِّينَ فَقَالُوا: اذْهَبْ مَعَنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَإِنَّ لَنَا حَاجَةً، فَذَهَبْتُ مَعَهُمْ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اسْتَعِنْ بِنَا فِي عَمَلِكَ؟ قَالَ أَبُو مُوسَى: فَاعْتَذَرْتُ مِمَّا قَالُوا، وَأَخْبَرْتُ أَنِّي لَا أَدْرِي مَا حَاجَتُهُمْ، فَصَدَّقَنِي، وَعَذَرَنِي، فَقَالَ: إِنَّا لَا نَسْتَعِينُ فِي عَمَلِنَا بِمَنْ سَأَلَنَا»(٢).

**واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: خەڵکێک لە ئەشعەریەکان هاتن بۆ لام وتیان: لەگەڵمان وەرە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێویستیەکمان هەیە، منیش لە گەڵیاندا ڕۆیشتم وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بمانکە بە بەرپرس لە کاروبارەکانتدا، ئەبو موسا وتی: منیش داوای لێبوردنم کرد لەوەی کە وتیان: پێم ڕاگەیاند من ئاگاداری داواکاریەکەیان نەبووم، پێغەمبەر ﷺ بڕوای پێ کردم و بیانووی بۆ هێنامەوە، پاشان فەرمووی: ئێمە پۆست و پلە نادەین بە کەسێک داوامان لێ بکات.**

**٥٣٨٣-** «عَنْ أُسَيْدِ بْنِ حُضَيْرٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً مِنَ الْأَنْصَارِ جَاءَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: أَلَا تَسْتَعْمِلُنِي كَمَا اسْتَعْمَلْتَ فُلَاناً؟ قَالَ: إِنَّكُمْ سَتَلْقَوْنَ بَعْدِي أَثَرَةً، فَاصْبِرُوا حَتَّى تَلْقَوْنِي عَلَى الْحَوْضِ»(٣).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٣٥٢، ومسلم: ١٧١٦، وأبو داود: ٣٥٧٤، والترمذي: ١٣٢٦، وإبن ماجه: ٢٣١٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٦١، ومسلم: ١٧٣٣ و ١٨٢٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٩٢ و ٧٠٥٧، ومسلم: ١٨٤٥، والترمذي: ٢١٨٩.




واتە: ئوسەیدی کوڕی خوضەیر ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک لە ئەنصارەکان هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئایا پۆستێکم نادەیتێ وەکو چۆن پۆستت داوە بە فڵانە کەس؟ فەرمووی: ئێوە دوای من دەبینن پۆست دەسەڵات دەدرێت بە کەسی نەشیاو بەسەرتاندا، ئارام بگرن هەتا دەگەنە لام لەسەر حەوز.

## قەدەغەکردن لە داواکردنی دەسەڵات

٥٣٨٤- «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَسْأَلِ الْإِمَارَةَ، فَإِنَّكَ إِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا، وَإِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا»(١).

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: داوای دەسەڵات مەکە، چونکە ئەگەر بە هۆی داواکردنەوە پێت بەخشرا خوا یارمەتیت نادات، وە ئەگەر بەبێ داواکردن پێت بەخشرا ئەوە خوا یارمەتیت دەدات.

٥٣٨٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّكُمْ سَتَحْرِصُونَ عَلَى الْإِمَارَةِ، وَإِنَّهَا سَتَكُونُ نَدَامَةً وَحَسْرَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَنِعْمَتِ الْمُرْضِعَةُ، وَبِئْسَتِ الْفَاطِمَةُ»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئێوە لە داهاتویەکی نزیکدا سوور دەبن لەسەر دەستگرتن بە جڵەوی دەسەڵاتەوە، بێگومان ئەو دەسەڵاتەش دەبێتە مایەی پەشیمانی و حەسرەت، جا گەیشتن بە دەسەڵات خۆشترین ژیانە (لە دنیادا)، وە نەمانیشی ناخۆشترین شتە (ئەویش مردنە).(واتە: لە دنیادا خۆشترین ژیانیان هەیە، لە دوای مردنیش ناخۆشترین ژیانیان هەیە، خوا زاناترە).

## بەکارهێنانی شاعیرەکان بۆ دەسەڵات

٥٣٨٦- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ قَدِمَ رَكْبٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَمِّرِ الْقَعْقَاعَ بْنَ مَعْبَدٍ، وَقَالَ عُمَرُ: بَلْ أَمِّرِ الْأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ، فَتَمَارَيَا حَتَّى ارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا، فَنَزَلَتْ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧١٤٨.




فِي ذَلِكَ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۝١ ﴾الحجرات، حَتَّى انْقَضَتِ الآيَةُ: ﴿ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ صَبَرُواْ حَتَّىٰ تَخۡرُجَ إِلَيۡهِمۡ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ۝٥ ﴾الحجرات»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (خوا لێیان ڕازی بێ) هەواڵیداوە، چەند سوارێک لە نەوەکانی تەمیم هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ئەبو بەکر وتی: قەعقاعی کوڕی مەعبەد بکە بە ئەمیر، عومەریش وتی: بەڵکو ئەقرەعی کوڕی حابس بکە بە ئەمیر، هەردووکیان مشت و مڕیان کرد هەتا دەنگیان بەرزبوویەوە، ئەم ئایەتەش لەم بارەیەوە دابەزیە خوارەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۝١ ﴾ (واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە پێش مەکەون لە هیچ کاروبارێکدا لە خواو پێغەمبەرەکەی) هەتا ئایەتەکە کۆتایی پێ هێنا: ﴿ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ صَبَرُواْ حَتَّىٰ تَخۡرُجَ إِلَيۡهِمۡ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ۝٥ ﴾ (واتە: خۆ ئەگەر ئەوان چاوەڕوانیان بکردایە تا دەرۆیشتیتە دەرەوە بۆ لایان ئەوە چاکتر بوو بۆیان وە خوا لێبوردەی میهرەبانە).

## ئەگەر کەسێکیان کردە دادوەر حوکمی لە نێوانیاندا کرد

**٥٣٨٧-** «عَنْ شُرَيْحِ بْنِ هَانِئٍ، عَنْ أَبِيهِ هَانِئٍ ﷺ، أَنَّهُ لَمَّا وَفَدَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ سَمِعَهُ وَهُمْ يَكْنُونَ هَانِئاً أَبَا الْحَكَمِ، فَدَعَاهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ لَهُ: إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَكَمُ وَإِلَيْهِ الْحُكْمُ، فَلِمَ تُكَنَّى أَبَا الْحَكَمِ؟ فَقَالَ: إِنَّ قَوْمِي إِذَا اخْتَلَفُوا فِي شَيْءٍ أَتَوْنِي فَحَكَمْتُ بَيْنَهُمْ، فَرَضِيَ كِلَا الْفَرِيقَيْنِ، قَالَ: مَا أَحْسَنَ مِنْ هَذَا، فَمَا لَكَ مِنَ الْوُلْدِ؟ قَالَ: لِي شُرَيْحٌ، وَعَبْدُ اللَّهِ، وَمُسْلِمٌ، قَالَ: فَمَنْ أَكْبَرُهُمْ؟ قَالَ: شُرَيْحٌ، قَالَ: فَأَنْتَ أَبُو شُرَيْحٍ فَدَعَا لَهُ وَلِوَلَدِهِ»[٢].

واتە: شورەیحی کوڕی هانیء دەگێڕێتەوە، لە باوکی هانیئە ﷺ،کاتێ بە نوێنەرایەتی ڕۆیشتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بیستی بە هانیء دەڵێن: ئەبو حەکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: بێگومان تەنها خوا حەکەمە، بۆچی بە ئەبو حەکەم بانگ دەکرێی؟ وتی: کەسوکارەکەم ئەگەر جیاوازی تێبکەوێ لە بارەی شتێکەوە من بانگ دەکەن، هەردوو کۆمەڵەکە ڕازی دەبن بە بڕیارم، فەرمووی: چی لەمە چاکترە، چەند منداڵت هەیە؟ وتی: شورەیح و عەبدوڵڵاو موسلیم، فەرمووی: کامەیان

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٣٦٧ و ٤٨٤٥ و ٤٨٤٧ و ٧٣٠٢، والترمذي: ٣٢٦٦.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٩٥٥




گەورەترینیانە؟ وتی: شورەیح، فەرمووی: کەواتە تۆ ئەبو شورەیحیت، نزای کرد بۆ خۆی و منداڵەکەیشی.

## قەدەغە کردنی بەکارهێنانی ئافرەتان بۆ دەسەڵات لە حوکم و بڕیاردا

**٥٣٨٨-** «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: عَصَمَنِي اللَّهُ بِشَيْءٍ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَمَّا هَلَكَ كِسْرَى قَالَ: مَنِ اسْتَخْلَفُوا؟ قَالُوا: بِنْتَهُ، قَالَ: لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمُ امْرَأَةً»[١].

واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: خوای گەورە پاراستمی (کاتێ ویستم لەبەرەی عائیشە بجەنگم دژ بە عەلی خوا لە هەموویان ڕازی بێ) بە شتێک لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستبووم، کاتێ کیسرا لەناوچوو، فەرمووی: کێیان کردوە بە جێنشین؟ وتیان: کچەکەی، فەرمووی: گەلێک سەرکەوتوو نابێت کاروباریان بخەنە ژێر دەستی ئافرەتێک.

## حوکم و بڕیاردان بە هاوشێوەو لەیەکچواندن، (وەک لێکچواندنی حەج بە قەرز لە ڕوانگەی ئەوەی کەسێکی نزیک لە جیاتی خاوەنەکەی جێبەجێی بکات) وە باسی جیاوازی لەسەر وەلیدی کوڕی موسلیم لە فەرموودەی ئیبنو عەبباس

**٥٣٨٩-** «عَنِ مُحَمَّد بن هَاشِمٍ عَنِ الْوَلِيدِ، عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ بْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّهُ كَانَ رَدِيفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ غَدَاةَ النَّحْرِ، فَأَتَتْهُ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمَ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ فَرِيضَةَ اللَّهِ ﷻ فِي الْحَجِّ عَلَى عِبَادِهِ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخاً كَبِيراً، لَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَرْكَبَ إِلَّا مُعْتَرِضاً، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، حُجِّي عَنْهُ، فَإِنَّهُ لَوْ كَانَ عَلَيْهِ دَيْنٌ قَضَيْتِيهِ؟»[٢].

واتە: موحەممەدی کوڕی هاشم دەگێڕێتەوە، لە وەلیدەوە، لە ئەوزاعی، لە زوهری، لە سولەیمانی کوڕی یەسار، لە ئیبنو عەبباس، لە فەضلی کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، ئەو لە پشتی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لەسەر وڵاخەکە سەر لە

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٤٢٥ و ٧٠٩٩، والترمذي: ٢٢٦٢.

(٢) صحيح.




بەیانی قوربانی کرد، ئافرەتێک لە خەثعەم هات بۆ لای وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، حەج فەرزی خوایە ﷻ لەسەر بەندەکانی، لەسەر باوکیشم فەرز بووە، زۆر پیرەو خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێ، دەکەوێتە خوارەوە، ئایا من حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ حەجی بۆ بکە، ئەگەر قەرزی لەسەر بووایە دەتدایەوە؟

**٥٣٩٠-** «عَنِ عَمْرُو بن عُثْمَانَ قال: حدثنا الْوَلِيدُ، عَنْ الْأَوْزَاعِيِّ، قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ شِهَابٍ، ح وَأَخْبَرَنِي مَحْمُودُ بْنُ خَالِدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ، عَنْ الْأَوْزَاعِيِّ، حَدَّثَنِي الزُّهْرِيُّ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ امْرَأَةً مِنْ خَثْعَمَ اسْتَفْتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَالْفَضْلُ رَدِيفُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ فَرِيضَةَ اللَّهِ ﷻ فِي الْحَجِّ عَلَى عِبَادِهِ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخاً كَبِيراً، لَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَسْتَوِيَ عَلَى الرَّاحِلَةِ، فَهَلْ يُجْزِئُ؟ قَالَ مَحْمُودٌ: فَهَلْ يَقْضِي أَنْ أَحُجَّ عَنْهُ؟ فَقَالَ لَهَا: نَعَمْ»[١].

واتە: عەمری کوڕی عوسمان دەڵێ: وەلید بۆی باس کردین، لە ئەوزاعیەوە دەڵێ: ئیبنو شیهاب هەواڵی پێدام، فەرموودەکەی هێنایەوە، وە مەحموودی کوڕی خالد دەڵێ: عومەر بۆی باس کردین، لە ئەوزاعی، لە زوهری، لە سولەیمانی کوڕی یەسار، لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) هەواڵی پێداوە، ئافرەتێک لە خەثعەم پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، فەزلی کوڕی عەبباسیش لە پشتیەوە بوو لەسەر وڵاخەکە، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، حەج فەرزی خوایە ﷻ لەسەر بەندەکانی، لەسەر باوکیشم فەرز بووە، زۆر پیرەو خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێ، ئایا دروستە من حەجی بۆ بکەم؟ مەحمود وتی: ئایا دەکرێ من حەجی بۆ بکەم؟ پێی فەرموو: بەڵێ.

**٥٣٩١-** «عَنِ ابْنِ الْقَاسِمِ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ رَدِيفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَجَاءَتْهُ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمَ تَسْتَفْتِيهِ، فَجَعَلَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا، وَتَنْظُرُ إِلَيْهِ، وَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصْرِفُ وَجْهَ الْفَضْلِ إِلَى الشِّقِّ الْآخَرِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ فَرِيضَةَ اللَّهِ ﷻ عَلَى عِبَادِهِ فِي الْحَجِّ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخاً كَبِيراً، لَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَثْبُتَ عَلَى الرَّاحِلَةِ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَذَلِكَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥١٣، ومسلم: ١٣٣٤.

(٢) صحيح.




واتە: ئیبنو لقاسم دەگێڕێتەوە، لە مالک، لە ئیبو شیهاب، لە سولەیمانی کوڕی یەسار، لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباس دەڵێ: فەزلی کوڕی عەبباس لەپشتی پێغەمبەری خواوە ﷺ بوو بەسەر وڵاخەکە، ئافرەتێک لە خەثعەم هات بۆ لای پرسیاری لێ دەکرد، لەوکاتەدا فەزل تەماشای ئافرەتەکەی دەکرد، ئافرەتەکەش تەماشای ئەوی دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی فەزلی وەرچەرخاند بەلایەکی تردا، ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، حەج فەرزی خوایە ﷻ لەسەر بەندەکانی، لەسەر باوکیشم فەرز بووە، زۆر پیرەو خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێ، ئایا من حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ. ئەویش لە حەجی ماڵئاواییدا بوو.

**٥٣٩٢-** «عَنْ يَعْقُوبَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنْ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ سُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ امْرَأَةً مِنْ خَثْعَمَ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ فَرِيضَةَ اللَّهِ ﷻ فِي الْحَجِّ عَلَى عِبَادِهِ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخاً كَبِيراً، لَا يَسْتَوِي عَلَى الرَّاحِلَةِ، فَهَلْ يَقْضِي عَنْهُ أَنْ أَحُجَّ عَنْهُ؟ قَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: نَعَمْ فَأَخَذَ الْفَضْلُ يَلْتَفِتُ إِلَيْهَا، وَكَانَتِ امْرَأَةً حَسْنَاءَ، وَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْفَضْلَ فَحَوَّلَ وَجْهَهُ مِنَ الشِّقِّ الْآخَرِ»(١).

واتە: یەعقوبی کوڕی ئیبراهیم دەڵێ: باوکم بۆی باس کردم لە صالەحی کوڕی کەیسان، لە ئیبنو شیهاب، سولەیمانی کوڕی یەسار هەواڵی پێداوە، کە ئیبنو عەبباس پێی ڕاگەیاندوە، ئافرەتێک لە خەثعەم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، حەج فەرزی خوایە ﷻ لەسەر بەندەکانی، لەسەر باوکیشم فەرز بووە، زۆر پیرەو خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێ، ئایا دەبێ من حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ. فەزلیش لای لێکردەوە ئافرەتەکەیش جوان بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوخساری فەزڵی بەو لاکەی تردا وەرچەرخاند.

## باسی جیاوازی لەسەر یەحیای کوڕی ئەبو ئیسحاق لە فەرموودەکەدا

**٥٣٩٣-** «عَنْ هُشَيم، عَن يَحْيَى بْنِ أَبِي إِسْحَق، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ: إِنَّ أَبِي أَدْرَكَهُ الْحَجُّ وَهُوَ شَيْخٌ كَبِيرٌ، لَا يَثْبُتُ عَلَى رَاحِلَتِهِ، فَإِنْ شَدَدْتُهُ

---

(١) صحيح.



خَشِيتُ أَنْ يَمُوتَ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: أَفَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ عَلَيْهِ دَيْنٌ فَقَضَيْتَهُ، أَكَانَ مُجْزِئاً؟ قَالَ: نَعَمْ قَالَ: فَحُجَّ عَنْ أَبِيكَ»[1].

**واتە: هوشەیم دەگێڕێتەوە، لە یەحیای کوڕی ئەبو ئیسحاق، لە سولەیمانی کوڕی یەسار، لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، پیاوێک پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ وتی: حەج فەرزی خوایە لەسەر بەندەکانی، لەسەر باوکیشم فەرز بووە، زۆر پیرەو خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێ، ئەگەر زۆری لێبکەم دەترسم بمرێ، ئایا من حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: ئەگەر ببینی باوکت قەرزار بێت و قەرزەکەی بۆ بدەیتەوە، ئایا ئەوە دروستە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: لە بری باوکت حەج بکە.**

**٥٣٩٤-** «عَنْ مُحَمد، عَن يَحْيَى بْنِ أَبِي إِسْحَقَ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ الْفَضْلِ بْنِ الْعَبَّاسِ، أَنَّهُ كَانَ رَدِيفَ النَّبِيِّ ﷺ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أُمِّي عَجُوزٌ كَبِيرَةٌ، إِنْ حَمَلْتُهَا لَمْ تَسْتَمْسِكْ، وَإِنْ رَبَطْتُهَا خَشِيتُ أَنْ أَقْتُلَهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّكَ دَيْنٌ أَكُنْتَ قَاضِيَهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَحُجَّ عَنْ أُمِّكَ»[2].

**واتە: موحەممەد دەگێڕێتەوە، یەحیای کوڕی ئەبو ئیسحاق، لە سولەیمانی کوڕی یەسار، لە فەزلی کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، ئەو لە پشتی پێغەمبەر ﷺ بوو بە سەر وڵاخەوە، پیاوێک هات بۆ لای وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دایکم پیرەو بەساڵاچووە ئەگەر بیخەمە سەر وڵاخ خۆی ناگرێ، وە ئەگەر بیبەستمەوە دەترسم ببەمە هۆی مردنی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا ئەگەر دایکت قەرزار بووایە قەرزەکەت دەدایەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: لە جیاتی دایکت حەج بکە.**

**٥٣٩٥-** «عَنْ شُعبة، عَن يَحْيَى بْنِ أَبِي إِسْحَقَ، قَالَ: سَمِعْتُ سُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ يُحَدِّثُهُ، عَنْ الْفَضْلِ بْنِ الْعَبَّاسِ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ لَا يَسْتَطِيعُ الْحَجَّ، وَإِنْ حَمَلْتُهُ لَمْ يَسْتَمْسِكْ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: حُجَّ عَنْ أَبِيكَ»[3].

**واتە: شوعبە دەگێڕێتەوە، لە یەحیای کوڕی ئەبو ئیسحاق دەڵێ: گوێم لێ بوو سولەیمانی کوڕی یەسار، لە فەزلی کوڕی عەباسەوە دەیگێڕایەوە، وتی: پیاوێک هات**

---

**(١) شاذ مضطرب.**

**(٢) شاذ.**

**(٣) شاذ.**




بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، باوکم پیرەو بەساڵاچووە ناتوانێ حەج بکات، ئەگەر بیخەمە سەر وڵاخ خۆی ناگرێ، ئایا حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: لە جیاتی باوکت حەج بکە.

**٥٣٩٦-** «عَنْ زَكَرِيَّا بْنِ إِسْحَقَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ أَبِي الشَّعْثَاءِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ عَلَيْهِ دَيْنٌ فَقَضَيْتَهُ أَكَانَ يُجْزِئُ عَنْهُ»[١].

واتە: زەکەریای کوڕی ئیسحاق دەگێڕێتەوە، لە عەمری کوڕی دینار، لە ئەبو شەعثاء، لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، پیاوێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، وتی: باوکم پیرەو بەساڵاچووە ناتوانێ حەج بکات، ئایا حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، ئایا ئەگەر باوکت قەرزار بووایەت و قەرزەکەت بۆ بدایەتەوە دەبوو بۆی.

## حوکم و بڕیار بەیەک دەنگی زانایان

**٥٣٩٧-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: أَكْثَرُوا عَلَى عَبْدِ اللَّهِ ذَاتَ يَوْمٍ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّهُ قَدْ أَتَى عَلَيْنَا زَمَانٌ وَلَسْنَا نَقْضِي، وَلَسْنَا هُنَالِكَ، ثُمَّ إِنَّ اللَّهَ ﷻ قَدَّرَ عَلَيْنَا أَنْ بَلَغْنَا مَا تَرَوْنَ، فَمَنْ عَرَضَ لَهُ مِنْكُمْ قَضَاءٌ بَعْدَ الْيَوْمِ، فَلْيَقْضِ بِمَا فِي كِتَابِ اللَّهِ، فَإِنْ جَاءَ أَمْرٌ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ، فَلْيَقْضِ بِمَا قَضَى بِهِ نَبِيُّهُ ﷺ، فَإِنْ جَاءَ أَمْرٌ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ، وَلَا قَضَى بِهِ نَبِيُّهُ ﷺ، فَلْيَقْضِ بِمَا قَضَى بِهِ الصَّالِحُونَ، فَإِنْ جَاءَ أَمْرٌ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ، وَلَا قَضَى بِهِ نَبِيُّهُ ﷺ، وَلَا قَضَى بِهِ الصَّالِحُونَ، فَلْيَجْتَهِدْ رَأْيَهُ، وَلَا يَقُولُ: إِنِّي أَخَافُ، وَإِنِّي أَخَافُ، فَإِنَّ الْحَلَالَ بَيِّنٌ، وَالْحَرَامَ بَيِّنٌ، وَبَيْنَ ذَلِكَ أُمُورٌ مُشْتَبِهَاتٌ، فَدَعْ مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لَا يَرِيبُكَ»[٢].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یەزید دەڵێ: ڕۆژێک پرسیاری زۆریان کرد لە عەبدوڵلا، عەبدوڵلا ﷺ وتی: سەردەمانێک زۆرمان بەسەر برد بڕیاو فتوامان نەدەدا و لەوێ نەبووین، (چونکە خەڵک هیچ پێویستی بە ئێمە نەبوو هاوەڵەکان هەموویان شارەزا بوون) بەڵام خوای پەروەردگار قەدەری وابوو گەیشتین بەو سەردەمەی

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد موقوف.




که دیبینن (واته گەیشتین بە زەمانێک کە جۆرەها خەڵک و بابەت دروست بووە و پرسیاری زۆر دەکرێت) هەر کەس لە ئێوە حوکمێکی بۆ هاتە پێش لە دوای ئەمڕۆ، با بەوە بڕیار بدات کە لە کتێبی خوادا هەیە، ئەگەر کارێک هاتە پێش لە کتێبی خوادا نەبوو، ئەوە با بەوە دادوەری بکات کە پێغەمبەر ﷺ دادوەری پێ کردوە، وە ئەگەر کارێک هاتە پێش نە لە کتێبی خوادا هاتبوو نە پێغەمبەریش دادپەروەری پێ کردبوو، ئەوا با بەوە بڕیار بدات کە پیاو چاکان بڕیاریان لە سەرداوە، وە ئەگەر کارێک هاتە پێش نە لە کتێبی خوادا هاتبوو نە پێغەمبەرەکەیشی دادپەروەری پێکردبوو، وە نە پیاو چاکانیش بڕیاریان پێدابوو، ئەوە با بەبۆچوونی خۆی ئیجتیهاد بکات و نەڵێت من دەترسم من دەترسم، چونکە حەڵاڵ دیارەو حەرامیش دیارە، لە نێوانی ئەو دوانەیشدا کۆمەڵە کارێکی گوماناوی هەیە، واز لەوە بهێنە کە گومانی لێدەکەیت، وە بڕۆ بۆ لای ئەوەی گومانت لێی نیە.

**٥٣٩٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: أَتَى عَلَيْنَا حِينٌ وَلَسْنَا نَقْضِي، وَلَسْنَا هُنَالِكَ، وَإِنَّ اللَّهَ ﷻ قَدَّرَ أَنْ بَلَغْنَا مَا تَرَوْنَ، فَمَنْ عَرَضَ لَهُ قَضَاءٌ بَعْدَ الْيَوْمِ، فَلْيَقْضِ فِيهِ بِمَا فِي كِتَابِ اللَّهِ، فَإِنْ جَاءَ أَمْرٌ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ، فَلْيَقْضِ بِمَا قَضَى بِهِ نَبِيُّهُ، فَإِنْ جَاءَ أَمْرٌ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ، وَلَمْ يَقْضِ بِهِ نَبِيُّهُ ﷺ، فَلْيَقْضِ بِمَا قَضَى بِهِ الصَّالِحُونَ، وَلَا يَقُولُ أَحَدُكُمْ: إِنِّي أَخَافُ، وَإِنِّي أَخَافُ، فَإِنَّ الْحَلَالَ بَيِّنٌ، وَالْحَرَامَ بَيِّنٌ، وَبَيْنَ ذَلِكَ أُمُورٌ مُشْتَبِهَةٌ، فَدَعْ مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لَا يَرِيبُكَ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: سەردەمانێک زۆرمان بەسەر برد بڕیارو فتوامان نەدەداو لەوێ نەبووین، (چونکە خەڵک هیچ پێویستی بە ئێمە نەبوو هاوەڵەکان هەموویان شارەزا بوون)، وە بێگومان بەڵام خوای پەروەردگار قەدەری وابوو گەیشتین بەو سەردەمەی کە دەیبینن (واتە: گەیشتین بە زەمانێک کە جۆرەها خەڵک و بابەت دروست بووەو پرسیاری زۆر دەکرێت)، هەر کەس لە ئێوە حوکمێکی بۆ هاتە پێش لە دوای ئەمڕۆ، با بەوە بڕیار بدات کە لە کتێبی خوادا هەیە، ئەگەر کارێک هاتە پێش لە کتێبی خوادا نەبوو، ئەوە با بەوە دادوەری بکات کە پێغەمبەر ﷺ دادوەری پێ کردوە، وە ئەگەر کارێک هاتە پێش نە لە کتێبی خوادا هاتبوو نە پێغەمبەریش دادپەروەری پێ کردبوو، ئەوە با بەوە بڕیار بدات کە پیاو چاکان بڕیاریان پێ داوە، با یەکێک لە ئێوە نەڵێت من دەترسم من دەترسم، چونکە

---

(١) صحيح لغيره.




حەڵاڵ دیارەو حەرامیش دیارە، لە نێوانی ئەو دوانەیشدا کۆمەڵە کارێکی گوماناوی هەیە، واز لەوە بهێنە کە گومانی لێدەکەیت، وە بڕۆ بۆ ئەوەی کە گومانت لێی نیە.

**٥٣٩٩-** «عَنْ شُرَيْحٍ ﷺ، أَنَّهُ كَتَبَ إِلَى عُمَرَ يَسْأَلُهُ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ، أَنْ اقْضِ بِمَا فِي كِتَابِ اللَّهِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِي كِتَابِ اللَّهِ فَبِسُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِي كِتَابِ اللَّهِ، وَلَا فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَاقْضِ بِمَا قَضَى بِهِ الصَّالِحُونَ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِي كِتَابِ اللَّهِ، وَلَا فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلَمْ يَقْضِ بِهِ الصَّالِحُونَ، فَإِنْ شِئْتَ فَتَقَدَّمْ، وَإِنْ شِئْتَ فَتَأَخَّرْ، وَلَا أَرَى التَّأَخُّرَ إِلَّا خَيْراً لَكَ، وَالسَّلَامُ عَلَيْكُمْ»[١].

واتە: شورەیح ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو نوسراوێکی کرد بۆ عومەر ﷺ پرسیاری لێکرد، ئەویش نوسراوێکی بۆ نوسی، حوکم و بڕیار بەوە بدە کە لە کتێبی خوادا هەیە، ئەگەر لە کتێبی خوادا نەبوو، ئەوە بە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە ئەگەر لە کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبوو ئەوە بەوە بڕیار بدە کە پیاوچاکان بڕیاریان پێ داوە ئەگەر نە لە کتێبی خوادا و نە لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا بوو ﷺ، پیاوچاکانیش بڕیاریان پێ نەدابوو، ئەگەر ویستت بڕیارەکە پێش بخە، وە ئەگەر ویستت دوای بخە، وا دەزانم دواخستن بۆ تۆ چاکترە، سڵاوی خوات لە سەر.

## تەفسیری فەرمایشتی خوا ﷻ:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾[٢].

**٥٤٠٠-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَتْ مُلُوكٌ بَعْدَ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ بَدَّلُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنْجِيلَ، وَكَانَ فِيهِمْ مُؤْمِنُونَ يَقْرَءُونَ التَّوْرَاةَ قِيلَ لِمُلُوكِهِمْ: مَا نَجِدُ شَتْماً أَشَدَّ مِنْ شَتْمٍ يَشْتِمُونَا هَؤُلَاءِ، إِنَّهُمْ يَقْرَءُونَ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ المائدة، وَهَؤُلَاءِ الْآيَاتُ مَعَ مَا يَعِيبُونَا بِهِ فِي أَعْمَالِنَا فِي قِرَاءَتِهِمْ، فَادْعُهُمْ فَلْيَقْرَءُوا كَمَا نَقْرَأُ، وَلْيُؤْمِنُوا كَمَا آمَنَّا، فَدَعَاهُمْ، فَجَمَعَهُمْ، وَعَرَضَ عَلَيْهِمُ الْقَتْلَ أَوْ يَتْرُكُوا قِرَاءَةَ التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ، إِلَّا مَا بَدَّلُوا مِنْهَا، فَقَالُوا: مَا تُرِيدُونَ إِلَى ذَلِكَ، دَعُونَا، فَقَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ: ابْنُوا

---

(١) صحيح الإسناد موقوف.

(٢) واتە: هەر کەس حوکم نەکات بەو بڕیارانەی کە خوا ناردویەتیە خوارەوە ئا ئەوانە بێبڕوان.

لَنَا أُسْطُوَانَةً ثُمَّ ارْفَعُونَا إِلَيْهَا، ثُمَّ اعْطُونَا شَيْئاً نَرْفَعُ بِهِ طَعَامَنَا وَشَرَابَنَا، فَلَا نَرِدُ عَلَيْكُمْ. وَقَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ: دَعُونَا نَسِيحُ فِي الْأَرْضِ، وَنَهِيمُ وَنَشْرَبُ كَمَا يَشْرَبُ الْوَحْشُ، فَإِنْ قَدَرْتُمْ عَلَيْنَا فِي أَرْضِكُمْ فَاقْتُلُونَا. وَقَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ: ابْنُوا لَنَا دُوراً فِي الْفَيَافِي، وَنَحْتَفِرُ الْآبَارَ، وَنَحْتَرِثُ الْبُقُولَ فَلَا نَرِدُ عَلَيْكُمْ، وَلَا نَمُرُّ بِكُمْ، وَلَيْسَ أَحَدٌ مِنَ الْقَبَائِلِ إِلَّا وَلَهُ حَمِيمٌ فِيهِمْ. قَالَ: فَفَعَلُوا ذَلِكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ﴿٢٧﴾﴾الحديد، وَالْآخَرُونَ قَالُوا: نَتَعَبَّدُ كَمَا تَعَبَّدَ فُلَانٌ، وَنَسِيحُ كَمَا سَاحَ فُلَانٌ، وَنَتَّخِذُ دُوراً كَمَا اتَّخَذَ فُلَانٌ، وَهُمْ عَلَى شِرْكِهِمْ، لَا عِلْمَ لَهُمْ بِإِيمَانِ الَّذِينَ اقْتَدَوْا بِهِ، فَلَمَّا بَعَثَ اللَّهُ النَّبِيَّ ﷺ، وَلَمْ يَبْقَ مِنْهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ، انْحَطَّ رَجُلٌ مِنْ صَوْمَعَتِهِ، وَجَاءَ سَائِحٌ مِنْ سِيَاحَتِهِ، وَصَاحِبُ الدَّيْرِ مِنْ دَيْرِهِ، فَآمَنُوا بِهِ، وَصَدَّقُوهُ، فَقَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَءَامِنُوا۟ بِرَسُولِهِۦ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِۦ ﴿٢٨﴾﴾الحديد، أَجْرَيْنِ بِإِيمَانِهِمْ بِعِيسَى وَبِالتَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ، وَبِإِيمَانِهِمْ بِمُحَمَّدٍ ﷺ وَتَصْدِيقِهِمْ. قَالَ: ﴿وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِۦ ﴿٢٨﴾﴾ الْقُرْآنَ، وَاتِّبَاعَهُمُ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: ﴿لِّئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٢٩﴾﴾الحديد، يَتَشَبَّهُونَ بِكُمْ: ﴿أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ مِّن فَضْلِ ٱللَّهِ ﴿٢٩﴾﴾الحديد»[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پاشاکان لە دوای عیسای کوڕی مەریەم تەورات و ئینجیلیان دەستکاری کرد، جا تیایاندا بوو بڕواردار بوون تەوراتیان دەخوێند، بە پاشاکانیان، بە پاشاکانیان وترا: نابینین هیچ جنێودانێک ئەوەندەی جنێودانی ئەوانە سەخت و ناخۆش بێت، ئەوان ئەو ئایەتە دەخوێننەوە: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ (واتە: هەر کەس حوکم نەکات بەو بڕیارانەی کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە ئا ئەوانە بێبڕوان)، ئەو ئایەتانەی لەگەڵ ئەوەی بە خوێندنەوەی ئێمەی پێ لەکەدار دەکەن، بانگیان بکەن با وەکو چۆن ئێمە دەیخوێنینەوە ئەوانیش بیخوێننەوە، وە با بڕوای پێ بهێنن وەکو چۆن ئێمە بڕوامان پێی هێناوە، ئەویش بانگی کردن و کۆیکردنەوە، پاشان پێشنیاری کوشتن یان وازهێنان لە خوێندنەوەی تەورات و ئینجیلی بۆ کردن، جگە لەوە نەبێ کە دەستکاری کراوە، وتیان: چیتان دەوێ، وازمان لێ بێنن؟ کۆمەڵێکیان وتیان: شوێنێکی بەرزمان بۆ دروست بکەن پاشان بەرزمان بکەنەوە بۆ لای، پاشان شتێکمان بدەنێ خواردن و**

---

(١) صحيح الإسناد موقوف.



خواردنەوەكانمانی پێ بەرز بكەینەوە ئیتر نەگەڕێینەوە بۆ لاتان، كۆمەڵێكی دیكەیان وتیان: لێمان گەڕێن با بەسەر زەویدا بگەڕێین، بخۆین و بخۆینەوە هەروەكو چۆن ئاژەڵ دەخواو دەخواتەوە، ئەگەر تواناتان هەبوو بەسەرماندا لە ناو زەوی خۆتان بمانكوژن، كۆمەڵێكی تریان وتیان: ماڵمان لە دەشتایی بۆ دروست بكەن، خۆمان بیر هەڵدەكەنین و دانەوێڵە دەچێنین، هەرگیز نایەین بۆ لاتان و بە لاتاندا تێناپەڕین، هیچ هۆزێک نەبوو ئیللا ئەوەیان پێ قبووڵ بووە، وتی: ئەوەیان ئەنجامدا، خوا ﷻ ئەمەی دابەزاندە خوارەوە: ﴿وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ﴿٢٧﴾﴾ (واتە: وە گۆشەگیریەک كە خۆیان دایانهێنا بوو، ئێمە ئەوەمان لەسەر پێویست نەكردبوون، بەڵام خۆیان دایانهێنا بۆ ڕەزامەندی خوا، كەچی وەک پێویست پارێزگاری ئەو گۆشەگیریەیان نەكرد)، ئەوانی تریش وتیان: پەرستش ئەنجام دەدەین وەک فڵان كەس ئەنجامیداوە، وە دەگەڕێین وەكو چۆن فڵان كەس گەڕاوە، شوێنێكیش هەڵدەبژێرین هەروەک چۆن فڵان كەس هەڵیبژارد، ئەوان لەسەر هاوبەشدانانیان بەردەوام بوون، زانست و زانیاریان نەبوو بەوانەی پێشینی خۆیان كە پەیڕەویان دەكردن، كاتێ خوا ﷻ پێغەمبەری نارد كەسی وایان نەمابوو كەمێک نەبێ، پیاوێک لە پەرستگاكەی دەمایەوە، گەشتیارێكیش لە گەشتەكەی دەگەڕایەوە، وە خاوەنی پەرستگایەكیش لە پەرستگاكەی دەردەچوو، بڕوایان بە پێغەمبەر ﷺ هێناو بە ڕاستیان زانی، خوا ﷻ فەرمووی:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَءَامِنُواْ بِرَسُولِهِۦ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِۦ ﴿٢٨﴾﴾، (واتە: ئەی ئەو كەسانەی بڕواتان هێناوە لە خوا بترسن و بڕوا بە پێغەمبەرەكەی بهێنن دوو بەشتان لە ڕەحمەت و بەخششی خۆی پێ دەبەخشێ)، بڕوایان هەبوو بە عیساو تەورات و ئینجیل، هەروەها بڕوایان بە موحەممەد هێناو بە ڕاستیان زانی، فەرمووی:﴿ وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِۦ ﴿٢٨﴾﴾ (واتە: وە ڕووناكیەكتان دەداتێ كە ڕێنموویی پێ بكەن)، واتە: قورئان، وە شوێنكەوتنیان بۆ پێغەمبەر ﷺ، فەرموویەتی: ﴿لِّئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٢٩﴾﴾ (واتە: تا خاوەن پەڕاوە ئاسمانیەكان بزانن)، خۆیان دەشوبهێنن بە ئێوە: ﴿أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ مِّن فَضْلِ ٱللَّهِ ﴿٢٩﴾﴾ (واتە: كە دەسەڵاتیان نیە بەسەر هیچ یەک لە بەخششی خوا).

لِهَذِهِ نِصْفٌ، وَلِهَذِهِ نِصْفٌ، قَالَتِ الْكُبْرَى: نَعَمْ، اقْطَعُوهُ، فَقَالَتِ الصُّغْرَى: لَا تَقْطَعْهُ، هُوَ وَلَدُهَا، فَقَضَى بِهِ لِلَّتِي أَبَتْ أَنْ يَقْطَعَهُ»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوو ئافرەت دەرچوون دوو منداڵیان پێ بوو، گورگ هاتوو منداڵی یەکێکیانی برد، هەردووکیان لەسەر ئەو منداڵەی کە مابوو کێشەی خۆیان برد بۆ لای پێغەمبەر داود، ئەویش منداڵەکەی دا بە ئافرەتە گەورەکەیان، پاشان تێپەڕین بە لای پێغەمبەر سولەیماندا وتی: چۆن فەرمانی پێکردن؟ وتی: منداڵەکەی دا بە گەورەکە،سولەیمان فەرمووی: دەیکەم بە دوو لەتەوە نیوەی بۆ تۆو نیوەی بۆ ئەو، ئافرەتە گەورەکە وتی: باشە لەتی بکەن، بچوکەکە وتی: لەتی مەکە، چونکە منداڵی ئەوە، سولەیمان منداڵەکەیدا بە ئەو ئافرەتەی کە داوای کرد نەبڕدرێتەوە.**

## بابەت: ڕەتکردنەوەی بڕیاری دادوەر ئەگەر بڕیارێکی بە ناحەقدا

**٥٤٠٥-** «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ إِلَى بَنِي جَذِيمَةَ، فَدَعَاهُمْ إِلَى الْإِسْلَامِ، فَلَمْ يُحْسِنُوا أَنْ يَقُولُوا: أَسْلَمْنَا، فَجَعَلُوا يَقُولُونَ: صَبَأْنَا، وَجَعَلَ خَالِدٌ قَتْلاً وَأَسْراً، قَالَ: فَدَفَعَ إِلَى كُلِّ رَجُلٍ أَسِيرَهُ، حَتَّى إِذَا أَصْبَحَ يَوْمُنَا أَمَرَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ أَنْ يَقْتُلَ كُلُّ رَجُلٍ مِنَّا أَسِيرَهُ، قَالَ ابْنُ عُمَرَ: فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لَا أَقْتُلُ أَسِيرِي، وَلَا يَقْتُلُ أَحَدٌ»، وَقَالَ بِشْرٌ: مِنْ أَصْحَابِي أَسِيرَهُ، قَالَ: فَقَدِمْنَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَذُكِرَ لَهُ صُنْعُ خَالِدٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ وَرَفَعَ يَدَيْهِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَبْرَأُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ خَالِدٌ»[2].

**واتە: سالم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ خالدی کوڕی وەلیدی نارد بە لەشکرێکەوە بۆ لای بەنی جەزیمە، بانگی کردن بۆ ئیسلام، نەیانتوانی بە چاکی بڵێن: مسوڵمان بووین، بەڵکو وتیان: (صَبَأْنَا)، خالد کۆمەڵێکی لێ کوشتن و کۆمەڵێکی بەدیلی لێ گرتن، وتی: بۆ هەر کەس دیلەکەی خۆی دا بە دەستیەوە، هەتا ئەو ڕۆژە بەیانیان کردەوە، خالدی کوڕی وەلید بڕیاریدا هەر کەسەو دیلەکەی خۆی بکوژێت، ئیبنو عومەر وتی: سوێند بە خوا دیلەکەی خۆم ناکوژم، وە با هیچ کەسیش لە ئێمە دیلەکەی خۆی نەکوژێ، بیشر وتی: با هیچ کەسێک لە هاوەڵەکانم**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٣٣٩ و ٧١٨٩.





دیلەکەی نەکوژێ، وتی: هاتینەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەوەی بۆ باسکرا کە خالد کردی، پێغەمبەر ﷺ دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و فەرمووی: خوایە من بەریم لەوەی خالد کردی.

## باسی ئەوەی کە پێویستە دادوەر خۆی لێ بە دوور بگرێ

**٥٤٠٦-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: كَتَبَ أَبِي، وَكَتَبْتُ لَهُ إِلَى عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ وَهُوَ قَاضِي سِجِسْتَانَ أَنْ لَا تَحْكُمَ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَأَنْتَ غَضْبَانُ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا يَحْكُمْ أَحَدٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ»[١].

واتە: عەبدورڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە دەڵێ: باوکم نوسراوێکی بۆ نوسیم، منیش نوسراوێکم بۆ نوسی بۆ لای عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکرە کە دادوەری سجستان بوو، حوکم و بڕیار لە نێوان دوو کەسدا مەدە لە کاتی توڕەییدا، چونکە گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: با یەکێک لە ئێوە بڕیار لە نێوان دوو کەسدا نەدات لە کاتێکدا کە توڕەیە.

## مۆڵەتدان بە دادوەرێکی ئەمین و دەستپاک بەوەی لە کاتی توڕەییدا بڕیار بدات

**٥٤٠٧-** «عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ ﷺ، أَنَّهُ خَاصَمَ رَجُلاً مِنَ الْأَنْصَارِ قَدْ شَهِدَ بَدْراً مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي شِرَاجِ الْحَرَّةِ، كَانَا يَسْقِيَانِ بِهِ، كِلَاهُمَا النَّخْلَ فَقَالَ الْأَنْصَارِيُّ: سَرِّحِ الْمَاءَ يَمُرُّ عَلَيْهِ، فَأَبَى عَلَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اسْقِ يَا زُبَيْرُ ثُمَّ أَرْسِلِ الْمَاءَ إِلَى جَارِكَ فَغَضِبَ الْأَنْصَارِيُّ وَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنْ كَانَ ابْنَ عَمَّتِكَ، فَتَلَوَّنَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: يَا زُبَيْرُ اسْقِ، ثُمَّ احْبِسِ الْمَاءَ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الْجَدْرِ، فَاسْتَوْفَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلزُّبَيْرِ حَقَّهُ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَبْلَ ذَلِكَ أَشَارَ عَلَى الزُّبَيْرِ بِرَأْيٍ فِيهِ السَّعَةُ لَهُ وَلِلْأَنْصَارِيِّ، فَلَمَّا أَحْفَظَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ الْأَنْصَارِيُّ اسْتَوْفَى لِلزُّبَيْرِ حَقَّهُ فِي صَرِيحِ الْحُكْمِ، قَالَ الزُّبَيْرُ: « لَا أَحْسَبُ هَذِهِ الْآيَةَ أُنْزِلَتْ إِلَّا فِي ذَلِكَ: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ﴿٦٥﴾ ﴾النساء»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧١٥٨، ومسلم: ١٧١٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٦١ و ٢٣٦٢ و ٢٧٠٨ و ٤٥٨٥.




واتە: زوبەیری کوڕی عەوام ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو ناکۆکی هەبوو لەگەڵ پیاوێکی ئەنصاریدا کە ئامادەی بەدر بوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی ڕێڕەوی ئاوێکەوە کە بە زەویەکی بەردەڵاندا دەڕۆیی، هەردووکیان ئاوی دار خورماکەیان پێ دەدا، ئەنصاریەکە وتی: ئاوەکە بەر بدەرەوە با سەرەتا بۆ من بێت، زوبەیر ڕازی نەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی زوبەیر سەرەتا تۆ ئاوی بدە، پاشان ئاوەکە بەر بدەرەوە بۆ دراوسێکەت، ئەنصاریەکە توڕە بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دیارە ئەوە ئامۆزای تۆیە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگی گۆڕا، پاشان فەرمووی: ئەی زوبەیر ئاوی دار خورماکانت بدەو، پاشان ئاوەکە بگرەرەوە، هەتا دەگەڕێتەوە بۆ شوێنێکی تر، پێغەمبەری خوا ﷺ مافی بە زوبەیردا، هەروەها پێش ئەوە ئاماژەی بە زوبەیر کرد کە بەشی ئەنصارەکەیش بدات، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنصاریەکەی پاراست لەوەی مافی زوبەیر بدا لە حوکمێکی ڕاستەوخۆدا، زوبەیر وتی: وا نابینم ئەم ئایەتە دابەزیبێ مەگەر بۆ ئەمە نەبێت: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ﴿٦٥﴾ ﴾(واتە: نەخێر سوێند بە پەروەردگارت بڕوادار نین تا تۆ نەکەنە دادوەر لە هەر ئاژاوەو دووبەرەکیەکی نێوانیاندا).

## بڕیاری دادوەر لە ماڵی خۆیدا

**٥٤٠٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كَعْبٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ تَقَاضَى ابْنَ أَبِي حَدْرَدٍ دَيْناً كَانَ عَلَيْهِ فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا حَتَّى سَمِعَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ فِي بَيْتِهِ فَخَرَجَ إِلَيْهِمَا فَكَشَفَ سِتْرَ حُجْرَتِهِ فَنَادَى: يَا كَعْبُ، قَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: ضَعْ مِنْ دَيْنِكَ هَذَا وَأَوْمَأَ إِلَى الشَّطْرِ، قَالَ: قَدْ فَعَلْتُ قَالَ: قُمْ فَاقْضِهِ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی کەعب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ ئەو قەرزی لەلای ئیبنو ئەبو حەدرەد داوای قەرزەکەی کردەوە، دواتر دەنگیان بەرزبوویەوە هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێیان بوو، لە ماڵی خۆیدا بوو، پەردەی ژوورەکەی خۆی لاداو هاتە دەرەوەو، بانگی کرد: ئەی کەعب، وتی: لە خزمەتتدام ئەی پێغەمبەری

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٧ و ٤٧١ و ٢٤١٨ و ٢٤٢٤ و ٢٧٠٦ و ٢٧١٠، ومسلم: ٢٠ و ١٥٥٨/٢١، وأبو داود: ٣٥٩٥، وإبن ماجه: ٢٤٢٩.




خوا ﷺ، فەرمووی: واز لە نیوەی قەرزەکەت بهێنە، وتی: ئەوە وازم لێهێنا، فەرمووی: دەی تۆش هەڵسە نیوەکەی تری بدەرەوە.

## دەستدرێژی کردن

٥٤٠٩- «عَنْ عَبَّادِ بْنِ شُرَحْبِيلَ ﷺ قَالَ: قَدِمْتُ مَعَ عُمُومَتِي الْمَدِينَةَ فَدَخَلْتُ حَائِطاً مِنْ حِيطَانِهَا، فَفَرَكْتُ مِنْ سُنْبُلِهِ، فَجَاءَ صَاحِبُ الْحَائِطِ فَأَخَذَ كِسَائِي وَضَرَبَنِي، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَسْتَعْدِي عَلَيْهِ، فَأَرْسَلَ إِلَى الرَّجُلِ، فَجَاءُوا بِهِ فَقَالَ: مَا حَمَلَكَ عَلَى هَذَا؟ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ دَخَلَ حَائِطِي، فَأَخَذَ مِنْ سُنْبُلِهِ فَفَرَكَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا عَلَّمْتَهُ إِذْ كَانَ جَاهِلاً، وَلَا أَطْعَمْتَهُ إِذْ كَانَ جَائِعاً، ارْدُدْ عَلَيْهِ كِسَاءَهُ، وَأَمَرَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِوَسْقٍ أَوْ نِصْفِ وَسْقٍ»[1].

واتە: عەبادەی کوڕی شورەحبیل ﷺ دەڵێ: لەگەڵ مامەکانم هاتم بۆ مەدینە، چوومە ناو باخچەیەکەوە لە بەروبومەکەم کردەوە، پاشان دام بە لەپدا بۆ ئەوەی دەنکەکانی دەربکەم، خاوەنی باخچەکە هات جلەکەمی بردو لێیدام، منیش هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوام کرد تۆڵەی لێ بکاتەوە بۆم، ئەوانیش پیاوەکەیان هێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چی وای لێکردی ئەم کارە بکەیت؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو چووە ناو باخچەکەمەوە، لە بەروبومەکەی بردو دای بە لەپەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بۆ فێرت نەکرد لەوەیە ئەو نەفام بووایە، ئەی بۆ تێرت نەکرد لەوەیە ئەو برسی بووایە، جلەکەی بۆ بگێڕەرەوە، وە فەرمانی پێکردم بارێک یان نیو بار خورمای بۆ ببەم.

## پاراستنی ئافرەتان لە شوێنی حوکم و بڕیاردان

٥٤١٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ، أَنَّهُمَا أَخْبَرَا، أَنَّ رَجُلَيْنِ اخْتَصَمَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: أَحَدُهُمَا: اقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللَّهِ، وَقَالَ الْآخَرُ وَهُوَ أَفْقَهُهُمَا: أَجَلْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَأْذَنْ لِي فِي أَنْ أَتَكَلَّمَ، قَالَ: إِنَّ ابْنِي كَانَ عَسِيفاً عَلَى هَذَا، فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ، فَأَخْبَرُونِي أَنَّ عَلَى ابْنِي الرَّجْمَ، فَافْتَدَيْتُ بِمِائَةِ شَاةٍ وَبِجَارِيَةٍ لِي، ثُمَّ إِنِّي سَأَلْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ، فَأَخْبَرُونِي أَنَّمَا عَلَى ابْنِي جَلْدُ مِائَةٍ، وَتَغْرِيبُ عَامٍ، وَإِنَّمَا الرَّجْمُ عَلَى امْرَأَتِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ،

---

(١) صحيح.




لَأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللَّهِ، أَمَّا غَنَمُكَ وَجَارِيَتُكَ فَرَدٌّ إِلَيْكَ، وَجَلَدَ ابْنَهُ مِائَةً، وَغَرَّبَهُ عَاماً، وَأَمَرَ أُنَيْساً أَنْ يَأْتِيَ امْرَأَةَ الْآخَرِ، فَإِنِ اعْتَرَفَتْ، فَارْجُمْهَا، فَاعْتَرَفَتْ، فَرَجَمَهَا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرەو زەیدی کوڕی خالدی جوهەنی دەگێڕنەوە، دوو پیاو کێشەی خۆیان هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێکیان وتی: دادوەری لە نێوانماندا بکە بە کتێبی خوا، ئەوی تریان لە ئەو تێگەیشتووتر بوو، وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، مۆڵەتم پێ بدە قسە بکەم، وتی: کوڕەکەم لای ئەو پیاوە کاری دەکرد، زینای لەگەڵ ژنەکەی کرد، هەواڵیان پێدام کوڕەکەم دەبێ بەردباران بکرێ، سەد مەڕو جاریەیەکم لە پێناویدا، پاشان پرسیارم کرد لە خەڵکی زانا هەواڵیان پێدام کوڕەکەم سەد داری لێدەدرێ و ساڵێک دوور دەخرێتەوە، بەڵکو ڕەجم لەسەر ژنەکەیەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بە دەستە دادوەری دەکەم لە نێوانتاندا بە کتێبی خوا، بەڵام مەڕو جاریەکەت دەگەڕێنرێتەوە بۆت، سەد داریدا لە کوڕەکەی و ساڵێک دووری خستەوە، فەرمانی کرد بە کەسێک ژنی کابرا بهێنێ، ئەگەر دانی بە تاوانەکەیدانا، ئەوە بەردبارنی بکات، ژنەکەیش دانی پێدانا، ئەویش ڕەجمی کرد.

**٥٤١١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ، وَشِبْلٍ ﷺ قَالُوا: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ فَقَالَ: أَنْشُدُكَ بِاللَّهِ، إِلَّا مَا قَضَيْتَ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللَّهِ، فَقَامَ خَصْمُهُ وَكَانَ أَفْقَهَ مِنْهُ فَقَالَ: صَدَقَ، اقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللَّهِ، قَالَ: قُلْ قَالَ: إِنَّ ابْنِي كَانَ عَسِيفاً عَلَى هَذَا، فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ، فَافْتَدَيْتُ مِنْهُ بِمِائَةِ شَاةٍ وَخَادِمٍ، وَكَأَنَّهُ أُخْبِرَ أَنَّ عَلَى ابْنِهِ الرَّجْمَ فَافْتَدَى مِنْهُ، ثُمَّ سَأَلْتُ رِجَالاً مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ، فَأَخْبَرُونِي أَنَّ عَلَى ابْنِي جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللَّهِ ﷻ، أَمَّا الْمِائَةُ شَاةٍ وَالْخَادِمُ فَرَدٌّ عَلَيْكَ، وَعَلَى ابْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ، اغْدُ يَا أُنَيْسُ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا، فَإِنِ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا فَغَدَا عَلَيْهَا، فَاعْتَرَفَتْ فَرَجَمَهَا»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرەو زەیدی کوڕی خالدی جوهەنی و شیبل ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بووین پیاوێک لە مەجلیسەکەدا هەڵسا وتی: سوێندت دەدەم بە خوا بە کتێبی خوا دادوەریان لە نێواندا بکەی، دژەکەی هەڵسا لەو تێگەیشتووتر بوو

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣١٤، ومسلم: ١٦٩٨.

(٢) صحيح.




وتی: ڕاست دەکات، بە کتێبی خوا دادوەری لە نێوانماندا بکە، وتی: کوڕەکەم لای ئەو پیاوە کاری دەکرد، زینای لەگەڵ ژنەکەی کرد، منیش سەد مەڕو خزمەتکارێکم لە پێناویدا، وەکو چۆن بڵێی هەواڵی پێدرابوو کوڕەکەی دەبێ ڕەجم بکرێ، لە بریدا فیدیەی دا، پاشان پرسیارم کرد لە خەڵکی زانا هەواڵیان پێدام کوڕەکەم سەد داری لێدەدرێ و ساڵێک دوور دەخرێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە دادوەریتان لە نێواندا دەکەم بە کتێبی خوا، بەڵام سەد مەڕو خزمەتکارەکەت دەگەڕێنرێتەوە بۆت، کوڕەکەیشت سەد داری لێدەدرێ و ساڵێک دوور دەخرێتەوە، ئەی ئونەیس بڕۆ بەیانی بکەرەوە لای ژنی ئەم پیاوە، ئەگەر دانی بە تاوانەکەیدانا، ئەوە بەردبارنی بکە.

## ناردنی دادوەر بە شوێن ئەو کەسەی هەواڵدراوە زینای کردوە

**٥٤١٢-** «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أُتِيَ بِامْرَأَةٍ قَدْ زَنَتْ فَقَالَ: مِمَّنْ؟ قَالَتْ: مِنَ الْمُقْعَدِ الَّذِي فِي حَائِطِ سَعْدٍ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ، فَأُتِيَ بِهِ مَحْمُولاً، فَوُضِعَ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَاعْتَرَفَ فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِإِثْكَالٍ فَضَرَبَهُ، وَرَحِمَهُ لِزَمَانَتِهِ، وَخَفَّفَ عَنْهُ»[١].

واتە: ئەبو ئومامە سەهلی کوڕی حونەیف ﷺ دەگێڕێتەوە: ئافرەتێکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ زینای کردبوو، فەرمووی: خەڵکی کوێی؟ وتی: لە (الْمُقْعَد)م لای باخەکەی سەعد، ناردی بە دوای پیاوەکەدا، هێنایانە خزمەتی هەڵیان گرتبوو، لەبەردەستیدا دایاننا، دانی نا بە تاوانەکەیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لقی دار خورمای کرد هەندێکی لێدا، بەزەیی پێدا هاتەوە لەبەر پیریی، سووکیشی کرد لەسەری.

## ڕۆیشتنی دادوەر یان کاربەدەست بۆ لای ژێردەستەکانی بۆ ئەوەی ئاشتەوایی لە نێوانیاندا بکات

**٥٤١٣-** «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ يَقُولُ: وَقَعَ بَيْنَ حَيَّيْنِ مِنَ الْأَنْصَارِ كَلَامٌ حَتَّى تَرَامَوْا بِالْحِجَارَةِ، فَذَهَبَ النَّبِيُّ ﷺ لِيُصْلِحَ بَيْنَهُمْ، فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فَأَذَّنَ بِلَالٌ، وَانْتُظِرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَاحْتُبِسَ، فَأَقَامَ الصَّلَاةَ، وَتَقَدَّمَ أَبُو بَكْرٍ، فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي بِالنَّاسِ، فَلَمَّا رَآهُ النَّاسُ

---

(١) صحيح.




صَفَّحُوا، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ لَا يَلْتَفِتُ فِي الصَّلَاةِ، فَلَمَّا سَمِعَ تَصْفِيحَهُمُ الْتَفَتَ، فَإِذَا هُوَ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَرَادَ أَنْ يَتَأَخَّرَ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ أَنِ اثْبُتْ، فَرَفَعَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ «يَعْنِي يَدَيْهِ» ثُمَّ نَكَصَ الْقَهْقَرَى، وَتَقَدَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّى، فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الصَّلَاةَ، قَالَ: مَا مَنَعَكَ أَنْ تَثْبُتَ؟ قَالَ: مَا كَانَ اللَّهُ لِيَرَى ابْنَ أَبِي قُحَافَةَ بَيْنَ يَدَيْ نَبِيِّهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: مَا لَكُمْ إِذَا نَابَكُمْ شَيْءٌ فِي صَلَاتِكُمْ صَفَّحْتُمْ إِنَّ ذَلِكَ لِلنِّسَاءِ، مَنْ نَابَهُ شَيْءٌ فِي صَلَاتِهِ فَلْيَقُلْ: سُبْحَانَ اللَّهِ»[1].

واتە: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: لە نێوان دوو گەڕەکی ئەنصارەکاندا دەمەقالێ و ئاژاوە ڕوویدا هەتا یەکتریان بەردباران کرد، پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ ئەوەی ئاشتەوایی بخاتە نێوانیانەوە، کاتی نوێژ هات، بیلال بانگیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێ مایەوە، قامەتی نوێژ کراو ئەبو بەکر ﷺ پێش کەوت، پێغەمبەریش هات و ئەبو بەکر نوێژی بۆ خەڵکەکە دەکرد، کاتێ خەڵکەکە بینیان چەپڵەیان لێدا، ئەبو بەکر لە نوێژدا لای نەدەکردەوە، بەڵام کاتێ بیستی زۆربەی خەڵکەکە دایان لە چەپڵە، لای کردەوە، پێغەمبەری ﷺ بینی ویستی بێتە دواوە، (پێغەمبەری خوا ﷺ) ئاماژەی بۆ کرد لە جێگای خۆی بمێنێتەوە، ئەبو بەکر دەستەکانی بەرزکردەوەو پاشان هاتە دواوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێش کەوت و نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، کاتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژ بوویەوە فەرمووی: چی ڕێگری لێت کرد لە شوێنی خۆت جێگیر نەبووی؟ ئەبو بەکر وتی: بۆ کوڕەکەی ئەبو قوحافە نیە خوا تەماشای بکات پێشنوێژی پێغەمبەر ﷺ بکات، پاشان بە خەڵکەکەی فەرموو: ئەوە چیە ئەگەر شتێکتان بۆ دروست بوو لە ناو نوێژەکەتاندا، چەپڵە لێ ئەدەن، ئەوە بۆ ئافرەتانە، هەرکەس شتێک لە ناو نوێژەکەیدا ڕوویدا، با بڵێ: سُبْحَانَ اللَّه.

## ئاماژەکردنی دادوەر بۆ کەسی بەرانبەر کە ئاشتەوایی لەگەڵ ئەو کەس بکات کە ناکۆکی لەگەڵ هەیە

**٥٤١٤-** «عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ لَهُ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي حَدْرَدٍ الْأَسْلَمِيِّ «يَعْنِي دَيْناً» فَلَقِيَهُ، فَلَزِمَهُ، فَتَكَلَّمَا حَتَّى ارْتَفَعَتِ الْأَصْوَاتُ، فَمَرَّ بِهِمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا كَعْبُ فَأَشَارَ بِيَدِهِ كَأَنَّهُ يَقُولُ: النِّصْفَ، فَأَخَذَ نِصْفاً مِمَّا عَلَيْهِ، وَتَرَكَ نِصْفاً»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




واتە: کەعبی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو قەرزێکی لە لای عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو حەدرەدی ئەسلەمی بوو، کاتێ پێی گەیشت ڕووبەڕوی بوویەوە، قسەیان کرد هەتا دەنگیان بەرزبویەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بە لایاندا فەرمووی: ئەی کەعب بە دەستی ئاماژەی بۆی کرد کە نیوەی قەرزەکەی وەربگرێ، ئەویش نیوەی وەرگرت و وازی لە نیوەکەی تر هێنا.

## ئاماژە کردنی دادوەر بۆ خاوەن حەق لە تاوانبار خۆش بێت

**٥٤١٥-** «عَنْ وَائِلٍ ﷺ قَالَ: شَهِدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حِينَ جَاءَ بِالْقَاتِلِ يَقُودُهُ وَلِيُّ الْمَقْتُولِ فِي نِسْعَةٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِوَلِيِّ الْمَقْتُولِ: أَتَعْفُو؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَتَأْخُذُ الدِّيَةَ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَتَقْتُلُهُ؟ قَالَ: نَعَمْ قَالَ: اذْهَبْ بِهِ. فَلَمَّا ذَهَبَ فَوَلَّى مِنْ عِنْدِهِ دَعَاهُ فَقَالَ: أَتَعْفُو؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَتَأْخُذُ الدِّيَةَ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَتَقْتُلُهُ؟ قَالَ: نَعَمْ قَالَ: اذْهَبْ بِهِ. فَلَمَّا ذَهَبَ فَوَلَّى مِنْ عِنْدِهِ دَعَاهُ فَقَالَ: أَتَعْفُو؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَتَأْخُذُ الدِّيَةَ؟ قَالَ: لَا، قَالَ: فَتَقْتُلُهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: اذْهَبْ بِهِ؟. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ ذَلِكَ: أَمَا إِنَّكَ إِنْ عَفَوْتَ عَنْهُ يَبُوءُ بِإِثْمِهِ، وَإِثْمِ صَاحِبِكَ فَعَفَا عَنْهُ وَتَرَكَهُ، فَأَنَا رَأَيْتُهُ يَجُرُّ نِسْعَتَهُ»[(١)].

واتە: وائل ﷺ دەڵێ: ئامادەبووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بکوژێکیان هێناو خاوەن کوژراوەکە ڕای دەکێشا پێستێکی لە مل کردبوو (کە وشتری پێ لغاو دەکرا) پێغەمبەری خوا ﷺ بە خاوەنی کوژراوەکەی فەرموو: ئایا لێی خۆش دەبی؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ئایا خوێنبایی وەردەگری؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: دەیکوژیتەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: بیبە لەگەڵ خۆت، کاتێ کە بردی، لێی دوورکەوتەوە بانگی کرد، پێی فەرموو: ئایا لێی خۆش دەبی؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ئایا خوێنبایی وەردەگری؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: دەیکوژیتەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: بیبە لەگەڵ خۆت، کاتێ کە بردی لەگەڵ خۆی و لێی دوورکەوتەوە، فەرمووی: ئایا لێی خۆش دەبی؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ئایا خوێنبایی وەردەگری؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: دەیکوژیتەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: بیبە لەگەڵ خۆت، پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەدا فەرمووی: تۆ ئەگەر لێی خۆش بی ئەوە تاوانی خۆی و هاوەڵەکەیشت

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٢ و ١٦٨٠/٣٣، وأبو داود: ٤٤٩٩ و ٤٥٠٠ و ٤٥٠١.




دەکەوێتە ئەستۆی، ئەویش لێی خۆش بوو وازی لێ هێنا، من بە چاوی خۆم بینیم ئەو پەتەی ئەوی پێ بەسترابوویەوە بە بەتاڵی ڕادەکێشا (واتە: پیاوەکەی لێ کردبویەوەو ئازادی کردبوو).

## ئاماژەکردنی دادوەر بە نەرم و نیانی

**٥٤١٦-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، أَنَّ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ خَاصَمَ الزُّبَيْرَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي شِرَاجِ الْحَرَّةِ الَّتِي يَسْقُونَ بِهَا النَّخْلَ، فَقَالَ الْأَنْصَارِيُّ: سَرِّحِ الْمَاءَ يَمُرُّ، فَأَبَى عَلَيْهِ، فَاخْتَصَمُوا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اسْقِ يَا زُبَيْرُ، ثُمَّ أَرْسِلِ الْمَاءَ إِلَى جَارِكَ فَغَضِبَ الْأَنْصَارِيُّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنْ كَانَ ابْنَ عَمَّتِكَ، فَتَلَوَّنَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ قَالَ: يَا زُبَيْرُ، اسْقِ، ثُمَّ احْبِسِ الْمَاءَ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الْجَدْرِ، قَالَ الزُّبَيْرُ: إِنِّي أَحْسَبُ أَنَّ هَذِهِ الْآيَةَ نَزَلَتْ فِي ذَلِكَ: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾ النساء»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە، پیاوێکی ئەنصاری ناکۆکی نێوان خۆی و زوبەیری برد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی ڕێڕەوی ئاوێکەوە کە بەناو زەویەکی بەردەڵاندا دەڕۆیی، هەردووکیان ئاوی دار خورماکەیان پێ دەدا، ئەنصاریەکە وتی: ئاوەکە بەر بدەرەوە با بڕوات، زوبەیر پێی ناڕازی بوو، کێشەکەیان بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەی زوبەیر سەرەتا تۆ ئاوی بدە، پاشان ئاوەکە بەر بدەرەوە بۆ دراوسێکەت، ئەنصاریەکە توڕەبوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دیارە ئەوە ئامۆزای تۆیە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگی گۆڕا، پاشان فەرمووی: ئەی زوبەیر ئاوی دارخورماکانت بدەو پاشان ئاوەکە بگرەرەوە، هەتا دەگەڕێتەوە بۆ شوێنێکی تر، زوبەیر وتی: من وا دەزانم ئەم ئایەتە بۆ ئەمە دابەزیە خوارەوە:﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾ (واتە: نەخێر سوێند بە پەروەردگارت بڕوادار نین).

## تکای دادوەر بۆ ناکۆکیکاران پێش ئەوەی بڕیارەکە یەکلابێتەوە

**٥٤١٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ زَوْجَ بَرِيرَةَ كَانَ عَبْداً يُقَالُ لَهُ: مُغِيثٌ، كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ يَطُوفُ خَلْفَهَا يَبْكِي وَدُمُوعُهُ تَسِيلُ عَلَى لِحْيَتِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِلْعَبَّاسِ: يَا عَبَّاسُ، أَلَا

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٥٩ و ٢٣٦٠، ومسلم: ٢٣٥٧، وأبو داود: ٣٦٣٧ و ٣٠٢٧، وإبن ماجه: ١٥ و ٢٤٨٠.




تَعْجَبْ مِنْ حُبِّ مُغِيثٍ بَرِيرَةَ، وَمِنْ بُغْضِ بَرِيرَةَ مُغِيثاً؟ فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ ﷺ: لَوْ رَاجَعْتِيهِ، فَإِنَّهُ أَبُو وَلَدِكِ، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَأْمُرُنِي؟ قَالَ: إِنَّمَا أَنَا شَفِيعٌ قَالَتْ: فَلَا حَاجَةَ لِي فِيهِ»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوەکەی بەریرە کۆیلەیەک بوو پێی دەوترا: موغیث، هەروەکو ئەوەی ئێستا تەماشای بکەم بینیم (دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر داوای ژنەکە لێکی جیاکردنەوە) بە دوایدا دەگریاو فرمێسک بە ڕیشیدا دەهاتە خوارەوە، پێغەمبەر ﷺ بە عەبباسی فەرموو: ئەی عەبباس ئایا سەرت سوڕنامێنێ لە خۆشەویستی موغیث بۆ بەریرەو لە ڕقی بەریرە بۆ موغیث؟ پێغەمبەر ﷺ بە بەریرەی فەرموو: خۆزگە دەگەڕایتەوە بۆ لای، چونکە ئەو باوکی منداڵەکەتە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا فەرمانم پێ دەکەی، فەرمووی: بەڵکو من تەنها تکاکارم، ئەویش وتی: من هیچ پێویستیەکم پێی نیە.**

## ڕێگری کردنی دەسەڵاتدار لە ژێردەستەکانی بە لەناوبردنی سامانیان لە کاتێکدا پێویستیان پێیەتی

**٥٤١٨-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أَعْتَقَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ غُلَاماً لَهُ عَنْ دُبُرٍ، وَكَانَ مُحْتَاجاً، وَكَانَ عَلَيْهِ دَيْنٌ، فَبَاعَهُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِثَمَانِ مِائَةِ دِرْهَمٍ، فَأَعْطَاهُ فَقَالَ: اقْضِ دَيْنَكَ، وَأَنْفِقْ عَلَى عِيَالِكَ»[٢].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک لە ئەنصارەکان کۆیلەیەکی هەبوو ئازادکردنی بەستبوو بە مردنی خۆیەوە، ئەو پیاوە کەسێکی هەژار و قەرزار بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی فرۆشت بە هەشت درهەم و پارەکەی پێیداو فەرمووی: قەرزەکەتی پێ بدەرەوەو خەرجی بکە بۆ ماڵ و منداڵەکەت.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٨٣، وأبو داود: ٢٢٣١، وإبن ماجه: ٢٠٧٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٤١، ومسلم: ٩٩٧.




## دادوەری کردن لە ماڵ و سامانی کەم و زۆردا

**٥٤١٩-** «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنِ اقْتَطَعَ حَقَّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِهِ فَقَدْ أَوْجَبَ اللَّهُ لَهُ النَّارَ، وَحَرَّمَ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: وَإِنْ كَانَ شَيْئاً يَسِيراً يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: وَإِنْ كَانَ قَضِيباً مِنْ أَرَاكٍ»[1].

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بە هۆی سوێند خواردنیەوە ماڵی مسوڵمانێک بخوات، ئەوە خوا ئاگری بۆ پێویست دەکات و بەهەشتیشی لەسەر قەدەغە دەکات، پیاوێک پێی وت: ئەی ئەگەر شتێکی کەمیش بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەگەر دارێکیش بێت لە (أَرَاك) (ئەو دارەیە کە سیواکی لێ دروست دەکرێ).

## بڕیاردانی دادوەر لەسەر ئەو کەسەی ئامادە نیە ئەگەر ناسی

**٥٤٢٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: جَاءَتْ هِنْدٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ، وَلَا يُنْفِقُ عَلَيَّ وَوَلَدِي مَا يَكْفِينِي، أَفَآخُذُ مِنْ مَالِهِ، وَلَا يَشْعُرُ؟ قَالَ: خُذِي مَا يَكْفِيكِ وَوَلَدِكِ بِالْمَعْرُوفِ»[2].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هیند هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەبو سوفیان پیاوێکی ڕەزیلە بە ئەندازەی پێویست نابەخشێ بە من و منداڵەکەم، ئایا لە ماڵەکەی ببەم، بەبێ ئەوەی هەست بکات؟ فەرمووی: بە ئەندازەی پێویستی خۆت و منداڵەت بە شێوەیەکی چاک لێی ببە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢١٨ و ١٣٧/٢١٩، وإبن ماجه: ٢٣٢٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢١١ و ٢٤٦٠ و ٣٨٢٥ و ٥٣٥٩ و ٥٣٦٤ و ٥٣٧٠ و ٦٦٤١ و ٧١٦١، ومسلم: ٧ و ١٧١٤/٩، وأبو داود: ٣٥٣٢ و ٣٥٣٣، وإبن ماجه: ٢٢٩٣.

## قەدەغەکردن لە دادوەری کردن لە یەک شتدا بە دوو بڕیار

**٥٤٢١-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، وَكَانَ عَامِلاً عَلَى سِجِسْتَانَ قَالَ: كَتَبَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرَةَ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا يَقْضِيَنَّ أَحَدٌ فِي قَضَاءٍ بِقَضَاءَيْنِ، وَلَا يَقْضِي أَحَدٌ بَيْنَ خَصْمَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ»[١].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە، ئەو دەسەڵاتدار بوو بەسەر سجستانەوە، دەڵێ: ئەبو بەکرە نوسراوێکی بۆ کردم دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: با هیچ کەس دادوەری نەکات لە یەک شتدا بە دوو بڕیار، (بۆ نموونە: بڕیار بدات بە چەسپاندنی قەرزو بە لابردنی)، وە با هیچ کەس لە کاتی توڕەییدا دادوەری نەکات لە نێوان دوو کەسدا کە ناکۆکیان هەیە.

## ئەوەی بڕیارو ناکۆکی پێ یەکلادەکرێتەوە

**٥٤٢٢-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ، وَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَلْحَنُ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، فَإِنَّمَا أَقْضِي بَيْنَكُمَا عَلَى نَحْوِ مَا أَسْمَعُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ شَيْئاً، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ»[٢].

واتە: دایکی سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئێوە ناکۆکیەکانتان دەهێنن بۆ لام، بێگومان منیش مرۆڤم، پێدەچێت هەندێکتان زمانی بۆ بەڵگەهێنانەوە بەهێزتر بێت لەوی تر، منیش دادوەری دەکەم لە نێوانتاندا بە پێی ئەوەی دەیبیستم، جا هەرکەس حەق و مافی براکەیمدا بە ئەو، ئەوا باوەرینەگرێت، چونکە بێگومان بەشێک لە ئاگری بۆ دەبڕم.

## بابەت: کەسی ناکۆکی سەرسەخت

**٥٤٢٣-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ أَبْغَضَ الرِّجَالِ إِلَى اللَّهِ الْأَلَدُّ الْخَصِمُ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٥٨، ومسلم: ١٧١٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٥٧ و ٤٥٢٣ و ٧١٨٨، ومسلم: ٢٦٦٨، والترمذي: ٢٩٧٦.




واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی بوغزێنراوترینی ناو پیاوان لای خوا کەسێکی سەرسەختە لە کاتی ناکۆکیدا (واتە: هەمیشە ناحەزی و کێشەی لەگەڵ خەڵکدا هەیە).

## دادوەری کردن لە بارەی شتێکەوە بەڵگەی نەبێ بۆی

٥٤٢٤- «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، أَنَّ رَجُلَيْنِ اخْتَصَمَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فِي دَابَّةٍ لَيْسَ لِوَاحِدٍ مِنْهُمَا بَيِّنَةٌ، فَقَضَى بِهَا بَيْنَهُمَا نِصْفَيْنِ»[1].

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە: دوو پیاو ناکۆکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لەبارەی ئاژەڵێکەوە، هیچ کامەیان بەڵگەی پێنەبوو، (کە هی ئەو بێت) بڕیاریدا ئاژەڵەکە بکاتە دووبەشەوە لە نێوانیاندا.

## ئامۆژگاری دادوەر لەسەر سوێند خواردن

٥٤٢٥- «عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ ﷺ قَالَ: كَانَتْ جَارِيَتَانِ تَخْرُزَانِ بِالطَّائِفِ، فَخَرَجَتْ إِحْدَاهُمَا وَيَدُهَا تَدْمَى، فَزَعَمَتْ أَنَّ صَاحِبَتَهَا أَصَابَتْهَا، وَأَنْكَرَتِ الْأُخْرَى، فَكَتَبْتُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فِي ذَلِكَ، فَكَتَبَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى أَنَّ الْيَمِينَ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ، وَلَوْ أَنَّ النَّاسَ أُعْطُوا بِدَعْوَاهُمْ لَادَّعَى نَاسٌ أَمْوَالَ نَاسٍ وَدِمَاءَهُمْ، فَادْعُهَا وَاتْلُ عَلَيْهَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُو۟لَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ ﴿٧٧﴾﴾آل عمران، حَتَّى خَتَمَ الْآيَةَ، فَدَعَوْتُهَا فَتَلَوْتُ عَلَيْهَا فَاعْتَرَفَتْ بِذَلِكَ فَسَرَّهُ»[2].

واتە: ئیبنو ئەبو مولەیکە ﷺ دەڵێ: دوو کەنیزەک هەبوون لە طائف پێستەیان دەدوری، دانەیەکیان دەرچوو دەستی خوێنی لێدەهات، دەیوت هاوەڵەکەی لێیداوە، هاوەڵەکەیشی ئینکاری دەکرد، نوسراوێکم نووسی بۆ ئیبنو عەبباس لەوبارەیەوە، ئەویش نوسراوێکی نووسی، پێغەمبەری خوا ﷺ دادوەری کردوە سوێند خواردن لەسەر شکات لێکراوە، ئەگەر خەڵکی بە سکاڵا کردنیان پێیان بدرێ، ئەوە خەڵکانێک ماڵ و خوێنی کەسانێکی تر دەبەن، بانگی بکەو ئەم ئایەتەی بەسەردا بخوێنەوە:

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٦١٣ و ٣٦١٥، وإبن ماجه: ٢٣٣٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥١٤، ومسلم: ١٧١١، وأبو داود: ٣٦١٩، والترمذي: ١٣٤٢، وإبن ماجه: ٢٣٢١.



﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُوْلَـٰٓئِكَ لَا خَلَـٰقَ لَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ﴿٧٧﴾ ﴾ (واتە: بێگومان ئەوانەی دەیفرۆشن پەیمانی خواو سوێندەکانی خۆیان بە نرخێکی کەم ئەوانە بێ بەشن لە ڕۆژی دوایی دا)، هەتا ئایەتەکەی تەواو کرد، بانگم کردو ئایەتەکەم بەسەریدا خوێندەوە، دانی بەوەداناو زۆری پێ خۆش بوو.

## دادوەر چۆن داوا دەکات سوێندی بۆ بخورێ

**٥٤٢٦-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ مُعَاوِيَةُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ عَلَى حَلْقَةٍ يَعْنِي مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: مَا أَجْلَسَكُمْ؟ قَالُوا: جَلَسْنَا نَدْعُو اللَّهَ وَنَحْمَدُهُ عَلَى مَا هَدَانَا لِدِينِهِ، وَمَنَّ عَلَيْنَا بِكَ، قَالَ: اللَّهُ مَا أَجْلَسَكُمْ إِلَّا ذَلِكَ؟ قَالُوا: اللَّهُ مَا أَجْلَسَنَا إِلَّا ذَلِكَ، قَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهَمَةً لَكُمْ، وَإِنَّمَا أَتَانِي جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ فَأَخْبَرَنِي أَنَّ اللَّهَ ﷻ يُبَاهِي بِكُمُ الْمَلَائِكَةَ»[1].

**واتە:** ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: موعاویە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆ ناو هەندێ لە هاوەڵانی، فەرمووی: چی داینیشاندوون؟ وتیان: دانیشتوین داوا لە خوای گەورە بکەین و ستایشی بکەین لە سەر ئەوەی هیدایەتی داوین بۆ ئاینەکەی، وە بە هۆی تۆوەوە منەتی کردوە بە سەرماندا، فەرموی: سوێندتان دەدەم بە خوا هیچ شتێک دای نەنیشاندوون جگە لەوە نەبێ؟ وتیان: سوێند بە خوا هیچ شتێک دای نەنیشاندوین جگە لەوە، فەرمووی: من سوێندتان نادەم لەبەر ئەوەی گومانم لێتان هەبێ، بەڵکو جبریل هات بۆ لام و هەواڵی پێدام کە خوا ﷻ فەزل و چاکەی ئێوەو کردەوە چاکەکانتان نیشانی فریشتەکان دەدا (تاوەکو بزانم ئەو فەزڵە تەنها هی ئەوەیە).

**٥٤٢٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: رَأَى عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلَامُ رَجُلاً يَسْرِقُ، فَقَالَ لَهُ: أَسَرَقْتَ؟ قَالَ: لَا وَاللَّهِ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، قَالَ عِيسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ: آمَنْتُ بِاللَّهِ، وَكَذَّبْتُ بَصَرِي»[2].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عیسای کوڕی مەریەم پیاوێکی بینی دزی دەکرد، پێی فەرموو: ئایا دزیت کرد؟ وتی: نەخێر، سوێند بەو خوایەی هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لەو، عیسا فەرمووی: بڕوام بە خوا هێناو، چاوەکانم بە درۆخستەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧٠١، والترمذي: ٣٣٧٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤٤٤، ومسلم: ٢٣٦٨، وإبن ماجه: ٢١٠٢.




٥٤٢٨- «عَنْ مُعَاذِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: أَصَابَنَا طَشٌّ وَظُلْمَةٌ، فَانْتَظَرْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِيُصَلِّيَ بِنَا، ثُمَّ ذَكَرَ كَلَاماً مَعْنَاهُ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِيُصَلِّيَ بِنَا، فَقَالَ: قُلْ فَقُلْتُ: مَا أَقُولُ؟، قَالَ: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ﴾، وَالْمُعَوِّذَتَيْنِ حِينَ تُمْسِي، وَحِينَ تُصْبِحُ، ثَلَاثاً يَكْفِيكَ كُلَّ شَيْءٍ»[(١)].

**واتە: موعازی کوڕی عەبدوڵلا دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: تووشی بارانێکی کەم و تاریکیەک بووین، چاوەڕوانی پێغەمبەرمان کرد بۆ ئەوەی نوێژمان بۆ بکات، فەرمووی: بڵێ، وتم: چی بڵێم؟ فەرمووی: سێ جار ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ﴾ و (الْمُعَوِّذَتَيْنِ) (واتە: سوورەتی (الناس)و (الفلق) کاتێ شەو دادێ و کاتێ ڕۆژ دەبێتەوە، بەسە بۆت لە هەموو شتێک.**

٥٤٢٩- «عَنْ مُعَاذِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خُبَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي طَرِيقِ مَكَّةَ، فَأَصَبْتُ خُلْوَةً مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَدَنَوْتُ مِنْهُ، فَقَالَ: قُلْ فَقُلْتُ: مَا أَقُولُ؟، قَالَ: قُلْ، قُلْتُ: مَا أَقُولُ؟، قَالَ: ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾ ﴾ حَتَّى خَتَمَهَا، ثُمَّ قَالَ: ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ ﴾ حَتَّى خَتَمَهَا، ثُمَّ قَالَ: مَا تَعَوَّذَ النَّاسُ بِأَفْضَلَ مِنْهُمَا»[(٢)].

**واتە: موعازی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی خوبەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: من لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووم ﷺ لە ڕێگای مەککە، بە تەنها کەوتمە لای پێغەمبەرەوە ﷺ، ئینجا لێی نزیک بوومەوە، فەرمووی: بڵێ، وتم: چی بڵێم؟ فەرمووی: بڵێ، وتم: چی بڵێم؟ فەرمووی: ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾ ﴾ هەتا تەواوی کرد، پاشان فەرمووی: ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ ﴾ هەتا تەواوی کرد، پاشان فەرمووی: خەڵکی لەم دووانە چاکتر پەنایان نەگرتووە. (واتە: هیچ شتێک ئەوەندەی ئەم دووانە چاک نیە بۆ خەڵک پەنای پێ بگرن بە خوا لە جڕو جانەوەر).**

٥٤٣٠- «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ قَالَ: بَيْنَا أَنَا أَقُودُ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَاحِلَتَهُ فِي غَزْوَةٍ إِذْ قَالَ: يَا عُقْبَةُ، قُلْ فَاسْتَمَعْتُ، ثُمَّ قَالَ: يَا عُقْبَةُ، قُلْ فَاسْتَمَعْتُ، فَقَالَهَا الثَّالِثَةَ، فَقُلْتُ: مَا أَقُولُ؟، فَقَالَ: قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ فَقَرَأَ السُّورَةَ حَتَّى خَتَمَهَا، ثُمَّ قَرَأَ: قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، وَقَرَأْتُ مَعَهُ حَتَّى خَتَمَهَا، ثُمَّ قَرَأَ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ فَقَرَأْتُ مَعَهُ حَتَّى خَتَمَهَا، ثُمَّ قَالَ: مَا تَعَوَّذَ بِمِثْلِهِنَّ أَحَدٌ»[(٣)].

---

(١) حسن.

(٢) صحيح الإسناد. أخرجه أبو داود: ٥٠٨٢، والترمذي: ٣٥٧٥.

(٣) صحيح.




واتە: عوقبەی کوڕی عامڕی جوهەنی ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا من ڕەشمەی وشترەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ گرتبوو لە غەزایەکدا، فەرمووی: ئەی عوقبە بڵێ، منیش گوێم گرت، پاشان فەرمووی: ئەی عوقبە بڵێ، منیش گوێم گرت، سێ جار ئەوەی دووبارەکردەوە، وتم: چی بڵێم؟ فەرمووی: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾، سوورەتەکەی خوێند هەتا تەواوی کرد، پاشان: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ۝١﴾ی خوێند منیش لەگەڵی خوێندم هەتا تەواوی کرد، پاشان ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١﴾ی خوێند منیش لەگەڵی خوێندم هەتا تەواوی کرد، فەرمووی: هیچ کەسێک بەوێنەی ئەوانە پەنای نەگرتووە.

**٥٤٣١-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قُلْ قُلْتُ: وَمَا أَقُولُ؟ قَالَ: قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ، قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ فَقَرَأَهُنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: لَمْ يَتَعَوَّذِ النَّاسُ بِمِثْلِهِنَّ، أَوْ لَا يَتَعَوَّذُ النَّاسُ بِمِثْلِهِنَّ»[1].

واتە: عوقبەی کوڕی عامڕی جوهەنی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ پێمی فەرموو: بڵێ، وتم: چی بڵێم؟ فەرمووی: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ۝١﴾، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١﴾ پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندیانیەوە، پاشان فەرمووی: هیچ کەسێک بەوێنەی ئەمانە پەنای نەگرتووە، یان خەڵکی بە وێنەی ئەمانە پەنا ناگرێ.

**٥٤٣٢-** «عَنِ ابْنِ عَابِسٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ أَخْبَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَهُ: يَا ابْنَ عَابِسٍ أَلَا أَدُلُّكَ «أَوْ قَالَ:» أَلَا أُخْبِرُكَ بِأَفْضَلِ مَا يَتَعَوَّذُ بِهِ الْمُتَعَوِّذُونَ؟ قَالَ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ هَاتَيْنِ السُّورَتَيْنِ»[2].

واتە: ئیبنو عابسی جوهەنی ﷺ هەواڵیداوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەی ئیبنو عابیس ئایا ڕێنماییت بکەم، «یان فەرمووی»: ئایا هەواڵت بدەمێ بە چاکترین شتێک کە پەنا گران پەنای پێ دەگرن؟ وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ۝١﴾ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١﴾ ئەم دوو سوورەتە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**٥٤٣٣-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: أُهْدِيَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ بَغْلَةٌ شَهْبَاءُ فَرَكِبَهَا، وَأَخَذَ عُقْبَةُ يَقُودُهَا بِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِعُقْبَةَ: اقْرَأْ، قَالَ: وَمَا أَقْرَأُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟، قَالَ: اقْرَأْ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾﴾ فَأَعَادَهَا عَلَيَّ حَتَّى قَرَأْتُهَا، فَعَرَفَ أَنِّي لَمْ أَفْرَحْ بِهَا جِدًّا، قَالَ: لَعَلَّكَ تَهَاوَنْتَ بِهَا، فَمَا قُمْتُ، يَعْنِي بِمِثْلِهَا»[1].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامرِ ﷺ دەڵێ: هێسترێک بە دیاری هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەویش سواری بوو، عوقبەیش ڕەشمەکەی ڕادەکێشا، پێغەمبەری خوا ﷺ بە عوقبەی فەرموو: بخوێنە، وتی: چی بخوێنم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرموو بخوێنە: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾﴾، دووبارەی کردەوە بۆم هەتا خوێندمەوە، زانی کە من زۆر دڵخۆش نەبووم پێی (چونکە دڵی لەوکاتەدا سەرقاڵ بوو بەو تاریکیەی لەو شەوەدا تووشیان بوو بوو)، فەرمووی: پێ دەچێ کەمتەرخەمیت تێدا کردبێ، وەک پێویست پێی هەڵنەسام.**

**٥٤٣٤-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمُعَوِّذَتَيْنِ، قَالَ عُقْبَةُ: فَأَمَّنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِهِمَا فِي صَلَاةِ الْغَدَاةِ»[2].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامرِ ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی (الْمُعَوِّذَتَيْنِ) عوقبە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێشوێژی بەیانیدا بۆی خوێندین. (گەورەیی ئەم دوو سوورەتە لەوەدایە لە جێگای دوو سوورەتی درێژ لە ناو نوێژی بەیانیدا دەخوێنرێ).**

**٥٤٣٥-** «عَنْ عُقْبَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَرَأَ بِهِمَا فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ»[3].

**واتە: عوقبە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی بەیانیدا ئەو دوو سوورەتەی خوێند.**

**٥٤٣٦-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ أَقُودُ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي السَّفَرِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا عُقْبَةُ، أَلَا أُعَلِّمُكَ خَيْرَ سُورَتَيْنِ قُرِئَتَا؟ فَعَلَّمَنِي قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ فَلَمْ

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




يَرَنِي سُرِرْتُ بِهِمَا جِدّاً، فَلَمَّا نَزَلَ لِصَلَاةِ الصُّبْحِ صَلَّى بِهِمَا صَلَاةَ الصُّبْحِ لِلنَّاسِ، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الصَّلَاةِ، الْتَفَتَ إِلَيَّ فَقَالَ: يَا عُقْبَةُ، كَيْفَ رَأَيْتَ؟»[1].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: من ڕشمەی وشترەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ گرتبوو لە گەشتێکدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی عوقبە، ئایا خێرترین دوو سوورەتت فێر بکەم خوێندرابێتنەوە؟ فێری کردم: ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ۝١﴾ ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١﴾، نەیبینیم زۆر دڵخۆش بم پێیان، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی بۆ نوێژی بەیانی ئەو دوو سوورەتەی بۆ خەڵکەکە لە ناو نوێژدا خوێند، کاتێ لە نوێژ بوویەوە لای لێم کردەوە فەرمووی: (مەزنی ئەم دوو سوورەتەت) (چۆن بینی ئەی عوقبە؟ (ئەگەر گەورە نەبوونایە لە جێگای دوو سوورەتی درێژ نەدەخوێنران لە ناو نوێژی بەیانیدا).**

**٥٤٣٧-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: بَيْنَا أَقُودُ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي نَقَبٍ مِنْ تِلْكَ النِّقَابِ إِذْ قَالَ: أَلَا تَرْكَبُ يَا عُقْبَةُ؟ فَأَجْلَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنْ أَرْكَبْ مَرْكَبَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: أَلَا تَرْكَبُ يَا عُقْبَةُ؟ فَأَشْفَقْتُ أَنْ يَكُونَ مَعْصِيَةً، فَنَزَلَ وَرَكِبْتُ هُنَيْهَةً، وَنَزَلْتُ، وَرَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: أَلَا أُعَلِّمُكَ سُورَتَيْنِ مِنْ خَيْرِ سُورَتَيْنِ قَرَأَ بِهِمَا النَّاسُ؟ فَأَقْرَأَنِي قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ، فَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَتَقَدَّمَ فَقَرَأَ بِهِمَا، ثُمَّ مَرَّ بِي، فَقَالَ: كَيْفَ رَأَيْتَ يَا عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ؟ اقْرَأْ بِهِمَا كُلَّمَا نِمْتَ وَقُمْتَ»[2].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا ڕەشمەی وشترەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ گرتبوو ڕادمکێشا لە چاڵاییەک لە چاڵاییەکان، فەرمووی: ئایا سوار نابیت ئەی عوقبە؟ منیش بە لامەوە گران بوو لە جێگای پێغەمبەری خوا ﷺ سوار ببم، پاشان فەرمووی: ئایا سوار نابیت ئەی عوقبە؟ ترسام لەوەی ببێتە سەرپێچی، دواتر دابەزیە خوارەوەو منیش تۆزێک سوار بووم، پاشان دابەزیم و پێغەمبەری خوا ﷺ سەرکەوت، پاشان فەرمووی: ئایا دوو سوورەتت فێر بکەم خێرترینی ئەو سوورەتانەن کە خەڵکی دەیانخوێنن؟ جا بۆی خوێندمەوە ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ۝١﴾ ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١﴾، دواتر قامەت بۆ نوێژ کرا، پێغەمبەری خوا ﷺ پێشکەوت**

---

**(١) صحيح.**

**(٢) حسن الإسناد.**

**و ئەو دوو سوورەتەی خوێند، پاشان تێپەڕی بە لامدا فەرمووی: چۆن دەبینی ئەی عوقبەی کوڕی عامر؟ هەر کاتێک خەوتیت و لە خەو هەڵسایت بیانخوێنە.**

**٥٤٣٨-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا عُقْبَةُ، قُلْ فَقُلْتُ: مَاذَا أَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَسَكَتَ عَنِّي، ثُمَّ قَالَ: يَا عُقْبَةُ قُلْ قُلْتُ: مَاذَا أَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَسَكَتَ عَنِّي، فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ ارْدُدْهُ عَلَيَّ، فَقَالَ: يَا عُقْبَةُ قُلْ قُلْتُ: مَاذَا أَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، فَقَرَأْتُهَا حَتَّى أَتَيْتُ عَلَى آخِرِهَا، ثُمَّ قَالَ: قُلْ قُلْتُ: مَاذَا أَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ فَقَرَأْتُهَا حَتَّى أَتَيْتُ عَلَى آخِرِهَا، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ ذَلِكَ: مَا سَأَلَ سَائِلٌ بِمِثْلِهِمَا، وَلَا اسْتَعَاذَ مُسْتَعِيذٌ بِمِثْلِهِمَا»[١].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: من لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێم دەکرد، فەرمووی: ئەی عوقبە بڵێ، وتم: چی بڵێم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ بێدەنگ بوو، پاشان فەرمووی: ئەی عوقبە بڵێ، وتم: چی بڵێم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ بێدەنگ بوو، وتم: بۆم دووبارە بکەرەوە، فەرمووی: ئەی عوقبە بڵێ، وتم: چی بڵێم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ۝١﴾ خوێندمەوە هەتا گەیشتم بە کۆتاییەکەی، پاشان فەرمووی: بڵێ، وتم: چی بڵێم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١﴾ خوێندمەوە هەتا گەیشتم بە کۆتاییەکەی، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەدا فەرمووی: هیچ داواکارێک هاوشێوەی ئەوە داوای نەکردوە، وە هیچ پەناگرێکیش هاوشێوەی ئەوە پەنای نەگرتووە.**

**٥٤٣٩-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ رَاكِبٌ فَوَضَعْتُ يَدِي عَلَى قَدَمِهِ، فَقُلْتُ: أَقْرِئْنِي سُورَةَ هُودٍ، أَقْرِئْنِي سُورَةَ يُوسُفَ فَقَالَ: لَنْ تَقْرَأَ شَيْئاً أَبْلَغَ عِنْدَ اللَّهِ ﷻ مِنْ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ»[٢].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو بەسەر وڵاخەکەیەوە بوو دەستم خستە سەر پێیەکانی، وتم: سوورەتی هودو سوورەتی یوسفم بۆ بخوێنە، فەرمووی: هیچ شتێک ناخوێنی لە لای خوا ﷻ بگاتە ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ۝١﴾.**

---

**(١) حسن صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٤ و ٨١٤/٢٦٥، وأبو داود: ١٤٦٣، والترمذي: ٢٤٠٦ و ٢٩٠٢ و ٣٣٦٧.**

**(٢) صحيح.**





**٥٤٤٠-** «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أُنْزِلَ عَلَيَّ آيَاتٌ لَمْ يُرَ مِثْلُهُنَّ: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ۝١﴾الفلق، إِلَى آخِرِ السُّورَةِ وَ: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١﴾الناس، إِلَى آخِرِ السُّورَةِ»[1].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کۆمەڵە ئایەتێکم بۆ دابەزیوە وێنەی ئەوان نەبینراوە: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ۝١﴾ هەتا کۆتایی سوورەتەکە، وە ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١﴾ هەتا کۆتایی سوورەتەکە.**

**٥٤٤١-** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اقْرَأْ يَا جَابِرُ قُلْتُ: وَمَاذَا أَقْرَأُ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: اقْرَأْ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ فَقَرَأْتُهُمَا، فَقَالَ: اقْرَأْ بِهِمَا، وَلَنْ تَقْرَأَ بِمِثْلِهِمَا»[2].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: بخوێنە ئەی جابر، وتم: چی بخوێنم باوک و دایکم بە قوربانت بێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ۝١﴾، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١﴾بخوێنە، منیش خوێندیانمەوە، فەرمووی: بیانخوێنەوە، هەرگیز هاوشێوەی ئەو دوو سوورەتە نەخوێندراوەتەوە.**

## پەناگرتن لە دڵێک ترسی خوای تێدا نەبێت

**٥٤٤٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَعَوَّذُ مِنْ أَرْبَعٍ: مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ، وَدُعَاءٍ لَا يُسْمَعُ، وَنَفْسٍ لَا تَشْبَعُ»[3].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پەنای دەگرت بە چوار شت: لە زانستێک سوود نەگەیەنێ، لە دڵێک نەترسێت، لە نزاو پاڕانەوەیەک وەڵام نەدرێتەوە، وە لە نەفسێک هەرگیز تێر نەبێت.**

---

(١) صحيح.

(٢) حسن صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٤٨٢.




## پەناگرتن بە خوا لە فیتنەو بەڵای دڵ

**٥٤٤٣-** «عَنْ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَعَوَّذُ مِنَ الْجُبْنِ، وَالْبُخْلِ، وَفِتْنَةِ الصَّدْرِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ»[١].

**واتە: عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پەنای دەگرت لە ترسنۆکی و ڕەزیلی و بەڵاو فیتنەی ناو دڵ و سزای ناو گۆڕ.**

## پەناگرتن لە شەڕو خراپەی بیستن و بینین

**٥٤٤٤-** «عَنْ شَكَلِ بْنِ حُمَيْدٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، عَلِّمْنِي تَعَوُّذاً أَتَعَوَّذُ بِهِ، فَأَخَذَ بِيَدِي، ثُمَّ قَالَ: قُلْ: أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ سَمْعِي، وَشَرِّ بَصَرِي، وَشَرِّ لِسَانِي، وَشَرِّ قَلْبِي، وَشَرِّ مَنِيِّي، قَالَ: حَتَّى حَفِظْتُهَا، قَالَ سَعْدٌ: وَالْمَنِيُّ: مَاؤُهُ»[٢].

**واتە: شەکەلی کوڕی حومەید ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پەناگرتنێکم فێر بکە پەنای پێ بگرم، دەستمی گرت و پاشان فەرمووی: بڵێ: پەنا دەگرم بە تۆ ئەی خودایە، لە شەڕو خراپەی بیستنم، لە شەڕی بینینم، لە شەڕی زمانم، لە شەڕی دڵم، وە شەڕی (مَنِيِّي) وتی: هەتا لەبەرم کرد، سەعد وتی: (الْمَنِيُّ): ئاوەکەیەتی. (واتە: پەنا دەگرم بە خوا لەوەی مەنی زاڵ بێت بەسەرمدا تووشی گوناه ببم وەکو تەماشا کردنی نامەحرەم و هاوشێوەکانی).**

## پەناگرتن لە ترسنۆکی

**٥٤٤٥-** «عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَانَ يُعَلِّمُنَا خَمْساً، كَانَ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْعُو بِهِنَّ وَيَقُولُهُنَّ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ»[٣].

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ١٥٣٩، وإبن ماجه: ٣٨٤٤.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٥١، والترمذي: ٣٤٩٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٢٢ و ٦٣٦٥ و ٦٣٧٠ و ٦٣٧٤ و ٦٣٩٠، والترمذي: ٣٥٦٧.



**واتە: موصعەبی کوڕی سەعد دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: (باوکمان) پێنج شتی فێر دەکردین، دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای پێ دەکردن و دەیفەرموو: خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە ڕەزیلی، وە پەنات پێ دەگرم لە ترسنۆکی، وە پەنات پێ دەگرم لەوەی بگەمە تەمەنێکی یەکجار پیری و پەککەوتەیی کە توانای هیچم نەمێنێ، وە پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی دونیا، وە پەنات پێ دەگرم لە سزای ناو گۆڕ.**

## پەناگرتن لە ڕەزیلی

**٥٤٤٦-** «عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، يَتَعَوَّذُ مِنْ خَمْسٍ: مِنَ الْبُخْلِ، وَالْجُبْنِ، وَسُوءِ الْعُمُرِ، وَفِتْنَةِ الصَّدْرِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ»(١).

**واتە: ئیبنو مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پەنای دەگرت لە پێنج شت: لە ڕەزیلی و ترسنۆکی و خراپی تەمەن و فیتنەی ناو دڵ و سزای ناو گۆڕ.**

**٥٤٤٧-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ الْأَوْدِيِّ قَالَ: كَانَ سَعْدٌ يُعَلِّمُ بَنِيهِ هَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ، كَمَا يُعَلِّمُ الْمُعَلِّمُ الْغِلْمَانَ، وَيَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَتَعَوَّذُ بِهِنَّ دُبُرَ الصَّلَاةِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ»(٢).

**واتە: عەمری کوڕی مەیمونی ئەودی دەڵێ: سەعد منداڵەکانی فێر دەکرد بەم وشانە، هەروەکو چۆن مامۆستا منداڵ فێر دەکات، دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای پێ گرتوون لە دوای هەموو نوێژێک: خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە ڕەزیلی، وە پەنات پێ دەگرم لە ترسنۆکی، وە پەنات پێ دەگرم لەوەی بگەمە تەمەنێکی پیری و پەککەوتەیی کە توانای هیچم نەمێنێ، وە پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی دونیا، وە پەنات پێ دەگرم لە سزای ناو گۆڕ.**

**٥٤٤٨-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ، وَالْكَسَلِ، وَالْبُخْلِ، وَالْهَرَمِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَفِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ»(٣).

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ئەی خوایە پەنات پێ دەگرم لە بێ توانایی و تەمبەڵی و ڕەزیلی و پیری و پەکەوتەیی و سزای ناو گۆڕ، وە فیتنەی ژیان و سەرەمەرگ.**

## پەناگرتن لە خەم و پەژارە

**٥٤٤٩-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ دَعَوَاتٌ لَا يَدَعُهُنَّ كَانَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ، وَالْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْبُخْلِ وَالْجُبْنِ، وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ»[١].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێنج نزای هەبوو هەرگیز وازی لێ نەدەهێنان دەیفەرموو: ئەی خوایە پەنات پێ دەگرم لە خەم و خەفەت و بێ توانایی و تەمبەڵی، وە لە ڕەزیلی و ترسنۆکی، وە لە زاڵبوونی دەسەڵاتدارە خراپەکان.**

**تێبینی:**

**(الْهَمِّ): ئەو ناخۆشیەیە کە گومان دەکرێ ڕوو بدات بەڵام هێشتا ڕووی نەداوە.**

**(الْحَزَنِ): ئەو ناخۆشیەی کە ڕوویداوە شوێنەواری خەم و پەژارە لە دڵدا جێدەهێڵێ.**

**(الْعَجْزِ): وازهێنانە لە شتێک لە تواناد نەبێت.**

**٥٤٥٠-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ دَعَوَاتٌ لَا يَدَعُهُنَّ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ، وَالْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْبُخْلِ وَالْجُبْنِ، وَالدَّيْنِ وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ»[٢].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێنج نزای هەبوو هەرگیز وازی لێ نەدەهێنان دەیفەرموو: ئەی خوایە پەنات پێ دەگرم لە خەم و خەفەت و بێ توانایی و تەمبەڵی، وە لە ڕەزیلی و ترسنۆکی و قەرزو لە زاڵبوونی دەسەڵاتدارە خراپەکان.**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٢٣ و ٤٧٠٧ و ٦٣٦٧ و ٦٣٦٩ و ٦٣٧١، ومسلم: ٥٠ و ٥١ و ٢٧٠٦/٥٢، وأبو داود: ١٥٤٠ و ١٥٤١ و ٣٩٧٢، والترمذي: ٣٤٨٤ و ٣٤٨٥.




**٥٤٥١-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَدْعُو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْهَرَمِ، وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ، وَفِتْنَةِ الدَّجَّالِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ»[١].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نزای دەکرد: ئەی خوایە پەنات پێ دەگرم لە تەمبەڵی و پیری و پەکەوتەیی و ترسنۆکی و ڕەزیلی، وە فیتنەی دەجال و سزای ناو گۆڕ.**

**٥٤٥٢-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْهَرَمِ وَالْبُخْلِ وَالْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ئەی خوایە پەنات پێ دەگرم لە بێ توانایی و تەمبەڵی و پیری و پەکەوتەیی و ڕەزیلی و ترسنۆکی، وە پەنات پێ دەگرم لە سزای ناوگۆڕ و لە فیتنەی ژیان و مردن.**

## پەناگرتن لە خەم و پەژارەو دڵتەنگی

**٥٤٥٣-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا دَعَا قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ، وَالْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْبُخْلِ وَالْجُبْنِ، وَضَلَعِ الدَّيْنِ، وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ»[٣].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ نزای بکردایە دەیفەرموو: ئەی خوایە پەنات پێ دەگرم لە خەم و خەفەت و لە بێ توانایی و تەمبەڵی و ڕەزیلی و ترسنۆکی، وە لە قەرزاری زۆرو توانای نەدانەوەی، وە لە زاڵبوونی دەسەڵاتدارە خراپەکان.**

## بابەت: پەناگرتن لە قەرزاری و گوناهو تاوان

**٥٤٥٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَكْثَرَ مَا يَتَعَوَّذُ مِنَ الْمَغْرَمِ، وَالْمَأْثَمِ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا أَكْثَرَ مَا تَتَعَوَّذُ مِنَ الْمَغْرَمِ، قَالَ: إِنَّهُ مَنْ غَرِمَ حَدَّثَ، فَكَذَبَ وَوَعَدَ فَأَخْلَفَ»[٤].

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح.




واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر پەنای دەگرت لە قەرزاری و گوناه، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر پەنا دەگری لە قەرزاری، فەرمووی: بێگومان ئەو کەسەی قەرز دەکات قسە دەکات و درۆ دەکات، پەیمانیش دەدات و نایباتە سەر.

## پەناگرتن لە شەڕو خراپەی بیستن و بینین

**٥٤٥٥-** «عَنْ شَكَلِ بْنِ حُمَيْدٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، عَلِّمْنِي تَعَوُّذاً أَتَعَوَّذُ بِهِ، فَأَخَذَ بِيَدِي، ثُمَّ قَالَ: قُلْ: أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ سَمْعِي، وَشَرِّ بَصَرِي، وَشَرِّ لِسَانِي، وَشَرِّ قَلْبِي، وَشَرِّ مَنِيِّي قَالَ: حَتَّى حَفِظْتُهَا، قَالَ سَعْدٌ: وَالْمَنِيُّ: مَاؤُهُ»[١].

واتە: شەکەلی کوڕی حومەید ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پەناگرتنێکم فێر بکە پەنای پێبگرم، دەستمی گرت، پاشان فەرمووی: بڵێ: (خوایە) پەنات پێدەگرم لە شەڕو خراپەی بیستنم، لە شەڕو خراپەی بینینم، لە شەڕی زمانم، لە شەڕی دڵم، وە شەڕی مەنیەکەم. دەڵێ تا لەبەرم کرد، سەعد وتی: مەنی ئاوەکەیەتی (واتە: پەنا گرتن لەوەی حەزو ئارەزوی داوێنی بۆ خراپە بەکاربهێنێ).

## پەناگرتن لە شەڕو خراپەی بینین

**٥٤٥٦-** «عَنْ شَكَلِ بْنِ حُمَيْدٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَلِّمْنِي دُعَاءً أَنْتَفِعُ بِهِ، قَالَ: قُلِ اللَّهُمَّ عَافِنِي مِنْ شَرِّ سَمْعِي وَبَصَرِي، وَلِسَانِي وَقَلْبِي، وَمِنْ شَرِّ مَنِيِّي. يَعْنِي ذَكَرَهُ»[٢].

واتە: شەکەلی کوڕی حومەید ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، نزایەکم فێر بکە سودم پێ بگەیەنێ، فەرمووی: بڵێ: خوایە بمپارێزە لە شەڕو خراپەی بیستن و بینینم، وە زمان و دڵم، وە لە شەڕی مەنیەکەم. واتە: ئەندامی نێرینەی.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٥١، والترمذي: ٣٤٩٢.

(٢) صحيح.




## پەناگرتن لە تەمبەڵی و تەوەزەلی

**٥٤٥٧-** «عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: سُئِلَ أَنَسٌ وَهُوَ ابْنُ مَالِكٍ ﷺ عَنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَعَنِ الدَّجَّالِ، قَالَ: كَانَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْهَرَمِ، وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ، وَفِتْنَةِ الدَّجَّالِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ»(١).

**واتە: حومەید دەڵێ: پرسیار کرا لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەربارەی سزای ناو گۆڕ و دەجال، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە تەمبەڵی و پیری و پەکەوتەیی و ترسنۆکی و ڕەزیلی، وە لە فیتنەی دەجال و سزای ناو گۆڕ.**

## پەناگرتن لە بێ توانایی و دەستەوسانی

**٥٤٥٨-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ قَالَ: لَا أُعَلِّمُكُمْ إِلَّا مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعَلِّمُنَا يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْبُخْلِ وَالْجُبْنِ، وَالْهَرَمِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ، وَعِلْمٍ لَا يَنْفَعُ، وَدَعْوَةٍ لَا يُسْتَجَابُ لَهَا»(٢).

**واتە: زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ دەڵێ: فێرتان ناکەم ئەوە نەبێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کردووین، دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە بێ توانیی و تەمبەڵی و ڕەزیلی و ترسنۆکی و پیری و پەکەوتەیی، وە لە سزای ناو گۆڕ، خوایە گیان تەقواو خۆپارێزی ببەخشی بە نەفسم، وە پاک و پاڵفتەی بکەرەوە، چونکە تۆ چاکترینی ئەوانەی کە نەفس و دەروون پاک دەکەنەوە، تۆ خاوەن و دروستکەری ئەو نەفسەی، خوایە من پەنات پێ دەگرم لە دڵێک ترسی تۆی تێدا نەبێت، وە لە نەفس و دەروونێک تێر نەبێت، وە لە زانستێک سوود نەگەیەنێ، هەروەها لە نزایەک وەرنەگیرێ.**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧٢٢، والترمذي: ٣٥٧٢.




**٥٤٥٩-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْبُخْلِ وَالْجُبْنِ، وَالْهَرَمِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَفِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ»[١].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە بێ توانایی و تەمبەڵی و ڕەزیلی و ترسنۆکی و پیری و پەکەوتەیی، وە لە سزای ناو گۆڕ، وە لە فیتنەی ژیان و مردن.**

## پەناگرتن لە زەلیلی

**٥٤٦٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْفَقْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْقِلَّةِ وَالذِّلَّةِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ. خَالَفَهُ الْأَوْزَاعِيُّ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە هەژاری، وە پەنات پێ دەگرم لە (الْقِلَّة) (كەمی خێرو چاكە كردن و ئارامگرتن)، وە لە زەلیلی و زەبوونی، وە پەنات پێ دەگرم لەوەی ستەم بكەم، یان ستەمم لێ بكرێ.**

**٥٤٦١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنَ الْفَقْرِ، وَالْقِلَّةِ، وَالذِّلَّةِ، وَأَنْ تَظْلِمَ أَوْ تُظْلَمَ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەنا بگرن بە خوا لە هەژاری و كەمی خێرو چاكە كردن و ئارامگرتن و زەلیلی و زەبوونی، وە لەوەی ستەم بكەی، یان ستەمت لێ بكرێ.**

**٥٤٦٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْقِلَّةِ، وَالْفَقْرِ، وَالذِّلَّةِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٤٤، وإبن ماجه: ٣٨٤٢.

(٣) ضعيف.

(٤) صحيح.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە کەمی خێرو چاکە کردن و ئارامگرتن، هەروەها لە هەژاری و زەلیلی و زەبوونی، وە پەنات پێ دەگرم لەوەی ستەم بکەم یان ستەمم لێ بکرێ.

## پەناگرتن لە کەمی (خێرو بێری نیعمەت)

**٥٤٦٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنَ الْفَقْرِ، وَمِنَ الْقِلَّةِ، وَمِنَ الذِّلَّةِ، وَأَنْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەنا بگرن بە خوا لە هەژاری، لە کەمی خێرو چاکە کردن و ئارامگرتن، وە لە زەلیلی و زەبوونی، وە لەوەی ستەم بکەم یان ستەمم لێ بکرێ.

## پەناگرتن لە هەژاری

**٥٤٦٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنَ الْفَقْرِ، وَالْقِلَّةِ، وَالذِّلَّةِ، وَأَنْ تَظْلِمَ أَوْ تُظْلَمَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەنا بگرن بە خوا لە هەژاری و کەمی خێرو چاکەکردن و ئارامگرتن، وە زەلیلی و زەبوونی، وە لەوەی ستەم بکەی یان ستەمت لێ بکرێ.

**٥٤٦٥-** «عَنْ مُسْلِمِ بنِ أَبِي بَكْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ كَانَ سَمِعَ وَالِدَهُ، يَقُولُ فِي دُبُرِ الصَّلَاةِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكُفْرِ وَالْفَقْرِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، فَجَعَلْتُ أَدْعُو بِهِنَّ، فَقَالَ: يَا بُنَيَّ، أَنَّى عُلِّمْتَ هَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ؟ قُلْتُ: يَا أَبَتِ سَمِعْتُكَ تَدْعُو بِهِنَّ فِي دُبُرِ الصَّلَاةِ، فَأَخَذْتُهُنَّ عَنْكَ، قَالَ: فَالْزَمْهُنَّ يَا بُنَيَّ، فَإِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَدْعُو بِهِنَّ فِي دُبُرِ الصَّلَاةِ»[٣].

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح الإسناد.




واتە: موسلیمی كوڕی ئەبو بەكرە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، ئەو بیستی باوكی لە دوای نوێژ دەیوت: خوایە من پەنات پێدەگرم لە بێبڕوایی و هەژاری، وە لە سزای ناو گۆڕ، منیش ئەو نزایانەم دەكرد، وتی: ئەی كوڕەكەم، ئەم وشانە لە كوێ فێر كراوی؟ وتم: ئەی باوكە گیان بیستم لە دوای نوێژ نزات پێ دەكرد، لە تۆوە وەرم گرت، وتی: پەیوەستبە پێیانەوە ئەی كوڕەكەم، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای نوێژ نزای پێدەكرد.

## پەناگرتن لە شەڕو فیتنەی ناو گۆڕ

**٥٤٦٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَثِيراً مَا يَدْعُو بِهَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ النَّارِ، وَعَذَابِ النَّارِ، وَفِتْنَةِ الْقَبْرِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَشَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَشَرِّ فِتْنَةِ الْفَقْرِ، وَشَرِّ فِتْنَةِ الْغِنَى، اللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَايَ بِمَاءِ الثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَأَنْقِ قَلْبِي مِنَ الْخَطَايَا كَمَا أَنْقَيْتَ الثَّوْبَ الْأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وَبَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْهَرَمِ، وَالْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم نزایانەی زۆر دەكرد: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە فیتنە و ئاژاوەی ئاگرو سزای ئاگر، وە فیتنەی ناو گۆڕو سزای ناو گۆڕ، وە شەڕو فیتنەی مەسیحی دەجال و شەڕو فیتنەی هەژاری و شەڕو فیتنەی دوڵەمەندی، خوای گەورە گوناهەكانم بشۆرەوە بە ئاوو بەفرو تەرزە، وە دڵم پاك بكەرەوە لە گوناە وەكو چۆن جلی سپیت پاك كردۆتەوە لە پیسی، وە نێوانی من و گوناهەكانم دووربخەرەوە هەروەكو چۆن نێوان خۆرهەڵات و خۆر ئاوابوونت دوورخستۆتەوە، خوایە من پەنات پێ دەگرم لە تەمبەڵی و پیری و پەككەوتەیی و تاوان و قەرزاری.

## پەناگرتن لە نەفسێك تێر نەبێت

**٥٤٦٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْأَرْبَعِ: مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ، وَمِنْ دُعَاءٍ لَا يُسْمَعُ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٤٨، وإبن ماجه: ٢٥٠ و ٣٨٣٧.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە چوار شت: لە زانستێک سوودی نەبێت، لە دڵێک نەترسێت، لە نەفسێک هەرگیز تێر نەبێت، لە نزاو پاڕانەوەیەک گوێی لێ نەگیرێ.

## پەناگرتن لە برسێتی

**٥٤٦٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُوعِ، فَإِنَّهُ بِئْسَ الضَّجِيعُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخِيَانَةِ، فَإِنَّهَا بِئْسَتِ الْبِطَانَةُ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە برسێتی، چونکە خراپترین هاوەڵە (چونکە ڕێگریت لێ دەکات لە پەرستشەکان)، وە پەنات پێ دەگرم لە خیانەت و ناپاکی، چونکە خراپترین خەصڵەتی شاراوەیە.

## پەناگرتن لە خیانەت و ناپاکی

**٥٤٦٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُوعِ، فَإِنَّهُ بِئْسَ الضَّجِيعُ، وَمِنَ الْخِيَانَةِ، فَإِنَّهَا بِئْسَتِ الْبِطَانَةُ»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە برسێتی، چونکە خراپترین هاوەڵە (چونکە ڕێگریت لێ دەکات لە پەرستشەکان)، وە پەنات پێ دەگرم لە خیانەت و ناپاکی، چونکە خراپترین خەصڵەتی شاراوەیە.

## پەناگرتن لە گومڕایی و دوڕوویی و ڕەوشتی خراپ

**٥٤٧٠-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَدْعُو بِهَذِهِ الدَّعَوَاتِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ، وَقَلْبٍ لَا يَخْشَعُ، وَدُعَاءٍ لَا يُسْمَعُ، وَنَفْسٍ لَا تَشْبَعُ، ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَؤُلَاءِ الْأَرْبَعِ»(٣).

---

(١) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٤٧، وإبن ماجه: ٣٣٥٤.

(٢) حسن صحيح.

(٣) صحيح.




**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ بەم نزایانە دەپاڕایەوە: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە زانستێک سوودی نەبێ، لە دڵێک نەترسێت، لە نزاو پاڕانەوەیەک گوێی لێ نەگیرێ، لە نەفسێک هەرگیز تێر نەبێت، پاشان دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لەو چوار شتە.**

**٥٤٧١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَدْعُو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الشِّقَاقِ، وَالنِّفَاقِ، وَسُوءِ الْأَخْلَاقِ»(١).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم نزایەی دەکرد: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە گومڕایی و دوڕوویی و ڕەشتی خراپ.**

## پەناگرتن لە قەرزاری

**٥٤٧٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُكْثِرُ التَّعَوُّذَ مِنَ الْمَغْرَمِ، وَالْمَأْثَمِ فَقِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ تُكْثِرُ التَّعَوُّذَ مِنَ الْمَغْرَمِ، وَالْمَأْثَمِ، فَقَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا غَرِمَ حَدَّثَ فَكَذَبَ، وَوَعَدَ فَأَخْلَفَ»(٢).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر پەنای دەگرت لە قەرزاری و گوناه کردن، پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، تۆ زۆر پەنا دەگری لە قەرزاری و گوناه کردن، فەرمووی: پیاو ئەگەر قەرزار بوو قسە دەکات و درۆ دەکات، پەیمان دەدات و نایباتە سەر.**

## پەناگرتن لە قەرز

**٥٤٧٣-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الْكُفْرِ، وَالدَّيْنِ، قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَعْدِلُ الدَّيْنَ بِالْكُفْرِ؟، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: نَعَمْ»(٣).

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٥٤٦.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف.




واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: پەنا دەگرم بە خوا لە بێبڕوایی و قەرزاری، پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا قەرزاری وەک بێبڕوایی دادەنێی (بۆ پەناگرتن لێی)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ.

**٥٤٧٤**- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الْكُفْرِ وَالدَّيْنِ، فَقَالَ رَجُلٌ: تَعْدِلُ الدَّيْنَ بِالْكُفْرِ؟ قَالَ: نَعَمْ»(١).

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پەنا دەگرم بە خوا لە بێبڕوایی و قەرزاری، پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، وەک بێبڕوایی دادەنێی (بۆ پەناگرتن لێی)؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ.

## پەناگرتن لە زاڵبوونی قەرز

**٥٤٧٥**- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَدْعُو بِهَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ غَلَبَةِ الدَّيْنِ، وَغَلَبَةِ الْعَدُوِّ، وَشَمَاتَةِ الْأَعْدَاءِ»(٢).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو وشانە نزای دەکرد: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە قەرزاری زۆرو توانای نەدانەوەی، وە لە زاڵبوونی دوژمن، وە لە دڵخۆشبوونی دوژمنان بەوەی بەڵاو موسیبەتم تووش بێت.

## پەناگرتن لە کەڵەکە بوونی قەرزو توانای نەدانەوەی

**٥٤٧٦**- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ وَالْكَسَلِ، وَالْبُخْلِ وَالْجُبْنِ، وَضَلَعِ الدَّيْنِ، وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ»(٣).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ئەی خوایە پەنات پێ دەگرم لە خەم و خەفەت و تەمبەڵی، وە لە ڕەزیلی و ترسنۆکی و لە زاڵبوونی دەسەڵاتدارە خراپەکان بەسەرماندا.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**تێبینی:**

**(الْهَمّ): ئەو ناخۆشیەیە کە گومان دەکرێ ڕووبدات، بەڵام هێشتا ڕووی نەداوە.**

**(الْحَزَنِ): ئەو ناخۆشیەی کە ڕوویداوە شوێنەواری خەم و پەژارە لە دڵدا جێدەهێڵێ.**

## پەناگرتن لە شەڕو خراپەی فیتنەی دەوڵەمەندی

**٥٤٧٧-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَفِتْنَةِ النَّارِ، وَفِتْنَةِ الْقَبْرِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَشَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَشَرِّ فِتْنَةِ الْغِنَى، وَشَرِّ فِتْنَةِ الْفَقْرِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَايَ بِمَاءِ الثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّ قَلْبِي مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الْأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ، وَالْهَرَمِ، وَالْمَغْرَمِ، وَالْمَأْثَمِ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە سزای ناو گۆڕ و فیتنە و ئاژاوەی ئاگر، وە فیتنەی ناو گۆڕو سزای ناو گۆڕ، وە شەڕو فیتنەی مەسیحی دەجال و شەڕ و فیتنەی دەوڵەمەندی و شەڕو فیتنەی هەژاری، خوایە گوناهەکانم بشۆرەوە بە ئاوو بەفرو تەرزە، وە دڵم پاک بکەرەوە لە گوناه وەکو چۆن جلی سپیت پاک کردۆتەوە لە پیسی، خوایە من پەنات پێ دەگرم لە تەمبەڵی و پیری و پەککەوتەیی و قەرزاری و تاوان.**

## پەناگرتن لە فیتنەو ئاشووبی دنیا

**٥٤٧٨-** «عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: كَانَ سَعْدٌ يُعَلِّمُهُ هَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ وَيَرْوِيهِنَّ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا، وَعَذَابِ الْقَبْرِ»[٢].

**واتە: موصعەبی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: سەعد فێری ئەو وشانەی دەکردو دەیانیگێڕایەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە ڕەزیلی، پەنات پێ دەگرم لە ترسنۆکی، پەنات پێ دەگرم لەوەی بگەڕێمەوە بۆ تەمەنی پیری و پەککەوتەیی، پەنات پێ دەگرم لە فیتنەو ئاژاوەی دنیا، وە لە سزای ناو گۆڕ.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**٥٤٧٩-** «عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، وَعَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ الْأَوْدِيِّ قَالَا: كَانَ سَعْدٌ يُعَلِّمُ بَنِيهِ هَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ، كَمَا يُعَلِّمُ الْمُكْتِبُ الْغِلْمَانَ، وَيَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَتَعَوَّذُ بِهِنَّ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا، وَعَذَابِ الْقَبْرِ»[١].

**واتە: موصعەبی كوڕی سەعدو عەمڕی كوڕی مەیمونی ئەودی دەڵێن: سەعد منداڵەكانی فێری ئەو وشانە دەكرد، هەروەكو چۆن مامۆستا منداڵ فێر دەكات، وە دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای هەموو نوێژێكەوە بەم وشانە پەنای دەگرت: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە ڕەزیلی، پەنات پێ دەگرم لە ترسنۆكی، پەنات پێ دەگرم لەوەی بگەمە تەمەنی پیری و پەككەوتەیی، پەنات پێ دەگرم لە فیتنەو ئاشووبی دنیا، وە لە سزای ناو گۆڕ.**

**٥٤٨٠-** «عَنْ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَعَوَّذُ مِنَ الْجُبْنِ وَالْبُخْلِ، وَسُوءِ الْعُمُرِ، وَفِتْنَةِ الصَّدْرِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ»[٢].

**واتە: عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پەنای دەگرت لە ترسنۆكی و ڕەزیلی و، خراپی تەمەن و فیتنەی ناو دڵ و سزای ناو گۆڕ.**

**٥٤٨١-** «عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَعَوَّذُ مِنْ خَمْسٍ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ، وَالْبُخْلِ، وَسُوءِ الْعُمُرِ، وَفِتْنَةِ الصَّدْرِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ»[٣].

**واتە: عومەری كوڕی خەطاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای دەگرت لە پێنج شت: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە ترسنۆكی و ڕەزیلی خراپی تەمەن و فیتنەی ناو دڵ و سزای ناو گۆڕ.**

**٥٤٨٢-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَتَعَوَّذُ مِنَ الشُّحِّ، وَالْجُبْنِ، وَفِتْنَةِ الصَّدْرِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ»[٤].

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ١٥٣٩، وإبن ماجه: ٣٨٤٤.**

**(٣) ضعيف.**

**(٤) صحيح لغيره.**



واتە: عەمری كوڕی مەیمون دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بۆیان باسكردم، پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای دەگرت لە: ڕەزیلی و ترسنۆكی و فیتنەی ناو دڵ و سزای ناو گۆڕ.

**٥٤٨٣-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَعَوَّذُ»(١).

واتە: عەمری كوڕی مەیمون ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پەنای دەگرت (هەمان فەرموودەی دووبارە كردەوە).

## پەناگرتن لە شەڕو خراپەی دامێن

**٥٤٨٤-** «عَنْ شَكَلِ بْنِ حُمَيْدٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَلِّمْنِي دُعَاءً أَنْتَفِعُ بِهِ، قَالَ: قُلْ: اللَّهُمَّ عَافِنِي مِنْ شَرِّ سَمْعِي، وَبَصَرِي، وَلِسَانِي، وَقَلْبِي، شَرِّ مَنِيِّي، يَعْنِي ذَكَرَهُ»(٢).

واتە: شەكەلی كوڕی حومەید ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، نزایەكم فێر بكە سوودم پێ بگەیەنێ، فەرمووی: بڵێ: خوایە بمپارێزە لە شەڕو خراپەی بینینم، وە لە شەڕی زمانم و دڵم، لە شەڕی مەنیم واتە: ئەندامی نێرینەی.

## پەناگرتن لە شەڕو خراپەی بێبڕوایی

**٥٤٨٥-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكُفْرِ وَالْفَقْرِ فَقَالَ رَجُلٌ: وَيَعْدِلَانِ؟ قَالَ: نَعَمْ»(٣).

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە بێبڕوایی و هەژاری، پیاوێک وتی: بەرانبەر دەبنەوە؟ (واتە: هەردووكیان وەكو یەكتری زیانیان هەیە) فەرمووی: بەڵێ.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٥١، والترمذي: ٣٤٩٢.

(٣) ضعيف.




## پەناگرتن لە گومڕایی

**٥٤٨٦-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ قَالَ: بِسْمِ اللَّهِ، رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ أَزِلَّ أَوْ أَضِلَّ، أَوْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ، أَوْ أَجْهَلَ أَوْ يُجْهَلَ عَلَيَّ»[١].

واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە ماڵ دەرچووبایە دەیفەرموو: بە ناوی خوا، پەروەردگارم پەنات پێ دەگرم لەوەی تووشی گوناه بم بە بێ مەبەست، یان گومڕا بم و لە ڕێگای حەق لابدەم، یان ستەم بکەم، یان ستەمم لێ بکرێ، یان کاری نەفامەکان بکەم، یان نەفامەکان زیانم لێ بدەن.

## پەناگرتن لە زاڵبوونی دوژمن

**٥٤٨٧-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَدْعُو بِهَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ غَلَبَةِ الدَّيْنِ، وَغَلَبَةِ الْعَدُوِّ، وَشَمَاتَةِ الْأَعْدَاءِ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەپاڕایەوە بەو وشانە: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە زاڵبوونی قەرز بەسەرمدا، وە زاڵبوونی دوژمن، وە دڵخۆشبوونی دوژمنان بە بەڵاو ناڕەحەتیەکان کە بەسەرمان دێت.

## پەناگرتن لە دڵخۆشبوونی دوژمنان

**٥٤٨٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كَانَ يَدْعُو بِهَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ غَلَبَةِ الدَّيْنِ، وَشَمَاتَةِ الْأَعْدَاءِ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو وشانە دەپاڕایەوە: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە زاڵبوونی قەرز بەسەرمدا، وە دڵخۆشبوونی دوژمنان بە بەڵاو ناڕەحەتیەکان کە بەسەرماندا دێت.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٠٩٤، والترمذي: ٣٤٢٧، وإبن ماجه: ٣٨٨٤.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




## پەناگرتن لە پیری

**٥٤٨٩-** «عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَدْعُو بِهَذِهِ الدَّعَوَاتِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ، وَالْهَرَمِ، وَالْجُبْنِ وَالْعَجْزِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ»[١].

**واتە: عوسمانی کوڕی ئەبولعاص ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ نزای دەکرد بەم نزایانە: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە تەمبەڵی و پیری و پەکەوتەیی و ترسنۆکی و بێ توانایی، وە لە فیتنەی ژیان و مردن.**

**٥٤٩٠-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْهَرَمِ، وَالْمَغْرَمِ، وَالْمَأْثَمِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ النَّارِ»[٢].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەیەوە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە تەمبەڵی و پیری و پەکەوتەیی و قەرزاری و تاوان، وە پەنات پێ دەگرم لە شەڕو خراپەی مەسیحی دەجال، وە پەنات پێ دەگرم لە سزای ناو گۆڕ، وە پەنات پێ دەگرم لە سزای ئاگر.**

## پەناگرتن لە بەڵای خراپ

**٥٤٩١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، يَتَعَوَّذُ مِنْ هَذِهِ الثَّلَاثَةِ: مِنْ دَرَكِ الشَّقَاءِ، وَشَمَاتَةِ الْأَعْدَاءِ، وَسُوءِ الْقَضَاءِ، وَجَهْدِ الْبَلَاءِ، قَالَ سُفْيَانُ: هُوَ ثَلَاثَةٌ فَذَكَرْتُ أَرْبَعَةً، لِأَنِّي لَا أَحْفَظُ الْوَاحِدَ الَّذِي لَيْسَ فِيهِ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پەنای دەگرت لەم سیانە: لە عاقیبەتی خراپ بە هۆی گوناهەوە، یان هەر هۆکارێک کە ببێتە مایەی لەناوچوون، وە لە دڵخۆشبوونی دوژمنان بەوەی بەڵاو موسیبەتی تووش بێت، وە لە خراپی بەڵاو ناڕەحەتی کە بەسەریدا بێت، وە لەوانەی کە تووشی مرۆڤ دەبن لە ناڕەحەتی، کە**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) حسن صحيح الإسناد.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٣٤٧ و ٦٦١٦، ومسلم: ٢٧٠٧.




له توانایدا نیه چارەسەری بکات، (بە جۆرێک مردنی خۆی پێخۆشترە لەوەی لەسەر ئەو حاڵە بمێنێ، بۆ نموونە زۆری خێزان و نەبوونی بژێوی). سوفیان وتوویەتی: خۆی سێ دانەیە من چوارم باسکرد، چونکە دانەیەکیانم لەبەرنەکردوە کە تیایدا نیە.

## پەناگرتن لە عاقیبەتی خراپ بەهۆی گوناه و تاوان

**٥٤٩٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَسْتَعِيذُ مِنْ سُوءِ الْقَضَاءِ، وَشَمَاتَةِ الْأَعْدَاءِ، وَدَرَكِ الشَّقَاءِ، وَجَهْدِ الْبَلَاءِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پەنای دەگرت لە خراپی بەڵاو ناڕەحەتی کە بەسەریدا بێت، وە لە دڵخۆشبوونی دوژمنان بەوەی بەڵاو موسیبەتی تووش بێت، وەلە عاقیبەتی خراپ بە هۆی گوناهەوە، یان هەموو هۆکارێک کە ببێتە مایەی لەناوچوون، وە لەو ناڕەحەتیانەی کە تووشی مرۆڤ دەبن کە لە توانایدا نیە چارەسەری بکات، (بەجۆرێک مردنی پێخۆشترە لەوەی لەسەر ئەو حاڵە بمێنێ، بۆ نموونە زۆری خێزان و نەبوونی بژێوی).

## پەناگرتن لە شێتی

**٥٤٩٣-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُنُونِ، وَالْجُذَامِ، وَالْبَرَصِ، وَسَيِّئِ الْأَسْقَامِ»[2].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە شێتی و گەڕی و بەڵکی و نەخۆشیە پیسەکان.

## پەناگرتن لە چاوی جنۆکەکان

**٥٤٩٤-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَعَوَّذُ مِنْ عَيْنِ الْجَانِّ، وَعَيْنِ الْإِنْسِ، فَلَمَّا نَزَلَتِ الْمُعَوِّذَتَانِ أَخَذَ بِهِمَا، وَتَرَكَ مَا سِوَى ذَلِكَ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٥٤.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٠٥٨، وإبن ماجه: ٣٥١١.




واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای دەگرت بە خوا لە جنۆكەكان، وە لە چاوی مرۆڤەكان، كاتێ (الْمُعَوِّذَتَان) دابەزی (واتە: سوورەتی ناس و فەلەق) كاری بەو دوو سوورەتە كردو وازی هێنا لە غەیری ئەو دووانە.

## پەناگرتن لە شەڕو خراپەی پیری پەكەوتەیی

**٥٤٩٥-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَعَوَّذُ بِهَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ، كَانَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ، وَالْهَرَمِ، وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ، وَسُوءِ الْكِبَرِ، وَفِتْنَةِ الدَّجَّالِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ»[١].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای دەگرت بەو وشانە و دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە تەمبەڵی و پیری و ترسنۆكی و ڕەزیلی و خراپی پیری و پەكەوتەیی و فیتنەی دەجال و سزای ناو گۆر.

تێبینی: ئەگەر (الْكِبَرَ) بە (فتح)ەی (الباء) بخوێنرێتەوە، ئەوە بە مانای پیریی دێت، وە ئەگەر (الْكِبْرِ) بە (سكون)ەی (الباء) بخوێنرێتەوە، ئەوە بە مانای لووتبەرزی دێت.

## پەناگرتن لە پیری و پەكەوتەیی و ئەوپەڕی لاوازی تەمەن

**٥٤٩٦-** «عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَانَ يُعَلِّمُنَا خَمْساً كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْعُو بِهِنَّ، وَيَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ»[٢].

واتە: موصعەبی كوڕی سەعد دەگێڕێتەوە، لە باوكیەوە ﷺ دەڵێ: (باوكم) پێنج شتی فێر دەكردین، پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای پێ دەكردن و دەیفەرموو: خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە ڕەزیلی، وە پەنات پێ دەگرم لە ترسنۆكی، وە پەنات پێ دەگرم لەوەی بگەمە تەمەنێكی پیری كە توانای هیچم نەمێنێ، وە پەنات پێ دەگرم لە سزای ناو گۆڕ.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.




## پەناگرتن لە خراپی تەمەن[1]

**٥٤٩٧-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ قَالَ: حَجَجْتُ مَعَ عُمَرَ ﷺ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ بِجَمْعٍ: أَلَا إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَعَوَّذُ مِنْ خَمْسٍ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ وَالْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ سُوءِ الْعُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الصَّدْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ»[2].

واتە: عەمری کوڕی مەیمون دەڵێ: حەجم کرد لەگەڵ عومەردا ﷺ گوێم لێ بوو لە موزدەلیفە دەیوت: پێغەمبەر ﷺ پەنای دەگرت بە پێنج شت: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە ڕەزیلی و ترسنۆکی، وە پەنات پێ دەگرم لە خراپی تەمەن (واتە: گەیشتنی تەمەن بە ئەوپەڕی پیری کە وەکو منداڵی لێبێت لە کەم عەقڵی و کەمی تێگەیشتن و لاوازی هێزو توانا)، وە پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی ناو دڵ، وە پەنات پێ دەگرم لە سزای ناو گۆڕ.

## پەناگرتن لە گەڕانەوە لە تەواویەوە بۆ ناتەواوی

**٥٤٩٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا سَافَرَ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ، وَالْحَوْرِ بَعْدَ الْكَوْرِ، وَدَعْوَةِ الْمَظْلُومِ، وَسُوءِ الْمَنْظَرِ فِي الْأَهْلِ وَالْمَالِ»[3].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەرجیس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ گەشتی بکردایە دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە ناخۆشی و ناڕەحەتی گەشت، وە لە گەڕانەوە بە خەم و پەژارەوە، وە لە گەڕانەوە لە تەواویەوە بۆ ناتەواوی، (یان لە ئیمانەوە بۆ کوفر، یان لە گوێڕایەڵی بۆ سەرپێچی یان لە خۆشگوزەرانیەوە بۆ دەست کورتی) وە پەنا دەگرم لە نزای ستەم لێکراو (واتە: پەنا دەگرم بە خوا لەوەی ستەم بکەم و ستەم لێکراویش نزام لێ بکات) وە پەنا دەگرم لە خراپی شتێک کە لەماڵ و منداڵدا ببینم.

---

(١) واتە: گەیشتنی تەمەن بە ئەوپەڕی پیری کە وەکو منداڵی لێبێت لە کەم عەقڵی و کەمی تێگەیشتن و لاوازی هێز و توانا.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٢٦ و ١٣٤٣/٤٢٧، والترمذي: ٣٤٣٩، وإبن ماجه: ٣٨٨٨.




**٥٤٩٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا سَافَرَ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ، وَالْحَوْرِ بَعْدَ الْكَوْرِ، وَدَعْوَةِ الْمَظْلُومِ، وَسُوءِ الْمَنْظَرِ فِي الْأَهْلِ وَالْمَالِ وَالْوَلَدِ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەرجیس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ گەشتی بکردایە دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە ناخۆشی و ناڕەحەتی گەشت، لە گەڕانەوە بە خەم و پەژارەوە، لە گەڕانەوە لە تەواویەوە بۆ ناتەواوی، (یان لە ئیمانەوە بۆ کوفر، یان لە گوێڕایەڵی بۆ سەرپێچی یان لە خۆشگوزەرانیەوە بۆ دەست کورتی) وە پەنا دەگرم لە نزای ستەم لێکراو (واتە: پەنا دەگرم بە خوا لەوەی ستەم بکەم و ستەم لێکراویش نزام لێبکات) وە پەنا دەگرم لە خراپی شتێک کە لەماڵ و منداڵدا ببینم.**

## پەناگرتن لە نزای ستەم لێکراو

**٥٥٠٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا سَافَرَ يَتَعَوَّذُ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ، وَالْحَوْرِ بَعْدَ الْكَوْرِ، وَدَعْوَةِ الْمَظْلُومِ، وَسُوءِ الْمَنْظَرِ»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەرجیس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ گەشتی بکردایە پەنای دەگرت لە ناخۆشی و ناڕەحەتی گەشت، لە گەڕانەوە بە خەم و پەژارەوە، لە گەڕانەوە لە تەواویەوە بۆ ناتەواوی، وە پەنای دەگرت لە نزای ستەم لێکراو، وە پەنای دەگرت لە خراپترین دیمەنێک کە لەماڵ و منداڵدا ببینێنت.**

## پەناگرتن لە گەڕانەوە لە گەشت بە خەم و پەژارەوە

**٥٥٠١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، إِذَا سَافَرَ فَرَكِبَ رَاحِلَتَهُ، قَالَ: بِإِصْبَعِهِ، وَمَدَّ شُعْبَةُ بِإِصْبَعِهِ، قَالَ: اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالْخَلِيفَةُ فِي الْأَهْلِ وَالْمَالِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٥٩٨، والترمذي: ٣٤٣٨.




**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ گەشتی بکردایە سواری وڵاخەکەی دەبوو، بە پەنجەی ئاماژەی دەکرد «شوعبە پەنجەی درێژ کرد»، فەرمووی: خوایە تۆ هاوەڵی لە گەشتدا، وە تۆ چاودێری ماڵ و سامانی، خوایە پەنا دەگرم بە تۆ لە ناخۆشی و ناڕەحەتی گەشت و لە گەڕانەوە بە خەم و پەژارەوە.**

## پەناگرتن لە دراوسێی خراپ

**٥٥٠٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ، مِنْ جَارِ السَّوْءِ فِي دَارِ الْمُقَامِ، فَإِنَّ جَارَ الْبَادِيَةِ يَتَحَوَّلُ عَنْكَ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەنا بگرن بە خوا لە دراوسێی خراپ لە شوێنی نیشتەجێ بوون، چونکە دراوسێی دەشت و دەوار نشین لە لات نامێنێتەوە.**

## پەناگرتن لە زاڵبوونی دەسەڵاتدارە خراپەکان

**٥٥٠٣-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِأَبِي طَلْحَةَ: الْتَمِسْ لِي غُلَاماً مِنْ غِلْمَانِكُمْ يَخْدُمُنِي فَخَرَجَ بِي أَبُو طَلْحَةَ يُرْدِفُنِي وَرَاءَهُ، فَكُنْتُ أَخْدُمُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كُلَّمَا نَزَلَ، فَكُنْتُ أَسْمَعُهُ يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَرَمِ، وَالْحُزْنِ، وَالْعَجْزِ، وَالْكَسَلِ، وَالْبُخْلِ، وَالْجُبْنِ، وَضَلَعِ الدَّيْنِ، وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ»[٢].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبو طەڵحەی فەرموو: خزمەتکارێکی منداڵ لە منداڵەکانی لای خۆتم بۆ بدۆزەرەوە خزمەتم بکات، ئەبو طەڵحەش منی لەگەڵ خۆیدا بردو لە پشتیەوە سوارمی کرد، جا من خزمەتی پێغەمبەری خوامﷺ دەکرد هەرکاتێ دابەزیایە، من دەمبیست زۆر دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە پیری و خەم و خەفەت و تەمبەڵی و ڕەزیلی و ترسنۆکی و لە قەرزاری زۆرو توانای نەدانەوەی، وە لە زاڵبوونی دەسەڵاتدارە خراپەکان.**

---

**(١) حسن صحيح.**

**(٢) صحيح.**




## پەناگرتن لە فیتنەی دەجال

**٥٥٠٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَسْتَعِيذُ بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ قَالَ: وَقَالَ: إِنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي قُبُورِكُمْ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پەنای دەگرت بە خوا لە سزای ناو گۆڕ و فیتنەی دەجال، وتی: فەرموویەتی: ئێوە تاقی دەکرێنەوە لە ناو گۆڕەکانتاندا، (وەکو تاقی کردنەوەی دەجال، بەڵام بڕواداران ڕزگاریان دەبێت).**

## پەناگرتن لە سزای دۆزەخ و شەڕی مەسیحی دەجال

**٥٥٠٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە سزای دۆزەخ، وە پەنات پێ دەگرم لە سزای ناو گۆڕ، وە پەنات پێ دەگرم لە شەڕی مەسیحی دەجال، وە پەنات پێ دەگرم لە شەڕو فیتنەی ژیان و مردن.**

**٥٥٠٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ النَّارِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە سزای ناو گۆڕ، وە پەنات پێ دەگرم لە سزای ئاگر، وە پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی ژیان و مردن، وە پەنات پێ دەگرم لە شەڕی مەسیحی دەجال.**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٨٨/١٣٢.

(٣) صحيح.

## پەناگرتن لە شەڕی شەیتانەکانی مرۆڤ

**٥٥٠٧-** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِيهِ، فَجِئْتُ فَجَلَسْتُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: يَا أَبَا ذَرٍّ، تَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّ شَيَاطِينِ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ قُلْتُ: أَوَ لِلْإِنْسِ شَيَاطِينُ؟ قَالَ: نَعَمْ»[١].

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: چوومە ناو مزگەوتەوەو پێغەمبەری خوای ﷺ تێدا بوو، هاتم لە لای دانیشتم، فەرمووی: ئەی ئەبو زەڕ پەنا بگرە بە خوا لە شەڕی شەیتانەکانی جنۆکەو مرۆڤەکان وتم: ئایا لە ناو مرۆڤەکانیش شەیتان هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ.**

## پەناگرتن لە فیتنەی ژیان

**٥٥٠٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: عُوذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، عُوذُوا بِاللَّهِ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، عُوذُوا بِاللَّهِ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پەنا بگرن بە خوا لە سزای ناو گۆڕ، پەنا بگرن بە خوا لە فیتنەی ژیان و مردن، پەنا بگرن بە خوا لە فیتنەی مەسیحی دەجال.**

**٥٥٠٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَتَعَوَّذُ مِنْ خَمْسٍ يَقُولُ: عُوذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ شَرِّ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای دەگرت لە پێنج شت و دەیفەرموو: پەنا بگرن بە خوا لە سزای ناو گۆڕ، پەنا بگرن بە خوا لە سزای دۆزەخ، وە لە فیتنەی ژیان و مردن و لە فیتنەی مەسیحی دەجال.**

**٥٥١٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَكَانَ يَتَعَوَّذُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَعَذَابِ جَهَنَّمَ، وَفِتْنَةِ الْأَحْيَاءِ وَالْأَمْوَاتِ، وَفِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ»[٤].

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٨٨/١٣٢.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٦٠٤.

(٤) صحيح الإسناد.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس گوێڕایەڵی من بکات، ئەوە گوێڕایەڵی خوای کردوە، هەرکەسیش سەرپێچیم بکات، ئەوە سەرپێچی خوای کردوە، هەروەها پەنای دەگرت لە سزای ناو گۆڕ و سزای دۆزەخ و فیتنەی ژیان و مردن و فیتنەی مەسیحی دەجال.

**٥٥١١-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، مِـنْ فِيهِ إِلَـى فِيَّ قَالَ: وَقَالَ: يَعْـنِي النَّبِيَّ ﷺ: اسْتَعِيذُوا بِاللَّهِ مِنْ خَمْسٍ: مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَفِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَفِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: لە زاری پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ زاری من، فەرموویەتی: پەنا بگرن بە خوا لە پێنج شت: لە سزای دۆزەخ و سزای ناو گۆڕ و فیتنەی ژیان و مردن و فیتنەی مەسیحی دەجال.

## پەناگرتن لە فیتنەی مردن

**٥٥١٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُعَلِّمُهُمْ هَذَا الدُّعَاءَ كَمَا يُعَلِّمُ السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، قُولُوا: اللَّهُمَّ إِنَّا نَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ»[٢].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم نزایەی فێر دەکردن هەروەکو چۆن سوورەتێکی قورئان فێری کەسێک دەکات، دەیفەرموو بڵێن: خوایە ئێمە پەنا دەگرین بە تۆ لە سزای دۆزەخ، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە سزای ناو گۆڕ، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە فیتنەو ئاشوبی مەسیحی دەجال، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە فیتنەی ژیان و مردن.

**٥٥١٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: عُوذُوا بِاللَّهِ ﷻ مِنْ عَذَابِ اللَّهِ، عُوذُوا بِاللَّهِ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٨٨/١٣٢.




**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پەنا بگرن بە خوا لە سزای خوا، پەنا بگرن بە خوا ﷻ لە فیتنەی ژیان و مردن، وە لە سزای ناو گۆڕو لە فیتنەی مەسیحی دەجال.**

## پەناگرتن لە سزای ناو گۆڕ

**٥٥١٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَدْعُو يَقُولُ فِي دُعَائِهِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ»(١).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەو: پێغەمبەری خوا ﷺ نزای دەکرد لە نزاکەیدا دەیفەرموو: خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە سزای دۆزەخ، وە پەنات پێ دەگرم لە سزای ناو گۆڕ، وە پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی مەسیحی دەجال، وە پەنات پێدەگرم لە فیتنەی ژیان و مردن.**

## پەناگرتن لە فیتنەی ناو گۆڕ

**٥٥١٥-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي دُعَائِهِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْقَبْرِ، وَفِتْنَةِ الدَّجَّالِ، وَفِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ»(٢).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە نزاکانیدا دەیفەرموو: خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە فیتنەی ناو گۆڕ و فیتنەی دەجال و فیتنەی ژیان و مردن.**

## پەناگرتن لە سزای خوا

**٥٥١٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: عُوذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ اللَّهِ، عُوذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، عُوذُوا بِاللَّهِ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، عُوذُوا بِاللَّهِ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ»(٣).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٨٨/١٣٢.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٨٨/١٣٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٨٨/١٣٢.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پەنا بگرن بە خوا لە سزای خوا، پەنا بگرن بە خوا لە سزای ناو گۆڕ، پەنا بگرن بە خوا لە فیتنەی ژیان و مردن، پەنا بگرن بە خوا لە فیتنەی مەسیحی دەجال.

## پەناگرتن لە سزای دۆزەخ

**٥٥١٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَعَوَّذُ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَالْمَسِيحِ الدَّجَّالِ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای دەگرت لە سزای دۆزەخ و سزای ناو گۆڕ، وە لە مەسیحی دەجال.**

## پەناگرتن لە سزای ئاگر

**٥٥١٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ النَّارِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ شَرِّ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەموویەتی: پەنا بگرن بە خوا لە سزای دۆزەخ و سزای ناو گۆڕ، وە لە فیتنەی ژیان و مردن و فیتنەی مەسیحی دەجال.**

## پەناگرتن لە گەرمی ئاگر

**٥٥١٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اللَّهُمَّ رَبَّ جِبْرَائِيلَ وَمِيكَائِيلَ، وَرَبَّ إِسْرَافِيلَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ حَرِّ النَّارِ، وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی خودایە، ئەی پەروەردگاری جبرائیل و میکائیل، ئەی پەروەردگاری ئیسرافیل، پەنا دەگرم بە تۆ لە گەرمی ئاگر و لە سزای ناو گۆڕ.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٨٨/١٣٢.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.





**٥٥٢٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا الْقَاسِمِ ﷺ يَقُولُ فِي صَلَاتِهِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ حَرِّ جَهَنَّمَ»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە باوکی قاسم بوو لە ناو نوێژەکەیدا دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی ناو گۆڕو فیتنەی دەجال، وە لە فیتنەی ژیان و مردن، وە لە گەرمی دۆزەخ.**

**٥٥٢١-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ سَأَلَ اللَّهَ الْجَنَّةَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، قَالَتِ الْجَنَّةُ: اللَّهُمَّ أَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ، وَمَنْ اسْتَجَارَ مِنَ النَّارِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، قَالَتِ النَّارُ: اللَّهُمَّ أَجِرْهُ مِنَ النَّارِ»[2].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس سێ جار داوای بەهەشت بکات لە خوا، بەهەشت دەڵێ: خوایە بیخەرە بەهەشتەوە، هەرکەس سێ جار پەنا بگرێ لە ئاگر، ئاگر دەڵێ: خوایە بیپارێزە لە ئاگر.**

## پەناگرتن لە شەڕو خراپەی ئەوەی کردوویەتی، وە باسی جیاوازی لەسەر عەبدوڵلای کوڕی بورەیدە لە فەرمودەکەدا.

**٥٥٢٢-** «عَنْ حُسَيْنٍ الْمُعَلِّمُ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ بُشَيْرِ بْنِ كَعْبٍ، عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ سَيِّدَ الِاسْتِغْفَارِ أَنْ يَقُولَ الْعَبْدُ: اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي، وَأَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، فَاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، فَإِنْ قَالَهَا حِينَ يُصْبِحُ مُوقِناً بِهَا، فَمَاتَ دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَإِنْ قَالَهَا حِينَ يُمْسِي مُوقِناً بِهَا، دَخَلَ الْجَنَّةَ»[3].

**واتە: حوسەینی موعەلیم دەگێڕێتەوە، لە عەبدوڵلای کوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە، لە بوشەیری کوڕی کەعب، لە شەدادی کوڕی ئەوس ﷺ، لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی گەورەی لێخۆشبونەکان ئەوەیە کە بەندە بڵێ: خوایە تۆ**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٨٨/١٣٢.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٥٧٢، وإبن ماجه: ٤٣٤٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٣٠٦ و ٦٣٢٣.




پەروەردگاری منی، هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە تۆ بەدیتهێناوم و من بەندەی تۆم و لەسەر پەیمان و بەڵێنەکەمم کە بە تۆم داوە تا بتوانم، پەنات پێ دەگرم لە خراپەی ئەوەی ئەنجامم داوە لە گوناە، دان ئەنێم بە گوناهەکانم و بە نیعمەتەکانت لەسەرم، جا ئەی خوایە لێم خۆشبە، چونکە بەڕاستی کەس لە گوناە خۆش نابێت جگە لە تۆ، ئەگەر ئەوە بە یەقینەوە بڵێ کاتێ کە ڕۆژ دەکاتەوە، ئەگەر مرد دەچێتە بەهەشتەوە، وە ئەگەر بە یەقینەوە بیڵێت کاتێ ئیوارە دەکاتەوە دەچێتە بەهەشت.

## پەناگرتن لە شەڕو خراپەی ئەو کردەوەی ئەنجامیداوە، وە باسی جیاوازی لەسەر هیلال

**٥٥٢٣-** «عَنِ عَبْدَةَ بن أبي لُبَابَةَ أَنَّ ابْنِ يَسَافٍ، أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ: مَا كَانَ أَكْثَرُ مَا يَدْعُو بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَبْلَ مَوْتِهِ، قَالَتْ: كَانَ أَكْثَرُ مَا كَانَ يَدْعُو بِهِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ، وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ»[١].

واتە: عەبدەی کوڕی ئەبو لوبابە دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو یەسافەوە، پرسیاری کرد لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێش مردنی چی نزایەکی زۆر دەکرد، وتی: زۆربەی نزاکانی کە نزای پێ دەکرد: خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە شەڕ و خراپەی ئەو کارەی ئەنجاممداوە، وە لە شەڕو خراپەی ئەو کارەی کە ئەنجامم نەداوە.

**٥٥٢٤-** «عَنِ عَبْدَةِ، قَالَ حَدَّثَنِي ابْنِ يَسَافٍ قَالَ: سُئِلَتْ عَائِشَةُ: مَا كَانَ أَكْثَرُ مَا كَانَ يَدْعُو بِهِ النَّبِيُّ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ أَكْثَرُ دُعَائِهِ أَنْ يَقُولَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ، وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ بَعْدُ»[٢].

واتە: عەبدە دەڵێ: ئیبنو یەساف دەڵێ: پرسیار کرا لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ): ئایا پێغەمبەر ﷺ چی نزایەکی زۆر دەکرد، وتی: زۆربەی نزاکانی دەیفەرموو: خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە شەڕ و خراپەی ئەو کارەی ئەنجامداوە، وە لە شەڕو خراپەی ئەو کارەی کە هێشتا ئەنجامم نەداوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.



**٥٥٢٥-** «عَنْ مَنْصُور، عَنْ هِلَالِ بْنِ يَسَافٍ، عَنْ فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ قال: سَأَلْتُ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ عَائِشَةَ عَمَّا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْعُو، قَالَتْ: كَانَ يَقُولُ: أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ، وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ»[1].

**واتە: مەنصور دەگێڕێتەوە، لە هیلالی کوڕی یەساف، لە فەروەی کوڕی نەوفەلەوە دەڵێ: پرسیارم کرد لە دایکی ئیماندارا‌ن عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ بە چی نزایەک نزای دەکرد، وتی: دەیفەرموو: پەنا دەگرم بە تۆ لە شەڕ و خراپەی ئەو کارەی ئەنجامم‌داوە، وە لە شەڕی ئەو کارەی کە ئەنجامم نەداوە.**

**٥٥٢٦-** «عَنْ حُصَين عن هِلَالٍ، عَنْ فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ، وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ»[2].

**واتە: هیلال دەگێڕێتەوە، لە فەروەی کوڕی نەوفەل، لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە شەڕ و خراپەی ئەو کارەی ئەنجامم‌داوە، وە لە شەڕی ئەو کارەی کە ئەنجامم نەداوە.**

## پەناگرتن لە شەڕو خراپەی ئەو کردەوەی ئەنجامی نەداوە

**٥٥٢٧-** «عَنْ فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ فَقُلْتُ: حَدِّثِينِي بِشَيْءٍ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْعُو بِهِ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ، وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ»[3].

**واتە: فەروەی کوڕی نەوفەل دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) وتم: باسی شتێکم بۆ بکە پێغەمبەری خوا ﷺ نزای پێ کردبێت، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە شەڕو خراپەی ئەوەی کردومە، وە لە شەڕی ئەوەی نەمکردوە.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧١٦، وأبو داود: ١٥٥٠، وإبن ماجه: ٣٨٣٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**٥٥٢٨-** «عَنْ فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ: أَخْبِرِينِي بِدُعَاءٍ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْعُو بِهِ، قَالَتْ: كَانَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ، وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ»(١).

**واتە: فەروەی کوڕی نەوفەل دەڵێ: بە عائیشەم (خوا لێی ڕازی بێ) وت: باسی نزایەکم بۆ بکە پێغەمبەری خوا ﷺ نزای پێ کردبێت، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە شەڕو خراپەی ئەوەی کردوومە، وە لە شەڕو خراپەی ئەوەی نەمکردوە.**

## پەناگرتن لە ڕۆچوون بە زەویدا

**٥٥٢٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِعَظَمَتِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي، قَالَ جُبَيْرٌ: وَهُوَ الْخَسْفُ، قَالَ عُبَادَةُ: فَلَا أَدْرِي قَوْلُ النَّبِيِّ ﷺ أَوْ قَوْلُ جُبَيْرٍ»(٢).

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوایە من پەنا دەگرم بە مەزنیت لەوەی بەبێ ئاگایی لەناوببرێم جوبەیر: وتی: بریتیە لە ڕۆچوون داڕوخان بەناخی زەویدا، عوبادە وتی: نازانم ئەوە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بوو یان وتەی: جوبەیرە.**

**٥٥٣٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: اللَّهُمَّ فَذَكَرَ الدُّعَاءَ، وَقَالَ فِي آخِرِهِ: أَعُوذُ بِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي» يَعْنِي بِذَلِكَ الْخَسْفَ»(٣).

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: خوایە، دواتر باسی نزاکەی کرد، لە کۆتاییەکەیدا فەرمووی: پەنا دەگرم بە مەزنیت لەوەی بەبێ ئاگایی لەناوببرێم، مەبەستی لەوەدا ڕۆچوون و داڕوخان بوو.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٠٧٤، وإبن ماجه: ٣٨٧١.




## پەناگرتن لە کەوتنە خوارەوە لە شوێنی بەرز و ڕوخانی خانوو بەسەریدا

**٥٥٣١-** «عَنْ أَبِي الْيَسَرِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ التَّرَدِّي، وَالْهَدْمِ، وَالْغَرَقِ، وَالْحَرِيقِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ يَتَخَبَّطَنِي الشَّيْطَانُ عِنْدَ الْمَوْتِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَمُوتَ فِي سَبِيلِكَ مُدْبِراً، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَمُوتَ لَدِيغاً»[١].

**واتە: ئەبو یەسەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە کەوتنە خوارەوە لە شوێنی بەرز ڕوخانی خانوو بەسەرمدا و خنکان و سوتان، وە پەنات پێ دەگرم لەوەی شەیتان لەسەرە مەرگدا زاڵ بێت بەسەرمدا، وە پەنات پێ دەگرم لە پێناویی تۆدا (بجەنگم) و بە هاڵهاتووی بمرم، وە پەنات پێ دەگرم بە هۆی ئەوە بمرم شتێک پێمەوە بدات.**

**٥٥٣٢-** «عَنْ أَبِي الْيَسَرِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَدْعُو فَيَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَرَمِ، وَالتَّرَدِّي، وَالْهَدْمِ، وَالْغَمِّ، وَالْحَرِيقِ، وَالْغَرَقِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ يَتَخَبَّطَنِي الشَّيْطَانُ عِنْدَ الْمَوْتِ، وَأَنْ أُقْتَلَ فِي سَبِيلِكَ مُدْبِراً، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَمُوتَ لَدِيغاً»[٢].

**واتە: ئەبو یەسەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نزای دەکردو دەیفەرموو: خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە ڕوخانی خانوو بەسەرمداو کەوتنە خوارەوە لە شوێنی بەرزو سوتان و خنکان، وە پەنات پێ دەگرم لەوەی شەیتان لەسەرە مەرگدا زاڵ بێت بەسەرمدا، وە پەنات پێ دەگرم لە پێناوی تۆدا بە هاڵهاتووی بمرم، وە پەنات پێ دەگرم بە هۆی ئەوە بمرم شتێک پێمەوە بدات.**

**٥٥٣٣-** «عَنْ أَبِي الْأَسْوَدِ السُّلَمِيِّ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَدْمِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ التَّرَدِّي، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْغَرَقِ، وَالْحَرِيقِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ يَتَخَبَّطَنِي الشَّيْطَانُ عِنْدَ الْمَوْتِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَمُوتَ فِي سَبِيلِكَ مُدْبِراً، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَمُوتَ لَدِيغاً»[٣].

**واتە: ئەبو ئەسوەدی سولەمی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە ڕوخانی خانوو بەسەرمدا، وە پەنات پێ دەگرم کەوتنە خوارەوە**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٥٢ و ١٥٥٣.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




لە شوێنی بەرز، وە پەنات پێ دەگرم لە خنکان و سوتان، وە پەنات پێ دەگرم لەوەی شەیتان لەسەرە مەرگدا زاڵ بێت بەسەرمدا، وە پەنات پێ دەگرم لە ڕێگەی تۆدا (لە کاتی جەنگ) بە هاڵهاتووی بمرم، وە پەنات پێ دەگرم بە هۆی ئەوە بمرم شتێک پێمەوە بدات.

## پەناگرتن بە ڕەزامەندی خوا لە تورەیی خوا ﷻ

**٥٥٣٤-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: طَلَبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ فِي فِرَاشِي، فَلَمْ أُصِبْهُ، فَضَرَبْتُ بِيَدِي عَلَى رَأْسِ الْفِرَاشِ، فَوَقَعَتْ يَدِي عَلَى أَخْمَصِ قَدَمَيْهِ، فَإِذَا هُوَ سَاجِدٌ يَقُولُ: أَعُوذُ بِعَفْوِكَ مِنْ عِقَابِكَ، وَأَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: شەوێک پێغەمبەری خوام ﷺ لێ ونبوو بە دەستم دەگەڕام بە دوایدا دەستم بەر قاچەکانی کەوت، دایناببوون لە سوژدەدا بوو، دەیفەرموو: پەنا دەگرم بە لێبوردنت لەوەی سزام بدەیت، وە پەنا دەگرم بە ڕەزامەندیت لەوەی لێم تورە بیت، پەنا دەگرم بە زاتی تۆ لە شوێنەواری سیفاتەکانت.

## پەناگرتن لە تەنگەبەری و سەختی ڕۆژی دوایی

**٥٥٣٥-** «عَنْ عَاصِمِ بْنِ حُمَيْدٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ: بِمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَفْتَتِحُ قِيَامَ اللَّيْلِ؟ قَالَتْ: سَأَلْتَنِي عَنْ شَيْءٍ مَا سَأَلَنِي عَنْهُ أَحَدٌ، كَانَ يُكَبِّرُ عَشْراً، وَيُسَبِّحُ عَشْراً، وَيَسْتَغْفِرُ عَشْراً، وَيَقُولُ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَاهْدِنِي، وَارْزُقْنِي، وَعَافِنِي، وَيَتَعَوَّذُ مِنْ ضِيقِ الْمَقَامِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٢].

واتە: عاصمی کوڕی حومەید دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ): پێغەمبەری خوا ﷺ شەونوێژی بەچی دەست پێ دەکرد؟ وتی: پرسیاری شتێکت لێ کردم هیچ کەس ئەو پرسیارەی لێ نەکردووم، دە جار (اللَّهُ أَكْبَرُ)ی دەکرد، دە جار (سُبْحَانَ اللَّه)ی دەکرد، دە جار (أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ)ی دەکرد، وە دەیفەرموو: خوایە لێم خۆشبەو هیدایەتم بدەو ڕزق و ڕۆزیم بدەو لەشم ساغ بکە، وە پەنای دەگرت لە تەنگەبەری و سەختی ڕۆژی دوایی.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٨٦، وأبو داود: ٨٧٩، وإبن ماجه: ٣٨٤١.

(٢) صحيح.




## پەناگرتن لە نزاو پاڕانەوەیەک گوێی لێ نەگیرێ

**٥٥٣٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ، وَمِنْ دُعَاءٍ لَا يُسْمَعُ»(١).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە زانستێک سوود نەگەیەنێ و، لە دڵێک ترسی تێدا نەبێ، وە لە نەفسێک تێر نەبێ و، لە پاڕانەوەیەکیش گوێی بۆ نەگیرێ.**

**٥٥٣٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ، وَمِنْ دُعَاءٍ لَا يُسْمَعُ»(٢).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە زانستێک سوود نەگەیەنێ و، لە دڵێک ترسی تێدا نەبێ، وە لە نەفسێک تێر نەبێ و لە پاڕانەوەیەکیش گوێی بۆ نەگیرێ.**

## پەناگرتن لە نزاو پاڕانەوەیەک وەرنەگیرێ

**٥٥٣٨-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ: كَانَ إِذَا قِيلَ لِزَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ حَدِّثْنَا مَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا أُحَدِّثُكُمْ إِلَّا مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَدَّثَنَا بِهِ، وَيَأْمُرُنَا أَنْ نَقُولَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْبُخْلِ، وَالْجُبْنِ، وَالْهَرَمِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ، وَمِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ، وَدَعْوَةٍ لَا تُسْتَجَابُ»(٣).

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی حارث دەڵێ: ئەگەر بە زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ بوترایە ئەوەمان بۆ باس بکە کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستووتە، دەیوت: تەنها ئەوەتان بۆ باس دەکەم کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باسکردووین و فەرمانی پێ کردووین،**

---

(١) حسن صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧٢٢، والترمذي: ٣٥٧٢.




بڵێین: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە بێ توانایی و تەمبەڵی و ڕەزیلی و ترسنۆکی و پیری و پەکەوتەیی، وە لە سزای ناو گۆڕ، خوایە گیان تەقواو خۆپارێزی ببەخشی بە نەفسم، وە پاک و پاڵفتەی بکەرەوە، چونکە تۆ چاکترینی ئەوانەی کە نەفس و دەروون پاک دەکەنەوە، تۆ خاوەن و دروستکەری ئەو نەفسەی، خوایە من پەنات پێ دەگرم لە نەفسێک تێر نەبێ، وە لە دڵێک ترسی تۆی تێدا نەبێ، وە لە زانستێک سوود نەگەیەنێ، هەروەها لە نزایەک وەرنەگیرێ.

**٥٥٣٩-** «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ قَالَ: بِسْمِ اللَّهِ، رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ أَزِلَّ أَوْ أَضِلَّ، أَوْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ، أَوْ أَجْهَلَ أَوْ يُجْهَلَ عَلَيَّ»[١].

واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە ماڵ دەربچووایە دەیفەرموو: بە ناوی خوا، پەروەردگارم پەنات پێ دەگرم لەوەی تووشی گوناه بم بەبێ مەبەست، یان گومڕا بم و لە ڕێگای حەق لابدەم، یان ستەم بکەم، یان ستەمم لێ بکرێ، یان کاری نەفامەکان بکەم، یان نەفامەکان زیانم لێ بدەن.

---

(١) صحيح.

## بابەت: قەدەغەکردنی خواردنەوەی مەی:

**خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ ﴾[1]**

**٥٥٤٠-** «عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ قَالَ عُمَرُ: اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَاناً شَافِياً فَنَزَلَتِ الْآيَةُ الَّتِي فِي الْبَقَرَةِ فَدُعِيَ عُمَرُ فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ، فَقَالَ عُمَرُ: اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَاناً شَافِياً، فَنَزَلَتِ الْآيَةُ الَّتِي فِي النِّسَاءِ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ ﴿٤٣﴾ ﴾النساء، فَكَانَ مُنَادِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَقَامَ الصَّلَاةَ نَادَى: ﴿ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ ﴿٤٣﴾ ﴾النساء، فَدُعِيَ عُمَرُ فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ فَقَالَ: اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَاناً شَافِياً، فَنَزَلَتِ الْآيَةُ الَّتِي فِي الْمَائِدَةِ فَدُعِيَ عُمَرُ فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ، فَلَمَّا بَلَغَ: ﴿ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ ﴾المائدة، قَالَ عُمَرُ: انْتَهَيْنَا انْتَهَيْنَا»[2].

**واتە: عومەر ﷺ لێی گێڕدراوەتەوە: کاتێ ئایەتی قەدەغەکردنی خواردنەوەی مەی دابەزی عومەر وتی: خوایە خواردنەوەی مەیان بۆ ڕوونبکەرەوە بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا، ئینجا ئەو ئایەتە دابەزیە خوارەوە کە لە بەقەڕەدا هاتووە، عومەر بانگکراو بە سەریدا خوێندرایەوە، عومەر وتی: خوایە خواردنەوەی مەیان بۆ ڕوون بکەرەوە بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا، ئینجا ئەو ئایەتە دابەزیە خوارەوە کە لە سووڕەتی نیسائدایە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ ﴿٤٣﴾ ﴾ (واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە نزیکی نوێژ مەبنەوە کاتێک ئێوە سەرخۆش بن)، پاشان بانگکەری پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ قامەتی نوێژ بکرایە دەیوت: ﴿ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ ﴿٤٣﴾ ﴾ عومەر بانگکرا و ئایەتەکەی بۆ خوێندرایەوە، وتی: خوایە خواردنەوەی مەیان بۆ ڕون بکەرەوە بە شێوەیەکی ڕون و ڕەوان، پاشان ئەو ئایەتە دابەزی کە لە مائیدەدا هاتووە، عومەر بانگکراو بەسەریدا خوێندرایەوە، کاتێ گەیشتە: ﴿ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ ﴾ (واتە: دەی ئایا ئێوە وازدەهێنن لەو خراپانە)، عومەر وتی: وازمان هێنا وازمان هێنا.**

---

(١) واتە: بێگومان شەیتان هەر دەیەوێ دوژمنایەتی و کینەو ڕق بخاتە ناوتانەوە بەهۆی ئارەق و قومارەوە وە بەرگریتان بکات لە یادو باسی خواو لە نوێژکردن دەی ئایا ئێوە وازدەهێنن لەو (خراپانە)؟.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٦٧٠، والترمذي: ٣٠٤٩.




## باسی ئەو شەرابەی كە بە هۆی قەدەغەكردنی مەیەوە ڕژێنرا

**٥٥٤١-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: بَيْنَا أَنَا قَائِمٌ، عَلَى الْحَيِّ وَأَنَا أَصْغَرُهُمْ سِنّاً عَلَى عُمُومَتِي، إِذْ جَاءَ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّهَا قَدْ حُرِّمَتِ الْخَمْرُ، وَأَنَا قَائِمٌ عَلَيْهِمْ أَسْقِيهِمْ مِنْ فَضِيخٍ لَهُمْ «، فَقَالُوا: اكْفَأْهَا، فَكَفَأْتُهَا، فَقُلْتُ: لِأَنَسٍ مَا هُوَ؟ قَالَ: الْبُسْرُ، وَالتَّمْرُ»(١).

**واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: لە كاتێكدا من خزمەتم دەكرد لە ناو خەڵكێكدا، من بچوكترینیان بووم لە ناو مامەكانمدا، لە ناكاو پیاوێک هات و وتی: بەڕاستی مەی قەدەغەكرا، منیش شەرابم بەسەریاندا دەگێڕا، وتیان: بیڕێژە، منیش ڕێژتم، بە ئەنەسم وت: ئەو شەرابە چی بوو وتی: شەرابی خورما بوو.**

**تێبینی:**

**(الْبُسْرُ): خورمایەكە تەواو نەگەیوە.**

**(التَّمْر): خورمای وشكە دوای ئەوەی پێگەیشت وشک دەكرێتەوە، ئەو دوو جۆرە تێكەڵ بكرێ لەگەڵ ئاودا زووتر دەبێتە سەرخۆشكەر.**

**٥٥٤٢-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ أَسْقِي أَبَا طَلْحَةَ، وَأُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ، وَأَبَا دُجَانَةَ فِي رَهْطٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَدَخَلَ عَلَيْنَا رَجُلٌ فَقَالَ: حَدَثَ خَبَرٌ نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ فَكَفَأْنَا، قَالَ: وَمَا هِيَ يَوْمَئِذٍ إِلَّا الْفَضِيخُ خَلِيطُ الْبُسْرِ، وَالتَّمْرِ، قَالَ: وَقَالَ أَنَسٌ: لَقَدْ حُرِّمَتِ الْخَمْرُ، وَإِنَّ عَامَّةَ خُمُورِهِمْ يَوْمَئِذٍ الْفَضِيخُ»(٢).

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: من شەرابم دەگێڕا بۆ ئەبو طەڵحەو ئوبەی كوڕی كەعب و ئەبو دوجانە لەگەڵ كۆمەڵێک لە ئەنصارەكان، پیاوێک هاتە ژوورەوە بۆ ناومان وتی: هەواڵێک ڕوویداوە قەدەغەكردنی شەراب و مەی دابەزیە خوارەوە، ئێمەش ڕژاندمان، وتی: لەو ڕۆژەدا تەنها شەرابی خورما هەبوو، ئەنەس وتی: كاتێ شەراب قەدەغەكرا سەرجەم شەرابەكانیان لە خورما بوو.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٨٠ و ٥٥٨٢ و ٥٥٨٣ و ٥٥٨٤ و ٥٦٢٢ و ٧٢٥٣، ومسلم: ٣ و ٧ و ١٩٨٠/٩.

(٢) صحيح.



٥٥٤٣- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: حُرِّمَتِ الْخَمْرُ حِينَ حُرِّمَتْ، وَإِنَّهُ لَشَرَابُهُمُ الْبُسْرُ وَالتَّمْرُ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: مەی قەدەغە کرا کاتێ قەدەغەکرا، شەرابی ئەوان بریتی بوو لە شەرابی خورمای: (الْبُسْرُ) و (التَّمْر).

تێبینی:

(الْبُسْرُ): خورمایەکە تەواو نەگەیوە.

(التَّمْر): خورمای وشکە، دوای ئەوەی کە پێگەیشتوە وشک دەکرێتەوە.

## دروستکردنی شەراب بە خورمای: (الْبُسْرُ) و (التَّمْر) (تێکەڵکردنی ئەو دوو جۆرە خورمایە لەگەڵ ئاودا زووتر دەبێتە سەرخۆشکەر)

٥٥٤٤- «عَنْ جَابِرٍ يَعْنِي، ابْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: الْبُسْرُ وَالتَّمْرُ خَمْرٌ»[2].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: شەراب لە خورمای: (الْبُسْرُ) و (التَّمْر) دروست دەکرێ.

٥٥٤٥- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: الْبُسْرُ وَالتَّمْرُ خَمْرٌ»[3].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: شەراب لە خورمای (الْبُسْرُ) و (التَّمْر) دروست دەکرێ.

٥٥٤٦- «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الزَّبِيبُ، وَالتَّمْرُ هُوَ الْخَمْرُ»[4].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: تێکەڵکردنی مێوژو خورما لەگەڵ ئاودا دەکرێت بە شەراب.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح موقوف.

(٣) صحيح موقوف.

(٤) صحيح.




## قەدەغەکردنی ڕوونکردنەوە لە خواردنەوەی شەربەتی دوو تێکەڵە لە خورمای (الْبَلَح) کە خورمایەکی زەردە سەرەکەی گەیوە، وە خورمای وشک

**٥٥٤٧-** «عَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ رَجُلٍ، مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الْبَلَحِ وَالتَّمْرِ، وَالزَّبِيبِ وَالتَّمْرِ»(١).

واتە: ئیبنو ئەبو لەیلا دەگێڕێتەوە، لە پیاوێکەوە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد لەوەی خورمای (الْبَلَحِ) و خورمای وشک تێکەڵ بکرێ و بکرێت بە شەربەت، وە هەروەها مێوژو خورماش. (چونکە دەبێتە سەرخۆشکەر، دیارە ئەگەر خواردنەوەی کەمترین ڕێژەی مرۆڤ سەرخۆش نەکات قەدەغەکە هەڵدەگیرێت).

## تێکەڵەی دوو جۆر خورما، خورمای (الْبَلَح) کە خورمایەکی زەردە سەرکەی گەیوە، وە خورمای (الزَّهْو) ئەویش خورمایەکە زیاتر سوور یان زەرد دەڕوانێ

**٥٥٤٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالْمُزَفَّتِ، وَالنَّقِيرِ، وَأَنْ يُخْلَطَ الْبَلَحُ وَالزَّهْوُ»(٢).

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە دروستکردنی شەراب لەناو کولەکەو قاپی بۆیەکراو بە زفت و قەدی دارخورما، وە هەروەها خورمای (الْبَلَحِ) و (الزَّهْو)یش تێکەڵ بکرێ لەگەڵ ئاودا.

**٥٥٤٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْمُزَفَّتِ، وَزَادَ مَرَّةً أُخْرَى، وَالنَّقِيرِ، وَأَنْ يُخْلَطَ التَّمْرُ بِالزَّبِيبِ، وَالزَّهْوُ بِالتَّمْرِ»(٣).

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە دروستکردنی شەراب لە ناو کولەکەو قاپی بۆیەکراو بە زفت، ئەوەیشی

---

(١) صحيح الإسناد. أخرجه أبو داود: ٣٧٠٥.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٤١ و ١٩٩٥/٤٢.

(٣) صحيح.




زیادکرد، قەدی دارخورما، وە خورماو مێوژیش تێکەڵ بکرێ لەگەڵ ئاودا، وە خورمای (الزَّهْو)یش لەگەڵ خورمای وشکدا تێکەڵ بکرێ لەگەڵ ئاودا.

**٥٥٥٠-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الزَّهْوِ وَالتَّمْرِ، وَالزَّبِيبِ وَالتَّمْرِ»[١].

**واتە:** ئەبو سەعید خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە تێکەڵە کردنی خورمای (الزَّهْو) و خورمای وشک، وە لە مێوژو خورمای وشک.

## تێکەڵ کردنی خورمای (الزَّهْو) خورمای تەڕ یان ڕوتاب پێکەوە لەگەڵ ئاودا

**٥٥٥١-** «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا تَجْمَعُوا بَيْنَ التَّمْرِ وَالزَّبِيبِ، وَلَا بَيْنَ الزَّهْوِ وَالرُّطَبِ»[٢].

**واتە:** ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خورماو مێوژ پێکەوە کۆمەکەنەوە لەگەڵ ئاودا، وە خورمای (الزَّهْو) و خورمای تەڕ پێکەوە تێکەڵ مەکەن.

**٥٥٥٢-** «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا تَنْبِذُوا الزَّهْوَ وَالرُّطَبَ جَمِيعاً، وَلَا تَنْبِذُوا الزَّبِيبَ وَالرُّطَبَ جَمِيعاً»[٣].

**واتە:** ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خورمای (الزَّهْو) خورمای تەڕ پێکەوە مەکەن بە شلەمەنی، وە خورماو مێوژ پێکەوە مەکەن بە شلەمەنی.

## تێکەڵ کردنی خورمای (الزَّهْو) کە خورمایەکە زیاتر سور یان زەرد دەڕوانێ، لەگەڵ خورمای (الْبُسْرُ): کە خورمایەکە تەواو پێ نەگەیوە

**٥٥٥٣-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُخْلَطَ التَّمْرُ وَالزَّبِيبُ، وَأَنْ يُخْلَطَ الزَّهْوُ وَالتَّمْرُ، وَالزَّهْوُ وَالْبُسْرُ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠ و ١٩٨٧/٢٣، والترمذي: ١٨٧٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٠٢، ومسلم: ٢٤ و ١٩٨٨/٢٦، وأبو داود: ٣٧٠٤، وإبن ماجه: ٣٣٩٧.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠ و ١٩٨٧/٢٢، والترمذي: ١٨٧٧.




واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە تێکەڵەی خورماو مێوژ لەگەڵ ئاودا، وە خورمای (الزَّهْو) تێکەڵ بکرێت لەگەڵ خورمای (الْبُسْرُ)دا.

## تێکەڵەی خورمای (البُسْر) و خورمای تەڕ یان ڕوتاب لەگەڵ ئاودا

**٥٥٥٤-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ خَلِيطِ التَّمْرِ وَالزَّبِيبِ، وَالْبُسْرِ وَالرُّطَبِ»[١].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لە تێکەڵکردنی خورماو مێوژ لەگەڵ ئاودا، وە خورمای (الْبُسْرُ) لەگەڵ خورمای تەڕدا.

**٥٥٥٥-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا تَخْلِطُوا الزَّبِيبَ وَالتَّمْرَ، وَلَا الْبُسْرَ وَالتَّمْرَ»[٢].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مێوژو خورما تێکەڵ مەکەن لەگەڵ ئاودا، هەروەها خورمای (الْبُسْرُ) لەگەڵ خورمای وشکدا.

## تێکەڵەی خورمای (البُسْر): (خورمایەکە تەواو نەگەیوە) و (التَّمر) خورمای وشکە دوای ئەوەی دەگەیی وشک دەکرێتەوە

**٥٥٥٦-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ نَهَى أَنْ يُنْبَذَ الزَّبِيبُ وَالتَّمْرُ جَمِيعاً، وَنَهَى أَنْ يُنْبَذَ الْبُسْرُ وَالتَّمْرُ جَمِيعاً»[٣].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لەوەی خورماو مێوژ پێکەوە بکرێت بە شلەمەنی، وە قەدەغەی کردوە خورمای (الْبُسْرُ) لەگەڵ خورمای وشکدا پێکەوە تێکەڵ بکرێت بۆ شەربەت.

**٥٥٥٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالْمُزَفَّتِ، وَالنَّقِيرِ، وَعَنِ الْبُسْرِ، وَالتَّمْرِ أَنْ يُخْلَطَا، وَعَنِ الزَّبِيبِ وَالتَّمْرِ أَنْ يُخْلَطَا وَكَتَبَ إِلَى أَهْلِ هَجَرَ أَنْ لَا تَخْلِطُوا الزَّبِيبَ وَالتَّمْرَ جَمِيعاً»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٠١، ومسلم: ١٦ و ١٩٨٦/١٩، وأبو داود: ٣٧٠٣، والترمذي: ١٨٧٦، وإبن ماجه: ٣٣٩٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە دروستکردنی شەراب لەناو کولەکەو گۆزەو قاپی بۆیەکراو بە زفت و قەدی دارخورمای هەڵکۆڵدراو (ئەوانە چەند قاپێک بوو لەناو عەرەبدا بەکاریان دەهێنا، لە دار دروست کرابوون، هەڵیان دەکۆڵی و بەکاریان دەهێنا بۆ جۆرەها خواردنەوە، ئەو قاپانە دەبوونە هۆکارو یارمەتیدەر بۆ ئەوەی ئەو خواردنەوانە زووتر ببێتە سەرخۆشکەر) وە لە خورمای (الْبُسْرُ) و خورمای وشک تێکەڵ بکرێ، وە لە مێوژ و خورما تێکەڵ بکرێت، وە نوسراوی کرد بۆ خەڵکی هەجەر مێوژو خورما پێکەوە تێکەڵ نەکەن.

**٥٥٥٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: الْبُسْرُ وَحْدَهُ حَرَامٌ، وَمَعَ التَّمْرِ حَرَامٌ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: شلەمەنی خورمای (الْبُسْرُ) بە تەنها حەرامە، وە لەگەڵ خورمای وشکیشدا حەرامە.

## تێکەڵەی خورماو مێوژ

**٥٥٥٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ خَلِيطِ التَّمْرِ وَالزَّبِيبِ، وَعَنِ التَمْرِ وَالْبُسْرِ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە تێکەڵەی خورماو مێوژ، وە لە تێکەڵەی خورمای وشک و خورمای (الْبُسْرِ).

**٥٥٦٠-** «عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ التَّمْرِ وَالزَّبِيبِ، وَنَهَى عَنِ التَّمْرِ وَالْبُسْرِ أَنْ يُنْبَذَا جَمِيعاً»[٣].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە تێکەڵەی خورماو مێوژ، وە قەدەغەی کردوە لە تێکەڵەی خورمای وشک و خورمای (الْبُسْرُ) هەردووکیان پێکەوە بکرێن بە شەراب.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




## تێکەڵەی خورمای تەڕ و مێوژ

٥٥٦١- «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا تَنْبِذُوا الزَّهْوَ، وَالرُّطَبَ، وَلَا تَنْبِذُوا الرُّطَبَ وَالزَّبِيبَ جَمِيعاً»[١].

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خورمای (الزَّهْو)و خورمای تەڕ پێکەوە مەکەن بە شلەمەنی، وە هەروەها خورمای تەڕو مێوژ پێکەوە تێکەڵ مەکەن بۆ شەراب.

## تێکەڵەی خورمای (الْبُسْرُ) و مێوژ

٥٥٦٢- «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ نَهَى أَنْ يُنْبَذَ الزَّبِيبُ، وَالْبُسْرُ جَمِيعاً، وَنَهَى أَنْ يُنْبَذَ الْبُسْرُ وَالرُّطَبُ جَمِيعاً»[٢].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لەوەی مێوژ و خورمای (الْبُسْرُ) پێکەوە بکرێ بە شلەمەنی، وە قەدەغەی کردوە خورمای (الْبُسْرُ) و خورمای تەڕ پێکەوە بکرێ بە شلەمەنی.

## باسی ئەو هۆکارەی لە پێناویدا قەدەغەی کردوە لەو تێکەڵانە، ئەویش لەبەر ئەوەیە دانەیەکیان زاڵ دەبێت بەسەر ئەویتردا.

٥٥٦٣- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَجْمَعَ شَيْئَيْنِ نَبِيذاً يَبْغِي أَحَدُهُمَا عَلَى صَاحِبِهِ قَالَ: وَسَأَلْتُهُ عَنِ الْفَضِيخِ، فَنَهَانِي عَنْهُ، قَالَ: كَانَ يَكْرَهُ الْمُذَنِّبَ مِنَ الْبُسْرِ مَخَافَةَ أَنْ يَكُونَا شَيْئَيْنِ، فَكُنَّا نَقْطَعُهُ»[٣].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە دوو شت پێکەوە تێکەڵ بکەین و بیکەین بە شلەمەنی، دانەیەکیان زاڵ بێت بەسەر

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح الإسناد.

ئەویتردا، وتی: پرسیارم لێکرد لەبارەی شەرابێکەوە لە (الْفَضِيخِ) دروست بکرێت، (کە خورمایەکە لە خورمای (الْبُسْرُ)، بۆیە قەدەغەی لێکردم، وتی: پێغەمبەر ﷺ حەزی نەدەکرد لەوەی خورمای (الْبُسْرُ) بکرێت بە شلەمەنی، لە ترسی ئەوەی نەبێتە دوو شت، بۆیە دەمانکرد بە دوو بەشەوە. (واتە: خورمای (الزهو)مان لە خورمای (الْبُسْرُ) جیادەکردەوە هەتا بە زوویی نەبێتە سەرخۆشکەر).

**٥٥٦٤-** «عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ قَالَ: شَهِدْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ أُتِيَ بِبُسْرٍ مُذَنِّبٍ، فَجَعَلَ يَقْطَعُهُ مِنْهُ»[١].

واتە: باوکی ئیدریس دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیکم ﷺ بینی خورمای (الْبُسْر)ی تێکەڵ کراویان بۆ هێنا، هەڵسا جیای کردەوە. (واتە: خورمای (الزهو) لە خورمای (الْبُسْرُ) جیا دەکردەوە هەتا بە زوویی نەبێتە سەرخۆشکەر).

**٥٥٦٤م-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ قَالَ قَتَادَةُ: كَانَ أَنَسٌ ﷺ يَأْمُرُ بِالتَّذْنُوبِ فَيُقْرَضُ»[٢].

واتە: سەعیدی کوڕی عروبە دەڵێ: قەتادە وتی: ئەنەس ﷺ فەرمانی کرد خورمای تەڕ لە خورمای (الْبُسْرُ) جیابکرێتەوە.

**٥٥٦٥-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ لَا يَدَعُ شَيْئاً قَدْ أَرْطَبَ إِلَّا عَزَلَهُ عَنْ فَضِيخِهِ»[٣].

واتە: ئەنەس ﷺ لێی گێڕدراوەتەوە: ئەو نەیدەهێشت هیچ خورمایەک شل ببێتەوە، ئیللا لە یەکتر جیای دەکردەوە.

## مۆڵەتدان بە دروستکردنی شلەمەنی لە خورمای (الْبُسْر) بە تەنها، وە خواردنەوەی پێش ئەوەی بگۆڕێ

**٥٥٦٦-** «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا تَنْبِذُوا الزَّهْوَ وَالرُّطَبَ جَمِيعاً، وَلَا الْبُسْرَ وَالزَّبِيبَ جَمِيعاً، وَانْبِذُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى حِدَتِهِ»[٤].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح.




واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خورمای (الزَّهْو)و خورمای تەڕ پێکەوە تێکەڵ مەکەن بە شلەمەنی، وە خورمای (الْبُسْر) مێوژ پێکەوە مەکەن بە شلەمەنی، هەر یەکەیان بە تەنها بکەن بە شلەمەنی.

## مۆڵەتدان بە دروستکردنی شلەمەنی لە ناو ئەو دەفرانەی کە لە پێستە دروست دەکرێت و دەمەکەی دەبەسترێ

**٥٥٦٧-** «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ خَلِيطِ الزَّهْوِ وَالتَّمْرِ، وَخَلِيطِ الْبُسْرِ وَالتَّمْرِ. وَقَالَ: لِتَنْبِذُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى حِدَةٍ فِي الْأَسْقِيَةِ الَّتِي يُلَاثُ عَلَى أَفْوَاهِهَا»[١].

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لە تێکەڵەی خورمای زەهو لەگەڵ خورمای وشک، هەروەها تێکەڵەی خورمای (الْبُسْرُ) و خورمای وشکیش، وە فەرموویەتی: هەریەکەیان بە تەنها شلەمەنی لێ دروست بکەن لە ناو ئەو دەفرانەی کە لە پێستە دروست دەکرێن و سەریان دادەپۆشرێ.

## چاوپۆشی لە گرتنەوەی شلەمەنی خورمای وشک بە تەنها

**٥٥٦٨-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُخْلَطَ بُسْرٌ بِتَمْرٍ، أَوْ زَبِيبٌ بِتَمْرٍ، أَوْ زَبِيبٌ بِبُسْرٍ، وَقَالَ: مَنْ شَرِبَهُ مِنْكُمْ فَلْيَشْرَبْ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُ فَرْداً، تَمْراً فَرْداً، أَوْ بُسْراً فَرْداً، أَوْ زَبِيباً فَرْداً»[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە خورمای (الْبُسْر) تێکەڵ بکرێ لەگەڵ خورمای وشک، یان مێوژ لەگەڵ خورمای وشک، یان مێوژ لەگەڵ خورمای (الْبُسْر)، وە فەرمووی: هەرکەس لە ئێوە خواردیەوە با بە تەنها بیخواتەوە، خورمای وشک بە تەنها، خورمای (الْبُسْر) بە تەنها، یان مێوژ بە تەنها.

**٥٥٦٩-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى أَنْ يُخْلَطَ بُسْراً بِتَمْرٍ، أَوْ زَبِيباً بِتَمْرٍ، أَوْ زَبِيباً بِبُسْرٍ وَقَالَ: مَنْ شَرِبَ مِنْكُمْ فَلْيَشْرَبْ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُ فَرْداً»[٣].

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠ و ١٩٨٧/٢٣.

(٣) صحيح.




واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە خورمای (الْبُسْر) تێکەڵ بکرێ لەگەڵ خورمای وشک، یان مێوژ لەگەڵ خورمای وشک، یان مێوژ لەگەڵ خورمای (الْبُسْر)، وە فەرمووی: هەرکەس لە ئێوە خواردیەوە با بە تەنها بیخواتەوە.

## گرتنەوەی شلەمەنی ترێ بە تەنها

**٥٥٧٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُخْلَطَ الْبُسْرُ وَالزَّبِيبُ، وَالْبُسْرُ وَالتَّمْرُ، وَقَالَ: انْبِذُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى حِدَةٍ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە خورمای (الْبُسْر) و مێوژ تێکەڵ بکرێ، وە خورمای (الْبُسْر) و خورمای وشکیش، وە فەرمووی: هەریەکەیان بە تەنها شلەمەنی لێ دروست بکەن.

## مۆڵەتدان بە گرتنەوەی شلەمەنی بە خورمای (الْبُسْر) بە تەنها

**٥٥٧١-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى أَنْ يُنْبَذَ التَّمْرُ وَالزَّبِيبُ، وَالتَّمْرُ وَالْبُسْرُ، وَقَالَ: انْتَبِذُوا الزَّبِيبَ فَرْداً، وَالتَّمْرَ فَرْداً، وَالْبُسْرَ فَرْداً»[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە شلەمەنی خورمای وشک و مێوژ بگیرێتەوە، وە خورمای وشک و خورمای (الْبُسْر)یش، وە فەرموویەتی: مێوژ بە تەنها بکەن بە شلەمەنی، خورمایش بە تەنها، خورمای (الْبُسْر) یش بە تەنها.

---

(١) حسن صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٨٩.

(٢) صحيح.





## تەفسیری فەرمایشتی خوا ﷻ:

﴿ وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلۡأَعۡنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرٗا وَرِزۡقًا حَسَنًا ﴿٦٧﴾ ﴾(١)

**٥٥٧٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْخَمْرُ مِنْ هَاتَيْنِ وَقَالَ سُوَيْدٌ: فِي هَاتَيْنِ الشَّجَرَتَيْنِ النَّخْلَةُ وَالْعِنَبَةُ»(٢).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مەی و شەراب لەم دوانەیە، سوەید (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودە) وتی: لەم دوو دارەیە، خورماو ترێ.**

**٥٥٧٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْخَمْرُ مِنْ هَاتَيْنِ الشَّجَرَتَيْنِ النَّخْلَةُ وَالْعِنَبَةُ»(٣).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مەی و شەراب لەم دوو دارەیە، خورماو ترێ.**

**٥٥٧٤-** «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، وَالشَّعْبِيِّ قَالَا: السَّكَرُ خَمْرٌ»(٤).

**واتە: ئیبراهیم و شەعبی دەڵێن: سەرخۆشکەر مەی و ئارەقە.**

**٥٥٧٥-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: السَّكَرُ خَمْرٌ»(٥).

**واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: سەرخۆشکەر مەی و ئارەقە.**

**٥٥٧٦-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: السَّكَرُ خَمْرٌ»(٦).

**واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: سەرخۆشکەر مەی و ئارەقە.**

---

(١) واتە: وە لە بەروبوومەکانی دارخورما و ڕەزەکانیش خواردنەوەی سەرخۆشکەری لێ دروست دەکەن وە بژێوی پاکء چاکیشی لێ دروست دەکەن وەك مێوژ و دۆشاو.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣ و ١٩٨٥/١٥، وأبو داود: ٣٦٧٨، والترمذي: ١٨٧٥، وإبن ماجه: ٣٣٧٨.

(٣) صحيح.

(٤) ضعيف.

(٥) صحيح الإسناد مقطوع.

(٦) صحيح الإسناد.





**٥٥٧٧-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: السَّكَرُ حَرَامٌ، وَالرِّزْقُ الْحَسَنُ حَلَالٌ»[١].

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: سەرخۆشکەر قەدەغەیە، ڕزق و ڕۆزی چاکیش حەڵاڵە.

## باسی ئەو جۆرە شتانەی کە مەی لێ دروست دەکرا لەو کاتەی ئایەتی قەدەغەکردنی دابەزی

**٥٥٧٨-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ يَخْطُبُ عَلَى مِنْبَرِ الْمَدِينَةِ فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ، أَلَا إِنَّهُ نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ يَوْمَ نَزَلَ، وَهِيَ مِنْ خَمْسَةٍ: مِنَ الْعِنَبِ، وَالتَّمْرِ، وَالْعَسَلِ، وَالْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرِ، وَالْخَمْرُ مَا خَامَرَ الْعَقْلَ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە عومەر بوو لەسەر مینبەر وتاری دەدا وتی: ئەی خەڵکینە، کاتێ ئایەتی قەدەغەکردنی ئارەق دابەزیە خوارەوە، پێنج جۆرە شت هەبوو شەرابیان لێ دروست دەکرد: لە ترێ و خورماو هەنگوین و گەنم و جۆ، ئارەق ئەوەیە عەقڵ دادەپۆشێت.

**٥٥٧٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ الْخَمْرَ نَزَلَ تَحْرِيمُهَا، وَهِيَ مِنْ خَمْسَةٍ: مِنَ الْعِنَبِ، وَالْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرِ، وَالتَّمْرِ، وَالْعَسَلِ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە عومەری کوڕی خەطاب بوو لەسەر مینبەری پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا وتی: ئەی خەڵکینە، کاتێ قەدەغەکردنی مەی و ئارەق دابەزیە خوارەوە، پێنج جۆرە شت هەبوو شەرابیان لێ دروست دەکرد: لە ترێ و گەنم و جۆو خورماو هەنگوین.

**٥٥٨٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: الْخَمْرُ مِنْ خَمْسَةٍ: مِنَ التَّمْرِ، وَالْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرِ، وَالْعَسَلِ، وَالْعِنَبِ»[٤].

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٦١٩ و ٥٥٨١، ومسلم: ٣٢ و ٣٠٣٢/٣٣، وأبو داود: ٣٦٦٩، والترمذي: ١٨٧٤.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح الإسناد.




واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: شەرابی سەرخۆشكەر لە پێنج دانە دروست دەكرێت: لە خورماو گەنم و جۆو هەنگوین و ترێ.

## قەدەغەكردنی خواردنەوەی سەرخۆشكەر لە بەروبوومەكان و دانەوێڵەكان بە جیاوازی ڕەگەزەكانیان بۆ ئەو كەسەی دەیخواتەوە

**٥٥٨١**- «عَنِ ابْنِ سِيرِينَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى ابْنِ عُمَرَ فَقَالَ: إِنَّ أَهْلَنَا يَنْبِذُونَ لَنَا شَرَاباً عَشِيّاً، فَإِذَا أَصْبَحْنَا شَرِبْنَا قَالَ: أَنْهَاكَ عَنِ الْمُسْكِرِ قَلِيلِهِ وَكَثِيرِهِ، وَأُشْهِدُ اللَّهَ عَلَيْكَ، أَنْهَاكَ عَنِ الْمُسْكِرِ قَلِيلِهِ وَكَثِيرِهِ، وَأُشْهِدُ اللَّهَ عَلَيْكَ، إِنَّ أَهْلَ خَيْبَرَ يَنْتَبِذُونَ شَرَاباً مِنْ كَذَا وَكَذَا، وَيُسَمُّونَهُ كَذَا وَكَذَا وَهِيَ الْخَمْرُ، وَإِنَّ أَهْلَ فَدَكٍ يَنْتَبِذُونَ شَرَاباً مِنْ كَذَا وَكَذَا، يُسَمُّونَهُ كَذَا وَكَذَا، وَهِيَ الْخَمْرُ حَتَّى عَدَّ أَشْرِبَةً أَرْبَعَةً أَحَدُهَا الْعَسَلُ»[١].

واتە: ئیبنو سیرین دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای ئیبنو عومەر وتی: كەسو كارەكەمان بە شەو شەرابمان بۆ دروست دەكەن، كاتێ كە ڕۆژ بكەینەوە لێی دەخۆینەوە، ئەویش وتی: ڕێگریت لێ دەكەم لە شەرابی سەرخۆشكەر، كەم بێت یان زۆر، وە خوای گەورەش دەكەم بە شاهید بە سەرتەوە، ڕێگریت لێ دەكەم لە شەرابی سەرخۆشكەر، كەم بێت یان زۆر، وە خوای گەورەش دەكەم بە شاهید بە سەرتەوە، خەڵكی خەیبەر شەراب دروست دەكەن لەمەو لەوە، ناویشی دەنێن فڵانە شت و فڵانە شت لە كاتێكدا ئەوە خۆی لە خۆیدا شەرابێكی سەرخۆشكەرە، وە خەڵكی فەدەكیش شەراب دروست دەكەن لەمەو لەوە، ناویشی دەنێن فڵانە شت و فڵانە شت لە كاتێكدا ئەوە خۆی لە خۆیدا شەرابێكی سەرخۆشكەرە، هەتا چوار خواردنەوەی ژمارد دانەیەكیان هەنگوین بوو.

## چەسپاندنی ناوی مەی بۆ هەر سەرخۆشكەرێک لە خواردنەوەكان

**٥٥٨٢**- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ»[٢].

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٧٤ و ٢٠٠٣/٧٥، والترمذي: ١٨٦٤، وإبن ماجه: ٣٣٨٧ و ٣٣٩٠.

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە، وە هەموو سەرخۆشکەرێک مەی و ئارەقە.

**٥٥٨٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ»(١).

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە، وە هەموو سەرخۆشکەرێک مەی و ئارەقە.

**٥٥٨٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ»(٢).

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو سەرخۆشکەرێک مەی و ئارەقە.

**٥٥٨٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»(٣).

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو سەرخۆشکەرێک مەی و ئارەقە، وە هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە.

**٥٥٨٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ»(٤).

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە، وە هەموو سەرخۆشکەرێک مەی و ئارەقە.

## قەدەغەکردنی هەر خواردنەوەیەک مرۆڤ سەرخۆش بکات

**٥٥٨٧-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»(٥).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) حسن صحيح.

(٥) صحيح.




**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە.**

**٥٥٨٨-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە.**

**٥٥٨٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى أَنْ يُنْبَذَ فِي الدُّبَّاءِ، وَالْمُزَفَّتِ، وَالنَّقِيرِ، وَالْحَنْتَمِ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لەوەی شەراب بگیرێتەوە لەناو کولەکەو قاپی بۆیە کراو بە زفت و قەدی دارخورمای هەڵکۆڵدراو گۆزە، (ئەوانە چەند قاپێک بوو لەناو عەرەبدا بەکاریان دەهێنا، لە دار دروست کرابوون، هەڵیان دەکۆڵی و بەکاریان دەهێنا بۆ جۆرەها خواردنەوە، ئەو قاپانە دەبوونە هۆکارو یارمەتیدەر بۆ ئەوەی ئەو خواردنەوانە زووتر ببێتە سەرخۆشکەر)، وە هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە.**

**٥٥٩٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا تَنْبِذُوا فِي الدُّبَّاءِ، وَلَا الْمُزَفَّتِ، وَلَا النَّقِيرِ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شەراب مەگرنەوە لە ناو کولەکەو (الْمُزَفَّت) قاپی بۆیەکراو بە زفت و قەدی دارخورمای هەڵکۆڵدراو، وە هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە.**

**٥٥٩١-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ»[٤].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر شەرابێک مرۆڤ سەرخۆش بکات ئەوە قەدەغەیە.**

---

(١) حسن صحيح الإسناد.

(٢) حسن صحيح الإسناد. أخرجه إبن ماجه: ٣٤٠١.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٦٨٧.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٢ و ٥٥٨٥ و ٥٥٨٦، ومسلم: ٦٧ و ٢٠٠١/٦٩، وأبو داود: ٣٦٨٢، والترمذي: ١٨٦٣، وإبن ماجه: ٣٣٨٦.

**٥٥٩٢**- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ عَنِ الْبِتْعِ، فَقَالَ: كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ حَرَامٌ»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکرا لەبارەی ئارەقی هەنگوین، فەرمووی: هەر خواردنەوەیەک مرۆڤ سەرخۆش بکات قەدەغەیە.**

**٥٥٩٣**- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ عَنِ الْبِتْعِ، فَقَالَ: كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ، وَالْبِتْعُ مِنَ الْعَسَلِ»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکرا لە بارەی ئارەقی هەنگوین، فەرمووی: هەر خواردنەوەیەک مرۆڤ سەرخۆش بکات قەدەغەیە.**

**٥٥٩٤**- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ عَنِ الْبِتْعِ، فَقَالَ: كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ، وَالْبِتْعُ هُوَ نَبِيذُ الْعَسَلِ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکرا لە بارەی ئارەقی هەنگوین، فەرمووی: هەر خواردنەوەیەک مرۆڤ سەرخۆش بکات قەدەغەیە، (الْبِتْعُ) واتە: ئارەقی هەنگوین.**

**٥٥٩٥**- «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»[٤].

**واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە.**

**٥٥٩٦**- «عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنَا وَمُعَاذٌ إِلَى الْيَمَنِ، فَقَالَ مُعَاذٌ: إِنَّكَ تَبْعَثُنَا إِلَى أَرْضٍ كَثِيرٌ شَرَابُ أَهْلِهَا، فَمَا أَشْرَبُ؟ قَالَ: اشْرَبْ، وَلَا تَشْرَبْ مُسْكِراً»[٥].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح الإسناد، لكن قوله : «وَالْبِتْعُ مِنَ الْعَسَلِ» مدرج.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح لغيره. أخرجه البخاري: ٤٣٤٣ و ٤٣٤٤ و ٦١٢٤ و ٧١٧٢، ومسلم: ٧٠ و ١٧٣٣/٧١، وأبو داود: ٣٦٨٤ و ٤٨٣٥، وابن ماجه: ٣٣٩١.




واتە: ئەبو بوردە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ من و موعازی نارد بۆ یەمەن، موعاز وتی: تۆ ئێمە دەنێری بۆ زەویەک خەڵکەکەی خواردنەوەی زۆر دروست دەکەن، چی بخۆمەوە؟ فەرمووی: بخۆرەوە، بەڵام شتی سەرخۆشکەر مەخۆرەوە.

**٥٥٩٧-** «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»[١].

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە

**٥٥٩٨-** «عَنِ الْأَسْوَدِ بْنِ شَيْبَانِ السَّدُوسِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ عَطَاءً، سَأَلَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّا نَرْكَبُ أَسْفَاراً فَتُبْرَزُ لَنَا الْأَشْرِبَةُ فِي الْأَسْوَاقِ، لَا نَدْرِي أَوْعِيَتَهَا، فَقَالَ: كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ فَذَهَبَ يُعِيدُ، فَقَالَ: كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ فَذَهَبَ يُعِيدُ، فَقَالَ: هُوَ مَا أَقُولُ لَكَ»[٢].

واتە: ئەسوەدی کوڕی شەیبانی سەدوسی دەڵێ: گوێم لە پیاوێک بوو پرسیاری لە عەطاء کرد وتی: ئێمە گەشت دەکەین، خواردنەوە لە بازاڕدا دەبینین نازانین قاپەکەی چۆنە (ئایا چی بکەین)؟ ئەویش وتی: هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە، کابرا دووبارەی کردوە، ئەویش وتی: هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە، دیسان کابرا دووبارەی کردەوە، وتی: هەر ئەوەیە کە پێم وتی.

**٥٥٩٩-** «عَنِ ابْنِ سِيرِينَ قَالَ: كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»[٣].

واتە: ئیبنو سیرین دەڵێ: هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە.

**٥٦٠٠-** «عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ الطُّفَيْلِ الْجَزَرِيِّ قَالَ: كَتَبَ إِلَيْنَا عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ: لَا تَشْرَبُوا مِنَ الطِّلَاءِ حَتَّى يَذْهَبَ ثُلُثَاهُ، وَيَبْقَى ثُلُثُهُ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»[٤].

واتە: عەبدولمەلیکی کوڕی طوفەیلی جەزری دەڵێ: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نوسراوی بۆ کردین: گیراوەی ترێ مەخۆنەوە تا دوو لەسەر سێی لەسەر ئاگر دەڕواو

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح الإسناد مقطوع.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) ضعيف الإسناد مقطوع.

یەک لەسەر سێی دەمێنێ، وە هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە. (هەندێک لە عەرەبەکان بەسەر خۆشکەر دەیانوت: (الطِّلَاء).

**٥٦٠١-** «عَنِ الصَّعْقِ بْنِ حَزْنٍ قَالَ: كَتَبَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ إِلَى عَدِيِّ بْنِ أَرْطَاةَ: كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»[١].

**واتە: صەعقی کوڕی حەزن دەڵێ: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نوسراوی کرد بۆ عەدی کوڕی ئەرطەئە: هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە.**

**٥٦٠٢-** «عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»[٢].

**واتە: ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە.**

## شیکردنەوە (الْبِتْع) شەرابی هەنگوینە (الْمِزْر) شەرابی دانەوێڵەیە (گەنم و جۆ)

**٥٦٠٣-** «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْيَمَنِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ بِهَا أَشْرِبَةً، فَمَا أَشْرَبُ، وَمَا أَدَعُ؟ قَالَ: وَمَا هِيَ؟ قُلْتُ: الْبِتْعُ، وَالْمِزْرُ، قَالَ: وَمَا الْبِتْعُ، وَالْمِزْرُ؟ قُلْتُ: أَمَّا الْبِتْعُ: فَنَبِيذُ الْعَسَلِ، وَأَمَّا الْمِزْرُ: فَنَبِيذُ الذُّرَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا تَشْرَبْ مُسْكِراً، فَإِنِّي حَرَّمْتُ كُلَّ مُسْكِرٍ»[٣].

**واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ یەمەن، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، جۆرەها خواردنەوە لەوێ هەیە، من چی بخۆمەوەو واز لە چی بهێنم؟ فەرمووی: ئەوانە چین؟ وتم: (الْبِتْع) و (الْمِزْر)، فەرمووی: (الْبِتْع) و (الْمِزْر) چیە؟ وتم: (الْبِتْع): شەرابی هەنگوینە، وە (الْمِزْر) شەرابی دانەوێڵەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خواردنەوەی سەرخۆشکەر مەخۆرەوە، چونکە من هەموو سەرخۆشکەرێکم قەدەغە کردوە.**

---

(١) حسن الإسناد مقطوع.

(٢) حسن لغيره.

(٣) حسن الإسناد.




**٥٦٠٤-** «عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيه ﷺ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْيَمَنِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ بِهَا أَشْرِبَةً يُقَالُ لَهَا: الْبِتْعُ وَالْمِزْرُ، قَالَ: وَمَا الْبِتْعُ، وَالْمِزْرِ؟، قُلْتُ: شَرَابٌ يَكُونُ مِنَ الْعَسَلِ، وَالْمِزْرُ: يَكُونُ مِنَ الشَّعِيرِ، قَالَ: كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»(١).

**واتە: ئەبو بوردە دەگێڕێتەوە، لە باوكیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ یەمەن، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، چەند جۆرە خواردنەوەیەكی تێدایە پێی دەوترێ: (الْبِتْع) و (الْمِزْر)، فەرمووی: (الْبِتْع) و (الْمِزْر) چیە؟ وتم: (الْبِتْع) شەرابێكە لە هەنگوین، وە (الْمِزْر) شەرابێكە لە جۆ، فەرمووی: هەموو سەرخۆشكەرێک قەدەغەیە.**

**٥٦٠٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرَ آيَةَ الْخَمْرِ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ الْمِزْرَ؟ قَالَ: وَمَا الْمِزْرُ؟، قَالَ: حَبَّةٌ تُصْنَعُ بِالْيَمَنِ، فَقَالَ: تُسْكِرُ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»(٢).

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاریدا باسی ئایەتی مەی و ئارەق (الْخَمْر)ی كرد، پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا (الْمِزْر)یش؟ فەرمووی: (الْمِزْر) چیە؟ وتی: دانەوێڵەیەكە لە یەمەن خواردنەوەیەكی لێ دروست دەكرێ، فەرمووی: مرۆڤ سەرخۆش دەكات؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: هەموو سەرخۆشكەرێک قەدەغەیە.**

**٥٦٠٦-** «عَنْ أَبِي الْجُوَيْرِيَةِ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ وَسُئِلَ، فَقِيلَ لَهُ: أَفْتِنَا فِي الْبَاذَقِ، فَقَالَ: سَبَقَ مُحَمَّدٌ الْبَاذَقَ، وَمَا أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ»(٣).

**واتە: ئەبو جوەیریە دەڵێ: بیستم ئیبنو عەبباس پرسیاری لێكرا، پێی وترا: فەتوامان بۆ بدە لەبارەی (الْبَاذَق) (كە خواردنەوەیەكی سەرخۆشكەر بووە، لە فارسیەوە وەرگیراوە پێی دەوترێ بادە) وتی: فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ پێشی (الْبَاذَق) كەوتووە، هەر شتێک مرۆڤ سەرخۆش بكات قەدەغەیە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٩٨.




## قەدەغەکردنی کەمێک لە هەر خواردنەوەیەک کە زۆریەکەی مرۆڤ سەرخۆش بکات

**٥٦٠٧-** «عَنْ عَمْرُو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ، فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ»[١].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیرەیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر شتێک زۆر لێ خواردنەوەی سەرخۆش بکات کەم لێ خواردنەوەیشی قەدەغەیە. (واتە: هەر شتێک مرۆڤ زۆری لێ بخواتەوە پێی سەرخۆش بێت، ئەوە خواردنەوەی ئەندازەیەکی کەمیش لێی قەدەغەیە، ئەگەرچی ڕێژە کەمەکەیش سەرخۆشی نەکات).**

**٥٦٠٨-** «عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَنْهَاكُمْ عَنْ قَلِيلِ مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ»[٢].

**واتە: عامری کوڕی سەعد دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: ڕێگریتان لێ دەکەم لە کەم خواردنەوە لەو شەرابەی کە زۆر خواردنەوە لێی سەرخۆشکەرە.**

**٥٦٠٩-** «عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ قَلِيلِ مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ»[٣].

**واتە: عامری کوڕی سەعد دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، کە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لە کەم خواردنەوە لەو شەرابەی کە زۆر خواردنەوە لێی سەرخۆشکەرە.**

**٥٦١٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: عَلِمْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَصُومُ، فَتَحَيَّنْتُ فِطْرَهُ بِنَبِيذٍ صَنَعْتُهُ لَهُ فِي دُبَّاءٍ، فَجِئْتُهُ بِهِ، فَقَالَ: أَدْنِهِ، فَأَدْنَيْتُهُ مِنْهُ، فَإِذَا هُوَ يَنِشُّ، فَقَالَ: اضْرِبْ بِهَذَا الْحَائِطَ، فَإِنَّ هَذَا شَرَابُ مَنْ لَا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٣٣٩٤.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٧١٦، وإبن ماجه: ٣٤٠٩.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: زانیم پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕۆژووە، ویستم بەربانگی بۆ ئامادە بکەم بە گیراوەیەک خۆم دروستم کردبوو لە ناو کولەکەیەکدا، هێنام بۆ خزمەتی، فەرمووی: نزیکی بکەرەوە، منیش نزیکم کردەوە لێی، گیراوەکە قوڵپی دەدا، فەرمووی: ئەمە بدە بە قەدی دیوارەکەدا، چونکە بەڕاستی ئەمە خواردنەوەی خەڵکێکە کە بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی نەبێت.

## قەدەغەکردن لە دروستکردنی شەرابی (الْجِعَة) ئەویش شەرابێکە لە جۆ دروست دەکرێ

**٥٦١١-** «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: نَهَانِي النَّبِيُّ ﷺ عَنْ حَلْقَةِ الذَّهَبِ، وَالْقَسِّيِّ، وَالْمِيثَرَةِ، وَالْجِعَةِ»[١].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی لێکردم لە لەدەستکردنی موستیلەی زێڕ، وە لە (الْقَسِّيِّ) (کە جلێکە زۆرینەی حەریرە)، هەروەها لە (الْمَيَاثِرِ الْحُمْرِ) (ڕاخەرێکی سورە لەسەر کورتانی ئەسپ یان پشتی وشتر دادەنرا، ئافرەتان دروستیان دەکرد بۆ مێردەکانیان، ڕەنگی سوور بوو لە حەریر دروست دەکرا، ئەوە پیشەی لووتبەرزەکان بوو) وە لە (الْجِعَةِ) (کە شەرابێکە لە جۆ دروست دەکرێت سەرخۆشکەرە).

**٥٦١٢-** «عَنْ مَالِكِ بْنِ عُمَيْرٍ قَالَ: قَالَ صَعْصَعَةُ لِعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ: انْهَنَا يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ عَمَّا نَهَاكَ عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ»[٢].

واتە: مالیکی کوڕی عومەیر دەڵێ: صەعصەعە بە عەلی کوڕی ئەبو طاڵیبی وت: ئەی ئەمیری بڕواداران قەدەغەمان لێ بکە لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردووی، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێ کردووم لەناو کولەکە و گۆزەدا شلەمەنی بگرمەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٦٩٧.




## باسی ئەو قاپەی شلەمەنی تێدا دەگیرایەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ

**٥٦١٣-** «عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُنْبَذُ لَهُ فِي تَوْرٍ مِنْ حِجَارَةٍ»[١].

واتە: جابر رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ شلەمەنی بۆ دەگیرایەوە لە قاپێک لە بەرد.

## باسی ئەو قاپ و دەفرانەی کە قەدەغەکراوە شلەمەنی تێدا بگیرێتەوە، جگە لەو قاپانەی کە گرتنەوەی شلەمەنی تیایاندا وەکو ئەمانە نیە بابەت: قەدەغەکردنی گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو گۆزەدا، بە تەنها

**٥٦١٤-** «عَنْ طَاوُسٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِابْنِ عُمَرَ: أَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَنْ نَبِيذِ الْجَرِّ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ طَاوُسٌ: وَاللَّهِ إِنِّي سَمِعْتُهُ مِنْهُ»[٢].

واتە: طاوس دەڵێ: پیاوێک بە ئیبنو عومەری وت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو گۆزەدا؟ وتی: بەڵێ، طاوس وتی: سوێند بە خوا من بیستم لێیەوە، (چونکە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناویدا زوو دەبێتە ئارەق).

**٥٦١٥-** «عَنْ طَاوُسٍ يَقُولُ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى ابْنِ عُمَرَ قَالَ: أَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ نَبِيذِ الْجَرِّ قَالَ: نَعَمْ، زَادَ إِبْرَاهِيمُ فِي حَدِيثِهِ: وَالدُّبَّاءِ»[٣].

واتە: طاوس دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای ئیبنو عومەر وتی: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لەناو گۆزەدا؟ وتی: بەڵێ، ئیبراهیم (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) ئەوەشی زیاد کرد لە فەرموودەکەیدا: گرتنەوەی شلەمەنی لەناو کولەکەشدا قەدەغەکردوە. (چونکە گرتنەوەی شلەمەنی لەناویاندا زوو دەبێتە ئارەق).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٦١ و ١٩٩٩/٦٢، وأبو داود: ٣٧٠٢، وإبن ماجه: ٣٤٠٠.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٠ و ٥١ و ٥٢ و ١٩٩٧/٥٣، والترمذي: ١٨٦٧.

(٣) صحيح.




**٥٦١٦-** «عَنْ عُيَيْنَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ نَبِيذِ الْجَرِّ»[١].

**واتە: عويەينەی كوڕی عەبدوڕڕەحمان دەگێڕێتەوە، لە باوكیەوە دەڵێ: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لەناو گۆزەدا.**

**٥٦١٧-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَنِ الْحَنْتَمِ قُلْتُ: مَا الْحَنْتَمُ؟، قَالَ: الْجَرُّ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە لە (گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو) (الْحَنْتَمِ) وتم: (الْحَنْتَمِ) چیە؟ وتی: گۆزەیە.**

**٥٦١٨-** «عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ يَعْنِي ابْنَ أَسِيدٍ الطَّاحِيَّ بَصْرِيٌّ يَقُولُ: سُئِلَ ابْنُ الزُّبَيْرِ: عَنْ نَبِيذِ الْجَرِّ، قَالَ: نَهَانَا عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[٣].

**واتە: عەبدولعەزیزی كوڕی ئوسەیدی طاحی بەصری دەڵێ: پرسیار كرا لە ئیبنو زوبەیر: لە بارەی گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو گۆزەدا، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێ كردوین.**

**٥٦١٩-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: سَأَلْنَا ابْنَ عُمَرَ، عَنْ نَبِيذِ الْجَرِّ، فَقَالَ: حَرَّمَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَتَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، فَقُلْتُ: سَمِعْتُ الْيَوْمَ شَيْئاً عَجِبْتُ مِنْهُ، قَالَ: مَا هُوَ؟ قُلْتُ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ عَنْ نَبِيذِ الْجَرِّ، فَقَالَ: حَرَّمَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: صَدَقَ ابْنُ عُمَرَ قُلْتُ: مَا الْجَرُّ؟ قَالَ: كُلُّ شَيْءٍ مِنْ مَدَرٍ»[٤].

**واتە: سەعیدی كوڕی جوبەیر دەڵێ: پرسیارمان كرد لە ئیبنو عومەر لە بارەی گرتنەوەی شلەمەنی لەناو گۆزەدا، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە، هاتم بۆ لای ئیبنو عەبباس، وتم: ئەمڕۆ شتێكم بینی سەرم لێ سوڕما، وتی: ئەوە چیە؟**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٩٧/٥٦.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




**وتم: پرسیارم لە ئیبنو عومەر کرد لە بارەی گرتنەوەی شلەمەنی لەناو گۆزەدا، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە، وتی: ئیبنو عومەر ڕاستی کرد، وتم: (الْجَرُّ) گۆزە چیە؟ وتی: هەر شتێکە لە قوڕی سورەوەکراو دروستکرابێت.**

**٥٦٢٠-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عُمَرَ، فَسُئِلَ عَنْ نَبِيذِ الْجَرِّ، فَقَالَ: حَرَّمَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَشَقَّ عَلَيَّ لَمَّا سَمِعْتُهُ، فَأَتَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، فَقُلْتُ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ سُئِلَ عَنْ شَيْءٍ، فَجَعَلْتُ أُعَظِّمُهُ، قَالَ: مَا هُوَ؟ قُلْتُ: سُئِلَ عَنْ نَبِيذِ الْجَرِّ، فَقَالَ: صَدَقَ، حَرَّمَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قُلْتُ: وَمَا الْجَرُّ؟ قَالَ: كُلُّ شَيْءٍ صُنِعَ مِنْ مَدَرٍ»[١].

**واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: من لای ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) بووم، پرسیاری لێکرا لەبارەی گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو گۆزەدا، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە، زۆر گران بوو بەلامەوە کاتێ ئەمەم بیست، هاتم بۆ لای ئیبنو عەبباس، وتم: ئیبنو عومەر پرسیاری لێ کرا لەبارەی شتێکەوە بەلامەوە زۆر گەورە بوو، وتی: ئەو شتە چیە؟ وتم: پرسیاری لێکرا لە بارەی گرتنەوەی شلەمەنی لەناو گۆزەدا، وتی: ڕاستی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە، وتم: (الْجَرُّ) چیە؟ وتی: هەموو گۆزەیەکە لە قوڕی سورەوەکراو دروستکرابێت.**

## گۆزەی سەوز

**٥٦٢١-** «عَنِ الشَّيْبَانِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ نَبِيذِ الْجَرِّ الْأَخْضَرِ، قُلْتُ: فَالْأَبْيَضُ؟، قَالَ: لَا أَدْرِي»[٢].

**واتە: شەیبانی دەڵێ: گوێم لە ئیبنو ئەبی ئەوفا ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو گۆزەی سەوزدا، وتم: ئەی گۆزەی سپی؟ وتی: نازانم.**

**٥٦٢٢-** «عَنْ أَبِي إِسْحَقَ الشَّيْبَانِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ نَبِيذِ الْجَرِّ الْأَخْضَرِ وَالْأَبْيَضِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح دون زيادة «أَدْرِي» فشاذة. أخرجه البخاري: ٥٥٩٦.

(٣) صحيح دون قوله : «وَالْأَبْيَضِ» فإنه مدرج.




واتە: ئەبو ئیسحاقی شەیبانی دەڵێ: گوێم لە ئیبنو ئەبی ئەوفا ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو گۆزەی سەوزو سپیدا.

**٥٦٢٣-** «عَنْ أَبِي رَجَاءٍ قَالَ: سَأَلْتُ الْحَسَنَ عَنْ نَبِيذِ الْجَرِّ، أَحَرَامٌ هُوَ؟ قَالَ: حَرَامٌ، قَدْ حَدَّثَنَا مَنْ لَمْ يَكْذِبْ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ نَبِيذِ الْحَنْتَمِ، وَالدُّبَّاءِ، وَالْمُزَفَّتِ، وَالنَّقِيرِ»[١].

واتە: ئەبو ڕەجاء دەڵێ: پرسیارم كرد لە حەسەن لە بارەی گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو گۆزەدا، ئایا قەدەغەیە؟ وتی: قەدەغەیە، بێگومان كەسێک بۆی باسكردین كە هەرگیز درۆی نەكردوە، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لەناو گۆزە و كولەكەو قاپی بۆیەكراو بە زفت و قەدی دار خورمای هەڵكۆڵدراو.

## قەدەغەكردنی گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو كولەكەدا

**٥٦٢٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الدُّبَّاءِ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو كولەكەدا.

**٥٦٢٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الدُّبَّاءِ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو كولەكەدا.

## قەدەغەكردنی گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو كولەكەو قاپی بۆیەكراو بە زفت

**٥٦٢٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْمُزَفَّتِ»[٤].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٩٥، ومسلم: ٣٥ و ١٩٩٥/٣٦.




واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لەناو کولەکە و قاپی بۆیەکراو بە زفت.

**٥٦٢٧**- «عَنْ عَلِيٍّ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ نَهَى عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْمُزَفَّتِ»[١].

واتە: عەلی  دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو کولەکەو قاپی بۆیەکراو بە زفت.

**٥٦٢٧**- «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَعْمَرَ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، نَهَى عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْمُزَفَّتِ»[٢].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یەعمەر  دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو کولەکەو قاپی بۆیەکراو بە زفت.

**٥٦٢٩**- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْمُزَفَّتِ أَنْ يُنْبَذَ فِيهِمَا»[٣].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو کولەکەو قاپی بۆیەکراو بە زفت.

**٥٦٣٠**- «عن أَبي هُرَيْرَةَ  يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْمُزَفَّتِ أَنْ يُنْبَذَ فِيهِمَا»[٤].

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو کولەکەو قاپی بۆیەکراو بە زفت.

**٥٦٣١**- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُزَفَّتِ، وَالْقَرْعِ»[٥].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو قاپی بۆیەکراو بە زفت و کولەکە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٩٤، ومسلم: ١٩٩٤.

(٢) صحيح الإسناد. أخرجه إبن ماجه: ٣٤٠٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٨٧، ومسلم: ٣٠ و ١٩٩٢/٣١.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٩٣، وإبن ماجه: ٣٤٠٨.

(٥) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٨ و ١٩٩٧/٤٩، وإبن ماجه: ٣٤٠٢.




## باسی قەدەغەکردن لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو کولەکە و گۆزەی حەنتەم و قەدی دار خورمای هەڵکۆڵدراو

**٥٦٣٢-** «عَنْ عَبْدِ الْخَالِقِ الشَّيْبَانِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيداً يُحَدِّثُ عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالنَّقِيرِ»[1].

**واتە: عەبدولخالقی کوڕی شەیبانی دەڵێ: گوێم لێ بوو سەعید لە ئیبنو عومەری باسی دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لەناو کولەکەو گۆزەی حەنتەم (کە لە تێکەڵەی قوڕو موو و خوێن دروست داکرا)، وە قەدی دار خورمای هەڵکۆڵدراو.**

**٥٦٣٣-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَنِ الشُّرْبِ فِي الْحَنْتَمِ، وَالدُّبَّاءِ، وَالنَّقِيرِ»[2].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو گۆزەی حەنتەم و کولەکەو قەدی دار خورمای هەڵکۆڵدراو.**

## قەدەغەکردن لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو کولەکە و گۆزەی حەنتەم قاپی بۆیەکراو بە زفت

**٥٦٣٤-** «عَنْ مُحَارِبٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالْمُزَفَّتِ»[3].

**واتە: موحاریب دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عومەر بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو کولەکە گۆزەی حەنتەم و قاپی بۆیەکراو بە زفت.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٩٧/٥٨.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٩٦/٤٥، وإبن ماجه: ٣٤٠٣.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٩٧/٥٤.




**٥٦٣٥-** «عَنْ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْجِرَارِ، وَالدُّبَّاءِ، وَالظُّرُوفِ الْمُزَفَّتَةِ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو گۆزەو کولەکەو قاپی بۆیەکراو بە زفت.**

**٥٦٣٦-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَنْهَى عَنْ شَرَابٍ صُنِعَ فِي دُبَّاءٍ، أَوْ حَنْتَمٍ، أَوْ مُزَفَّتٍ لَا يَكُونُ زَيْتاً، أَوْ خَلّاً»[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو قەدەغەی دەکرد لە خواردنەوەی شلەمەنیەک دروست کرابێت لە ناو کولەکە یان گۆزەی حەنتەم و یان قاپی بۆیەکراو بە زفت، زەیت یان سرکە نەبێت.**

## باسی قەدەغە کردن لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو کولەکەو گۆزەو قەدی دارخورماو قاپی بۆیەکراو بە زفت و گۆزەی حەنتەم

**٥٦٣٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالنَّقِيرِ، وَالْمُزَفَّتِ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو کولەکەو گۆزەی حەنتەم و قاپی بۆیەکراو بە زفت.**

**٥٦٣٨-** «عَنْ ثُمَامَةَ بْنِ حَزْنٍ الْقُشَيْرِيِّ قَالَ: لَقِيتُ عَائِشَةَ فَسَأَلْتُهَا عَنِ النَّبِيذِ، فَقَالَتْ: قَدِمَ وَفْدُ عَبْدِ الْقَيْسِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلُوهُ فِيمَا يَنْبِذُونَ؟ فَنَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَنْبِذُوا فِي الدُّبَّاءِ، وَالنَّقِيرِ، وَالْمُقَيَّرِ، وَالْحَنْتَمِ»[٤].

**واتە: ثومامەی کوڕی حەزنی قوشەیری دەڵێ: گەیشتم بە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) پرسیارم لێکرد لە بارەی گرتنەوەی شلەمەنی، وتی: نوێنەری عەبدولقەیس هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاریان کرد لە چیدا شلەمەنی بگرنەوە؟ پێغەمبەر**

---

(١) صحيح.

(٢) حسن.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.




ﷺ قەدەغەی کرد شلەمەنی بگرنەوە لە ناو کولەکەو قەدی دار خورمای هەڵکۆڵدراو قاپی بۆیەکراو بە زفت و گۆزەی حەنتەمدا.

**٥٦٣٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: نَهَى عَنِ الدُّبَّاءِ بِذَاتِهِ»(١).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لەناو خودی کولەکەدا.**

**٥٦٤٠-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ نَبِيذِ النَّقِيرِ، وَالْمُقَيَّرِ، وَالدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ»(٢).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لەناو قەدی دار خورمای هەڵکۆڵراوو قاپی بۆیەکراو بە زفت و کولەکەو گۆزەی حەنتەم.**

**٥٦٤١-** «عَنْ هُنَيْدَةَ بِنْتِ شَرِيكِ بْنِ أَبَانَ قَالَتْ: لَقِيتُ عَائِشَةَ بِالْخُرَيْبَةِ، فَسَأَلْتُهَا عَنِ الْعَكَرِ، فَنَهَتْنِي عَنْهُ، وَقَالَتْ: انْبِذِي عَشِيَّةً، وَاشْرَبِيهِ غُدْوَةً، وَأَوْكِي عَلَيْهِ، وَنَهَتْنِي عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالنَّقِيرِ، وَالْمُزَفَّتِ، وَالْحَنْتَمِ»(٣).

**واتە: هونەیدەی کچی شەریکی کوڕی ئەبان دەڵێ: گەیشتم بە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) لە شوێنێک بەناو (الْخُرَيْبَةِ) (گەڕەکێک بووە لە گەڕەکەکانی بەصرە) پرسیارم لێکرد دەربارەی پیسی بۆنی مەی و ئارەق لەناو قاپدا، ئەویش قەدەغەی لێکردم، وتی: بە شەودا شلەمەنی تێدا بگرەرەوە بە ڕۆژیشدا بیخۆرەوە، وە دەمی بگرە، وە قەدەغەی لێکردم لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو کولەکەو قەدی دار خورمای هەڵکۆڵدراوو قاپی ڕەنگ کراو بە زفت و گۆزەی حەنتەم.**

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٧ و ١٩٩٥/٣٨.

(٣) ضعيف.




## قاپی بۆیەکراو بە زفت

**٥٦٤٢-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الظُّرُوفِ الْمُزَفَّتَةِ»[(١)].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێکردم لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو قاپی بۆیەکراو بە زفت.**

## باسی بەڵگە لەسەر قەدەغەکردنی گرتنەوەی شلەمەنی لەناو ئەو قاپانەی کە وەسف کران لەپێشەوە، بێگومان قەدەغە کردنەکە حەتمیە نەک بۆ تەمێ کردن.

**٥٦٤٣-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عُمَرَ، وَابْنَ عَبَّاسٍ أَنَّهُمَا شَهِدَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ نَهَى عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالْمُزَفَّتِ، وَالنَّقِيرِ، ثُمَّ تَلَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۝٧﴾ الحشر»[(٢)].

**واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەگێڕێتەوە، ئەو گوێی لێ بوو ئیبنو عومەر و ئیبنو عەبباس هەردووکیان شایەتیان دەدا پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو کولەکەو گۆزەی حەنتەم و قاپی بۆیە کراو بە زفت و قەدی دار خورمای هەڵکۆڵدراو، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۝٧﴾ (واتە: ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێیدان وەریبگرن، وە ئەوەی لێتانی قەدەغەکرد وازی لێ بهێنن).**

**٥٦٤٤-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَلَمْ يَقُلِ اللَّهُ ﷻ: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۝٧﴾ الحشر؟ قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: أَلَمْ يَقُلِ اللَّهُ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۝٣٦﴾ الأحزاب؟، قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: فَإِنِّي أَشْهَدُ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ النَّقِيرِ، وَالْمُقَيَّرِ، وَالدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ»[(٣)].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٩٧/٤٦، وأبو داود: ٣٦٩٠.

(٣) ضعيف.




**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) وتی: ئایا خوا ﷻ نەیفەرمووە: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۝٧ ﴾ (واتە: ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێیدان وەریبگرن، وە ئەوەی لێتانی قەدەغەکرد وازی لێ بهێنن؟ وتم: بەڵێ فەرموویەتی، وتی: ئایا خوا ﷻ نەیفەرمووە: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۝٣٦﴾ (واتە: بۆ هیچ پیاوو ئافرەتێکی بڕوادار نیە کاتێ خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری هەر کارێکیاندا کە سەرپشک بن لە کارەکانیاندا؟) وتم: بەڵێ فەرموویەتی، وتی: من شایەتی دەدەم کە بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لەناو قەدی دار خورمای هەڵکۆڵدراو، قاپی بۆیەکراو بە زفت و کولەکەو گۆزەی حەنتەم.**

## ڕوونکردنەوەی قاپ و قاپاخەکان

**٥٦٤٥-** «عَنْ زَاذَانَ قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ، قُلْتُ: حَدِّثْنِي بِشَيْءٍ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْأَوْعِيَةِ، وَفَسِّرْهُ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْحَنْتَمِ: وَهُوَ الَّذِي تُسَمُّونَهُ أَنْتُمُ الْجَرَّةَ، وَنَهَى عَنِ الدُّبَّاءِ: وَهُوَ الَّذِي تُسَمُّونَهُ أَنْتُمُ الْقَرْعَ، وَنَهَى عَنِ النَّقِيرِ وَهِيَ: النَّخْلَةُ يَنْقُرُونَهَا، وَنَهَى عَنِ الْمُزَفَّتِ: وَهُوَ الْمُقَيَّرُ»[1].

**واتە: زاذان دەڵێ: پرسیارم کرد لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر وتم: شتێکم بۆ باس بکە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستبێتت لە بارەی بەکارهێنانی قاپ و قاپاخەکان، وە شی بکەرەوە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو (الْحَنْتَم): ئەویش ئەوەیە کە ئێوە پێی دەڵێن: (الْجَرَّةَ) گۆزەی قوڕ، وە قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو (الدُّبَّاء): ئەویش ئەوەیە کە ئێوە پێی دەڵێن: (الْقَرْعَ) واتە: کولەکە، وە قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو (النَّقِير) ئەویش قەدی دار خورمایەکە هەڵیدەکۆڵن و دەیکەن بە قاپ، قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو (الْمُزَفِّت): ئەویش بریتیە لە (الْمُقَيَّر) واتە: قاپی بۆیەکراو بە زفت.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٩٧/٥٧، والترمذي: ١٨٦٨.




## مۆڵەتدان بە گرتنەوەی شلەمەنی کە هەندێ لەو ڕیوایەتانەی باسمان کرد تایبەتیان کردوە لەو دەفرانەی کە پێستە دروست کراون و دەمیان بە پەت دەبەسترێ، وەکو جەوەنەو مەشکە

**٥٦٤٦-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَفْدَ عَبْدِ الْقَيْسِ حِينَ قَدِمُوا عَلَيْهِ، عَنِ الدُّبَّاءِ، وَعَنِ النَّقِيرِ، وَعَنِ الْمُزَفَّتِ، وَالْمَزَادَةِ الْمَجْبُوبَةِ وَقَالَ: انْتَبِذْ فِي سِقَائِكَ أَوْكِهِ، وَاشْرَبْهُ حُلْواً، قَالَ بَعْضُهُمْ: ائْذَنْ لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ فِي مِثْلِ هَذَا، قَالَ: إِذاً تَجْعَلَهَا مِثْلَ هَذِهِ وَأَشَارَ بِيَدِهِ يَصِفُ ذَلِكَ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد لە نوێنەرەکانی عەبدولقەیس کاتێ هاتن بۆ مەدینە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو کولەکەو قەدی دار خورمای هەڵکۆڵدراوو قاپی بۆیەکراو بە زفت و جەوەنەی گەورە کە سەری بڕابێتەوە، وە وتی: گیراوەکەت لە ناو جەوەنەکەتدا بگرەرەوەو سەری بگرە، کاتێ بیخۆ بە لەزەت بێت، هەندێکیان وتیان: مۆڵەتم بدە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوشێوەی ئەمە، فەرمووی: ئەگەر هاوشێوەی ئەمە بیکەی بە دەستی ئاماژەی کردو بۆی وەسف کرد.**

**٥٦٤٧-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْجَرِّ، وَالْمُزَفَّتِ، وَالدُّبَّاءِ، وَالنَّقِيرِ وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ، إِذَا لَمْ يَجِدْ سِقَاءً يُنْبَذْ لَهُ فِيهِ، نُبِذَ لَهُ فِي تَوْرٍ مِنْ حِجَارَةٍ»[٢].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو گۆزەی قوڕو قاپی بۆیەکراو بە زفت و کولەکەو قەدی دار خورمای هەڵکۆڵدراو، پێغەمبەر ﷺ ئەگەر جەوەنەیەکی نەبینیایەتەوە لە ناویدا شلەمەنی بۆ بگرنەوە، ئەوە لە ناو قاپی بەرددا بۆیان دەگرتەوە.**

**٥٦٤٨-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُنْبَذُ لَهُ فِي سِقَاءٍ، فَإِذَا لَمْ يَكُنْ لَهُ سِقَاءٌ نَنْبِذُ لَهُ فِي تَوْرِ بِرَامٍ، قَالَ: وَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالنَّقِيرِ، وَالْمُزَفَّتِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٩٣/٣٣، وأبو داود: ٣٦٩٣.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٩ و ١٩٩٨/٦٠.




واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو جەوەنە شلەمەنی بۆ دەگیرایەوە، ئەگەر قاپێک نەبووایە کە لە پێستە دروست کرابێت (وەکو جەوەنەو مەشکە)، ئەوا لە ناو قاپێکی (لەگەن) بەردین شلەمەنیان بۆ دەگرتەوە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو کولەکەو قەدی دار خورمای هەڵکۆڵدراوو قاپی بۆیەکراو بە زفت.

**٥٦٤٩-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالنَّقِيرِ، وَالْجَرِّ، وَالْمُزَفَّتِ»[١].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو کولەکەو قەدی دار خورمای هەڵکۆڵدراوو گۆزەی قوڕو قاپی بۆیەکراو بە زفت.

## مۆڵەتدان لە گرتنەوەی شلەمەنی لە گۆزەی قوڕین بە تایبەتی

**٥٦٥٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَخَّصَ فِي الْجَرِّ غَيْرَ مُزَفَّتٍ»[٢].

واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتیداوە بە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو گۆزەی قوڕیندا بەبێ ئەوەی ڕوپۆشکرابێ بە زفت.

## مۆڵەتدان لە شتێک لەوانە

**٥٦٥١-** «عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنِّي كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ، فَتَزَوَّدُوا وَادَّخِرُوا، وَمَنْ أَرَادَ زِيَارَةَ الْقُبُورِ، فَإِنَّهَا تُذَكِّرُ الْآخِرَةَ، وَاشْرَبُوا وَاتَّقُوا كُلَّ مُسْكِرٍ»[٣].

واتە: ئیبنو بورەیدە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من قەدەغەم لێ کردن لە هەڵگرتنی گۆشتی قوربانی (لە سەرووی سێ ڕۆژەوە)، ئیتر (لەمەودوا) لێی هەڵبگرن، هەرکەسیش دەیەوێ سەردانی گۆڕستان

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٩٣، ومسلم: ٢٠٠٠.

(٣) صحيح.

بکات، ئەوە ڕۆژی دوایی بەبیر دەهێنێتەوە، وە بخۆنەوەو خۆتان بپارێزن لە هەموو سەرخۆشکەرێک.

**٥٦٥٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنِّي كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوهَا، وَنَهَيْتُكُمْ عَنْ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ فَوْقَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فَأَمْسِكُوا مَا بَدَا لَكُمْ، وَنَهَيْتُكُمْ عَنِ النَّبِيذِ إِلَّا فِي سِقَاءٍ فَاشْرَبُوا فِي الْأَسْقِيَةِ كُلِّهَا، وَلَا تَشْرَبُوا مُسْكِراً»[١].

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من سەردانیکردنی گۆڕستانم لێ قەدەغە کردن (لە ئێستا بەملاوە) سەردانی بکەن، وە هەڵگرتنی گۆشتی قوربانیم لێ قەدەغە کردن لە سەرووی سێ ڕۆژەوە، (لە ئێستا بەملاوە) لێی هەڵبگرن چەندە دەتوانن، وە ڕێگریم لێکردن لە گرتنەوەی شلەمەنی جگە لەو قاپانەی لە پێستە دروست کراون (وەکو کونەو مەشکە)، ئیتر بخۆنەوە لە ناو هەموو قاپەکاندا، بەڵام خواردنەوەی سەرخۆشکەر مەخۆن.

**٥٦٥٣-** «عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنِّي كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ ثَلَاثٍ: زِيَارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوهَا، وَلْتَزِدْكُمْ زِيَارَتُهَا خَيْراً، وَنَهَيْتُكُمْ عَنْ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ بَعْدَ ثَلَاثٍ فَكُلُوا مِنْهَا مَا شِئْتُمْ، وَنَهَيْتُكُمْ عَنِ الْأَشْرِبَةِ فِي الْأَوْعِيَةِ فَاشْرَبُوا فِي أَيِّ وِعَاءٍ شِئْتُمْ، وَلَا تَشْرَبُوا مُسْكِراً»[٢].

**واتە:** ئیبنو بورەیدە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ شتم لێ قەدەغە کردن: سەردانیکردنی گۆڕستانم لێ قەدەغەکردن، ئیتر سەردانی بکەن، بەڵکو سەردانیکردنی ببێتە مایەی خێر بۆتان، وە قەدەغەم لێکردن لە هەڵگرتنی گۆشتی قوربانی لە سەرووی سێ ڕۆژەوە، لێی بخۆن چەندە لە تواناتاندایە، وە ڕێگریم لێکردن لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو قاپ و قاچاخدا ئیتر بخۆنەوە لەناو هەموو قاپێکدا بە ویستی خۆتان، بەڵام خواردنەوەی سەرخۆشکەر مەخۆن.

**٥٦٥٤-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنِ الْأَوْعِيَةِ فَانْتَبِذُوا فِيمَا بَدَا لَكُمْ، وَإِيَّاكُمْ وَكُلَّ مُسْكِرٍ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




**واتە: عەبدوڵڵای كوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە، لە باوكیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕێگریم لێكردن لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو قاپ و قاچاخەكاندا، شلەمەنی بگرنەوە چەندە لە تواناتاندایە، بەڵام خۆتان بپارێزن لە هەموو سەرخۆشكەرێك.**

**٥٦٥٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَيْنَا هُوَ يَسِيرُ إِذْ حَلَّ بِقَوْمٍ فَسَمِعَ لَهُمْ لَغَطاً، فَقَالَ: مَا هَذَا الصَّوْتُ؟ قَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ لَهُمْ شَرَابٌ يَشْرَبُونَهُ، فَبَعَثَ إِلَى الْقَوْمِ فَدَعَاهُمْ، فَقَالَ: فِي أَيِّ شَيْءٍ تَنْتَبِذُونَ؟، قَالُوا: نَنْتَبِذُ فِي النَّقِيرِ، وَالدُّبَّاءِ وَلَيْسَ لَنَا ظُرُوفٌ، فَقَالَ: لَا تَشْرَبُوا إِلَّا فِيمَا أَوْكَيْتُمْ عَلَيْهِ، قَالَ: فَلَبِثَ بِذَلِكَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَلْبَثَ، ثُمَّ رَجَعَ عَلَيْهِمْ، فَإِذَا هُمْ قَدْ أَصَابَهُمْ وَبَاءٌ وَاصْفَرُّوا، قَالَ: مَا لِي أَرَاكُمْ قَدْ هَلَكْتُمْ؟ قَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، أَرْضُنَا وَبِيئَةٌ، وَحَرَّمْتَ عَلَيْنَا إِلَّا مَا أَوْكَيْنَا عَلَيْهِ، قَالَ: اشْرَبُوا، وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای كوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە، لە باوكیەوە ﷺ، لە كاتێكدا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێی دەكرد دابەزیە ناو خەڵكانێك گوێی لە دەنگە دەنگیان بوو، فەرمووی: ئەم دەنگە دەنگە چیە؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنەوەیەكیان هەیە دەیخۆنەوە، ناردی بە شوێن خەڵكەكەداو بانگی كردن، پێیانی فەرموو: لە چ شتێكدا شلەمەنی دەگرنەوە؟ وتیان: شلەمەنی دەگرینەوە لەناو لقی دار خورمای هەڵكۆڵدراوو كولەكە، هیچ جۆرە قاپێكی ترمان نیە، فەرمووی: لە شتێكدا مەخۆنەوە مەگەر سەری بگرن (وەكو كونە یان مەشكە)، وتی: بەو شێوەیە مایەوە هەتا خوا ویستی بمێنێتەوە، پاشان گەڕایەوە بۆ لایان تەماشای كردن توشی نەخۆشیەك بوونەو ڕەنگیان زەرد هەڵگەڕاوە، فەرمووی: ئەوە چیە وا دەبینم تیاچوون؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ زەویەكەمان دەرداوی بووە، وە قەدەغەت لێ كردین شلەمەنی بگرینەوە لە ناو قاپەو قاچاخەكان جگە لەوانە نەبیت كە سەری دەبەستین (وەكو كونەو مەشكە)، فەرمووی: بخۆنەوە، وە هەموو سەرخۆشكەرێك قەدەغەیە.**

**٥٦٥٦-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا نَهَى عَنِ الظُّرُوفِ شَكَتِ الْأَنْصَارُ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَيْسَ لَنَا وِعَاءٌ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: فَلَا إِذاً»[٢].

---

**(١) صحيح الإسناد.**

**(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٩٢، وأبو داود: ٣٦٩٩، والترمذي: ١٨٧٠.**




**واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ ڕێگری لێ کردین لە گرتنەوەی شلەمەنی لەناو هەندێ قاپ و قاپاخدا، ئەنصارەکان سکاڵایان کرد، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە هیچ قاپ و قاپاخمان نیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کەواتە نابێت.**

## پلەی ئـــارەق

**٥٦٥٧-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ بِقَدَحَيْنِ مِنْ خَمْرٍ وَلَبَنٍ، فَنَظَرَ إِلَيْهِمَا، فَأَخَذَ اللَّبَنَ، فَقَالَ لَهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَاكَ لِلْفِطْرَةِ لَوْ أَخَذْتَ الْخَمْرَ غَوَتْ أُمَّتُكَ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوی ئیسڕاو میعراجدا دوو قاپیان بۆی هێنا قاپێکیان ئارەقی تێدا بوو، ئەویتریان شیر، تەماشای هەردووکیانی کرد، شیرەکەی هەڵگرت، جبریل پێی فەرموو: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە هیدایەت و ڕێنمایی کردی بۆ پاکێتی و سروشت، ئەگەر ئارەقت هەڵبگرتایە ئەوە ئوممەتەکەت گومڕا دەبوو.**

**٥٦٥٨-** «عَنِ ابْنِ مُحَيْرِيزٍ، عَنْ رَجُلٍ مَنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: يَشْرَبُ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي الْخَمْرَ يُسَمُّونَهَا بِغَيْرِ اسْمِهَا»[٢].

**واتە: ئیبنو موحەیریز دەگێڕێتەوە، لە پیاوێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خەڵکانێک لە ئوممەتەکەم مەی و ئارەق دەخۆنەوە ناوی تری لێ دەنێن.**

## باسی ئەو ڕیوایەتانەی کە بەسەختی و توندی هەڕەشە لە خواردنەوەی مەی و ئارەق دەکەن

**٥٦٥٩-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ شَارِبُهَا حِينَ يَشْرَبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَنْتَهِبُ نُهْبَةً يَرْفَعُ النَّاسُ إِلَيْهِ فِيهَا أَبْصَارَهُمْ حِينَ يَنْتَهِبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٩٤ و ٣٤٣٧ و ٤٧٠٩ و ٥٥٧٦ و ٥٦٠٣، ومسلم: ١٦٨، والترمذي: ٣١٣٠.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زیناکەر زینا ناکات لە کاتی زیناکردنەکەدا بڕوادار بێت، مەیخۆر مەی ناخواتەوە لە کاتی مەیخواردنەوەکەیدا بڕواداربێت، دز دزی ناکات لە کاتی دزیکردنەکەیدا بڕواداربێت، وە کەسێک تاڵانیەکی بە نرخ تاڵان ناکات بە زۆر کە خەڵک بۆی بڕوانن لە کاتی تاڵانکردنەکەیدا بڕوا داربێت.

**٥٦٦٠-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَنْتَهِبُ نُهْبَةً ذَاتَ شَرَفٍ يَرْفَعُ الْمُسْلِمُونَ إِلَيْهِ أَبْصَارَهُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: زیناکەر زینا ناکات لە کاتی زیناکردنەکەدا بڕوادار بێت، دز دزی ناکات لە کاتی دزیکردنەکەیدا بڕواداربێت، مەیخۆر مەی ناخواتەوە لە کاتی مەیخواردنەوەکەیدا بڕواداربێت، وە کەسێک تاڵانیەکی بەنرخ تاڵان ناکات بە زۆر کە خەڵک بۆی بڕوانن لە کاتی تاڵانکردنەکەیدا بڕوا داربێت.

**٥٦٦١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، وَنَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ ﷺ، قَالُوا: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فَاجْلِدُوهُ، ثُمَّ إِنْ شَرِبَ فَاجْلِدُوهُ، ثُمَّ إِنْ شَرِبَ فَاجْلِدُوهُ، ثُمَّ إِنْ شَرِبَ فَاقْتُلُوهُ»(٢).

واتە: ئیبنو عومەرو هەندێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ (خوا لێیان ڕازی بێ) وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس مەی و ئارەقی خواردەوە داری حەدی لێ بدەن، پاشان ئەگەر خواردیەوە داری حەدی لێبدەن، پاشان ئەگەر خواردیەوە داری حەدی لێبدەن، پاشان ئەگەر خواردیەوە بیکوژن.

**٥٦٦٢-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا سَكِرَ فَاجْلِدُوهُ، ثُمَّ إِنْ سَكِرَ فَاجْلِدُوهُ، ثُمَّ إِنْ سَكِرَ فَاجْلِدُوهُ، ثُمَّ قَالَ فِي الرَّابِعَةِ: فَاضْرِبُوا عُنُقَهُ»(٣).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٧٥ و ٥٥٧٨ و ٦٧٧٢ و ٦٨١٠، ومسلم: ١٠٠ و ٥٧/١٠٥، وأبو داود: ٤٦٨٩، والترمذي: ٢٦٢٥، وإبن ماجه: ٣٩٣٦.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٤٨٣.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٤٨٤، وإبن ماجه: ٢٥٧٥.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کەسێک سەرخۆش بوو داری حەدی لێبدەن، پاشان ئەگەر سەرخۆش بوو داری حەدی لێ بدەن، پاشان ئەگەر سەرخۆش بوو داری حەدی لێبدەن، پاشان لە جاری چوارەمدا فەرمووی: بدەن لە گەردنی.

**٥٦٦٣-** «عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى، عَنْ أَبِيهِ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَا أُبَالِي شَرِبْتُ الْخَمْرَ، أَوْ عَبَدْتُ هَذِهِ السَّارِيَةَ مِنْ دُونِ اللَّهِ ﷻ»[١].

واتە: ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو موسا دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەیوت: لەلای من وەکو یەکە ئارەق و مەی بخۆمەوە یان ئەم کۆڵەکەیە بپەرستم لە جیاتی خوا. (مەبەستی ئەوە بووە جیاوازی نیە لە نێوان هاوبەشدانان و خواردنەوەی مەی و ئارەق).

## باسی ئەو ڕیوایەتانەی کە نوێژی مەی خۆر ڕوون دەکەنەوە

**٥٦٦٤-** «عَنْ عُرْوَةَ بْنِ رُوَيْمٍ، أَنَّ ابْنَ الدَّيْلَمِيِّ رَكِبَ يَطْلُبُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، قَالَ: ابْنُ الدَّيْلَمِيِّ: فَدَخَلْتُ عَلَيْهِ، فَقُلْتُ: هَلْ سَمِعْتَ يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَكَرَ شَأْنَ الْخَمْرِ بِشَيْءٍ، فَقَالَ: نَعَمْ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ رَجُلٌ مِنْ أُمَّتِي فَيَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ صَلَاةً أَرْبَعِينَ يَوْماً»[٢].

واتە: عوروەی کوڕی ڕوەیم دەگێڕێتەوە، ئیبنو دەیلەمی سواری وڵاخ بوو بە دوای عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِی کوڕی عاصدا دەگەڕا، ئیبنو دەیلەمی وتی: ڕۆیشتم بۆ لای وتم: ئەی عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ هیچت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستووە لە بارەی خواردنەوەی مەی و ئارەق؟ وتی: بەڵێ، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو، هەر پیاوێک لە ئوممەتەکەم مەی و ئارەق بخواتەوە ئەوە خوا چل ڕۆژ نوێژی لێ وەرناگرێ.

**٥٦٦٥-** «عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: الْقَاضِي إِذَا أَكَلَ الْهَدِيَّةَ فَقَدْ أَكَلَ السُّحْتَ، وَإِذَا قَبِلَ الرِّشْوَةَ بَلَغَتْ بِهِ الْكُفْرَ، وَقَالَ مَسْرُوقٌ: مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فَقَدْ كَفَرَ، وَكُفْرُهُ أَنْ لَيْسَ لَهُ صَلَاةٌ»[٣].

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف الإسناد مقطوع.




**واتە: مەسروق لێی گێڕدراوەتەوە وتوویەتی: دادوەر ئەگەر دیاری وەرگرت ئەوە حەرامی خواردوە، وە ئەگەر ڕەشوە قبوڵ بكات سەری پێ دەكێشێ بۆ بێبڕوایی. واتە: مەسروق دەڵێ: هەر كەس مەی بخوات ئەوە بێبڕوایی كردوە، بێبڕواییەكەیشی ئەوەیە نوێژی لێ وەرناگیرێ.**

## باسی ئەو تاوانانەی كە لە خواردنەوەی مەی و ئارەقەوە سەرچاوە دەگرن، لە وازهێنان لە نوێژو كوشتنی ئەو نەفسەی كە خوا ﷻ حەرامی كردوە، وە توش بوون بە گوناھ

**٥٦٦٦-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ: سَمِعْتُ عُثْمَانَ ﷺ يَقُولُ: اجْتَنِبُوا الْخَمْرَ فَإِنَّهَا أُمُّ الْخَبَائِثِ، إِنَّهُ كَانَ رَجُلٌ مِمَّنْ خَلَا قَبْلَكُمْ تَعَبَّدَ، فَعَلِقَتْهُ امْرَأَةٌ غَوِيَّةٌ، فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ جَارِيَتَهَا، فَقَالَتْ لَهُ: إِنَّا نَدْعُوكَ لِلشَّهَادَةِ، فَانْطَلَقَ مَعَ جَارِيَتِهَا فَطَفِقَتْ كُلَّمَا دَخَلَ بَاباً أَغْلَقَتْهُ دُونَهُ، حَتَّى أَفْضَى إِلَى امْرَأَةٍ وَضِيئَةٍ عِنْدَهَا غُلَامٌ وَبَاطِيَةُ خَمْرٍ، فَقَالَتْ: إِنِّي وَاللَّهِ مَا دَعَوْتُكَ لِلشَّهَادَةِ، وَلَكِنْ دَعَوْتُكَ لِتَقَعَ عَلَيَّ، أَوْ تَشْرَبَ مِنْ هَذِهِ الْخَمْرَةِ كَأْساً، أَوْ تَقْتُلَ هَذَا الْغُلَامَ، قَالَ: فَاسْقِينِي مِنْ هَذَا الْخَمْرِ كَأْساً، فَسَقَتْهُ كَأْساً، قَالَ: زِيدُونِي فَلَمْ يَرِمْ حَتَّى وَقَعَ عَلَيْهَا، وَقَتَلَ النَّفْسَ، فَاجْتَنِبُوا الْخَمْرَ، فَإِنَّهَا وَاللَّهِ لَا يَجْتَمِعُ الْإِيمَانُ، وَإِدْمَانُ الْخَمْرِ إِلَّا لَيُوشِكُ أَنْ يُخْرِجَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ»[١].

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی كوڕی حارث دەڵێ: گوێم لێبوو عوسمان ﷺ دەیوت: دوور بكەونەوە لە خواردنەوەی مەی، چونكە ئەوە دایكی هەموو پیسیەكانە، پیاوێک بوو لە پێش ئێوە پەرستشی خوای دەكرد (زۆر خواپەرست بوو)، ئافرەتێكی خراپ كەنیزەكەكەی خۆی نارد بۆ لای، پێی وت: ئێمە داوات لێ دەكەین بێی بۆ لامان بۆ شایەتیدان، ئەویش لەگەڵ كەنیزەكەكە دەرچوو، بە پەلە ڕۆیشت، دەچووە هەر ژوورێكەوە دەرگاكەی لێ دادەخست، هەتا گەیشتە لای ژنێک پاڵكەوتبوو خزمەتكارێكیشی لەلا بوو لەگەڵ هەندێ لە ئارەق، وتی: سوێند بە خوا من تۆم بۆ شایەتیدان بانگ نەكردوە، بەڵكو تۆم بانگ كردوە بۆ ئەوەی سەرجێیم لەگەڵدا بكەی، یان كوپێک لەم ئارەقە بخۆیتەوە، یان ئەم منداڵە بكوژی (لە ناچاریدا ویستی سوكترینیان هەڵبژێرێ)، وتی: كوپێک لەم ئارەقەم بدەرێ با بیخۆمەوە، ئەویش كوپێكی پێدا خواردیەوە، وتی: هی ترم بۆ زیاد بكەن با بیخۆمەوە، وازی**

---

(١) صحيح موقوف.




**نەهێنا تا بە سەرخۆشی چووە لای ئافرەتەکەوە، وە نەفسێکیشی کوشت، کەواتە: دوور بکەونەوە لە مەی و ئارەق، سوێند بە خوا ئیمان و بەردەوام بوون لەسەر مەی و ئارەق کۆنابێتەوە ئیللا یەکێکیان ئەوی تریان دەردەکات.**

**٥٦٦٧-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ: سَمِعْتُ عُثْمَانَ ﷺ يَقُولُ: اجْتَنِبُوا الْخَمْرَ، فَإِنَّهَا أُمُّ الْخَبَائِثِ، فَإِنَّهُ كَانَ رَجُلٌ مِمَّنْ خَلَا قَبْلَكُمْ يَتَعَبَّدُ وَيَعْتَزِلُ النَّاسَ «فَذَكَرَ مِثْلَهُ» قَالَ: فَاجْتَنِبُوا الْخَمْرَ فَإِنَّهُ وَاللَّهِ لَا يَجْتَمِعُ وَالْإِيمَانُ أَبَداً إِلَّا يُوشِكَ أَحَدُهُمَا أَنْ يُخْرِجَ صَاحِبَهُ»[١].

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حارث دەڵێ: گوێم لێبوو عوسمان ﷺ دەیوت: دوور بکەونەوە لەمەی و ئارەق، چونکە بەڕاستی ئەوە دایکی پیسیەکانە، پیاوێک هەبوو لە پێش ئێوە پەرستشی خوای دەکردو لە خەڵکی دوورکەوتبویەوە «دواتر هەروەکو فەرمودەکەی پێشووی باسکرد»، وتی: دوور بکەونەوە لە مەی و ئارەق، چونکە سوێند بە خوا هەرگیز ئیمان و بەردەوامبوون لەسەر مەی و ئارەق کۆنابێتەوە ئیللا یەکێکیان ئەوی تریان دەردەکات.**

**٥٦٦٨-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فَلَمْ يَنْتَشِ، لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ مَا دَامَ فِي جَوْفِهِ أَوْ عُرُوقِهِ مِنْهَا شَيْءٌ، وَإِنْ مَاتَ مَاتَ كَافِراً، وَإِنْ انْتَشَى لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً، وَإِنْ مَاتَ فِيهَا مَاتَ كَافِراً»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: هەرکەس مەی خواردەوەو سەرخۆش نەبوو، ئەوا نوێژی لێ وەرناگیرێ مادام شتێک لەو ئارەق و مەیە لەناو قوڕگ یان دەمارەکانی ماوە، ئەگەر مرد بە بێ بڕوایی دەمرێ، وە ئەگەر سەرخۆش بوو ئەوا چل شەو نوێژی لێ وەرناگیرێ، وە ئەگەر بمرێ بە بێبڕوایی مردوە.**

**٥٦٦٩-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فَجَعَلَهَا فِي بَطْنِهِ لَمْ يَقْبَلِ اللَّهُ مِنْهُ صَلَاةً سَبْعاً، إِنْ مَاتَ فِيهَا مَاتَ كَافِراً، فَإِنْ أَذْهَبَتْ عَقْلَهُ عَنْ شَيْءٍ مِنَ الْفَرَائِضِ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ يَوْماً إِنْ مَاتَ فِيهَا مَاتَ كَافِراً»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ، فەرموویەتی: هەر کەس مەی بخواتەوەو بیخاتە ناو زگیەوە ئەوە خوا ﷻ حەوت شەو نوێژی لێ وەرناگرێ، ئەگەر پێوە بمرێ بە بێبڕوایی دەمرێ، ئەگەر سەرخۆش بوو نەیتوانی فەرزەکان جێبەجێ بکات، ئەوە چل ڕۆژ نوێژی لێ وەرناگیرێ، ئەگەر بە سەرخۆشی بمرێ بە بێبڕوایی مردوە.

## تەوبەکردنی ئارەق خۆر

**٥٦٧٠-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الدَّيْلَمِيِّ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ وَهُوَ فِي حَائِطٍ لَهُ بِالطَّائِفِ يُقَالُ لَهُ الْوَهْطُ، وَهُوَ مُخَاصِرٌ فَتًى مِنْ قُرَيْشٍ يُزَنُّ ذَلِكَ الْفَتَى بِشُرْبِ الْخَمْرِ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ شَرْبَةً لَمْ تُقْبَلْ لَهُ تَوْبَةٌ أَرْبَعِينَ صَبَاحاً، فَإِنْ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ، فَإِنْ عَادَ لَمْ تُقْبَلْ تَوْبَتُهُ أَرْبَعِينَ صَبَاحاً، فَإِنْ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ، فَإِنْ عَادَ كَانَ حَقّاً عَلَى اللَّهِ أَنْ يَسْقِيَهُ مِنْ طِينَةِ الْخَبَالِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[(١)].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی دەیلەمی دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِی کوڕی عاص لە ناو باخچەیەکی خۆیدا بوو لە طائیف پێی دەوترا (الْوَهْطُ) دەستی گەنجێکی گرتبوو لە قورەیش تۆمەتبار دەکرا بە خواردنەوەی ئارەق، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەرکەس قومێک ئارەق بخواتەوە ئەوە چل ڕۆژ تەوبەی لێ وەرناگیرێ، ئەگەر تەوبەی کرد خوا تەوبەی لێ وەردەگرێ، ئەگەر دووبارەی کردەوە چل ڕۆژ تەوبەی لێ وەرناگیرێ، ئەگەر تەوبەی کرد خوا تەوبەی لێ وەردەگرێ، ئەگەر دووبارەی کردەوە ئەوە حەقە لەسەر خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییدا کێم و زوخاوی دۆزەخیەکانیان دەرخوارد بدات.

**٥٦٧١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا ثُمَّ لَمْ يَتُبْ مِنْهَا حُرِمَهَا فِي الْآخِرَةِ»[(٢)].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس ئارەق بخوا لە دنیادا پاشان تەوبەی لێ نەکات، لە ڕۆژی دواییدا لێی قەدەغە دەکرێ.

---

(١) صحيح. أخرجه إبن ماجه: ٣٣٧٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٧٥، ومسلم: ٧٦ و ٢٠٠٣/٧٨، وأبو داود: ٣٦٧٩، والترمذي: ١٨٦١، وإبن ماجه: ٣٣٧٣.




## ڕیوایەت لەسەر ئەوانەی بەردەوامن لەسەر خواردنەوەی مەی و ئارەق

**٥٦٧٢-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنَّانٌ، وَلَا عَاقٌّ، وَلَا مُدْمِنُ خَمْرٍ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی زۆر منەت دەکات ناچێتە بەهەشتەوە، وە ئەو کەسەیشی دڵی دایک و باکی دەئێشێنێ، وە ئەوەیشی بەردەوامە لەسەر خواردنەوەی ئارەق.**

**٥٦٧٣-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا، فَمَاتَ وَهُوَ يُدْمِنُهَا، لَمْ يَتُبْ مِنْهَا، لَمْ يَشْرَبْهَا فِي الْآخِرَةِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس لە دنیادا ئارەق بخواتەوەو بمرێ، وە بەردەوام بێ لەسەری و تەوبەی لێ نەکات، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا نایخواتەوە.**

**٥٦٧٤-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا، فَمَاتَ وَهُوَ يُدْمِنُهَا، لَمْ يَشْرَبْهَا فِي الْآخِرَةِ»[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس لە دنیادا ئارەق بخواتەوەو بمرێ، وە بەردەوام بێ لەسەری، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا نایخواتەوە.**

**٥٦٧٥-** «عَنْ الضَّحَّاكِ قَالَ: مَنْ مَاتَ مُدْمِناً لِلْخَمْرِ نُضِحَ فِي وَجْهِهِ بِالْحَمِيمِ حِينَ يُفَارِقُ الدُّنْيَا»[٤].

**واتە: ضەحاک دەڵێ: هەرکەس بمرێ و بەردەوام بێت لە سەر ئارەق خواردنەوە، ئاوی گەرم دەکرێ بە ڕوخساریدا کاتێ دنیا جێدەهێڵێ.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) حسن الإسناد مقطوع.




## دەربەدەر کردنی ئارەق خۆر

**٥٦٧٦-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ قَالَ: غَرَّبَ عُمَرُ رَبِيعَةَ بْنَ أُمَيَّةَ فِي الْخَمْرِ إِلَى خَيْبَرَ، فَلَحِقَ بِهِرَقْلَ فَتَنَصَّرَ، فَقَالَ عُمَرُ: لَا أُغَرِّبُ بَعْدَهُ مُسْلِماً»[١].

**واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب وتوویەتی: عومەر ڕەبیعەی کوڕی ئومەییەی بەهۆی ئارەق خواردنەوە شاربەدەر کرد بۆ خەیبەر، ئەویش لەوێ پەیوەندی کرد بە هیرەقلەوەو بوو بە گاور، عومەر وتی: دوای ئەوە هیچ مسوڵمانێک شاربەدەر ناکەم.**

## باسی ئەو فەرموودانەی کە عیللەتی تێدایە (واتە: لاوازن) بۆ کەسێک ڕێگەی پێ درابێ بە خواردنەوەی سەرخۆشکەر

**٥٦٧٧-** «عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ نِيَارٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اشْرَبُوا فِي الظُّرُوفِ، وَلَا تَسْكَرُوا»[٢].

**واتە: ئەبو بوردەی کوڕی دینار ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بخۆنەوە لە قاپ و قاچاخەکاندا، بەڵام سەرخۆشکەر مەخۆنەوە.**

**٥٦٧٨-** «عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالنَّقِيرِ، وَالْمُزَفَّتِ»[٣].

**واتە: ئیبنو بورەیدە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لەناو کولەکەو گۆزەو قەدی دار خورمای هەڵکۆڵدراوو قاپی بۆیەکراو بە زفت.**

**٥٦٧٩-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: اشْرَبُوا، وَلَا تَسْكَرُوا»[٤].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بخۆنەوە، بەڵام شتی سەرخۆشکەر مەخۆنەوە.**

---

(١) ضعيف.

(٢) حسن صحيح الإسناد.

(٣) ضعيف الإسناد.

(٤) ضعيف الإسناد موقوف. لكن صح مرفوعاً.




**٥٦٨٠-** «عَنْ جَسْرَةَ بِنْتِ دَجَاجَةَ الْعَامِرِيَّةَ قَالَتْ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ، سَأَلَهَا أُنَاسٌ كُلُّهُمْ يَسْأَلُ عَنِ النَّبِيذِ، يَقُولُ: نَنْبِذُ التَّمْرَ غُدْوَةً، وَنَشْرَبُهُ عَشِيّاً، وَنَنْبِذُهُ عَشِيّاً وَنَشْرَبُهُ غُدْوَةً؟ قَالَتْ: لَا أُحِلُّ مُسْكِراً، وَإِنْ كَانَ خُبْزاً، وَإِنْ كَانَتْ مَاءً قَالَتْهَا: ثَلَاثَ مَرَّاتٍ»[١].

**واتە: جەسرەی کچی دەجاجەی عامریە دەڵێ: گوێم لێبوو خەڵکانێک پرسیاریان لە عائیشە کرد لە بارەی گرتنەوەی شلەمەنی وتیان: ئێمە بەیانیان خورمامان دەگرتەوە، بە شەوەکەی دەمانخوارد، وە بە شەو دەمانگرتەوەو بە ڕۆژدا دەمانخوارد، وتی: ئەوەی سەرخۆشکەر بێت بە حەڵاڵی نازانم، ئەگەر نانیش بێت، ئەگەر ئاویش بێت، سێ جار ئەمەی وت.**

**٥٦٨١-** «عَنْ كَرِيمَةَ بِنْتِ هَمَّامٍ، أَنَّهَا سَمِعَتْ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ تَقُولُ: نُهِيتُمْ عَنِ الدُّبَّاءِ، نُهِيتُمْ عَنِ الْحَنْتَمِ، نُهِيتُمْ عَنِ الْمُزَفَّتِ ثُمَّ أَقْبَلَتْ عَلَى النِّسَاءِ فَقَالَتْ: إِيَّاكُنَّ وَالْجَرَّ الْأَخْضَرَ، وَإِنْ أَسْكَرَكُنَّ مَاءُ حُبِّكُنَّ فَلَا تَشْرَبْنَهُ»[٢].

**واتە: کەریمەی کچی هەمام دەگێڕێتەوە: ئەو بیستویەتی عائیشە دایکی ئیمانداران (خوا لێی ڕازی بێ) دەیوت: قەدەغەتان لێکراوە لە گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو کولەکەو لە ناو گۆزەو لە ناو قاپی بۆیەکراو بە زفت، پاشان ڕووی کردە ئافرەتان و وتی: زۆر وریای گرتنەوەی شلەمەنی بن لە ناو گۆزەی سەوز ئەگەرچی زۆریش حەزتان لێی بێت مەیخۆنەوە.**

**٥٦٨٢-** «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا سُئِلَتْ عَنِ الْأَشْرِبَةِ، فَقَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْهَى عَنْ كُلِّ مُسْكِرٍ»[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پرسیاری لێکرا لەبارەی خواردنەوەکان، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی دەکرد لە هەموو خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەر.**

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) حسن الإسناد.

(٣) صحيح.




**٥٦٨٣-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: حُرِّمَتِ الْخَمْرُ قَلِيلُهَا وَكَثِيرُهَا، وَالسُّكْرُ مِنْ كُلِّ شَرَابٍ»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئارەق قەدەغەکراوە زۆر بێت یان کەم، وە هەموو خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەریش.**

**٥٦٨٤-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: حُرِّمَتِ الْخَمْرُ بِعَيْنِهَا قَلِيلُهَا وَكَثِيرُهَا، وَالسَّكْرُ مِنْ كُلِّ شَرَابٍ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئارەق لە خودی خۆیدا قەدەغەکراوە زۆر بێت یان کەم، وە هەموو خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەریش.**

**٥٦٨٥-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: حُرِّمَتِ الْخَمْرُ بِعَيْنِهَا قَلِيلُهَا وَكَثِيرُهَا، وَالسُّكْرُ مِنْ كُلِّ شَرَابٍ»[٣].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئارەق لە خودی خۆیدا قەدەغەکراوە زۆر بێت یان کەم، وە هەموو خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەریش.**

**٥٦٨٦-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: حُرِّمَتِ الْخَمْرُ قَلِيلُهَا وَكَثِيرُهَا، وَمَا أَسْكَرَ مِنْ كُلِّ شَرَابٍ»[٤].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئارەق قەدەغەکراوە زۆر بێت یان کەم، وە هەموو خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەریش.**

**٥٦٨٧-** «عَنْ أَبِي الْجُوَيْرِيَةِ الْجَرْمِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ وَهُوَ مُسْنِدٌ ظَهْرَهُ إِلَى الْكَعْبَةِ، عَنِ الْبَاذَقِ، فَقَالَ: سَبَقَ مُحَمَّدٌ الْبَاذَقَ، وَمَا أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ، قَالَ: أَنَا أَوَّلُ الْعَرَبِ سَأَلَهُ»[٥].

**واتە: ئەبو جوەیریەی جەرمی دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) پشتی دابوو بە کەعبەوە لە بارەی (الْبَاذَق) (کە خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەرە،**

---

(١) صحيح موقوف.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح.




لە فارسیەوە وەرگیراوە پێی دەوترێ: بادە) وتی: فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ پێشی (الْبَاذَق) کەوتووە، هەر شتێک سەرخۆش بکات حەرامە. وتی: من یەکەمین کەس بوم لەناو عەرەبدا لەو بارەیەوە پرسیارم لێکرد.

**٥٦٨٨-** «عَنْ أَبِي الْحَكَمِ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُحَرِّمَ، إِنْ كَانَ مُحَرِّماً مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ فَلْيُحَرِّمِ النَّبِيذَ»(١).

**واتە: ئەبولـحەکەم دەگێڕێتەوە، ئیبنو عەباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: هەر کەس پێی خۆشە ئەوە حەرام بکات کە خواو پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردوە، ئەوە با گرتنەوەی شلەمەنی لە ناو ئەو قاپانەدا حەرام بکات کە پێغەمبەرﷺ باسی کردوە.**

**٥٦٨٩-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِابْنِ عَبَّاسٍ: إِنِّي امْرُؤٌ مِنْ أَهْلِ خُرَاسَانَ، وَإِنَّ أَرْضَنَا أَرْضٌ بَارِدَةٌ، وَإِنَّا نَتَّخِذُ شَرَاباً نَشْرَبُهُ مِنَ الزَّبِيبِ، وَالْعِنَبِ، وَغَيْرِهِ، وَقَدْ أُشْكِلَ عَلَيَّ، فَذَكَرَ لَهُ ضُرُوباً مِنَ الْأَشْرِبَةِ، فَأَكْثَرَ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ لَمْ يَفْهَمْهُ، فَقَالَ لَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنَّكَ قَدْ أَكْثَرْتَ عَلَيَّ، اجْتَنِبْ مَا أَسْكَرَ مِنْ تَمْرٍ أَوْ زَبِيبٍ أَوْ غَيْرِهِ»(٢).

**واتە: عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: پیاوێک بە ئیبنو عەبباسی (خوا لێیان ڕازی بێ) وت: من پیاوێکم لە خەڵکی خوراسان، ناوچەکەمان ناوچەیەکی ساردە، ئێمە خواردنەوەیەکی لێ دەگرینەوە لە مێوژو تری و جگە لەویش، «لام تێکەڵ بوو»، باسی کۆمەڵە خواردنەوەیەکی کرد، ئەوەندەی باسکرد هەتا گومانم برد ئیبنو عەبباس لێی تێنەگەیشت، ئیبنو عەبباس پێی وت: تۆ بەڕاستی زۆرت باس کرد، دوور بکەوەرەوە لە هەر شتێک کە مرۆڤ سەرخۆش دەکات لە خورما بێت، یان مێوژ یان جگە لەوانە.**

**٥٦٩٠-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَبِيذُ الْبُسْرِ بَحْتٌ لَا يَحِلُّ»(٣).

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گیراوەی شلەمەنی خورمانی (الْبُسْرِ)ی پاڵفتە حەڵاڵ نیە.**

---

(١) صحيح الإسناد موقوف.

(٢) صحيح الإسناد موقوف.

(٣) صحيح الإسناد موقوف.

**٥٦٩١-** «عَنْ أَبِي جَمْرَةَ قَالَ: كُنْتُ أُتَرْجِمُ بَيْنَ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا وَبَيْنَ النَّاسِ، فَأَتَتْهُ امْرَأَةٌ تَسْأَلُهُ عَنْ نَبِيذِ الْجَرِّ، فَنَهَى عَنْهُ قُلْتُ: يَا أَبَا عَبَّاسٍ إِنِّي أَنْتَبِذُ فِي جَرَّةٍ خَضْرَاءَ، نَبِيذاً حُلْواً، فَأَشْرَبُ مِنْهُ فَيُقَرْقِرُ بَطْنِي، قَالَ: لَا تَشْرَبْ مِنْهُ وَإِنْ كَانَ أَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ»[١].

**واتە: ئەبو جەمرە دەڵێ: من لە نێوان ئیبنو عەبباس و خەڵکەکەدا بووم قسەکانیانم وەردەگێڕا، ئافرەتێک هات بۆ لای پرسیاری لێکرد لەبارەی گرتنەوەی شلەمەنی لەناو گۆزەدا، قەدەغەی لێکرد، وتم: ئەی ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) من خواردنەوە دەگرمەوە لە ناو گۆزەی سەوزدا گیراوەیەکی زۆر بەلەزەتە، لێی دەخۆمەوە سکم قوڕەی دێت، وتی: لێی مەخۆرەوە ئەگەر لە هەنگوینیش خۆشتر بێت.**

**٥٦٩٢-** «عَنْ أَبِي جَمْرَةَ نَصْرٌ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: إِنَّ جَدَّةً لِي تَنْبِذُ نَبِيذاً فِي جَرٍّ أَشْرَبُهُ حُلْواً، إِنْ أَكْثَرْتُ مِنْهُ، فَجَالَسْتُ الْقَوْمَ خَشِيتُ أَنْ أَفْتَضِحَ، فَقَالَ: قَدِمَ وَفْدُ عَبْدِ الْقَيْسِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: مَرْحَباً بِالْوَفْدِ، لَيْسَ بِالْخَزَايَا وَلَا النَّادِمِينَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ الْمُشْرِكِينَ، وَإِنَّا لَا نَصِلُ إِلَيْكَ إِلَّا فِي أَشْهُرِ الْحُرُمِ، فَحَدِّثْنَا بِأَمْرٍ إِنْ عَمِلْنَا بِهِ دَخَلْنَا الْجَنَّةَ، وَنَدْعُو بِهِ مَنْ وَرَاءَنَا، قَالَ: آمُرُكُمْ بِثَلَاثٍ، وَأَنْهَاكُمْ عَنْ أَرْبَعٍ، آمُرُكُمْ: بِالْإِيمَانِ بِاللَّهِ، وَهَلْ تَدْرُونَ مَا الْإِيمَانُ بِاللَّهِ؟ قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: شَهَادَةُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَإِقَامُ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَأَنْ تُعْطُوا مِنَ الْمَغَانِمِ الْخُمُسَ، وَأَنْهَاكُمْ عَنْ أَرْبَعٍ: عَمَّا يُنْبَذُ فِي الدُّبَّاءِ، وَالنَّقِيرِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالْمُزَفَّتِ»[٢].

**واتە: ئەبو جەمرە کەناوی نەصرە وتی: بە ئیبنو عەبباسم (خوا لێیان ڕازی بێ) وت: داپیرەیەکم هەیە خواردنەوەیەک دەگرێتەوە لە ناو گۆزەدا، دەیخۆمەوە زۆر بە لەزەتە، ئەگەر زۆری لێ بخۆمەوە دەترسم لە ناو کۆڕو مەجلیسدا تووشی نەنگی ڕیسوایی ببم، وتی: وەفدی عەبدولقەیس هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەخێر بێن ئەم وەفدە هەرگیز ڕیسواو پەشیمان نەبن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوانی ئێمە و تۆدا هاوبەشدانەران هەیە، ئێمە ناتوانین بێین بۆ خزمەتت مەگەر لە مانگی حەرامدا نەبێت، شتێکمان پێ بڵێ ئەگەر ئەنجامی**

---

(١) صحيح الإسناد موقوف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣ و ٥٢٣ و ١٣٩٨ و ١٣٩٥ و ٣٥١٠ و ٤٣٦٩، ومسلم: ١٧، وأبو داود: ٣٦٩٢ و ٣٦٩٤ و ٤٦٧٧، والترمذي: ١٥٩٩ و ٢٦١١.




بدەین بچینە بەهەشتەوە، وە بانگەوازی دوای خۆمانیشی پێ بکەین، فەرمووی: فەرمانتان پێدەکەم بە سێ شت و ڕێگریتان لێدەکەم لە چوار شت: فەرمانتان پێدەکەم بە بڕواهێنان بە خوا، ئایا دەزانن بڕواهێنان بە خوا چیە؟ وتیان خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن، فەرمووی: شایەتیدان بەوەی هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە جگە لە خوا، وە ئەنجامدانی نوێژ و دەرکردنی زەکات، وە پێنج یەکی غەنیمەت و دەستکەوتەکانتان بدەن بە من، وە ڕێگریتان لێدەکەم لە چوار شت لەو خواردنەوانەی دەگیرێتەوە لە ناو کولەکەو قەدی دار خورمای هەڵکۆڵدراوو گۆزەی حەنتەم و قاپی بۆیەکرا و بە زفت (کە چەند قاپێک بوو لەناو عەرەبدا بەکاریان دەهێنا، لە دار دروست کرابوون، هەڵیان دەکۆڵی و بەکاریان دەهێنا بۆ جۆرەها خواردنەوە، ئەو قاپانە دەبوونە هۆکارو یارمەتیدەر بۆ ئەوەی ئەو خواردنەوانە زوتر ببێتە سەرخۆشکەر).

**٥٦٩٣-** «عَنْ قَيْسِ بْنِ وَهْبَانَ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قُلْتُ: إِنَّ لِي جُرَيْرَةً أَنْتَبِذُ فِيهَا، حَتَّى إِذَا غَلَى وَسَكَنَ شَرِبْتُهُ، قَالَ: مُذْكَمْ هَذَا شَرَابُكَ؟، قُلْتُ: مُذْ عِشْرُونَ سَنَةً، أَوْ قَالَ: مُذْ أَرْبَعُونَ سَنَةً، قَالَ: طَالَمَا تَرَوَّتْ عُرُوقُكَ، مِنَ الْخَبَثِ»[١].

**واتە: قەیسی کوڕی وەهبان دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، وتم: من گۆزەیەکم هەیە خواردنەوەی لە ناودا دەگرمەوە هەتا کاتێ هەڵدەچی و دەنیشێتەوە دەیخۆمەوە، وتی: ماوەی چەنێکە ئەمە خواردنەوەتە؟ وتم: بیست ساڵە، یان وتی: ماوەی چل ساڵە، وتی: خەریکە دەمارەکانت پیسی دایبپۆشێ.**

**٥٦٩٤-** «عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ نَافِعٍ قَالَ: قَالَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: رَأَيْتُ رَجُلاً جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِقَدَحٍ فِيهِ نَبِيذٌ وَهُوَ عِنْدَ الرُّكْنِ، وَدَفَعَ إِلَيْهِ الْقَدَحَ فَرَفَعَهُ إِلَى فِيهِ، فَوَجَدَهُ شَدِيداً فَرَدَّهُ عَلَى صَاحِبِهِ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَحَرَامٌ هُوَ؟ فَقَالَ: عَلَيَّ بِالرَّجُلِ، فَأُتِيَ بِهِ، فَأَخَذَ مِنْهُ الْقَدَحَ، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ فَصَبَّهُ فِيهِ فَرَفَعَهُ إِلَى فِيهِ، فَقَطَّبَ ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ أَيْضاً، فَصَبَّهُ فِيهِ، ثُمَّ قَالَ: إِذَا اغْتَلَمَتْ عَلَيْكُمْ هَذِهِ الْأَوْعِيَةُ، فَاكْسِرُوا مُتُونَهَا بِالْمَاءِ»[٢].

**واتە: عەبدولمەلیکی کوڕی نافع دەڵێ: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) وتی: پیاوێکم بینی هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ قاپێکی پێ بوو شلەمەنی تێدا**

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف الإسناد.




بوو لە لای ڕوکن بوو، قاپەکەی پێدا ئەویش بەرزی کردەوە بۆ لای دەمی، بینی نزیکە لەوەی مرۆڤ سەرخۆش بکات، گەڕاندیەوە بۆ خاوەنەکەی، پیاوێک لە خەڵکەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا ئەوە قەدەغەیە؟ فەرمووی: ئەو پیاوەم بۆ بانگ بکەن، پیاوەکەیان بۆ هێنا، قاپەکەی لێوەرگرت، پاشان داوای ئاوی کردو تێی کرد، ئینجا بەرزی کردەوە بۆ لای دەمی، ڕوخساری گرژ کرد، (چونکە ئەوەی پێ باش نەبوو) پاشان داوای ئاوی کردو تێی کرد، پاشان فەرمووی: ئەگەر ئەو گیراوانە هەڵچووە، هەڵچوونەکەی بە ئاو بشکێنن (واتە: ئەوەندە ئاوی تێبکەن سەرخۆشکەریەکەی نەهێڵێت).

**٥٦٩٥-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِنَحْوِهِ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەر وەکو ئەو فەرموودەی پێشوو.

**٥٦٩٦-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ عَنِ الْأَشْرِبَةِ، فَقَالَ: اجْتَنِبْ كُلَّ شَيْءٍ يَنِشُّ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێک پرسیار لێکرد دەربارەی خواردنەوەکان، وتی: دوور بکەوەرەوە لە هەر گیراوەیەک هەڵبچێت. (واتە: سەرخۆشکەر بێت).

**٥٦٩٧-** «عَنْ زَيْدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنِ الْأَشْرِبَةِ، فَقَالَ: اجْتَنِبْ كُلَّ شَيْءٍ يَنِشُّ»[٣].

واتە: زەیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەربارەی خواردنەوەکان، وتی: دوور بکەرەوە لە هەر گیراوەیەک هەڵبچێت. (واتە: سەرخۆشکەر بێت).

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد موقوف.

(٣) صحيح الإسناد موقوف.




**٥٦٩٨-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: الْمُسْكِرُ قَلِيلُهُ وَكَثِيرُهُ حَرَامٌ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: سەرخۆشکەر کەم، بێت یان زۆر قەدەغەیە.**

**٥٦٩٩-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: هەموو سەرخۆشکەرێک مەی و ئارەقە، وە هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە.**

**٥٧٠٠-** «عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: حَرَّمَ اللَّهُ الْخَمْرَ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»[٣].

**واتە: سالمی کوڕی عەبدوڵلا دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا مەی و ئارەقی قەدەغە کردوە، وە هەموو سەرخۆشکەرێک حەرامە.**

**٥٧٠١-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ»[٤].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە، وە هەموو سەرخۆشکەرێک مەی و ئارەقە.**

**٥٧٠٢-** «عَنْ رُقَيَّةَ بِنْتِ عَمْرِو بْنِ سَعِيدٍ قَالَتْ: كُنْتُ فِي حَجْرِ ابْنِ عُمَرَ فَكَانَ يُنْقَعُ لَهُ الزَّبِيبُ فَيَشْرَبُهُ مِنَ الْغَدِ، ثُمَّ يُجَفَّفُ الزَّبِيبُ، وَيُلْقَى عَلَيْهِ زَبِيبٌ آخَرُ، وَيُجْعَلُ فِيهِ مَاءٌ فَيَشْرَبُهُ مِنَ الْغَدِ حَتَّى إِذَا كَانَ بَعْدَ الْغَدِ طَرَحَهُ»[٥].

**واتە: ڕوقەیەی کچی عەمری کوڕی سەعید دەڵێ: من لەلای ئیبنو عومەردا بووم، مێوژی بۆ دەخوسێنرا لە ناو ئاودا، بەیانیان دەیخواردەوە، پاشان مێوژەکە وشک**

---

(١) صحيح الإسناد موقوف.

(٢) صحيح الإسناد موقوف.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

(٥) ضعيف الإسناد موقوف.




**دەکرایەوە مێوژی دیکە دەخرایە سەری و ئاوی تێدەکرا لە بەیانیدا دەیخواردەوە، پاشان دوو بەیانی بەسەردا هات فڕێی دەدا.**

**٥٧٠٣-** «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: عَطِشَ النَّبِيُّ ﷺ حَوْلَ الْكَعْبَةِ فَاسْتَسْقَى، فَأُتِيَ بِنَبِيذٍ مِنَ السِّقَايَةِ، فَشَمَّهُ فَقَطَّبَ، فَقَالَ: عَلَيَّ بِذَنُوبٍ مِنْ زَمْزَمَ، فَصَبَّ عَلَيْهِ، ثُمَّ شَرِبَ، فَقَالَ رَجُلٌ: أَحَرَامٌ هُوَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: لَا»[١].

**واتە: ئەبو مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە دەوری کەعبە تینوی بوو داوای ئاوی کرد، شلەمەنیەکیان بۆ هێنا لەناو کونەیەکدا، بۆنی کرد، دواتر ڕوخساری گرژ کرد، فەرمووی: قاپێکی گەورەی ئاوی زەمزەمم بۆ بێنن، ئاوی کرد بەسەر شلەمەنیەکەدا، پاشان لێی خواردەوە، پیاوێک وتی: ئایا ئەوە قەدەغەیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: نەخێر.**

**٥٧٠٤-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: عَلِمْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَصُومُ فِي بَعْضِ الْأَيَّامِ الَّتِي كَانَ يَصُومُهَا، فَتَحَيَّنْتُ فِطْرَهُ بِنَبِيذٍ صَنَعْتُهُ، فِي دُبَّاءٍ، فَلَمَّا كَانَ الْمَسَاءُ، جِئْتُهُ أَحْمِلُهَا إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي قَدْ عَلِمْتُ أَنَّكَ تَصُومُ فِي هَذَا الْيَوْمِ، فَتَحَيَّنْتُ فِطْرَكَ بِهَذَا النَّبِيذِ، فَقَالَ: أَدْنِهِ مِنِّي يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، فَرَفَعْتُهُ إِلَيْهِ فَإِذَا هُوَ يَنِشُّ، فَقَالَ: خُذْ هَذِهِ فَاضْرِبْ بِهَا الْحَائِطَ، فَإِنَّ هَذَا شَرَابُ مَنْ لَا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: زانیم پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەندێ لە ڕۆژەکانیدا بەڕۆژوو دەبێ گیراوەیەکم بۆ بەربانگی ئامادە کرد لەناو کولەکەیەکدا، کاتێ ئێوارە هات هێنام بۆ خزمەتی، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من زانیم تۆ لەم ڕۆژەدا بە ڕۆژوو دەبی، ئەم گیراوەیەم بۆ بەربانگت ئامادە کرد، فەرمووی: نزیکی بکەرەوە لێم ئەی ئەبو هورەیرە، منیش نزیکم کردەوە لێی، گیراوەکە قوڵپی دەدا، فەرمووی: ئەمە ببەو بیدە بە قەدی دیوارەکەدا، چونکە بەڕاستی ئەمە خواردنەوەی خەڵکێکە کە بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی نەبێت.**

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) صحيح.





**٥٧٠٥-** «عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ قَالَ: إِذَا خَشِيتُمْ مِنْ نَبِيذٍ شِدَّتَهُ، فَاكْسِرُوهُ بِالْمَاءِ، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: مِنْ قَبْلِ أَنْ يَشْتَدَّ»[١].

**واتە: ئەبو رافیع ﷺ دەگێڕێتەوە: عومەری کوڕی خەطاب ﷺ دەڵێ: ئەگەر ترسان لەوەی گیراوەیەک ببێتە سەرخۆشکەر ئەوە ئاوی تێبکەن. عەبدوڵڵا وتی: پێش ئەوەی ببێتە سەرخۆشکەر.**

**٥٧٠٦-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ يَقُولُ: تَلَقَّتْ ثَقِيفٌ عُمَرَ ﷺ بِشَرَابٍ، فَدَعَا بِهِ، فَلَمَّا قَرَّبَهُ إِلَى فِيهِ كَرِهَهُ، فَدَعَا بِهِ، فَكَسَرَهُ بِالْمَاءِ، فَقَالَ: هَكَذَا فَافْعَلُوا»[٢].

**واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب دەڵێ: خەڵکی ثەقیف هاتن بۆ لای عومەر ﷺ خواردنەوەیەکیان هێنا بۆی، ئەویش داوای کرد، کاتی نزیکی کردەوە بۆ لای دەمی، حەزی لێ نەکرد، ئینجا ئاوی تێکردو وتی: بەو شێوەی لێ بکەن.**

**٥٧٠٧-** «عَنْ عُتْبَةَ بْنِ فَرْقَدٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيذُ الَّذِي يَشْرَبُهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ قَدْ خُلِّلَ»[٣].

**واتە: عوتبەی کوڕی فەرقەد دەڵێ: ئەو گیراوەیەی عومەری کوڕی خەطاب دەیخواردەوە کرابوو بە سرکە.**

**٥٧٠٨-** «عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ خَرَجَ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ: إِنِّي وَجَدْتُ مِنْ فُلَانٍ رِيحَ شَرَابٍ، فَزَعَمَ أَنَّهُ شَرَابُ الطِّلَاءِ، وَأَنَا سَائِلٌ عَمَّا شَرِبَ، فَإِنْ كَانَ مُسْكِراً جَلَدْتُهُ، فَجَلَدَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ الْحَدَّ تَامّاً»[٤].

**واتە: سائیبی کوڕی یەزید دەگێڕێتەوە، عومەری کوڕی خەطاب ﷺ هات بۆ لایان، وتی: من بۆنی مەی دەکەم لە فڵانەکەس، وتی: ئەو خواردنەوەیە سەرخۆشکەرە، من پرسیار دەکەم بۆچی خواردوویەتیەوە، ئەگەر سەرخۆشکەر بێت داری حەدی لێدەدەم، عومەری کوڕی خەطاب ﷺ داری حەدی تەواوەتی لێدا.**

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) ضعيف الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح الإسناد.

تێبینی: (الطِّلَاء): بریتیە لە گیراوەی ترێ لەسەر ئاگر دادەنرێ هەتا دوو لەسەر سێی دەڕوات، هەندێک لە عەرەبەکان بەسەر خۆشکەر دەڵێن: (الطِّلَاء).

## باسی ئەوەی خوا ﷻ ئامادەی کردوە بۆ ئارەق خۆر لە ڕیسوایی و سوکی و سزای بە ئێش

**٥٧٠٩-** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ جَيْشَانَ، وَجَيْشَانُ مِنَ الْيَمَنِ، قَدِمَ فَسَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ شَرَابٍ يَشْرَبُونَهُ بِأَرْضِهِمْ، مِنَ الذُّرَةِ يُقَالُ لَهُ الْمِزْرُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَمُسْكِرٌ هُوَ؟، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ، إِنَّ اللَّهَ ﷻ عَهِدَ لِمَنْ شَرِبَ الْمُسْكِرَ، أَنْ يَسْقِيَهُ مِنْ طِينَةِ الْخَبَالِ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا طِينَةُ الْخَبَالِ؟، قَالَ: عَرَقُ أَهْلِ النَّارِ، أَوْ قَالَ: عُصَارَةُ أَهْلِ النَّارِ»[١].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک لە جەیشان کە شوێنێکە لە یەمەن هات پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی خواردنەوەیەک لە زەوی خۆیاندا دەیانخواردەوە، لە دانەوێڵە پێی دەوترا (الْمِزْرُ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا ئەوە سەرخۆشکەرە؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە، خوا ﷻ پەیمانیداوە بۆ هەر کەس خواردنەوەی سەرخۆشکەر بخواتەوە، (طِينَةِ الْخَبَالِ) دەرخوارد بدات، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (طِينَةِ الْخَبَالِ) چیە؟ فەرمووی: ئارەقی دۆزەخیەکانە، یان کێم و زوخاوی دۆزەخیەکانە.

## جەختکردنەوەو هاندان لەسەر وازهێنان لە شتە گوماناویەکان

**٥٧١٠-** «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ الْحَلَالَ بَيِّنٌ وَإِنَّ الْحَرَامَ بَيِّنٌ، وَإِنَّ بَيْنَ ذَلِكَ أُمُوراً مُشْتَبِهَاتٍ وَرُبَّمَا قَالَ: وَإِنَّ بَيْنَ ذَلِكَ أُمُوراً مُشْتَبِهَةً وَسَأَضْرِبُ فِي ذَلِكَ مَثَلاً: إِنَّ اللَّهَ ﷻ حَمَى حِمًى، وَإِنَّ حِمَى اللَّهِ مَا حَرَّمَ، وَإِنَّهُ مَنْ يَرْعَ حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يُخَالِطَ الْحِمَى وَرُبَّمَا قَالَ: يُوشِكُ أَنْ يَرْتَعَ وَإِنَّ مَنْ خَالَطَ الرِّيبَةَ يُوشِكُ أَنْ يَجْسُرَ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٠٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢ و ٢٠٥١، ومسلم: ١٠٧ و ١٥٩٩/١٠٨، وأبو داود: ٣٣٢٩ و ٣٣٣٠، والترمذي: ١٢٠٥، وإبن ماجه: ٣٩٨٤.




واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: حەڵاڵ ڕوونەو حەرامیش ڕوونە، لە نێوانیشیاندا چەند شتێکی گوماناوی هەیە، پێم وابێ وتی: لە نێوان ئەوانەدا کۆمەڵە شتێکی گوماناوی هەیە، لەو بارەیشەوە نموونەیەکتان بۆ دەهێنمەوە، خوا ﷻ سنوورێکی بۆ خۆی داناوە بەڕاستی سنووری خوا ئەوەیە کە حەرامی کردوە، هەرکەسیش لە دەورو بەری ئەو سنوورەدا ئاژەڵەکانی بلەوەڕێنێ نزیکە تێکەڵی سنوورەکە ببێ، هەرکەسیش تێکەڵی شتی گوماناوی بێت نزیکە تووشی شتێکی گوماناوی ئاڵۆزتر بێت.

**٥٧١١-** «عَنْ أَبِي الْحَوْرَاءِ السَّعْدِيِّ قَالَ: قُلْتُ لِلْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ ﷺ: مَا حَفِظْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: حَفِظْتُ مِنْهُ: دَعْ مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لَا يَرِيبُكَ»[١].

واتە: ئەبو حەوڕائی سەعدی دەڵێ: بە حەسەنی کوڕی عەلیم ﷺ وت: چیت لەبەرکردوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ؟ وتی: لەبەرم کردوە لە پێغەمبەرەوە: وازبێنە لەوەی کە گومانت لێیەتی، وە برۆ بۆ لای ئەوەی گومانت لێی نیە.

## ناپەسەندی فرۆشتنی مێوژ بەو کەسەی دەیکات بە شەرابی سەرخۆشکەر

**٥٧١٢-** «عَنِ ابْنِ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ كَانَ يَكْرَهُ أَنْ يَبِيعَ الزَّبِيبَ لِمَنْ يَتَّخِذُهُ نَبِيذاً»[٢].

واتە: طاوس دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، ئەو پێی باش نەبووە مێوژ بفرۆشرێت بە کەسێک کە بۆ گیراوەی (سەرخۆشکەر) بەکاری دەهێنێت.

## ناپەسەندی لە کڕین و فرۆشتنی شلەمەنی

**٥٧١٣-** «عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: كَانَ لِسَعْدٍ كُرُومٌ وَأَعْنَابٌ كَثِيرَةٌ، وَكَانَ لَهُ فِيهَا أَمِينٌ، فَحَمَلَتْ عِنَباً كَثِيراً، فَكَتَبَ إِلَيْهِ: إِنِّي أَخَافُ عَلَى الْأَعْنَابِ الضَّيْعَةَ، فَإِنْ رَأَيْتَ أَنْ أَعْصُرَهُ عَصَرْتُهُ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ سَعْدٌ: إِذَا جَاءَكَ كِتَابِي هَذَا، فَاعْتَزِلْ ضَيْعَتِي، فَوَاللَّهِ لَا أَئْتَمِنُكَ عَلَى شَيْءٍ بَعْدَهُ أَبَداً، فَعَزَلَهُ عَنْ ضَيْعَتِهِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٥١٨.

(٢) صحيح الإسناد مقطوع.

(٣) صحيح الإسناد موقوف.




واتە: موصعەبی کوڕی سەعد دەڵێ: سەعد باخێکی مێوو ترێیەکی زۆری هەبوو، کەسێکی دەستپاکی دانابوو ترێیەکی زۆری هێنا، نوسراوی بۆ کرد: من دەترسم ترێیەکان لە ناو بچن، ئەگەر بتەوێ ئاوەکەی بگرمەوە، دەیگرمەوە، سەعد بۆی نوسی: ئەگەر ئەم نوسراوەم پێت گەیشت، واز لە باخچەکەم بێنە، سوێند بە خوا ئیتر هەرگیز لەسەر ماڵ داتنانێم. لەسەر باخەکەی لایبرد.

**٥٧١٤-** «عَنِ ابْنِ سِيرِينَ قَالَ: بِعْهُ عَصِيراً مِمَّنْ يَتَّخِذُهُ طِلَاءً وَلَا يَتَّخِذُهُ خَمْراً»[١].

واتە: ئیبنو سیرین دەڵێ: گیراوە بە شەربەتی بفرۆشە بەو کەسەی دەیکات بە (طِّلَاء) (واتە: ئەو ترێیەیە کە لەسەر ئاگر دەیکوڵێنن هەتا خەست دەبێتەوە، دوو لەسەر سێی لەسەر ئاگر دەسوتێنێ) وە نایکات بە مەی.

## باسی دروستی خواردنەوەی لە (الطِّلَاء) (واتە: ئەو ترێیەیە کە لەسەر ئاگر دەیکوڵێنن هەتا خەست دەبێتەوە، دوو لەسەر سێی لەسەر ئاگر دەڕواو یەک لەسەر سێی دەمێنێتەوە)، وە ئەوەیشی دروست نیە

**٥٧١٥-** «عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ قَالَ: كَتَبَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ إِلَى بَعْضِ عُمَّالِهِ: أَنْ ارْزُقِ الْمُسْلِمِينَ مِنَ الطِّلَاءِ مَا ذَهَبَ ثُلُثَاهُ، وَبَقِيَ ثُلُثُهُ»[٢].

واتە: سوەیدی کوڕی غەفلە دەڵێ: عومەری کوڕی خەطاب ﷺ نوسراوێکی کرد بۆ لای هەندێ لە کاربەدەستانی: ڕزق و ڕۆزی مسوڵمانان بدەن لە ئەو ترێیەی کە دوو لەسەر سێی لەسەر ئاگر ڕۆیشتووە و یەک لەسەر سێی ماوەتەوە.

**٥٧١٦-** «عَنْ عَامِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّهُ قَالَ: قَرَأْتُ كِتَابَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ إِلَى أَبِي مُوسَى: أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّهَا قَدِمَتْ عَلَيَّ عِيرٌ مِنَ الشَّامِ تَحْمِلُ شَرَاباً غَلِيظاً أَسْوَدَ كَطِلَاءِ الْإِبِلِ، وَإِنِّي سَأَلْتُهُمْ عَلَى كَمْ يَطْبُخُونَهُ، فَأَخْبَرُونِي أَنَّهُمْ يَطْبُخُونَهُ عَلَى الثُّلُثَيْنِ، ذَهَبَ ثُلُثَاهُ الْأَخْبَثَانِ، ثُلُثٌ بِبَغْيِهِ، وَثُلُثٌ بِرِيحِهِ، فَمُرْ مَنْ قِبَلَكَ يَشْرَبُونَهُ»[٣].

---

(١) صحيح الإسناد مقطوع.

(٢) حسن صحيح موقوف.

(٣) صحيح لغيره.




واتە: عامری کوڕی عەبدوڵلا دەڵێ: نوسراوەکەی عومەری کوڕی خەطابم ﷺ خوێندەوە کە بۆ ئەبو موسا ناردبووی: دواتر کاروانیەک لە شامەوە هات بۆ لام خواردنەوەیەکی خەستیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو ڕەش بوو وەکو (طِلَاءِ الْإِبِلِ) (بریتیە لەو تێکەڵەی کە دەخرێتە سەر پشتی وشتری گەڕ بۆ ئەوەی چاک بێتەوە، ڕەنگی ڕەشە) منیش پرسیارم لێکردن ماوەی چەنێک دەیخەنە سەر ئاگر، پێیان ڕاگەیاندم ئەوان دوو لەسەر سێی لەسەر ئاگر دەکوڵێنن، دوو لەسەر سێی پیسیایەکەی دەڕوات، یەک لەسەر سێی پیساییەکەی بە پیسیەکەیەوە دەڕوات، یەک لەسەر سێی تریشی بە بۆنەکەیەوە دەڕوات، کەواتە فەرمان بکە بەوانەی لە پێشتن با بیخۆنەوە.

**٥٧١٧-** «عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ يَزِيدَ الْخَطْمِيَّ قَالَ: كَتَبَ إِلَيْنَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: أَمَّا بَعْدُ، فَاطْبُخُوا شَرَابَكُمْ حَتَّى يَذْهَبَ مِنْهُ نَصِيبُ الشَّيْطَانِ، فَإِنَّ لَهُ اثْنَيْنِ وَلَكُمْ وَاحِدٌ»[(١)].

واتە: ئیبنو سیرین دەگێڕێتەوە، عەبدوڵلای کوڕی یەزیدی خەطەمی دەڵێ: عومەری کوڕی خەطاب نوسراوێکی بۆ کردن، پاشان، خواردنەوەکانتان بخەنە سەر ئاگر هەتا بەشی شەیتانی لێ دەڕوات، چونکە دوو بەشی بۆ ئەوەو یەک بەشی بۆ ئێوەیە.

**٥٧١٨-** «عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: كَانَ عَلِيٌّ يَرْزُقُ النَّاسَ الطِّلَاءَ يَقَعُ فِيهِ الذُّبَابُ، وَلَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَخْرُجَ مِنْهُ»[(٢)].

واتە: شەعبی دەڵێ: عەلی (الطِّلَاء)ی دەدا بە خەڵکی (واتە: ئەو ترێیەیە کە لەسەر ئاگر دەیکوڵێنن هەتا خەست دەبێتەوە، دوو لەسەر سێی لەسەر ئاگر دەڕوات و یەک لەسەر سێی دەمێنێتەوە)، مێشولەی تێدەکەوت ئەوەندە خەست بوو نەیدەتوانی لێی دەربچێت.

**٥٧١٩-** «عَنْ دَاوُدَ قَالَ: سَأَلْتُ سَعِيداً: مَا الشَّرَابُ الَّذِي أَحَلَّهُ عُمَرُ؟، قَالَ: الَّذِي يُطْبَخُ حَتَّى يَذْهَبَ ثُلُثَاهُ، وَيَبْقَى ثُلُثُهُ»[(٣)].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح الإسناد موقوف.

(٣) صحيح لغيره.




**واتە: داوود دەڵێ: پرسیارم کرد لە سەعید: ئەو خواردنەوەیە چیە عومەر حەڵاڵی کرد؟ وتی: ئەوەیە کە لەسەر ئاگر دەکوڵێنرێ هەتا دوو لەسەر سێی دەڕوات و یەک لەسەر سێی دەمێنێ.**

**٥٧٢٠-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ أَبَا الدَّرْدَاءِ، كَانَ يَشْرَبُ مَا ذَهَبَ ثُلُثَاهُ وَبَقِيَ ثُلُثُهُ»[1].

**واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب دەگێڕێتەوە، ئەبو دەرداء لەو خواردنەوەی دەخواردەوە کە دوو لەسەر سێی (بە ئاگر) بڕۆیشتایەو یەک لەسەر سێی بمایەتەوە.**

**٥٧٢١-** «عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَشْرَبُ مِنَ الطِّلَاءِ مَا ذَهَبَ ثُلُثَاهُ، وَبَقِيَ ثُلُثُهُ»[2].

**واتە: ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو لە خواردنەوەی (الطِّلَاء) ترێی دەخواردەوە کە دوو لەسەر سێی (بە ئاگر) بڕۆیشتایەو یەک لەسەر سێی بمایەتەوە.**

**٥٧٢٢-** «عَنْ يَعْلَى بْنِ عَطَاءٍ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، وَسَأَلَهُ أَعْرَابِيٌّ عَنْ شَرَابٍ يُطْبَخُ عَلَى النِّصْفِ، فَقَالَ: لَا حَتَّى يَذْهَبَ ثُلُثَاهُ، وَيَبْقَى الثُّلُثُ»[3].

**واتە: یەعلای کوڕی عەطاء دەڵێ: گوێم لە سەعیدی کوڕی موسەیەب بوو پیاوێکی دەشتەکی پرسیاری لێکرد لە بارەی خواردنەوەیەک بیکوڵێنێ نیوە بە نیوە، وتی: نابێت، هەتا دوو لەسەر سێی نەڕوات و یەک لەسەر سێی بمێنێتەوە.**

**٥٧٢٣-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ قَالَ: إِذَا طُبِخَ الطِّلَاءُ عَلَى الثُّلُثِ فَلَا بَأْسَ بِهِ»[4].

**واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب دەڵێ: ئەگەر (الطِّلَاء) ترێ کوڵێنراو لەسەر ئاگر سێیەکی مایەوە ئەوە هیچ گرفتێکی تێدانیە.**

**٥٧٢٤-** «عَنْ أَبِي رَجَاءٍ قَالَ: سَأَلْتُ الْحَسَنَ، عَنْ الطِّلَاءِ الْمُنَصَّفِ، فَقَالَ: لَا تَشْرَبْهُ»[5].

---

(١) صحيح الإسناد موقوف.

(٢) صحيح موقوف.

(٣) صحيح الإسناد مقطوع.

(٤) صحيح الإسناد مقطوع.

(٥) حسن الإسناد مقطوع.





واتە: ئەبو ڕەجاء دەڵێ: پرسیارم کرد لە حەسەن لەبارەی (الطِّلَاءُ) گیراوەی ترێ نیوە بە نیوە، وتی: مەیخۆرەوە.

**٥٧٢٥-** «عَنْ بَشِيرِ بْنِ الْمُهَاجِرِ قَالَ: سَأَلْتُ الْحَسَنَ عَمَّا يُطْبَخُ مِنَ الْعَصِيرِ، قَالَ: مَا تَطْبُخُهُ حَتَّى يَذْهَبَ الثُّلُثَانِ، وَيَبْقَى الثُّلُثُ»(١).

واتە: بەشیری کوڕی موهاجیر دەڵێ: پرسیارم لە حەسەن کرد لەو گیراوەی دەکوڵێنرێ، وتی: بیکوڵێنە هەتا دوو لەسەر سێی دەڕوات و یەک لەسەر سێی دەمێنێ.

**٥٧٢٦-** «عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ نُوحاً ﷺ نَازَعَهُ الشَّيْطَانُ فِي عُودِ الْكَرْمِ، فَقَالَ: هَذَا لِي، وَقَالَ: هَذَا لِي، فَاصْطَلَحَا عَلَى، أَنَّ لِنُوحٍ ثُلُثَهَا، وَلِلشَّيْطَانِ ثُلُثَيْهَا»(٢).

واتە: ئەنەسی کوڕی سیرین دەڵێ: گوێم لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ بوو دەیوت: شەیتان دژایەتی نووحی کرد لەبارەی داری مێو، وتی: ئەمە بۆ من، ئەویش وتی ئەمە بۆ من، ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی یەک لەسەر سێی بۆ نووح بێت و شەیتانیش دوو لەسەر سێی بەربکەوێت.

**٥٧٢٧-** «عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ طُفَيْلٍ الْجَزَرِيِّ قَالَ: كَتَبَ إِلَيْنَا عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ: أَنْ لَا تَشْرَبُوا مِنَ الطِّلَاءِ حَتَّى يَذْهَبَ ثُلُثَاهُ، وَيَبْقَى ثُلُثُهُ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»(٣).

واتە: عەبدولمەلیکی کوڕی طوفەیلی جەزری دەڵێ: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نوسراوێکی بۆ کردین: گیراوەی (الطِّلَاء) ترێ مەخۆنەوە، هەتا دوو لەسەر سێی بە ئاگر دەڕوات و یەک لەسەر سێی دەمێنێ، هەروەها هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە.

**٥٧٢٨-** «عَنْ مَكْحُولٍ قَالَ: كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»(٤).

واتە: مەکحول دەڵێ: هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەیە.

---

(١) حسن الإسناد مقطوع.

(٢) حسن الإسناد مقطوع.

(٣) ضعيف الإسناد.

(٤) صحيح الإسناد مقطوع غير أن المتن صحيح موصولًا.

## خواردنەوەی ئەو گیراوەی دروستەو ئەوەیشی دروست نیە

**٥٧٢٩-** «عَنْ أَبِي ثَابِتٍ الثَّعْلَبِيِّ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ، فَسَأَلَهُ عَنِ الْعَصِيرِ، فَقَالَ: اشْرَبْهُ مَا كَانَ طَرِيّاً، قَالَ: إِنِّي طَبَخْتُ شَرَاباً، وَفِي نَفْسِي مِنْهُ، قَالَ: أَكُنْتَ شَارِبَهُ قَبْلَ أَنْ تَطْبُخَهُ؟، قَالَ: لَا، قَالَ: فَإِنَّ النَّارَ لَا تُحِلُّ شَيْئاً قَدْ حَرُمَ»[1].

**واتە:** ئەبو ثابتی ثەعلەبی دەڵێ: من لای ئیبنو عەبباس بووم، پیاوێک هات بۆ لای، پرسیاری لێکرد لەبارەی گرتنەوەی خواردنەوە، وتی: ئەگەر تازە بوو بیخۆرەوە، وتی: من خواردنەوەیەکم دروست کردوە بە ئاگر لە نەفسمدا شتێک هەیە دەربارەی، وتی: پێش ئەوەی بیخەیتە سەر ئاگر لێت خواردەوە؟ وتی: نەخێر، وتی: ئاگر هیچ شتێک حەڵاڵ ناکات ئەگەر حەرام بێت.

**٥٧٣٠-** «عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ يَقُولُ: وَاللَّهِ مَا تُحِلُّ النَّارُ شَيْئاً، وَلَا تُحَرِّمُهُ قَالَ: ثُمَّ فَسَّرَ لِي قَوْلَهُ: لَا تُحِلُّ شَيْئاً لِقَوْلِهِمْ فِي الطِّلَاءِ، وَلَا تُحَرِّمُهُ»[2].

**واتە:** عەطاء دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عەبباس بوو دەیوت: سوێند بە خوا ئاگر نە هیچ حەڵاڵ دەکات و، نە هیچ حەرام دەکات، وتی: پاشان قسەکەی بۆم شیکردەوە: لە بارەی ئەوەی وتویانە گیراوەی (الطِّلَاء) ئەو ترێیەی لەسەر ئاگر دەیکوڵێنن، ئەوە نە حەڵاڵی دەکات و نە حەرامی دەکات. (بەڵکو هەموو سەرخۆشکەرێک حەرامە).

## دەستنوێژ گرتن لە خواردنی ئەو شتەی ئاگری بەرکەوتووە

**٥٧٣١-** «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ قَالَ: اشْرَبِ الْعَصِيرَ مَا لَمْ يُزْبِدْ»[3].

**واتە:** سەعیدی کوڕی موسەیەب دەڵێ: گیراوە بخۆرەوە بە مەرجێک کەف نەکات.

---

(١) صحيح الإسناد موقوف.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد مقطوع.




**٥٧٣٢-** «عَنْ هِشَامِ بْنِ عَائِذٍ الْأَسَدِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ إِبْرَاهِيمَ عَنِ الْعَصِيرِ، قَالَ: اشْرَبْهُ حَتَّى يَغْلِيَ، مَا لَمْ يَتَغَيَّرْ»[١].

**واتە: هیشامی كوڕی عائیزی ئەسەدی دەڵێ: پرسیارم لە ئیبراهیم كرد لە بارەی گیراوە، وتی: بیخۆرەوە هەتا قوڵ دەدات، بە مەرجێك نەگۆڕێت.**

**٥٧٣٣-** «عَنْ عَطَاءٍ، فِي الْعَصِيرِ، قَالَ: اشْرَبْهُ حَتَّى يَغْلِيَ»[٢].

**واتە: عەطاء لەبارەی گیراوەوە وتی: بیخۆرەوە هەتا قوڵ دەدات.**

**٥٧٣٤-** «عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: اشْرَبْهُ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا أَنْ يَغْلِيَ»[٣].

**واتە: شەعبی دەڵێ: سێ ڕۆژ بیخۆرەرەوە، بەڵام با قوڵ نەدات.**

## باسی ئەوەی دروستە لە خواردنەوەی گیراوە شلەمەنیەكان و ئەوەیشی دروست نیە

**٥٧٣٥-** «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الدَّيْلَمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ فَيْرُوزَ ﷺ قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا أَصْحَابُ كَرْمٍ، وَقَدْ أَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ تَحْرِيمَ الْخَمْرِ، فَمَاذَا نَصْنَعُ؟، قَالَ: تَتَّخِذُونَهُ زَبِيباً؟ قُلْتُ: فَنَصْنَعُ بِالزَّبِيبِ مَاذَا؟ قَالَ: تُنْقِعُونَهُ عَلَى غَدَائِكُمْ، وَتَشْرَبُونَهُ عَلَى عَشَائِكُمْ، وَتُنْقِعُونَهُ عَلَى عَشَائِكُمْ، وَتَشْرَبُونَهُ عَلَى غَدَائِكُمْ قُلْتُ: أَفَلَا نُؤَخِّرُهُ حَتَّى يَشْتَدَّ؟ قَالَ: لَا تَجْعَلُوهُ فِي الْقُلَلِ، وَاجْعَلُوهُ فِي الشِّنَانِ، فَإِنَّهُ إِنْ تَأَخَّرَ صَارَ خَلًّا»[٤].

**واتە: عەبدوڵڵای كوڕی دەیلەمی دەگێڕێتەوە، لە فەیروزی باوكیەوە ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە خەڵكانێكی خاوەن باخی مێوین، خوا ﷻ مەی و ئارەقی قەدەغە كردوە، ئیتر چی دروست بكەین؟ فەرمووی: بیكەن بە مێوژ، وتم: ئەی بە مێوژ چی دروست بكەین؟ فەرمووی: بەیانیان دەیخویسێنن و شەوان دەیخۆن، شەوانیش دەیخویسێنن و بەیانیان دەیخۆن،**

---

(١) صحيح الإسناد مقطوع.

(٢) صحيح الإسناد مقطوع.

(٣) صحيح الإسناد مقطوع.

(٤) صحيح الإسناد . أخرجه أبو داود: ٣٧١٠.





وتم: ئەی دوای نەخەین هەتا زیاتر خۆی دەگرێ؟ فەرمووی: مەیخەنە ناو گۆزەی گەورە، بەڵکو بیخەنە ناو پێستەوە، چونکە ئەگەر دوا بکەوێت دەبێتە سرکە.

**٥٧٣٦-** «عَنِ ابْنِ الدَّيْلَمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لَنَا أَعْنَاباً فَمَاذَا نَصْنَعُ بِهَا؟، قَالَ: زَبِّبُوهَا، قُلْنَا: فَمَا نَصْنَعُ بِالزَّبِيبِ؟ قَالَ: انْبِذُوهُ عَلَى غَدَائِكُمْ، وَاشْرَبُوهُ عَلَى عَشَائِكُمْ، وَانْبِذُوهُ عَلَى عَشَائِكُمْ، وَاشْرَبُوهُ عَلَى غَدَائِكُمْ، وَانْبِذُوهُ فِي الشِّنَانِ، وَلَا تَنْبِذُوهُ فِي الْقِلَالِ، فَإِنَّهُ إِنْ تَأَخَّرَ صَارَ خَلّاً»[١].

واتە: ئیبنو دەیلەمی دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە ترێمان زۆرە چی پێ دروست بکەین؟ فەرمووی: بیکەن بە مێوژ، وتم: ئەی بە مێوژ چی دروست بکەین؟ فەرمووی: گیراوەو شلەمەنی لێ دروست بکەن لە بەیانیانداو شەوان بیخۆن، شەوانیش دروستی بکەن و بە ڕۆژدا بیخۆن، وە لە ناو پێستەدا بیگرنەوەو لەناو گۆزەی گەورەدا مەیگرنەوە، چونکە ئەگەر دوا بکەوێت دەبێتە سرکە.

**٥٧٣٧-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ يُنْبَذُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَيَشْرَبُهُ مِنَ الْغَدِ، ومِنْ بَعْدِ الْغَدِ، فَإِذَا كَانَ مَسَاءُ الثَّالِثَةِ، فَإِنْ بَقِيَ فِي الْإِنَاءِ شَيْءٌ لَمْ يَشْرَبُوهُ أُهَرِيقَ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: شلەمەنی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەگیرایەوە لە بەیانیاندا دەیخوارد، وە لە دوای ڕۆژەکەی تریش، جا ئەگەر لە ئێوارەی سێیەمدا شتێک لەناو قاپەکەدا بمایەتەوە نەیان دەخواردەوەو دەیان ڕژان.

**٥٧٣٨-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُنْقَعُ لَهُ الزَّبِيبُ فَيَشْرَبُهُ يَوْمَهُ، وَالْغَدَ وَبَعْدَ الْغَدِ»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ مێوژی بۆ دەخوسێنرا، بە درێژایی ڕۆژەکە لێی دەخوارد، هەروەها لە ڕۆژەکەی دواتریش لێی دەخواردەوە.

---

(١) حسن صحيح الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٠ و ٢٠٠٤/٨٣، وأبو داود: ٣٧١٣، وإبن ماجه: ٣٣٩٩.

(٣) صحيح لغيره.




**٥٧٣٩-** «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُنْبَذُ لَهُ نَبِيذُ الزَّبِيبِ مِنَ اللَّيْلِ، فَيَجْعَلُهُ فِي سِقَاءٍ، فَيَشْرَبُهُ يَوْمَهُ ذَلِكَ وَالْغَدَ، وَبَعْدَ الْغَدِ، فَإِذَا كَانَ مِنْ آخِرِ الثَّالِثَةِ سَقَاهُ أَوْ شَرِبَهُ، فَإِنْ أَصْبَحَ مِنْهُ شَيْءٌ أَهْرَاقَهُ»[١].

**واته: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شلەمەنی مێوژی بۆ دەگیرایەوە لە شەودا، دەیکردە ناو کونەوە، لە ڕۆژەکەیدا دەیخواردەوە، وە ڕۆژەکەی تریش و ڕۆژێکیش دوای ئەویش، جا ئەگەر لە کۆتایی سێ ڕۆژەکەدا شتێکی لێ بمایەتەوە دەرخواردی یەکێکی تری دەدا، یان خۆی دەیخواردەوە، ئەگەر بۆ بەیانیەکەیدا شتێکی لێ بمایەتەوە دەیڕژاند.**

**٥٧٤٠-** «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ كَانَ يُنْبَذُ لَهُ فِي سِقَاءٍ الزَّبِيبُ غُدْوَةً، فَيَشْرَبُهُ مِنَ اللَّيْلِ، وَيُنْبَذُ لَهُ عَشِيَّةً فَيَشْرَبُهُ غُدْوَةً، وَكَانَ يَغْسِلُ الْأَسْقِيَةَ، وَلَا يَجْعَلُ فِيهَا دُرْدِيًا، وَلَا شَيْئاً قَالَ نَافِعٌ: فَكُنَّا نَشْرَبُهُ مِثْلَ الْعَسَلِ»[٢].

**واته: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: شلەمەنی مێوژی بۆ دەگیرایەوە لە ناو کونەدا بەڕۆژ، دواتر کە شەو دادەهات دەیخواردەوە، وە بە شەو بۆی دروست دەکراو بە ڕۆژ دەیخواردەوە، وە ئەو دەفرانەی دەشۆرد کە بە پێستە دروست دەکرا، خڵتەی تێ نەدەکرد، وە هیچ شتێکی تریش، نافع وتی: ئێمەیش دەمانخواردەوە وەکو هەنگوین وابوو.**

**٥٧٤١-** «عَنْ بَسَّامٍ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا جَعْفَرٍ عَنِ النَّبِيذِ قَالَ: كَانَ عَلِيُّ بْنُ حُسَيْنٍ يُنْبَذُ لَهُ مِنَ اللَّيْلِ، فَيَشْرَبُهُ غُدْوَةً، وَيُنْبَذُ لَهُ غُدْوَةً فَيَشْرَبُهُ مِنَ اللَّيْلِ»[٣].

**واته: بەسام دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئەبو جەعفەر لە بارەی گیراوەوە، وتی: عەلی کوڕی حوسێن بە شەو خواردنەوەی بۆ دەگیرایەوە، بە بەیانیان دەیخوارد، وە بە بەیانیان بۆی دروست دەکرا بە شەو دەیخوارد.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح الإسناد موقوف.

(٣) صحيح الإسناد مقطوع.

**٥٧٤٢**- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ سُفْيَانَ، سُئِلَ عَنِ النَّبِيذِ، قَالَ: انْتَبِذْ عَشِيّاً، وَاشْرَبْهُ غُدْوَةً»[١].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پرسیار کرا لە سوفیان لە بارەی گرتنەوەی گیراوەوە، وتی: بەشەو شلەمەنی بگرەرەوە، بە بەیانیان بیخۆ.**

**٥٧٤٣**- «عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، وَلَيْسَ بِالنَّهْدِيِّ، أَنَّ أُمَّ الْفَضْلِ أَرْسَلَتْ إِلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ تَسْأَلُهُ عَنْ نَبِيذِ الْجَرِّ، فَحَدَّثَهَا عَنِ النَّضْرِ ابْنِهِ أَنَّهُ كَانَ يَنْبِذُ فِي جَرٍّ يُنْبَذُ غَدْوَةً وَيَشْرَبُهُ عَشِيَّةً»[٢].

**واتە: عوسمان دەگێڕێتەوە، مەبەست پێی عوسمانی نەهدی نیە، دایکی فەضل ناردی بۆ لای ئەنەسی کوڕی مالیک پرسیاری لێکرد لە بارەی گرتنەوەی خواردنەوە لە ناو گۆزەدا؟ ئەویش بۆ نەضری کوڕی باس کرد، کە ئەو لە ناو گۆزەدا لە بەیانیاندا خواردنەوەی دەگرتەوەو بە شەو دەیخواردەوە.**

**٥٧٤٤**- «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، أَنَّهُ كَانَ يَكْرَهُ أَنْ يَجْعَلَ نَطْلَ النَّبِيذِ فِي النَّبِيذِ لِيَشْتَدَّ بِالنَّطْلِ»[٣].

**واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە، ئەو پێی باش نەبوو پاشماوەی گیراوە تێکەڵ بکات لەگەڵ هی تردا.**

**٥٧٤٥**- «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، أَنَّهُ قَالَ فِي النَّبِيذِ: خَمْرُهُ دُرْدِيُّهُ»[٤].

**واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب لە بارەی گرتنەوەی شلەمەنیەوە دەڵێ: لێڵیەکەی سەرخۆشکەرە.**

**٥٧٤٦**- «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ قَالَ: إِنَّمَا سُمِّيَتِ الْخَمْرُ لِأَنَّهَا تُرِكَتْ حَتَّى مَضَى صَفْوُهَا، وَبَقِيَ كَدَرُهَا، وَكَانَ يَكْرَهُ كُلَّ شَيْءٍ يُنْبَذُ عَلَى عَكَرٍ»[٥].

**واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب دەڵێ: مەی ئارەق لەبەر ئەوە ناونراوە بە خەمر، چونکە وازی لێهێنراوە هەتا پاکیەکەی ڕۆیشتوەو لێڵیەکەی ماوە، وە هەموو شتێکی پێناخۆش بوو لە سەر لێڵی بگیرێتەوە.**

---

(١) صحيح الإسناد مقطوع.

(٢) ضعيف الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد مقطوع.

(٤) صحيح الإسناد.

(٥) صحيح الإسناد.




## باسی جیاوازی لە سەر ئیبراهیم لە گرتنەوەی شلەمەنی و گیراوە لە فەرموودەكەدا

**٥٧٤٧-** «عَنْ فُضَيْلِ بن عَمْرٍو عن إِبْرَاهِيمَ قَالَ: كَانُوا يَرَوْنَ أَنَّ مَنْ شَرِبَ شَرَاباً فَسَكِرَ مِنْهُ، لَمْ يَصْلُحْ لَهُ أَنْ يَعُودَ فِيهِ»(١).

**واتە: فوزەیلی كوڕی عەمرِ دەگێڕێتەوە، لە ئیبراهیمەوە دەڵێ: ئەوان پێیان وابوو هەر كەس خواردەنەوەیەک بخواتەوە پێی بێهۆش بێت، حەڵاڵ نیە بۆی بگەڕێتەوە سەری.**

**٥٧٤٨-** «عَنْ أبي مَعْشَرٍعن إِبْرَاهِيمَ قَالَ: لَا بَأْسَ بِنَبِيذِ الْبُخْتُجِ»(٢).

**واتە: ئەبو مەعشەر دەگێڕێتەوە، لە ئیبراهیمەوە دەڵێ: گیراوەی شلەمەنی بە ئاگر هیچ گرفتێكی تێدانیە.**

**٥٧٤٩-** «عَنْ أَبِي مِسْكِينٍ قَالَ: سَأَلْتُ إِبْرَاهِيمَ قُلْتُ: إِنَّا نَأْخُذُ دُرْدِيَّ الْخَمْرِ أَوِ الطِّلَاءِ فَنُنَظِّفُهُ، ثُمَّ نَنْقَعُ فِيهِ الزَّبِيبَ ثَلَاثاً، ثُمَّ نُصَفِّيهِ، ثُمَّ نَدَعُهُ حَتَّى يَبْلُغَ فَنَشْرَبُهُ، قَالَ: يُكْرَهُ»(٣).

**واتە: ئەبو میسكین دەڵێ: پرسیارم كرد لە ئیبراهیم وتم: ئێمە لێڵی مەی، یان لەبەر گیراوەی ترێیان وەردەگرت و پاكمان دەكردەوە، پاشان سێ ڕۆژ مێوژمان تیایدا دەخویساند، پاشان پاڵفتەمان دەكرد، پاشان وازمان لێ دەهێنا هەتا پێدەگەیشت، ئینجا لێیمان دەخواردەوە، وتی: باش نیە.**

**٥٧٥٠-** «عَنِ ابْنِ شُبْرُمَةَ قَالَ: رَحِمَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ شَدَّدَ النَّاسُ فِي النَّبِيذِ، وَرَخَّصَ فِيهِ»(٤).

**واتە: ئیبنو شوبرومە دەڵێ: ڕەحمەتی خوا لە ئیبراهیم خەڵک توند بوون لە گرتنەوەی شلەمەنی و گیراوە، بەڵام ئەو مۆڵەتی پێدا.**

---

(١) صحيح الإسناد مقطوع.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) حسن الإسناد مقطوع.

(٤) صحيح الإسناد مقطوع.




**٥٧٥١-** «عَنْ أَبِي أُسَامَةَ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ الْمُبَارَكِ يَقُولُ: مَا وَجَدْتُ الرُّخْصَةَ فِي الْمُسْكِرِ عَنْ أَحَدٍ صَحِيحاً إِلَّا عَنْ إِبْرَاهِيمَ»[١].

**واتە: ئەبو ئوسامە دەڵێ: گوێم لە ئیبنو موبارەک بوو دەیوت: نەمبینیوە هیچ کەس مۆڵەت بدات بە شتی سەرخۆشکەر جگە لە ئیبراهیم نەبێت.**

**٥٧٥٢-** «عَنْ أَبِي أُسَامَةَ يَقُولُ: مَا رَأَيْتُ رَجُلاً أَطْلَبَ لِلْعِلْمِ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْمُبَارَكِ الشَّامَاتِ وَمِصْرَ وَالْيَمَنَ وَالْحِجَازَ»[٢].

**واتە: ئەبو ئوسامە دەڵێ: هیچ پیاوێکم نەبینیوە ئەوەندەی عەبدوڵڵای کوڕی موبارەک بە دوای زانستدا بگەڕێ لە شام و میسرو یەمەن و حجاز.**

## باسی ئەو خواردنەوانەی ڕێگەپێدراون

**٥٧٥٣-** «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ لِأُمِّ سُلَيْمٍ قَدَحٌ مِنْ عَيْدَانٍ، فَقَالَتْ: سَقَيْتُ فِيهِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كُلَّ الشَّرَابِ الْمَاءَ، وَالْعَسَلَ، وَاللَّبَنَ، وَالنَّبِيذَ»[٣].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: دایکی سولەیم دەفرێکی هەبوو لە دار دروست کرابوو، وتی: هەموو خواردنەوەیەکم لە ناو ئەمەدا داوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاو، هەنگوین، شیر، گیراوەی شلەمەنی.**

**٥٧٥٤-** «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَي قَالَ: سَأَلْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ ﷺ عَنِ النَّبِيذِ، فَقَالَ: اشْرَبِ الْمَاءَ، وَاشْرَبِ الْعَسَلَ، وَاشْرَبِ السَّوِيقَ، وَاشْرَبِ اللَّبَنَ الَّذِي نُجِعْتَ بِهِ فَعَاوَدْتُهُ فَقَالَ: الْخَمْرَ تُرِيدُ الْخَمْرَ تُرِيدُ»[٤].

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزی دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ لە بارەی گیراوەی شلەمەنی، وتی: ئاو بخۆرەوە، هەنگوین بخۆرەوە، (السَّوِيق) بخۆرەوە (کە خواردنێکە لە ئاردو ڕۆن دروست دەکرێت)، شیر بخۆرەوە کە لە**

---

(١) صحيح الإسناد مقطوع.

(٢) صحيح الإسناد مقطوع.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح الإسناد مقطوع.





منداڵیەوە خواردووتە، دووبارە پرسیارم لێكردەوە، وتی: ئارەقت دەوێ، ئارەقت دەوێ.

**٥٧٥٥-** «عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: أَحْدَثَ النَّاسُ أَشْرِبَةً مَا أَدْرِي مَا هِيَ، فَمَا لِي شَرَابٌ مُنْذُ عِشْرِينَ سَنَةً أَوْ قَالَ: أَرْبَعِينَ سَنَةً إِلَّا الْمَاءُ وَالسَّوِيقُ غَيْرَ أَنَّهُ لَمْ يَذْكُرِ النَّبِيذَ»[١].

**واتە: ئیبنو مەسعود ﷺ دەڵێ: خەڵكی كۆمەڵە خواردنەوەیەكیان داهێناوە نازانم چیە، من لە ماوەی بیست ساڵ یان وتی: چل ساڵ تەنها خواردنەوەی ئاوو (السویق) (كە خواردنێكە لە ئاردو ڕۆن دروست دەكرێت) دەخواردەوە، بەڵام باسی گیراوەی شلەمەنی نەكرد.**

**٥٧٥٦-** «عَنْ عَبِيدَةَ قَالَ: أَحْدَثَ النَّاسُ أَشْرِبَةً مَا أَدْرِي مَا هِيَ، وَمَا لِي شَرَابٌ مُنْذُ عِشْرِينَ سَنَةً إِلَّا الْمَاءُ، وَاللَّبَنُ، وَالْعَسَلُ»[٢].

**واتە: عوبەیدە دەڵێ: خەڵكی كۆمەڵە خواردنەوەیەكیان داهێناوە نازانم چیە، من لە ماوەی بیست ساڵدا هیچ خواردنەوەیەكم نەبووە، جگە لە ئاوو شیرو هەنگوین نەبێ.**

**٥٧٥٧-** «عَنِ ابْنِ شُبْرُمَةَ قَالَ: قَالَ طَلْحَةُ ﷺ لِأَهْلِ الْكُوفَةِ: فِي النَّبِيذِ فِتْنَةٌ يَرْبُو فِيهَا الصَّغِيرُ، وَيَهْرَمُ فِيهَا الْكَبِيرُ، قَالَ: وَكَانَ إِذَا كَانَ فِيهِمْ عُرْسٌ كَانَ طَلْحَةُ وَزُبَيْدٌ يَسْقِيَانِ اللَّبَنَ وَالْعَسَلَ، فَقِيلَ لِطَلْحَةَ: أَلَا تَسْقِيهِمُ النَّبِيذَ؟ قَالَ: إِنِّي أَكْرَهُ أَنْ يَسْكَرَ مُسْلِمٍ فِي سَبَبِي»[٣].

**واتە: ئیبنو شوبورمە دەڵێ: طەڵحە ﷺ بە خەڵكی كوفەی وت: لە گیراوەی شلەمەنیدا فیتنەو ئاشووب هەیە، منداڵی پێ بەهێز دەبێت و پیری پێ دەتەپێ، وتی: ئەگەر شاییەكیان هەبووایە طەڵحەو زوبەید شیرو هەنگوینیان دەگێڕا، بە طەڵحە وترا: ئایا بۆچی گیراوەی شلەمەنیان دەرخوارد نادەیت؟ وتی: من حەز ناكەم مسوڵمانێك بە هۆی منەوە سەرخۆش بێ.**

---

(١) صحيح الإسناد موقوف.

(٢) صحيح الإسناد مقطوع.

(٣) صحيح الإسناد مقطوع.





**٥٧٥٨-** «عَنْ جَرِيرٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ شُبْرُمَةَ لَا يَشْرَبُ إِلَّا الْمَاءَ وَاللَّبَنَ»[١].

**واتە: جەریر دەڵێ: ئیبنو شوبورمە هیچی نەدەخواردەوە جگە لە ئاوو شیر نەبێت.**

وَصَلَّى اللَّهُ وَسَلَّمَ عَلَى حَبِيْبِنَا مُحَمَّدٍ ﷺ، عَلَى اكْمَال هَذِهِ التَّرْجَمَة

**سەر لە بەیانی ڕۆژی پێنج شەممە بەرواری ٢٧ / ١٢ / ٢٠١٨، دەستم پێکرد**

**لە ٢٢ / ٧ / ٢٠١٩ تەواو بوو.**

**سوپاس بۆ خوای باڵادەست و کاربەجێ.**

---

(١) صحيح الإسناد مقطوع.




١. صحيح الأدب المفرد — سيروان كاكە أحمد

٢. سنن الدارمي — زانا عيسا عبابكر

٣. سنن النسائي — عباس محمد أمين




ڕێکخراوی پیت بۆ پەروەردە و توێژینەوەی زانستی






بۆ هەر ڕەخنەو پێشنیارێک تکایە پەیوەندیمان پێوە بکەن:

ژمارەی وەرگێڕ: م. عباس محمد أمين: ٠٧٧١٩٤٩٣٣٠٩




## ناوەڕۆك

